# یادگارییەکانی

# خانەی مردووان

نووسینی : دۆستۆیفسکی

وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف

ناوی کتێب: یادگارییەکانی خانەی مردووان

نووسینی: دۆستۆیفسکی

گۆڕینی: حەمە کەریم عارف

بابەت: بیرەوەری

پیت چنین: حەمە کەریم عارف

هەڵەچن: ئەحمەد محمود رەشید

دیزاینی ناوەڕۆك: زانا کەمال

چاپی یەکەم: ٢٠١٣

ژمارەی سپاردن ١٤١٨ساڵی ٢٠١٣ لە بەریوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکانی پێدراوە

## پێڕست

# وتەیەك

## حەمەكەریم عارف

"١"

***نیتشە :***

***" دۆستۆیفسكی یەكەم كەسە لە بواری سایكۆلۆژیدا شتێكی فێركردووم"***

بەندە پێموایە باشترین پێناسەی هەر دەقێك خودی دەقەكەیە. هەركەسێك بیەوێ بە جوانی لە دەقێك بگات هیچ چارێكی نییە جگە لە خوێندنەوەی دەقەكە. بە كورتی و كوردی پێموایە دەق هونەری نهێنی سازی یان هونەری نهێنی دۆزییە...ئەم دەقەی بەندە دەیخەمە بەر دەستی خوێنەرانی هێژا یەكێكە لە شاكارەكانی كەڵە ئەدیب و نووسەری سەدەی نۆزدەی روسیا، فیودۆر دۆستۆیفسكی ( ١٨٢١-١٨٨١) كە هەندێك لە پسپۆڕان و شارەزایان بە شاكاری ئەوی دەزانن و هەندێكی دی برایانی كارامازۆف بە شاكار دەزانن، بە هەرحاڵ ئەگەر ( یادگارییەكانی خانەی مردوان) شاكاری دۆستویفسكیش نەبێت، ئەوا لە بواری خۆیدا بێ چەند وچوون شاكارە.

دۆستویفسكی لەم بەرهەمەیدا، تراجیدیای ژیانی تیرەی بەشەری بە شێوەیەكی هێندە قووڵ و كاریگەر بەرجەستە كردووە كە خوێنەران و رەخنەگران، نووسەریان بە دانتییەكی تازە و بەرهەمەكەیان بە دۆزەخەكەی دانتی شوبهاندووە. بەڵام چ دۆزەخێك! دۆزەخی واقیع، دۆزەخێك كە پڕ بە مانای دۆزەخ لە واقیعدا هەیە نەك تەنیا لە خەیاڵی نووسەردا. ئەو واقیعە تاڵ و پەنهانەی كە نووسەر بۆ خوێنەرانی كەشف كردووە: جیهانی هەڕەمەی زندانییان، جیهانی بێگارو سوخرەی تاقەت پڕوكێن، رەفتاری ناكۆك و هەڤدژی زندانییان، ئەو كارانەی دەیكەن، خۆشی و ناخۆشییەكانیان، گەشبینی و رەشبینییەكانیان، ئەو نەخۆشخانە قێزەونەی كە تیایدا مالیجە دەكرێن، ئەو سزاو ئەشكەنجە بەدەنیانەی بە سەریاندا دەسەپێنرێت..هەر هەموو ئەمانە و زۆر شتی دیكەش لە لایەن نووسەرێكی بەهرەدار و بلیمەتەوە، كە بە خۆی لەو دۆزەخەدا ژیاوەو بە خۆی راستەوخۆ جەڕباندوویەتی ، بە جۆرێ بەرجەستە كراوەو هونەرمەندانە و وەستایانە هونەرێنراوە، كە نەك هەركاری لە خوێنەر كردووە ، بگرە لە ناخی ناخەوە هەژاندوویەتی، تەنانەت كەسێكی وەكو ئەلكساندەری دووەمی ئیمپراتۆر! بە دەم خوێندنەوەی ئەم كتێبەوە هۆن هۆن گریاوەو ڕوندكی بەسەر لاپەرەكانیدا هەڵڕشتووە.

"٢"

هەڵبەتە دۆستۆیفسكی لە یادگارییەكانی خانەی مردوواندا بەشێك لە ژیان و ئەزموونی خۆی لە زندانی سیبریادا دەگێڕێتەوە، بەڵام هەندێ نموونەی زۆر زندووشی لە هاوزندانییەكانی

وەرگرتووەو بە شێوازێکی وردو داهێنەرانە چارەنووسی خەمناکیان دەگێڕێتەوەو تەبیعەت و سروشتیان شەن و کەو دەکات و پەردە لە سەر زۆر نهێنی و رازی دەروونی مرۆڤ هەڵدەداتەوە.

دۆستۆیفسکی لە زندانی ئومسکدا دەست بە تۆمارکردنی سەرنج و تێبینییەکانی خۆی دەکات و بە پەیڤ و وشەیان دەسپێرێت و دەیانخاتە سەر کاغەز..ئیدی ئەو یادگارییانەی کە تۆماریان دەکات بۆ ماوەیەکی زۆر بە نهێنی لە لای یەکێك لە فەرمانبەرانی نەخۆشخانەی زندانەکە دادەنێت. پاشان لە شاری سیمیبالاتنسك دەگەڕێتەوە سەر یادگرییەکان و ئەنجام پاش گەڕانەوەی بۆ مۆسکۆ ئەوسا تەواوی دەکات. ئەم کتێبە کە سەرڕێژە لە بیرەوەری یەجگار ترسناك و ناخۆش، زادەی ئەزموونی شەخسی خۆیەتی، هەرچەندە داویەتیە پاڵ کابرایەك کە ناوی ناوە ئالکساندەر گوریانچیکۆف و بە زمانی ئەوەوە گێڕاویەتیەوە، بەڵام ئەمە گەمەیەکی هونەرییەو بەسەر خوێنەردا تێنا پەڕێت..

کاتێ دۆستویفسکی لە ساڵی ١٨٤٦دا یەکەمین بەرهەمی خۆی ( هەژاران)ی بلأوکردەوە،بیلینسکی گەورە رەخنەگری ناسراوی ئەو رۆژگارە، زۆری پەسند کرد و مژدەی لە دایکبوونی ئەدیبێکی رەسەن و گەورەی بە ئەهلی قەڵەم دا وپێشبینی ئایندەیەکی ئەدەبیی پرشنگداری بۆ دۆستویفسکی کرد کە هەر واش دەرچوو..

پاش بلأوبوونەوەی هەژاران، دۆسویفسکی بە تۆمەتی چالاکی سیاسی نهێنی و ژێرزەمینی، لە مانگی نیسانی ١٨٤٩دا دەستگیر کراو لە زندانیان پەستاوت و حوکمی ئیعدامیان بەسەرا دا..لە مانگی دوانزەی هەمان ساڵدا، دەگەڵ نۆ کەسی دیکەدا ، کە ئەوانیش بە هەمان تۆمەت گیرابوون و هەمان سزای ئەویان بۆ بڕابووەوە، برانە مەیدانی ئیعدام و چاویان بەستنەوەو و تەپلی دەست بەکاربوون لێدرا و فەرمانی تیرباران کردنیان درا، بەڵام مەبەست لەم نمایشە زیاتر ترساندنی تاوانبارەکان بوو نەك تیربارانکردنیان. بۆیە حوکمی تیربارانەکە ئەنجام نەدرا. پێیان راگەیەنرا کە تزار بە میهر و دلۆڤانی و مەرحەمەتی خۆی چاوپۆشی لە خەتاکانیان کردووە، یەکێکیانی بە تەواوەتی بەخشیوەو حوکمی ئەوانی تری سووك کردووەو کردوویەتی بە زندان لە تاراوگەدا..

ئیدی شەوی ١٨٤٩/١٢/٢٥ کۆت و زنجیر لە دەست و لاقی ئەم زندانییە قەرەبەختانە کراو بەرەو تاراوگەو گرتووخانەکانی سیبریا بران...دۆستویفسکی لە زندانێکی شاری ئومسکدا گیرسایەوەو چوار ساڵی خشتی لەم زندانەدا بەسەر بردوو ئەم چوار ساڵە کارێکی دەروونی و رۆحی یەجگار دژواری لێکرد..سیبریاو تاراوگە و گرتووخانەکانی سیبریا گاڵتە نەبوو، لە کۆنی کۆنەوە هەزاران رۆڵەی رووس بووبوون بە خۆراکی ئەو دۆزەخە ترسناکەو هەرکەسێك رێی کەوتبا ئەوێندەر، ئیدی کەس بە تەمای نەدەما و بێ سەرو شوێن لەو گۆڕستانی زندووانەدا ون دەبوو.جا کاریگەری ئەم تاراوگەو گۆرستانی زندووانە، لە سەرانسەری ژیان و بەرهەمەکانی دۆستویسکی دا مایەوەو خۆش نەبووەوەو نەبووەوە. ئەوەتا بە خۆی، پاش ئەوەی لە زندان ئازاد دەبێت، بە کەسەرێکی زۆرەوە دەڵێت: "چەندین ساڵم لە ژێر چاودێری وەردیان و زندانەوانانداـ دەگەڵ کۆمەڵێکدا، لە نێو حەشاماتێکدا بەسەر برد کە بە درێژایی ئەم ماوەیە بۆ

تاقە سەعاتێکیش تەنیا نەبووم ، بە عەزرەتی تەنیاییەوە بووم، لە کاتێکا تەنیایی یەکێکە لە پێداویستییەکانی ژیانی ئاسایی، لە حوکمی خەو و خۆراکدایە، ئەگەر ئەمە لە بەشەر قەدەغە بکەن ، ئیدی بەشەر لە ژیانی هاوبەشی زۆرەکی خۆی بێزار دەبێت و گومان لە رەگەزی بەشەر دەکات..من لە ماوەی ئەم چوار ساڵەدا ئەوەندەی لەم حاڵەتە بێزارو بێتاقەت بووم لە هیچ شتێکی دی بێزار نەبووم، زۆرجار رێکدەکەوت کە تووشی هەرکەسێك دەبووم – خەتابار بوایە یان بێ خەتا – رقم لێی دەبووەوە، بەو چاوە سەیرم دەکردن کە دزن و ژیانم لێدەدزن.."

بۆیە لە سەرانسەری ئەم شاکارەدا، خەم و پەژارە و کول و کۆڤانێکی کوشندە، دڵتەزێن، خەم و کەسەری پیاوێك کە ناچار کراوە لە دنیایەکی غەریب وناموٚدا بژی.. پیاوێك کە لە هەر مافێکی بەشەری بێ بەش کراوە، شەپۆل دەدات..

"٣"

ئەم پیاوە هەستیار و تورەیە، بەوپەڕی تامەزرۆییەوە ،بەوپەڕی کونجکاویەوە، لەم تاریکستانە تەنگ و ترسناکەدا بە دووی سیمای گەش و گەشبینانەدا، بە دووی خۆشەویستی و تەباییدا دەگەڕێت، فرمێسك بۆ ئازادی لە دەست چووی خۆی دەرێژێت، نیگا تیژو پاکەکانی، تەوێڵی داغمەدار و ڕووی گرژ ومۆنی زندانییەکان دەبەزێنێت و هزرە لێڵ و گۆنگەکانیان، خەونە دوورو درێژ و  بێ باڵ و باڵدارەکانیان دەخوێنێتەوەو بە تواناو سەلیقەیەکی داهێنەرانەی بێ وێنەوە دەیانخاتە سەر کاغەز..

ئەوەی کە دۆستویفسکی لە رووی دەروونییەوەو نارەحەت دەکرد ، ئەوە بوو کە زۆربەی هاوزندانییەکانی، بە چاوی دژمنەوە سەیریان دەکرد و هەستێکی دژمنانەیان دەرهەقی هەبوو، لەبەر ئەوەی گوایە لەوان نەبوو، بەڵکو سەر بەو چینە دەسەلاٚتدار و دەسترۆ و نەجیمزادەیە بوو کە لە شێوەی موڵکدار یان ئەفسەر یان گەورە فەرمانبەردا جەماوەری رەش و رووتی خەڵکیان دەچەوساندەوە. بۆیە لەم کتێبەوە بە ئاشکرا ئەوەمان بۆ بە دیاردەکەوێ کە دۆستویفسکی لە زنداندا فرە غەریب و نامۆ بووە، هەستی بە گۆشەگیرییەکی کوشندە کردووەو، خەڵکی هاوچین و هاوسنفی خۆی لە زنداندا نەبوون یان ئەگەر هەبووبنش زۆر کەم بوون و هیچ هەستێکی هاوسۆزی بەرانبەریان نەبووە . بۆیە زۆر بە گومانەوە، بە تایبەتی لە سەرەتاوە تەمەشای هاوزندانییەکانی خۆی کردووە، بە خەڵکی بێ ویژدان و بێ ئامان و دەم پیس و دەست پیس و تاوانبارو چەتە و تەریدەو رێگر و یاخی و بێباك و بێ پەروای زانیون....ئیدی دۆستویفسکی زۆر شارەزایانە خۆی بە ناخی ناخی مرۆڤدا دەکات و دەرگا لەسەر پەنهانترین تەبع و تەبیعەتی ئینسان ، دەخاتە سەر گازی پشت . بۆ نموونە ناخی جەلادمان بۆ دەخاتە بەر وردەبینی دەروونزانییەوەو دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە رەنگە باشترین مرۆڤ، بە حوکمی ڕاهاتن و عادەت ببێ بە دڵرەقترین مرۆڤ، ببێت بە دڕندەیەکی سامناك و لە هیچ تاوانێك نەپرینگێتەوە، خوێن و دەسەلاٚت مرۆڤ مەست دەکەن و دەیکەن بە دڕندەو لە مرۆڤایەتی دەخەن. دۆستویفسکی ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ماکی دڕندەیی و هۆڤیکاری لە زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی سەردەم و رۆژگاری ئەودا هەبووە..بەلاٚم پاشان بەرەبەرە ئەو گیانی رەشبینیەی لە لا دەرەوێتەوەو جیاوازی

نێوان باش و خراپەکان دەکات، لە نێو زندانییەکاندا خەڵکانێك دەدۆزێتەوە کە دەشێت لە رووی ئەخلاقییەوە پاکانە بۆ خەتاو تاوانەکانیان بکرێت..

"٤"

دۆستویفسکی بە زمانی هونەر ئەوەمان پێدەڵێت کە تاوانباران زۆرجار قوربانی ئەو بارو دۆخە کۆمەلأیەتییەن کە تیایدا ژیاون ودەژین، واتە قوربانی ژینگەن. بۆیە ئەو تاوانەی کە دەیکەن دەبێت بە تەوقی نەفرەت و دەچێتە گەردنیان، دەبێت بە بەلأی ناگەهان و بەرۆکیان دەگرێت، بۆیە کۆمەڵگە زۆر لە سەرهەقە کە ئەوانە بە قەرەبەخت و نەگبەت ناودەبات و بە غەریزە بەزەیی پێیانا دێتەوە و کەم و زۆر هاوسۆزیان دەگەڵ دەکات..

دۆستویفسکی هەستی بەوە کردووە کە مرۆڤ لە تەنگانەدا زیاتر ڕوودەکاتە خواو خواپەرستی و پێویستییەکی رۆحی و دەروونی گەورە بە هێزە غەیبانییەکان پەیدا دەکات.. ئەم بۆچوون و ئەنجامگیرییە لە زۆربەی قارەمانانی یادگارییەکانی خانەی مردوواندا رەنگی داوەتەوە و ، دەبینین زۆربەی زندانییەکان خەڵکی بە دین و خواناس بوون، خەریکی نوێژ و نزا بوون و چاویان لە رەحمەت و میهری خودا بووە و لەبەری پاڕاونەتەوە. ئەوەتا دۆستویفسکی لەو روانگەیەوە و بە مەبەستی دووپاتکردنەوەی بۆچوون و ئەنجامگیرییەکەی خۆی دەڵێت: " لە هەموو شوێنێك خەڵکی خراپ هەن، چەم بیّ چەقەڵ نابێت، کیّ دەزانێت ، لەوەیە ئەم زندانییانەی کە لەم گۆرستانی زندووانەدا دەژین، هەرگیز لەوانەی لە دەرێی چواردیواری زنداندا دەژین، خراترنەبن! دۆستویفسکی وەکو پێشتریش ئاماژەمان کردیّ لە سەرتاوە هاوزندانییەکانی خۆی بە دڕندە دەزانی، تەنیا دیوە خراپ و شەڕانییەکانی دەبینین، تروسکەی مرۆڤدۆستی و مرۆڤپەروەری تیادا بەدی نەدەکردن، بەلأم بەرەبەرە بەرچاوی روون بووەوەو دیوە باشەکەشی دەبینین و هەندێجار هاوخەمی و هاوسۆزی و ڤیان و میهر و دلۆڤانییەکی ئەوەندە مرۆڤانی لیّ دەبینین و دەبیست کە باوەڕی بە چاو و بە گوێی خۆی نەدەکرد!! بۆیە دەبینین دۆستویفسکی لە رۆژانی بەر لە ئازادبوونی ، پاش ئەوەی کۆمەڵێك دۆست و هاوڕێی باش لە نێو زندانییەکاندا پەیدا دەکات و باشتریان دەناسێت..داخ بۆ ئەوە دەخوات کە گەلێك لە توانا و بەهرە دەگمەنەکانی هەزاران رۆڵەی بەهرەمەندی گەلانی رووسیا لەو گۆڕستانی زندووانەدا پوکاونەوەو بە ناهەق بە فیڕۆ چوون..بەهەرحاڵ دۆزی خەتاو گوناح و تاوان وسزا، پانتاییەکی یەجگار زۆری لە کارە ئەدەبی و قەڵەمییەکانی دۆستویفسکی دا گرتووەتەوە کە بە خۆی لە هەر نووسەرێکی دیکە پتر دەرد و ئازاری ئەو دۆزانەی چەشتووەو لە نزیکەوە جەڕباندوویەتی. زۆرجاریش مەمنوونی شانس و نێوچەوانی خۆیەتی کە تووشی ئەو ئەزموونە بووە و دان بەوەدا دەنێت کە زۆر قەرزارباری ئەو چوار ساڵەیە کە لە زنداندا بەسەری بردووە. تەنانەت هزرو بیر و نەفسیەت و رۆح و باوەڕ و ئیمانی بە هۆی ئەو ئەزموونەوە گۆڕاوەو قاڵبووەتەوەو سیقاڵ بووەتەوە. بە هۆی زندانەوە ئیمانی بە خواو بە گەلی رووسیا دەمەزەرد و تازە بووەوە. بە خۆی لەوبارەیەوە دەڵێت: " مرۆڤ ، لە بێگارە زنداندا، بە دەم حەسرەت و مەحرووميەتەوە، سیس هەڵدەگەرێت، وەکو چۆن گیای سیسەوە بوو بە باران دەبوژێتەوەو دەژێتەوەو پاراو دەبێت، بەو

ئاوایه به ئیمان و باوەڕ پاراو دەبێت و دەگەشێتەوە. ئەنجام دەگاتە ئیمان، چونکە ئیمان لە کاتی تەنگانەو و بێدەسەلاتیدا روونتر دەردەکەوێت.." هەر لە درێژەی ئەو قسەیەدا دەڵێت : " رەنگە یەزدانی بەرزو بالا ، بۆیە بۆ ئەوێی ناردبم تا جەوهەری شتەکان فێربم و پاشان بۆ خەڵکی تری بگوازمەوە، ئیدی دەردو عەزاب بە تەواوەتی ئیمان و باوەڕی پاکژکردەوەو لە هەموو خڵتەیەکی پاك کردەوە. خەمی هەرە گەورەی بوو بە مرۆڤدۆستی و قەناعەتی تەواوی بەوە هێنا بوو کە ئەوانەی بە هۆی خەتاو هەڵەوە لە قوڕی کڵۆڵی وکوێرەوەری چەقیوون، زیاتر لە خەڵکی ئاسایی شایستەی هاوسۆزی و هاوخەمی و خۆشەویستین..بۆیە دەبینین گیانی مەسیحییەت لە سەرانسەری ئەم کتێبەدا شەپۆل دەدات. هەر ئەمەش وای لە تۆلستۆی کردووە زۆر بە گەرمی پێشوازی لەم شاکارە بکات و لە ساڵی ١٨٨٠دا لە نامەیەکدا بۆ ستراخۆف بڵێت : " لەم رۆژانەدا هەستم بە دڵتەنگییەکی زۆر دەکرد، دەستم دایە کتێبی یادگارییەکانی خانەی مردووان و بۆ جاری دووەم خوێندمەوە، زۆر شتیم بیر چووبووەوە، کە دووبارە خوێندمەوە گەییمە ئەو قەناعەتەی کە لە ئەدەبی تازەدا هیچ کتێبێك لەم کتێبە بالاتر نییە، تەنانەت کتێبەکانی پوشکین ش! جوانییەکەی لە تۆن و شێوازەکەیدا نییە، بەڵکو لەو بۆچوونانەدایە کە لە خۆی گرتووە: تا بڵێی ڕاستگۆیانەو مەسیحیانەیە، کتێبی فێرکردنی ئاینە. کە دۆستویفسکیت بینی رێزو خۆشەویستی منی پێ بگەیەنە ."

"٥"

دۆستویفسکی، دەروونناس و کۆمەڵناس و ئەدیب و نووسەرێکی مەزن بوو.بۆیە هەموو ئەو لایەنانە لە قارەمانانی چیرۆك و رۆمانەکانیدا زۆر هونەریانە پیشان دراون بۆ نموونە هەندێ لە قارەمانانی ئەم کتێبە کە بریتین لە : ئالکساندەر پترۆفیچ، ئاکیم ئاکیمیچ، سروتکین، گازین ، سوشیلۆف، عەلی، فۆمیچ باکلۆشین، میخائیلۆف، نورا، سمیکالۆف، شیشکۆف، لۆلیکۆف، کولیر و...تاد. هەریەکەیان تەبیعەتی تایبەتی خۆیان هەیە ولە هەر روویەکی دەروونی و کۆمەلایەتییەوە لە یەکتر جیاوازن و مامەڵەی هونەری جیاوازیان لە گەڵدا کراوەو کەسایەتی جیاوازی خۆیان هەیە و ناشێت کەسیان لە جیاتی کەسیان دابنرێت..

کتێبی یادگارییەکانی خانەی مردووان لە سالانی ١٨٦٠-١٨٦١دا لە هەردوو گۆڤاری (العالم الروسی ، والزمان)دا بە زنجیرە بلاوکراوەتەوە..هەڵبەتە لە گەڵ بلاوبوونەوەیدا سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێنا وپێشوازییەکی گەرمی لێکرا، بە تایەتی کە لە سەردەمێکی بڕێك لە باردا بلاوبووەوەو دام ودەزگای سانسۆر ئەو سەختگیرییەی جارانی نەمابوو..کتێبی وەها بلاو دەبوونەوە کە مەحاڵ بوو چەند ساڵێك لەوە پێش رێگەی بلاوکردنەوەیان بدرێت.

هەڵبەتە ئەم کتێبە زێدەباری بایەخە ئەدەبی و رۆشنبیرییەکەی کاریگەرییەکی سیاسی گەورەشی هەبوو، ئەوە بوو پاش بلاوبوونەوەی ، جەنەراڵ میر نیکولا ئۆرلۆف لە حوزەیرانی ساڵی ١٨٦٢دا نامەیەکی بۆ تزار نووسی و تکای لێکرد ئەو سزای ئەشکەنجە بەدەنییەی کە دۆستویفسکی لە کتێبەکەی خۆیدا زۆر بە وردی و بەو پەڕی ئەمانەت و راستگۆییەوە باسی کردبوو، لە سەر زندانییانی رووسیا لابرێت و بە یەکجارەکی هەڵبوەشێنرێتەوە. ئیدی بەلەز

لیژنەیەك بۆ ئەو مەبەستە پێكهێنرا، هەندێك دەیانگوت با بمێنێت و هەندێكی دی دەیانگوت لاببرێت.. ئەوە بوو لە ١٨٦٣/٤/١٧دا یاسایەك دەركراو ئەم سزا بەسام و ترسناكە بە یەكجارەكی هەڵوەشێنرایەوە.

جا خوێنەری هێژا، ئەم وتەیە هەرچیەك و هەرچۆنێك بێت، ئەڵتەرناتیفی دەقەكە نییە ، ناتوانێت هەمان سوود و لەزەتی خوێندنەوەی ڕاستەوخۆی دەقەكەت بداتێت، بۆیە لەوەی پتر لە سەری ناڕۆم و لە لەزەتی خوێندنەوەی دەقی ئەم شاكارە زندووە مەحرووومت ناكەم و..دەق خۆی پێناسەی خۆیەتی، فەرموون ئێوەو دەقی ( یادگارییەكانی خانەی مردووان )..

***تێبینی: بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە :***

***- هەژاران، ڕۆمان، دۆستۆیفسكی، پێشەكی و پاچڤەی حەمەكەریم عارف/ چاپی دووەم/ ٢٠١٢***

***- مێژووی ئەدەبیاتی ڕووسی، سەعیدی نەفیسی/ و: حەمەكەریم عارف،چاپی یەكەم/ ٢٠١٠***

***- الاعمال الادبیه الكامله (٥) دكریات من منزل الاموات/ دوستویفسكی /ترجمه: الدكتور سامی الدروبی***

***- خاطرات مردگان/ فدور داستایوسكی/ ترجمه : محمد جعفر محجوب چاپ دوم/ ١٣٤١***

***سەرنجێکی پێویست:***

**خوێنەری بەرکەتی، سەرچاوەی سەرەکی ئەم دەقە کوردییەی کە لە خزمەتی ئێوەی هێژدایە، عەرەبییە، بەڵام لە پاڵ عەرەبییەکەدا بەڕادەیەك سوودم لە دەقێکی فارسیش وەرگرتووە کە هەندێجار دەستەواژەو ڕستەو پەرەگرافم ڕاستەوخۆ لێوەی پاچڤە کردووە. جا ئەگەر ئەمە بووبێتە هۆی ئەوەی هەندێ دەستەواژەو ڕستەو پەرەگرافی دەقە کورییەکە، لە ڕواڵەت و شێوەدا بە تەواوەتی دەگەڵ دەقە عەرەبییەکەدا تێك نەکەنەوە، ئەوا بە دڵنیاییەوە لە نێوەڕۆکدا هەر یەکن،و دەقە کوردییەکەش ئەگەر لە هەردوو دەقە عەرەبی و فارسییەکە باشترو ئەمینتر نەبێ، هیچی لەوان کەمتر نییە و بەبێ ترس ڕووی مەجلیسی دەقانی هەیە.**

# پێشەکی

پیاو، لە ناوجەرگەی دەشت یان چیا یان چڕەدارستان‌و بێشە چوغووردەکانی ناوچەو دەڤەرە دوورە دەستەکانی سیبیریادا، ناو بە ناو تووشی هەندێ شاری بچووك‌و باژێرۆکان دەبێت کە ژمارەی دانیشتووانیان لە هەزار یان دوو هەزار کەسێك تێناپەڕێ.خانووبەرەکانی ئەم باژێڕۆکانە هەر هەمووی لە داروتەختە دروستکراون، تا بڵێی ناشیرین‌وبچووکن، دوو کڵێسایان تێدایە، یەکێکیان لە ناوەندی شاردایەو دووەمیان لە دەرێی شاردا، لە گۆڕستانەکەدایە، ئەگەر بمانەوێ بە کورتی وەسفی ئەم شارانە بکەین دەبێ بڵێین زیاتر لە گوندی دەوروبەری مۆسکۆ دەچن تا لە شاری ڕاستەقینە. بەشێوەیەکی گشتی ژمارەیەکی زۆری پۆلیس‌وباجەوان‌و فەرمانبەری بچووکیان تێدایە. ئەگەرچی کەش‌و هەوای سیبیریا زۆر ساردە، بەڵام شوێنێکی یەجگار باش‌و لەبارو پڕ سوودە بۆ مامورانی دەوڵەتی.خەڵکی ئەو شارانە، خەڵکانی سادەوساکارو محافەزەکارن‌و دوورن لە هەر هزرو هزرینێکی لیبڕالی، پابەندی داب و نەریتی دێرین‌و نەگۆڕو پیرۆزی خۆیانن.دەشێت بە فەرمانبەرانی سیبیریا بڵێین نوێنەر یان نمایندەی چینی ئەرستۆکرات، ئەمانە هەندێکیان سیبیریایی ئەسڵن‌و هەندێکیان لایدەن‌و لە رووسیاوە هاتوون. ئەم لایدانە لەلایەکەوە بە تەماحی مووچەی گەورەو دەسکەوتی چەوری کرێ سەفەر،و لەلایەکی ترەوە بە ئومێدی ژیان‌و ئایندەیەکی باشترو دەوڵەمەندتر هاتوون،وچاوپۆشیان لەخۆشی‌و جوانی پایتەخت‌و شارە گەورەکان کردووە. جا ئەوانەی دەتوانن ئەم گرفتەی ژیان چارەسەر بکەن. زۆربەی هەرە زۆریان لە سیبیریادا دەمێننەوەو بە یەکجارەکی تیایدا ئاکنجی دەبن، چونکە دەزانن ئەو دەسکەوتە زۆرو زەبەندو بەلەزەتەی لە ئایندەدا بە دەستی دێنن، بە زیادەوە قەرەبووی زیانەکانیان بۆ دەکاتەوە. بەڵام ئەوانی دی کە بە خۆ ناوەستن‌و ناتوانن بەسەر ئەم گرفتەدا زاڵ بن، زۆر زوو تاقەتیان دەچێت‌و بێزاردەبن،و بەداخ‌و کەسەرەوە لەخۆ دەپرسن:– بە چ ئەقڵێکەوە ڕووم کردووەتە ئەم دەڤەرە دوورە دەستە، چما لێرە ڕۆن رژاوە ؟.

ئەوانە بەبێ قەراری چاوەڕوانن تا سێ ساڵی خزمەتەکەیان تەواو بێت، تا یەکسەر داوای گواستنەوەی کارەکەیان بۆ شوێنێکی تری رووسیا بکەن‌و بۆ زێدو زاگەی خۆ بگەڕێنەوەو بە بێزارییەوە باسی سیبیریا بکەن‌و گاڵتەی پێبکەن. بەڵام ئەوانە هەڵەن، چونکە سیبیریا بۆ نیشتەجێ بوون، نەك هەر لە رووی خزمەتگوزاری گشتییەوە بەڵکو لە زۆر لایەنەوە، شوێنێکی خۆش‌و لەبەردڵانە.کەش و هەوایەکی جوانی هەیە، بازرگانانی دەوڵەمەندو غەریب دۆست و

میوانپەروەرن، دەوڵەمەندی زۆرن، بێگانانی دەوڵەمەندی زۆر تیایە. کیژۆڵانیان دەڵێی گوڵەباخی تازە پشکووتوون،و پاکڕەوشتو پاکڕەفتارن، تەیرو توو ونێچیران بەرەڵلای ناو شەقامەکانن‌و خۆ بە ملی نێچیرڤاندا دەدەن، ڕێ لە نێچیرڤان دەگرن، شامپانیا هێندە زۆرە، خەڵکی لە جیاتی ئاو دەیخۆنەوە، کافیار ئەوە هەر باسی مەکە، جووتیار خەنی بوون‌و دانەوێڵەو دەغڵو دانیان هێند بە بڕشتە، لە هەندێ شوێنان یەك‌و پازدە دێنێ. بە کورتیەکەی سیبیریا خاکێکی بە پیت‌و بەرەکەتە، بەڵام دەبێ بزانی چۆن دەکاری دەبەیت‌و سوودی لێدەبینی کە ئەمە کەمێك زەحمەتە.

لە یەکێك لەم شارە چکۆلە بە ڕەونەق‌و خۆشانەدا، کە هەرگیز یادی خەڵکە میرەبانەکەیم لە بیر ناچێت، یەکێك لە دوورخراوەکانم بۆ ئەم شارە بەنێوی ئەلکساندەر پترۆفیچ گوریانچیکۆف ناسی، ئەم پیاوە لە دەوڵەمەندو نەجیمزادەو موڵکدارەکانی رووسیا بوو، چونکە ژنەکەی خۆی کوشتبوو، حوکمی دە ساڵ زیندانیان دەگەڵ کاری قورسی(١) نمرە دوودا بۆ بڕی بووەوە. پاش تەواوکردنی ماوەی مەحکومیەتەکەی، ناردبوویان بۆ گوندێکی شاری ك(٢)... کە نشیمەن‌و کۆلۆنی مەحکومەکان بوو، تا ژیان و تەمەنی خۆی لە وێندەر بەسەر بەرێت. یانی بە فەرمی لەسەر ئەو کۆلۆنیە حیساب بوو، بەڵام لە شاری ك... دا دەژیاو دەیتوانی لە ڕێگەی وتنەوەی دەرسی تایبەت بە مندالان، بژێوی خۆی پەیدا بکات. پیاو زۆر جار لە سیبیریادا تووشی ئەو دوور خراوانە دەبێت کە خەریکی دەرس گوتنەوەن‌و کاری مامۆستایەتی دەکەن.و خەڵکی ڕقیان لێیان نیە، چونکە دەرسی زمانی فەرەنسی دەڵێنەوە کە بۆ ژیان زۆر پێویستە، خۆ ئەگەر ئەو دوورخراوانە نەبوایەن هیچ کەسێك لە خەڵکی ئەم دەڤەرە دوورەدەستانەی سیبیریا، زمانی فەرەنسی نەدەزانی.

من یەکەمجار (ئەلکساندەر پترۆفیچ)م لە ماڵی (ئیڤان ئیڤانوڤیچ گوسدیکوڤ)ی فەرمانبەردا بینی کە پیرەپیاوێکی بەڕێزوحورمەت، بە ویقارو میوانپەروەر بوو، ئەم پیاوە سێ کیژی بەهرەداری هەبوون کە ئومێدی ئایندەیەکی جوانیان لێدەکرا. ئەلکساندەر پترۆفیچ، هەفتەی چوار جاران وانەی زمانی فەرەنسی پێدەگوتنەوە، لە هەنبەر هەر وانەیەکدا چوار کۆپێکی زیوی وەردەگرت. دیمەنی ئەم پیاوە سەرنجی راکێشام. کابرایەکی ڕەنگی زەردو زۆر لاواز بوو، هێشتا گەنج بوو، تەمەنی لە سی‌و پێنج ساڵ زیاتر نەدەبوو، کورتە باڵاو ئەندام وردیلە بوو، جل‌و بەرگی زۆرپاك‌و خاوێن بوو، وجلکی ئەوروپایی لەبەردەکرد. ئەگەر قسەت دەگەڵی کردبا، بە وردی چاوی دەبڕییە چاوت‌و بەوپەڕی نەزاکەتەوە گوێی لێدەگرتیت‌و تا لە قسەکەت نەبوویتایەوە چاوی لێنەدەگواستیتەوە، لەوە دەچوو بیەوێ بزانێ تۆ چ دەڵێیت، یان گومانی ئەوەی هەبێ کە بتەوێ نهێنییەکی لێ دەربێنێ‌و پەی بە ناخی بیرە تایبەتیەکانی ببەیت. ئەگەر جوابیشی داباوە، زۆر بە کورتی وروونی وەڵامی دەدایەوە. هێندە بە وردی وشەکانی هەڵدەبژارد، گوێگر خۆ بە خۆ لە قسەکانی قەڵس‌و ناڕەحەت دەبوو، لە خوای دەیویست زووتر لێ ببێتەوە،و کە لێدەبووەوە گوێگر هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد.

داوام لە ئیڤان ئیڤانوڤیچ کرد باسیم بۆ بکات.

بۆی باسکردم کە گوریانچیکۆف پیاوێکی سەر ڕاستو جوان ڕەفتارو خانەدانو بێ عەیبەو ئەگەر وانەبوایە نەیدەکرد بە مامۆستاو فێرکاری کیژەکانی، لێ عەیبی ئەو (گۆریانچیکۆف). ئەوەیە کە لە بەشەران بێزارە، زۆری ڕق لە خەڵکییە، تێکەڵ نابێت، دوورە پەێزە، هەرچەندە پیاوێکی زیرەكو خوێنەوارو رۆشنبیرە، ڕموودەی خوێندنەوەو موتالایە، تێکەڵی کەس نابێ، زۆر کەم دووە، و گەلەك زەحمەتە بهێنرێتە قسەو دڵی خۆی بۆ کەسێك بکاتەوە.

هەندێ کەس پێیان وابوو شێتە، بەڵام هیچ مەترسییەکیان لەوەدا نەدەبینی، و زەرەری بۆ کەس نەبوو، بۆیە هەموو ماڵباتە خانەدانەکانی شار ئامادە بوون مدارای ئەلکساندەر پترۆفیچ بکەن، چونکە دەیتوانی سوودو قازانجی بۆ هەموویان هەبێت، بۆ نموونە لە جیاتی ئەوان عەرزوحاڵنووسیو ئەو بابەتەشتانەی بکردایە.

خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی پێیان وابوو لە بنەماڵەیەکی ناوداری رووسیەو خزمانی خودان پلەو پایەو پۆستی بەرزی لەوێندەر هەن، بەڵام ئەو بە خوایشتی خۆی، لەوەتای دوورخرابووەوە پەیوەندی دەگەڵ بڕی بوونو بەمەش زیانی لە خۆی دابوو. هەموو خەڵکی چیرۆكو بەسەرهاتەکەیان دەزانی، دەیانزانی دوای ساڵێك لە ژن هێنان، بەهۆی دڵپیسی و بەدگومانییەوە، ژنەکەی خۆی کوشتبوو،و یەکسەر چوو بوو، خۆی ڕادەستی پۆلیسو دادگا کردبوو. ئەم کارە ، حوکمەکەی لەسەری زۆر سووك کردبوو. خەڵکی لە سیبیریادا بە چاوی بە زەییەوە سەیری ئەمجۆرە تاوانبارانەیان دەکرد، تاوانەکەیان بە بەڵایەك دەزانی کە بەرۆکی تاوانباری گرتووە، بۆیە ئەمجۆرە تاوانبارە زیاتر مایەی بەزەییو سۆزن تا شایستەی سزادان بن. کەچی ئەم کابرا سەیرە، خۆی لە خەڵکی دوور دەگرت، مەگەر بۆ دەرس گوتنەوە لە ماڵی خۆی هاتبایە دەرێ.

لە هەوەڵەوە بە هەندم وەرنەگرت، کەمو زۆر گوێم نەدایە. بەڵام پاشان بێئەوەی بزانم بۆچی: لێم بوو بە مەتەڵو مەراق. قسەی دەگەڵدا نەدەهاتەکردن، مەحاڵ بوو بهێنرێتە قسە. ڕاستە هەر پرسیارێکم لێکردبا بەرسڤی دەدامەوە، بەڵام کە لە وەڵامەکەی دەبووەوە نەدەوێرام پرسیاری تری لێبکەمو پێ لە بەڕەی خۆم درێژتر بکەم. دوای هەر جۆرە گفتوگۆیەکی لەو بابەتە دەردو ئازارو شەکەتیو ماندوویەتی دەنیشتە سەر سەرو سیمای.

بیرم دێت کە شەوێك لە شەوانی جوانی هاوین پێکڤە لە ماڵی ئیڤان ئیڤانوفیچ هاتمە دەرێ کە بۆ ماڵ بڕۆمەوە. لە ناکاو هات بە سەرماو دەعوەتم کرد کە لاداتە نك منو جگەرەیە بکێشێت. مەگەر هەر خوا بزانێ لەوە دەمەدا چ ترسێك نیشتە سەر سیمای! چەند شپرزە بوو، چۆن پەشۆکا، لەوەسف کردن نایەت... یەجگار شپرزە بوو، چەند ورتە ورتێکی نامەفهوومو ناڕەوانو بێ سەرو بەری لە زار دەرچوو، ئەوجا نیگایەکی توڕەی کردم، لە ناکاو پێی وەغارەوە ناو بۆی دەرچوو. ئەمەم زۆر پێ سەیر بوو. لەو ساوە هەرکاتێ تووشی یەکدی دەبووین، دەسڵەمییەوەو لە تۆ وایە هەستی بە جۆرە ترسێك دەکرد. بەڵام من کۆڵم نەدا... شتێکی تیا بوو ڕایدەکێشام.. لە خۆڕا ڕموودەی بوو بووم... دوای مانگێك لەو ڕووداوە چکۆلەیە، رۆژێك کە لە پۆستەخانە دەگەڕامەوە، بێ هیچ هۆیەك، بێ هیچ بیانوویەك، لە خوتو خۆڕایی خۆم بە ماڵی گوریانچیکوف دا کرد. دیارە ئەم کارەی من نەك هەر گەوجانە بوو، بەڵکو لە هەر نەزاکەتو ئەدەبو نەرمو

نیانی و زەوقێك بەدەر بوو. ئەم پیاوە لە قەراخ شاردا، کرێچی پیرەژنێکی بورژوا بوو کە کیژێکی سیلاوی هەبوو. ئەم کیژەش، کچێکی نا شەرعی تەمەن دە ساڵانی هەبوو، ئەم کچۆلەیە یەجگار جوان، دەم بە خەندە، شادو شەنگوڵ بوو. کە خۆم وەژووردا کرد ئەلکساندەر پترۆفیچ لەلایەوە دانیشتبوو وفێری خوێندنەوەی دەکرد. بە جۆرێ لە وەژوورکەوتنە کتوپڕو چاوەڕوان نەکراوەکەی من شڵەژاو پەشۆکا، دەتگوت بەسەر تاوانێکی گەورەوە گرتوومە، لە ناکاو هەستایە سەر پێیان، شێت ئاسا بۆ چەند دەمێك لێم مۆڕ بووەوە، پاش ئەوەی هێور بووەوە، خوڵکی دانیشتنی کردم. ئەنجام دانیشتین، زۆر بە دیقەت چاودێری هەر نیگایەکی دەکردم، دەتگوت لێم بە گومانەو وا تەسەوردەکات نیازی شتێکم هەیەو لێی دەشارمەوە، یەکسەر زانیم ئەم پیاوە، زۆر بە گومان. بەدگومان،و بە پارێزە، بەوپەڕی نەفرەت و ڕقەوە لێی دەڕوانیم،و لەوە دەچوو، لە هەر ئان و ساتێکدا بڵێ: "ئەرێ دەکرێت، لێرە بڕۆی ؟".

باسی شارە بچووکەکەی خۆمان و دەنگوباسی باوی شارم بۆکرد، کڕوکپ، بێئەوەی هیچ بڵێ، گوێی دەگرت، یان بزەیەکی تاڵ دەنیشتە سەر لێوی. ئیدی بۆم دەرکەوت کە نەك هەر لە ڕووداو و واریقاتی شارەکەمان بێ ئاگایە، بەڵکو ناشیەوێ هیچ شتێك لەو بارەیەوە بزانێت. دوای ئەوە باسی دەڤەرەکەی خۆمان و پێویستییەکانی دەڤەرەکەم بۆ کرد، بە بێدەنگی گوێی لێدەگرتم، بە شێوەیەکی هێندە سەیر چاوی بڕییە چاوانم، کە لە خۆم تەریق بوومەوەو لەو قسانە ژێوان بوومەوە کە کردمن، تەنانەت کاتێ کە ویستم ئەو کتێب و بلاڤۆکانەی، کە لەگەڵ خۆماو لە پۆستەخانە هێنا بوومنەوە، و هێشتا نەم کردبوونەوە، بە ئەمانەت بدەمێ، خەریك بوو لێم توڕە ببێت. هەوەڵجار بە تامەزرۆیی و بەتاسەوە لێی ڕوانین، بەڵام زوو بە زوو ژێوان بووەوەو لێی وەرنەگرتم و تەوازۆی هێنایەوە کە نای پەرژێتە سەر خوێندنەوەو دەستی ناگات. ئەنجام دوعاخوازیم لێکرد، کە لە نك وی بە دەرکەوتم هەستم کرد بارێکی قورسم لەسەر شان لاچووە. بەڵام زۆریش لەوە ناڕەحەت بووم، کە تەنیایی مرۆڤێکم شڵەقاند، کە هەموو خەمێکی ئەوە بوو خۆی لە خەڵکی دوور بگرێت. بەڵام ئەوەی بوو بوو.

ئەوەی مایەی سەرنج بوو، تەنیا چەند کتێبێکی زۆر کەمم لە ژوورەکەیدا بینی، کەواتە ئەو قسە ڕاست نەبوو کە گوایە خوێنەرێکی پڕ خوێندنەوەیە.

بە ڕێکەوت، یەك دوو جارێك، شەوانی زۆر درەنگ بە گالیسکە بە بەر پەنجەرەی ماڵەکەیدا تێپەڕیم و سەیرم کرد چرای ماڵەکەی دەسووتێ و ژوورەکەی رووناکە. لە دڵی خۆدا گوتم دەبێ بۆ ئەم شەونخونیە بکات ؟ بڵێی خەریکی نووسین بێ، دەبێ چی بنووسێت؟

بە هەندێ ئیش و کاران بۆ ماوەی سێ هەیڤێك شارەکەمانم بەجێ هێشت. کە لە زستاندا گەڕامەوە، بیستم کە ئەلکساندەر پترۆفیچ لە پایزدا مردووە. وەکو چۆن بە تەنیا ژیا بوو، بەو ئاوایە بە تەنیاش مردبوو. لە کاتی نەخۆشیەکەیدا قاییل نەبوو بوو تەنانەت پزیشکیش ببینێ. ئیدی خەریك بوو لە بیری خەڵکی دەچووەوە. ژوورەکەی چۆڵ بوو. یەکسەر چووم بۆ لای خاوەن خانووەکە، بەو ئومێدەی پێم بڵێت کە دراوسێکەی سەرگەرمی چ کارێك بووەو بزانم ئاخۆ شتێکی نووسیوە یان نا! هەرکە بیست کوبیکم دایە، خێرا سەبەتەیەکی پڕ لە کاغەزی بۆ هێنام

که له پاش یارۆ بەجێ مابوو، و ئیعترافیشی کرد که دوو دانه دەفتەری بۆ ئاگر کردنەوە بەکار هێناوەو سووتاندوونی، خاوەن ماڵەکە پیرەژنێکی عەبووسی روو گرژو مۆنی کەم دوو بوو، نه من توانیم شتێکی ئەوتۆی لێ دەربێنم،و نه ئەو توانی شتێکی ئەوتۆم دەربارەی کرێچییەکەی خۆی پێ بڵێ. بەڵام ئەوەی بۆ گێڕامەوە که ئەو کابرایه هیچ شتێکی ئەوتۆی نەدەکرد، جاری وا هەبوو بەمانگان نه کتێبێکی دەکردەوەو نه قەڵەمێکی به دەستەوە دەگرت، بەڵام هەندێ شەو، تا بەیانی نەدەخەوت،و بەدەم هزرینو ڕامانەوە به ژوورەکەیدا دەهاتو دەچوو، تەنانەت هەندێجار به دەنگی بەرزیش خۆی دەدواند، هەروەها بۆی گێڕامەوە که "کاتیا"ی نەوەی ئەوی خۆشدەویست، به تایبەتی پاش ئەوەی که زانی ناوی (کاتیا)یه زیاتر ڕموودەی بوو، و هەموو ساڵێك له ڕۆژی (سان کاترین)دا به بۆنەی ساڵیادی مردوویەکەوە، له ڕای ئاسوودەیی روحی ئەو مردووەدا ڕێو ڕەسمی عەشای ڕەبانی دەگێڕا. حەزی نەدەکرد کەس هاتوچۆی بکات،و به خۆیشی بۆ دەرس گوتنەوە نەبوایه له ماڵ نەدەچووە دەرێ. تەنانەت کاتێ خاوەن ماڵەکه هەفتەی جارێك دەهات که ژوورەکەی بۆ پاك بکاتەوە، مۆنی لێدەکرد، به درێژایی ئەو سێ ساڵەی که کرێچی ئەو بوو بوو، تاقه جارێکیش قسەی دەگەڵ نەکرد بوو. له کاتیام پرسی که ئاخۆ هیچ شتێکی له بارەی مامۆستاکەیەوە له بیره یان نا؟ به بێدەنگی نیگایەکی کردم، ئەوسا رووی کرده دیوارەکەو کەوته گریان. سەیره! کەواته ئەم پیاوە سەیرەش توانیویەتی خۆی خۆشەویست بکات، کەسێك وا لێبکات خۆشی بوێت !

کاغەزەکانم بۆ ماڵ بردەوە، یەك ڕۆژی تەواو پێیانەوە خەریك بووم. هەڵبەته زۆربەی هەره زۆریان بێ کەڵكو بێ بایەخ بوون، مەشقو ڕاهێنانی قوتابیان بوو. ئەنجام له نێو کاغەزەکاندا دەفتەرێکی تا ڕادەیەك ئەستوورم دۆزییەوە، لاپەڕەکانی به نووسینی زۆر ورد پڕ کرابووەوە، بەڵام تەواو نەکرابوو، لەوە دەچوو نووسەرەکەی له بیری کردبێ. ئەم دەفتەره نیوەچڵه بریتی بوو له سەربهووردی ده ساڵی ژیانی ئەلکساندەر پترۆفیچ له زیندانی کاری قورس دا( بێگاره زندان)، هەڵبەته چیرۆکێکی شاشو پچڕ پچڕ بوو، پێدەچوو له کاتی جیاوازدا نووسرا بێ... ناو به ناو لێرەو لەوێ کورته بەسەرهاتێك یان بیرەوەرییەکی سەیرو ترسناکی تێدەکەوت، که پێدەچوو، خاوەنەکەی به تۆبزی له کۆڵ خۆی کردبێتەوە. هێزێکی نادیار به خۆرتی لێی دەرهێنا بێ، چەند جارێك ئەم بیرەوەرییه پچڕ پچڕانەم خوێندەوە، کەوتمه پرسیار له خۆم: تۆ بڵێی نووسەرەکەی له چەند دەمێکی شێتایەتیدا نەی نووسی بێت ؟ بەڵام ئەم بیرەوەریانەی که لەلایەن مەحکومێك بەکارێن قورس (بێگاره زندان) تۆمار کراون،و له شوێنێکیدا سەر ناوی ( یادگارییەکانی خانەی مردووان)ی بۆ داناوە، بۆ من مایەی سەرنج بوون. دنیایەکی زۆر تازەی، که تا ئەو کاته به تەواوەتی لێی بێ ئاگا بووم، و بەلامەوە نادیار بوو، بۆ کەشف کردم... هەندێ له ڕووداوەکانی، هەندێ لەو تێبینییه تایبەتیانەی که ئەم پیاوە لەسەر ئەو جیهانه قێزەونو بەدناوە تۆماری کردبوو.. ڕایانکێشام، به تاسەو لەزەتەوە خوێندمەوە. ڕەنگه من لەمەدا هەڵه بم ئەگەر پێم وابێ خەڵکی دیکەش هەمان لەزەتی منی لێ دەبینن، وەکو من ڕموودەی دەبن: بەڵام من چەند

بەشێکی ئەم چیرۆکە بڵاودەکەمەوە، ئیدی با خوێنەر بە خۆی حوکمی لەسەر بداتو ئەم داوەرییە بە خوێنەر دەسپێرم.

***پەراوێز:***

***١-کاری قورسی نمرە دوو: بریتی بوو لە کارکردن لە دروستکردنی ئەو قەڵایانەی کە لە سیبیریادا رۆدەنران بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەو جمو جۆڵە یاخیگەریانەی کە هەمیشە ئەگەری ئەوە هەبوو لەلایەن خەڵکی سیبیریاوە بەرپا بکرێ. بەڵام کاری قورسی نمرە یەك، بریتی بوو لە کار کردن لە کانەکاندا، کاری قورسی نمرە سێیەمیش کارکردن بوو لە کارخانەکاندا.***
***٢-شاری ك... لەوەیە مەبەست لە شاری کوزنتسکی سەر بە هەرێمی ئالمولنسك بێ، کە دۆستۆیفسکی لەساڵی ١٨٥٧دا ژنی یەکەمی لەوێندەر خواست.***

((١))

## خانەی مردووان

زیندانەکەمان کەوتبووە کۆتایی شارەوە، لە بەرزاییەکدا بوو، هەرچوار دەوری حەساری قایم‌و قوڵەو قەڵا بوو. ئەگەر لە درزی دیوارەکانەوە، بە ئومێدی ئەوەی شتێك بدینی، تەماشا بکەیت، جگە لە چمکێکی چکۆلەی ئاسمان‌و ساترو مەتەڕێسێکی گڵی بەرزو قایم کە یەکپارچە گیاوگۆڵی خۆڕسکی دەشتە،و پاسەوانان بە بەردەوامی بەسەریا دێن‌و دەچن، چ شتێکی ترت بەرچاو ناکەوێ، هەنگێ بە خۆت دەڵێی دەبێ ساڵانێکی دوورو درێژ، لە درزی ئەم حەسارەوە هەمان مەتەڕێس‌و سەنگەرقوڵەو هەمان ئەو پاسەوانانە ببینی و ببینیتەوە ، هەمان ئەم چمکە بچووکەی ئاسمان بدینی، هەڵبەتە نەك ئەو ئاسمانەی بەسەر زیندانەکەوەیە، بەڵکو ئاسمانێکی دیکەی دووری دوور.

حەوشێکی گەورەی هەبوو، درێژییەکەی دوو سەد شەقاوێك‌و پانییەکەی سەدو پەنجا شەقاوێك دەبوو، حەسارێکی شەش گۆشەی نا رێك‌و پێکی بە دەورا کێشرا بوو، ئەم حەسارە بریتی بوو لە عامودی نووك تیژ، و بە قووڵی لە عاردی چەقێنرا بوون‌و هێندە لە یەکەوە نزیك بوون هیچیان بە بەینەوە نەدەچوو: ئەوە تخوبی دەرەوەی زیندانەکە بوو. لەلایەکی ئەم حەسارەوە دەرگایەکی گەورەی قایم هەبوو، ئەم دەرگایە هەمیشە داخرا بوو، شەوو رۆژ لەلایەن ژمارەیەك پاسەوان‌و فەرمانبەرەوە پاسەوانی دەکرا، ئەم دەرگایە تەنیا ئەو کاتە دەکرایەوە کە زیندانیەکان بۆ کار ببرانایە دەرێ. ئەو دیوی ئەم دەرگایە، دنیای رووناکی بوو، ئازادی هەبوو، خەڵکی ئازاد بوون، هەر کارێکیان ویستبا دەیانکرد... بەڵام خەڵکی ناو حەسارەکە، ئەو دنیا جوان‌و سەیرەیان وەك خەون، وەکو ئەفسانانی جن‌و پەری دەبینی‌و دەهاتە بەرچاو... بەڵام دنیای ئێمە بە هیچ جۆرێك،و لە هیچ روویەکەوە لەو دنیایە ناچێت... دنیایەکی زۆر تایبەتیە، نە لە هیچ شتێك دەچێت‌و نە هیچ شتێکی لێدەچێت. دنیایەکە داب‌و نەریتی خۆی هەیە، جل‌وبەرگی خۆی هەیە، یاساو رێسای خۆی هەیە... رێو رەسمی تایبەتی خۆی هەیە. ماڵێکە "مردووی زندوو"، گۆڕستانی زندووانە، ژیانی ئەوێ لە ژیانی هیچ شوێنێکی تر ناچێت، خەڵکەکەی لە خەڵکی هیچ شوێنێکی تر ناچن. جا من هەوڵدەدەم باسی ئەم نشینگەیەتان بۆ بکەم.

کە دەچێتە ناو حەوشی نشینگەکەوە، دوو ریزە خانووی یەك نهۆمی لە تەختەو دار دروستکراو، لەم بەرم لەو بەری حەوشەکە دەبینی، ئەمانە قاوش‌و نشینگەی زیندانیەکانن، پاش ئەوەی جیا دەکرێنەوەو بەپێی حوکمی خۆیان پۆلین دەکرێن، دەخرێنە ئەو قاوشانەوە. لەوپەڕی حەوشەکەدا بینایەکی تر دیارە، ئەمە موبەقەو کراوە بە دوو بەشەوە. لەولای موبەقەکەوە بینایەکی دی هەیە کە لە هەمان کاتدا وەکو ئازووقەخانەو گەراجی گالیسکەو عەماری دانەوێڵەش بەکار دەبرێت. ناوەندی حەوشەکە، چۆڵ‌و هۆڵ، زیاتر لە مەیدانێکی گەورە دەچێت.

زیندانییەکان لەو مەیدانەدا ریز دەکرێن، تەفتیش دەکرێن‌و رۆژی سێ جاران، بەیانی، نیوەڕۆ، ئێوارە، سەرژمێر دەکرێن‌و ناویان دەخوێنرێتەوە، خۆ ئەگەر سەربازو پاسەوانەکان هەندێ بەدگومان‌و لە سەرژمێریدا کۆڵ بوایەن، ئەم کارە لە رۆژێکا چەندین جار دووبارە دەکرایەوە. لە نێوان بیناکان‌و حەسارەکەدا پانتاییەکی چۆڵی بەرین هەبوو، کە هەندێ لەو زیندانییانەی حەزیان لە تێکەڵاو بوون نەدەکردو بە ڕەشبین ناسرا بوون، لە کاتی بێ ئیشی دا لەو پانتاییەدا پیاسەیان دەکرد: دوور لە خەڵکی، لە فکران ڕادەچوون‌و یادگارییە تاڵ‌و شیرینەکانی خۆیان وەردەوە دەدا. زۆر جار کە بەدەم ئەم جۆرە پیاسانەوە دەمبینین‌و تووشیان دەبووم، حەزم دەکرد لە سەروسیمای خەمناکیان ورد ببمەوە،و مەزەندەی خۆم بخەمە کار کە بیر لەچی دەکەنەوەو چیان لە بیرو لە خەیاڵدایە. خۆشترین شت بەلای یەکێك لەو زیندانیانەوە ئەوە بوو کە عامودەکانی حەسارەکە بژمێرێ، ژمارەی عامودەکان هەزارو پێنج سەد دانە بوو، هەر هەموویانی ژمارد، لەبەری بوون، هەر عامودێك لەم عامودانەی بە نیشانەی رۆژێك لە ماوەی زیندانییەکەی خۆی دادەنا، هەموو رۆژێك یەکێك لە عامودەکانی لە حیسابەکە دەر دەکرد، بەم رێگەیە دەیزانی چەند رۆژی دیکەی لە زینداندا ماوە، گەورەترین خۆشی ئەو ئەمە بوو کە دەگەییە دوا عامودی یەکێك لە لا دیوارەکانی حەسارە شەش گۆشەکە! وێڕای ئەوەش دەبوا ساڵانێکی زۆر چاوەڕوان و سەبر بکات تا لە زیندان ئازاد ببێ. هیچ شتێك وەکو زیندان مرۆڤ فێری سەبرو هەدا ناکات.

لە بیرمە جارێکیان یەکێك لە زیندانیەکان پاش ئەوەی بیست ساڵی بە کاری قورسەوە، لە زینداندا بەسەر برد،و حوکمەکەی خۆی تەواو کرد، ئازاد کرا، بەسەر یەك بە یەکی هاوڕێکانیا گەڕا تا ماڵاوایان لێبکات‌و گەردن ئازادییان دەگەڵ بکات. هەندێ لە هاوزیندانیەکانی ئەوەیان لە بیر بوو کە هەوەڵجار بۆ زیندان هێنرا، گەنجێکی بێباك‌و بێ پەروا بوو، نە بیری لەو تاوانە دەکردەوە کە کردبووی‌و نە گوێی لەو سزایەش بوو کە بۆی بڕابووەوە: بەڵام ئێستا کە ئازاد دەبوو، بوو بوو بە پیرەمێرێکی سەر سپی، خەمبارو لێو بەبار، عەبووس‌و گرژ و مۆن. بۆ ماڵاوایی بەسەر هەر شەش قاوشەکەدا گەڕا، بە بێدەنگی خۆی بە هەر قاوشێکدا دەکرد، پاش ئەوەی لە بەردەم ئیکۆنەکەدا(١) ***(ئیکۆنە، پەیکەری یەکێك لە ئەولیاکان بوو کە هەمیشە لە سەمتی رۆژهەڵاتی ژوورەکاندا دادەنرا).*** نیشانەی خاچی دەکێشا، کڕنۆشی بۆ هاوزیندانیەکانی دەبرد، لێیان دەپاڕایەوە کە گەردنی ئازاد بکەن‌و بە خێرو چاکە یادی بکەنەوە.

زیندانیەکی دیکەشم چاك لە بیرە. ئەم پیاوە جووتیارێکی دەوڵەمەندی سیبیریایی بوو، ئێوارەیەك ژنەکەی هاتبوو بۆ دیدەنی، بانگیان کرد بۆ بەردەرگا. شەش مانگ لەوە پێشتر ئاگادار کرابووەوە کە ژنەکەی ڕەدووی پیاوێکی تر کەوتووەو شووی پێکردووە، ئەوەی زۆر لەبەر گران دەبێت، کەچی ئەوەتا ئەم ئێوارەیە هاتووە خێری پێبکات. کە هاتە بەر دەرگا، ژنەکەی بڕێ پارەی کەمی دایە. نزیکەی دوو دەقیقەیەك پێکەوە قسەیان کرد، هەردووکیان بە کوڵ گریان‌و پاشان بە یەکجارەکی‌و بۆ هەتا هەتایە لێکدی دابڕان... وەختێ ئەم زیندانیە بۆ قاوشەکەی خۆی گەڕایەوە، لە سەروسیمای ورد بوومەوە... بەڕاستی مرۆڤ لە زینداندا فێر دەبێت چۆن سەبرو هەدا بکات بە پیشە...

هەرکە خۆر ئاوا دەبوو، دنیا تاریك دەبوو، دەکراینە ئەو قاوش‌و ژوورانەوە کە دەبوایە شەوی تیا رۆژ بکەینەوە. هەمیشە زۆرم لەبەرگران بوو کە لە حەوشەوە دەیانکردینە قاوش‌و ژوورەکانەوە. زۆر خەمبار دەبووم. ئێوە بیهێنە بەرچاوی خۆتان، لە حەوشێکی ئازادەوە بتبەنە ناو ژوورێکی درێژی نزمی خەفە کە یەك دوو مۆمی کز بە ئاستەم رووناکی دەکەنەوەو بۆگەنی، پیاو هێڕو کاس دەکات ، چەند ناخۆش‌و بە ئازارە. کە ئێستا بیری لێدەکەمەوە نازانم چۆن توانیم دە دانە ساڵی خشت لەم زیندانەدا بەسەر بەرم. جێگەکەم لە قاوشەکەدا بریتی بوو لە تەختێکی سێ لەوحی، ئەمە لە جیاتی تەختە خەو بەکاردەبرا، بۆم هەبوو لە سنووری ئەم تەختەدا رەفتاربکەم، هەر ژوورە پتر لە سی کەسیان تێ دەپەستا. لە وەرزی زستاندا زووتر دەیانکردینە ژوورەوە، دەبوایە چوار سەعاتێك چاوەڕوان بکەین تا هەموو زیندانیەکان بخەون.و قاوشەکە هێمن ببێتەوە. بەڵام پێش ئەوە هەراو زەنایەکی ئەوتۆ باڵی بەسەر قاوشەکەدا دەکێشا کە لە وەسف کردن نایەت. بانگکردن، هاوار، پێکەنین‌و قاقا، دەمڕێژی جنێوان، زڕەی زنجیر، بۆنی بۆگەنی‌و چەڕە دووکەڵ، لە هەموو ئەمانەش خراتر سەرتاشین، نێوچەوانی بە مۆرو نیشان، جلکی شڕوشەپڕێو... و زۆر شتی دیکەی لەو بابەتە کە مایەی قێزو بێز بوو... نیشانەی ئەوپەڕی زەلیلی‌و زەبوونی بوون... بەڵێ مرۆڤ حەیوانێکی تەمەن درێژە!و دەشێت بڵێین: مرۆڤ گووراوێکە دەگەڵ هەموو شتێکدا ڕادێت، رەنگە ئەمە باشترین پێناسە بێت بۆ مرۆڤ.

ژمارەمان لەم زیندانەدا دوو سەدو پەنجا زیندانی بوو. ئەم ژمارەیە بە دەگمەن دەگۆڕا، راستە بەردەوام زیندانی تازە دەهێنران، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر زیندانییەك کە مەحکومیەتەکەی تەواو دەکرد، ئازاد دەبوو. جار جاریش خەڵکانێکمان لێدەمردن، ئێمە تێکەڵەیەکی سەیر بووین لە خەڵکانی هەمە جۆر. پێموایە هیچ دەڤەرو شارو شارستانێکی رووسیا نەبوو کە زیندانیەکی لەم زیندانەدا نەبێت. زیندانیەکان غەوارەو بێگانەشیان تێدا بوو، هەندێکیان لە تیرەو تایفە نیمچە هۆڤیەکانی کۆسارەکانی قەفقاز بوون. ئەم خەڵکە بە گوێرەی گەورەیی‌و بچووکی تاوانەکانیان‌و بەپێی مودەتی مەحکومیەتەکەیان پۆلین دەکران. نوێنەری هەموو جۆرە تاوانێك لە نێو ئەو زیندانیانەدا هەبوو. زۆربەی خەڵکی  ناو زیندانەکە، ئەوانە بوون کە بە کاری قورس، جۆری مەدەنی مەحکووم بوون، ( یانی زیندانیەکان گوتەنی: "گەورە مەحکوومان" بوون). ئەمانە لەو تاوانبارانە بوون کە لە هەموو مافێکی مەدەنی خۆیان بێبەش کرابوون، ئەمانە خەڵکانێك بوون کۆمەڵگە پشتی تێکردبوون، ترۆی کردبوون، وەدەری نابوون، و داغمە شەرمەزاری بە تەوێڵەوە نابوون، تا بۆ هەتا هەتایە شایەدو نیشانەی ئەو تاوانە بێت کە کردبوویان. ئەمانە بۆ ماوەی (٨) تا (١٢) ساڵ دەخرانە زیندانەوە، کە ماوەی سزاکەیان تەواو دەبوو، دەنێردران بۆ تاراوگەکانی ناو سیبیریا. جەماعەتێکی دی لە زیندانەدا هەبوون، تاوانبارانی سوپاییان پێدەگوترا، ئەمانە لە مافە مەدەنیەکانیان مەحرووم نەدەکران – ئەمە لە سیستەمی هێزی سوپایی روسیدا باو بوو– و بۆ ماوەیەکی تا ڕادەیەك کورت لە زیندانەدا دەهێڵرانەوە، هەرکاتێ ماوەی زیندانەکەیان تەواو کردبا، بۆ ئەو شوێنە دەنێردرانەوە کە لێوەی هاتبوون، بە سەربازی بۆ سەربازگەکانی سەر سنووری سیبیریا، دەگوازرانەوە، گەلێك لەمانە بە

هۆی ئەنجامدانی تاوانی گەورەو مەترسیدارەوە بۆ لای ئێمە دەنێردرانەوە، ئەمجارەیان بۆ ماوەیەکی کەم زیندانی نەدەکران، بەلای کەمەوە بۆ ماوەی بیست ساڵ حوکم دەدران، ئەمانە زیندانیانی ئەبەدییان پێدەگوترا، دەخرانە بەشی زیندانی ئەبەدییەوە، کەچی وێڕای ئەمەش لە ماف مەدەنی بێبەش نەبوون. تاقمێکی دیکە هەبوو، کە ژمارەیان زۆر بوو، ئەمانە ئەحکام خاسەیان پێدەگوترا، لە بەشی تایبەتیدا زیندانی دەکران، ئەمانە پیسترین‌و ترسناکترین تاوانبار بوون، خەڵکانێك بوون ئالوودەی تاوان بوون، بەبێ تاوان هەڵیان نەدەکرد. لە هەر چوارنکالی وڵاتی رووسیاوە مەحکومانیان بۆ ئەم بەشە تایبەتە دەنارد. ئەوانە خۆیان بە زیندانی ئەبەدی دەزانی، چونکە مودەتی زیندانیەکەیان دیار نەبوو. یاسا رێی دەدا کار قورسی زیادەشیان بەسەرا بسەپێنرێت. زۆرجار خۆزیایان بە زیندانیەکانی دی دەخواست‌و پێیان دەگوتن: "ئێوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لێرەن، درەنگ یان زوو ئازاد دەبن، بەڵام ئێمە دەبێ بۆ هەتا هەتایە لێرە بین." پاشان زانیم کە ئەم بەشە بە یەکجاری لابراوە،و مەحکوومە سوپاییەکانیش دوور خراونەتەوە،و نیزام‌و سیستەمێکی تایبەتیان بۆ دانراوە. هەڵبەتە ئیدارەی زیندانەکەش گۆڕاوە، بۆیە من ئێستا باسی داب‌و نەریت‌و رێو رەسمی سەردەمێکی کۆن،و هەندێ کاروباران دەگێڕمەوە کە لە مێژە هەڵوەشێنراونەتەوە...

بەڵێ، زۆر لە مێژە... کە من وەکو زنیدانیەك دەژیام، بەڵام تاکو ئەمڕۆ یادگارییەکانی ئەو سەردەمەم وەکو خەوێکی ترسناك لە بیرە. ئێستاش ئەو رۆژەم لە بیرە کە خرامە زندانەوە. ئێوارەیەکی درەنگی مانگی دیسامبەر، (کانوونی یەکەم) بوو، زنیدانیەکان تازە لە کارو بێگار هاتبوونەوەو فەرمانبەرو کارمەندەکان بۆ تەفتیش‌و سەرژمێرییان ریز دەکردن. عەریفێکی سمێڵ بابڕی باڵا بەرز، دەرگای ئەم ماڵە سەیرو سەمەرەیەی لێکردمەوە، کە ئەو هەموو ساڵەی تەمەنم تیا بردە سەر، رەنج‌و عەزابێکی وام تیا کێشا کە هەرگیز وێنام نەدەکرد بەرگەی بگرم. ئاخر لە کوێ تەسەوری ئەو عەزابەم پێدەکرا کە پیاو بۆ ماوەی دە دانە ساڵ، نەهێڵرێ، نەتوانێ بۆ تاقە چرکەیەکیش بە تەنیاو لەگەڵ خۆیدا بژی ؟.. بەڵێ، بە درێژایی ئەو ماوەیە نەمتوانی بۆ تاقە جارێکیش دەگەڵ خۆمدا تاك بکەومەوە... نە لەو کاتانەدا کە لە ژێر چاودێری پاسەواناندا خەریکی کارکردن بووم، نە لەو کاتانەدا کە دەگەڵ دوو سەد (هاوڕێ)دا لە ناو زیندان بووم... بەڵام چارم ناچار بوو دەبوا خۆم ڕابێنم...

لە نێو زیندانیەکاندا خەڵکانێك هەبوون لە ساتێکی تورەییدا خەڵکیان کوشتبوو، هەبوون کوشتنیان کردبوو بە پیشەو لەزەتیان لێدەبینی. هەبوون چەتەو رێگر بوون، هەبوون بەرەڵلاو گیرفانبڕ بوون‌و دەیانزانی چۆن رێبواران غافڵگیر دەکەن‌و گیرفانیان دەبڕن، یان چۆن شتی سەر مێزێك دەڕفێنن‌و بۆی دەردەچن، هەندێکیش هەبوون پیاو نەیدەزانی لەسەرچی‌و چۆن خرابوونە ئەم زیندانەوە. هەر یەکێك لەم زیندانیانە چیرۆکێکی ئاڵۆزو قورس‌و بەسوێی هەبوو کە وەکو مۆتەکە روحی ئازار دەداو نەیدەتوانی خۆی لە شەڕی رزگاربکات. زیندانیان، بە شێوەیەکی گشتی کەمتر باسی رابردووی خۆیان دەکەن. حەزناکەن ئەم رابردووە بگێڕنەوە، تەنانەت هەوڵدەدەن لە بیری خۆیانی بەرنەوە، هەر بیری لێنەکەنەوە. لە زیندانەدا پیاو کوژانێکم ناسین،

ئەوەندە شادو بە کەیفو بێ خەمو خەیاڵ بوون، پیاو دەتوانێ گریو بکات کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ویژدانیان عەزابی نەداونو هەستیان بە پەشیمانی نەکردووە. بەڵام خەڵکانێکیشم ناسین تا بڵێی گرژو پەست بوونو بە جۆرێ دەمیان لێك نابوو بە کێردیش نەدەکرایەوە. بەدەگمەن ڕێکدەکەوت یەکێك سەربهووردی خۆی بگێڕێتەوە، چونکە ئەمە لە زینداندا باو نەبوو، کەس گوێی لەو سەربهووردو حیکایەتانە نەدەگرتو کارێکی پەسند نەبوو. وێڕای ئەوەش ڕێکدەکەوت جار جارێ زیندانیەك لە بێکاری خۆیدا، سەربهووردێکی خۆی بۆ زیندانیەکی دی بگێڕێتەوە، هەڵبەتە زیندانی دووەم بە نەبەدڵی و بە ساردی گوێی لە زیندانیی یەکەم دەگرت. ڕاستت دەوێ هیچ کەسێك نەیدەتوانی بەگێڕانەوەی سەربهووردی خۆی، سۆزی بەرانبەرەکەی ببزوێنێت یان سەرنجی ڕاکێشێت. وەڵامی باوی زیندانیەکان ئەوە بوو، بە ڕاشکاویو بەتەوسەوە دەیانگوت: "بە غەشیممان دەزانی؟! ".

لە بیرمە ڕۆژێك یەکێك لە دزو ڕێگرەکان بە دەم مەستیەوە ( هەندێجار زیندانییەکان دەرفەتیان دێناو دەیانخواردەوەو مەست دەبوون ) بۆی گێڕاینەوە کە چۆن منداڵێکی پێنج ساڵانی خەڵەتاندووەو،بە زەبری لەیستۆکێك بردویەتیە ناوعەمارێکی ئازووقەوەو لەوێندەر کوشتوویەتیو پارچە پارچەی کردووە. زیندانییەکانی دی کە تا ئەو کاتە بە حەنەكو سوعبەتەکانی ئەو پێدەکەنین. لە پڕ لێی هاتنە زمانو بە یەك دەنگ پێیا هەڵشاخینو ناچاریان کرد کە بێدەنگ بێتو چیتر لەسەر ئەو بابەتە قسانە نەڕوات. زیندانییەکان لەبەر ئەوە قسەکەیان پێنەبڕی کە چیرۆکێکی ترسناك بوو، پەستو بێزاری کردن، بەڵکو زیاتر لەبەر ئەوە بوو کە گێڕانەوەی ئەو جۆرە بابەتانە لە زینداندا پەسندو باو نەبوو! جا لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێم کە لە ناو زیندانییەکاندا خوێنەوارانێکی زۆر هەبوون. نزیکەی نیوەیانو بگرە زیاتریش خوێندنەوەو نووسینیان دەزانی. جا لە چ شارێکی قەرەباڵغی ڕووسیادا، لە نێوان کۆمەڵگەیەکی دوو سەدو پەنجا کەسیدا، سەدو پەنجا کەسی خوێنەوار، کە خوێندنو نووسین بزانن، پەیدا دەبێت ؟ لە بیرمە یەکێك لەو زیندانییە کەم حوکمەکان کە خۆی نەخوێنەوار بوو، دەیگوت خوێنەواری دەبێتە مایەی بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی لە نێوان چینە نزمەکانی کۆمەڵگەداو ئەو جۆرە ڕووداوانەی بە بەڵگە دێنایەوە. بەڵام نا، ئەو حوکمە هەڵەیە : خوێنەواری هیچ پەیوەندییەکی بەم داڕوخانە ئەخلاقیەوە نیە. دەبێ دان بەوەدا بنەین کە عەیبەکە لە خودی خوێنەواریدا نیە، بە پێچەوانەوە خوێنەواری ورە بەرزدەکاتەوە، ویستو ویژدانی گەل دەپاڵێوێ. زیندانییانی هەر بەشێکی زیندانەکە جۆرە جلێکی تایبەتیان لەبەر دەکرد: هەندێك جۆرە چاکەتێکیان لەبەر دەکرد کە نیوەی کەوەییو نیوەی قاوەیی تۆخ بوو، پانتۆڵەکانیشیان بە هەمان شێوە لاقێکی کەوەییو لاقەکەی تری قاوەیی بوو. لە بیرمە ڕۆژێك کە لە دەرەوە خەریکی کارکردن بووین، کچۆڵەیەکی چۆرەك فرۆش هات، پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لێم ڕاما، لە پڕ لە قاقای پێکەنینی داو گوتی: "پەح... کە دیمەنیان ناشیرینە! وا دیارە ئەمانە پارچەیان لێبڕاوە بۆیە جلەکانیان لەدوو پارچەی جیاواز دروستکردوون." گروپێکی دی هەبوو چاکەتی شینباویان لەبەر دەکرد، بەڵام قۆڵی چاکەتەکان قاوەیی بوو. سەریان بە شێوەی جیاواز

دەتاشین، جاری وابوو گەوزێکیان لە پشتی ملەوە بۆ سەر تەوێڵ لێدەدا، و جاری وا بوو لەسەری ئەم گوێچکەتەوە بۆ سەری ئەو گوێچکە گەوزیان لێدەدا.

ئێدی ئەم زیندانیانە هێندە لە یەکدی دەچوون، کە سادەترین کەس هەستی بەو لێکچوونەیان دەکرد، رەفتارو هەڵسوکەوتیان زۆر لە یەکدی دەچوو، تەنانەت کەسایەتییە سەنگین‌و بە ویقارەکانیش، ئەو کەسایەتییانەی کە بێ ئەوەی بیانەوێ، بەسەر باقی زیندانییەکاندا زاڵ بوون، هەوڵیان دەدا لەوانی دی جیاواز نەبن، هەمان رەفتارو هەڵسوکەتی ئەوان بکەن. دەتوانین بڵێین گشت زیندانییەکان – جگە لە ژمارەیەکی کەم کە دنیایان دابووە بەر کلکان‌و هەمیشە شادو شەنگوڵ خەریکی فشقیات بوون‌و، لەبەر ئەمە لەلایەن ئەوانی ترەوە دەبوغزێنران– خەڵکانێکی گرژو مۆن، عەبووس، حەسوود، بەغیل، لە خۆرازی، فیشاڵباز، تۆرینۆک،و رواڵەت بازبوون‌و بەموو لە ئەتەکێتی زیندان لایان نەدەدا. یەکێك لەو ئەتەکێتانە ئەوە بوو کە هیچ شتێك سەرسامیان نەکات، بۆ هیچ شتێك خۆیان شێلو نەکەن، یەکێکی تر ئەوە بوو کە هەمیشە مەندو بەسام‌و ویقار بنوێنن. بەڵام زۆرجار ئەو رواڵەتبازیە، ئەو لووتبەرزیە، ئەو بەرزەفڕییە لە چاوتروکانێکا دەگۆڕا بۆ بچووکایەتی و ترسنۆکییەکی زەق‌و ئاشکرا. بەڵام وێڕای ئەوەش پیاوانی بە راستی مەردو ڕەندو ورەبەرزیانیش تیا بوو، ئەمانە دەگەڵ خۆیان‌و تەبیعەتی خۆیاندا دڵسۆزو راستگۆ بوون... بەڵام زۆربەی کات بە ڕادەیەك بە خۆ دەنازین، کە خەریك بوو لێیان دەبوو بە نەخۆشی. لووتبەرزی‌و خۆپەسندی هەمیشە لە سەرووی هەموو شتێکەوە بوو. بەڵام زۆربەی زیندانییەکان بودەڵەو رەوشت نزم بوون، بۆیە رێژنەی دوو زمانی، بوختان، قسەهێنان‌و بردن، قەرقەشە، تەوس‌و توانج، و راپۆرت لێدان، کاری چەپەڵ‌و نامەردانە، بە خوڕزم دەباری، ژیانمان لێ بوو بوو بە دۆزەخی ڕاستەقینە... هەموو زیندانییەکان هەستیان بەمە دەکرد... زۆریان لەبەر گران بوو، بەڵام کەس نەیدەوێرا دەنگی بەرزبکاتەوە، گلەیی لە سیستەمی ناوخۆی زیندانەکە بکات، داب‌و نەریت‌و رێو ڕەسمی باوی زیندانەکە رەفزبکات. هەموو زیندانییەکان، درەنگ یان زوو، کەوی دەبوون،و ملیان بۆ ئەم سیستەم‌و داب‌و نەریتانە دەدا. خەڵکانێك هەبوون زۆر درِو کەللە ڕەق‌و جنگن‌و شەڕەنگێز، ئەمانە درەنگ ڕام دەبوون. بەڵام لە ئەنجامدا هەر دەستەمۆ دەبوون. ئەو زیندانییانەی بەر لە زیندانیکردنیان، هەموو سنوورێکیان بەزاند بوو، بە هۆی جینگزی‌و ملهوڕی خۆیانەوە ترسناکترین تاوانیان ئەنجام دابوو، و شارو ناوچەیەکی تەواویان لە زەواق نابوو، ئەوانەیش درەنگ یان زوو ملیان بۆ سیستەمی زیندانەکە دەداو کەوی دەبوون... نەرم دەبوون‌و، دادەمرکانەوە. کاتێ کە بۆیان دەردەکەوت، کەس نییە لێرە گوێیان لێبگرێت،و بە کارە دڕندانەکانیان سەرسام بێ، بەرە بەرە بێدەنگ دەبوون، خۆیان دەگەڵ کەش‌و هەوای گشتی زیندانەکەدا دەگونجاندو وەکو هەر زیندانییەك خۆیان گران دەگرت‌و شانازیان بەوە دەکرد کە لەبەر کەمتەرخەمی زیندانی کراون وەك ئەوەی زیندانی بوون‌و کەمتەرخەمی، قارەمانیەتی بێت. یانی هیچ نیشانەیەکی شەرم یان پەشیمانیت پێوە نەدەبینین، بەڵکو بە پێچەوانەوە شانازیان بەوەوە دەکرد کە حوکم دراون، وەك ئەوەی حوکمدان‌و زیندانی بوون نیشانەو میدالی شانازی بێت‌و تەنیا بە چەند کەسێکی

هەڵبژاردە بدرێت. زۆرجار بە شۆخیو سوعبەتەوە باسی خۆیان دەکرد. بۆ نموونە دەیانگوت: "ئێمە خەڵکانێکی گومڕاین، ئێمە کە ئازاد بووین قەدری ژیانمان نەدەزانی، ئامادە نەبووین ڕێی ڕاست بگرین، ئێستا دەبێ بەغار بە شەقامی کەسکدا(٢)* بڕۆین، بە شەقامی کەسك مەمنوون بینو ریزەکانی ئەمبەرو ئەوبەر بژمێرینو بژمێرینەوە. ئێمە کە بە گوێی داكو بابی خۆمان نەدەکرد، ئێستا دەبێ دوای دەنگی دەهۆڵی بۆشو بەتاڵ بکەوین. ئێمە کە ئامادە نەبووین بەداوی زێڕ درومان بکەین، ئێستا دەبێ کەڤڕو بەردان بشکێنین". ئیدی گەلێك لەو پەندو قسەباوانەیان دەگوتو دەگوتەوە، بێئەوەی کەسیان بە هەندی بگرن، بەڵکو تەنیا بۆ خۆشیو کەیفی دڵی خۆیان دەیانگوتو دەیانگوتەوە... چما کەسیان تیا بوو تەنانەت لە دڵی خۆشیدا دان بە تاوانەکەیدا بنێت ؟ هەرگیز!... بۆ چ قودرەت بوو کەسێك، کەسێکی بێگانە – نەك زیندانی– یەکێك لەو زیندانیانەی بە تاوانبار زانیبا، یان لەسەر تاوانەکەی لۆمەی کردبا، ئیدی لە هەموو لایەکەوە دەمڕێژی جنێوی بەسەردا دەباریو خۆشی نەدەکردەوە! جا چەند لە جنێوو قسەی بە توێکڵو تانەو تەشەراندا کارامەو وەستاو لێزان بوون! جنێوی مزرو ئاودار، وردو پڕ بە پێست.. بە ڕاستی لەمەدا هونەرمەندن!... ئیدی جنێو بۆ خۆی بوو بوو بە زانست. نەدەهاتن جنێوی زەقو ڕاستەوخۆ بەخەنیمو ڕەقیبەکانیان بدەن، بەڵکو تانەو تەشەری ژەهراویان لە بن حەوت تۆکڵان دەشاردەوە تا پتر بەرانبەرەکەیان ئازار بدات. جا شەڕو قەرقەشەی بەردەوام هێندەی دی ڕەواجو برەوی بەم هونەرە تایبەتیە، هونەری جنێو، دەداو زەمینەی گەشەکردنو پەرەسەندنی بۆ خۆش دەکرد.

چونکە هەموویان ناچاربوون بە زەبری دارو بە بێگار کاربکەن، زیاتر روویان لە تەمەڵیو ساختەچیاتی و بێتامیو گومڕایی بوو. تەنانەت ئەوانەش کە لە دەرێی زینداندا خەڵکانی چەلەنگو چالاكو سەر ڕاست بوون، هەرکە دەگەیینە ناو زیندان، بە ماوەیەکی کەم خوویان بە تەمەڵیو گەندەڵیو بێبارییەوە دەگرت. چونکە بە یەکتر بێگانە بوونو شەقی زەمانە لە زیندانی کۆکردبوونەوە، ڕقیان لە یەکدی بوو، قسەی باوی سەر زاریان ئەمە بوو کە: " شەیتان سێ پێڵاوی دڕیوە ئەوجا توانیویەتی ئێمە لێرە کۆبکاتەوە." ئیدی فێڵو تەڵەکەبازی، پیلانو مل شکاندن، بوختان، دوو زمانی، بەغیلیو قەرقەشە دیاردەی هەرە باوی ئەم دۆزەخە بوو کە تیایدا دەژیاین. هیچ زمانێکی پیس نەبوو، بتوانێ خۆی لە هەمبەر ڕێژنەی دەمی هەمیشە پڕ جنێوو سخێفی ئەو پیاو کوژو چەقۆ کێشانە بگرێت.

وەکو پێشتر گوتم، لە نێو ئەمانەدا پیاوی بە ورە، بە هێز، سەلارو سەنگین،و مەردو ڕەندو ئازاو بوێر هەبوون، دەیان زانی چۆن هەڵسوکەوت دەکەنو ڕەفتاری خۆ کۆنترۆڵ دەکەن. ئەوانی دی خۆ بەخۆ شەرمیان لەمانە دەکرد، لێیان دەسڵەمینەوەو ڕێزو حورمەتیان دەگرتن، جا ئەمانە هەرچەندە خۆیان خۆش دەویو لە خەمی ناوبانگی خۆیانن، هەوڵدەدەن خۆیان بەسەر کەسدا نەسەپێنن،و کەس تەنگەتاوو سەغڵەت نەکەن، ئەمانە بە خۆڕایی و لە خۆڕا نە بوختانیان دەکرد، نە شەڕیان بە کەس دەفرۆشتو نە جنێویان دەدا. ڕەفتاریان لە هەموو ڕوویەکەوە مەردانەو پەسند بوو. خەڵکانێکی بەردەبارو ئەقڵمەندو بە ئاوەز بوون، بە شێوەیەکی گشتی گوێڕایەڵی

بەرپرسانی زیندان بوو، جا ئەم گوێرایەڵییە نە زادەی پرەنسیپێکی ئەخلاقی تایبەتی بوو، نە زادەی واجبو ئەرکی سەرشان بوو، بەڵکو جۆرە سازشو رێکەوتنێکی ژێراوژێرو بێدەنگ بوو لە نێوان ئەوانو ئیدارەی زینداندا، رێکەوتنێکی ناڕاستەوخۆ کە ئەوان دەیانزانی بە قازانجی خۆیانەو بەم رەفتارەیان شەڕی مامورانیانی زندانیان لە خۆ دوور دەخستەوە. وێڕای ئەوەش بە پارێزەوە مامەڵەیان لە تەکدا دەکرا. لە بیرمە زیندانیەکی ئازاو دڕو سەرکێش هەبوو، زیاتر لە دڕندە دەچوو، کە توڕە بووایە دۆو دۆشاوی تێکەڵ دەکرد، نەدەهاتە کۆنترۆڵکردن، رۆژێکی جوانی هاوین، کەس کاری نەدەکرد، لەسەر سەرپێچییەك لە قاوشەکە برایە دەرێ بۆ شەلاق لێدان. ئەو ئەفسەرەی کە سەرۆکی راستەوخۆی زیندانەکە بوو خۆی گەیاندە ژووری پاسەوانانی (قەرەوڵخانە) نزیکی دەروازە گەورەکە، تا بە چاوی خۆی جێبەجێکردنی سزایەکە ببینێ. ئەم ئەفسەرە(٣)* بەپلەی مێجەر بوو، بەڵای هەرە گەورەی گیانی زیندانییەکان بوو، زۆریان رق لێ بوو، کە دەیانبینی لەرزیان لێدەهات. بە رادەیەك توڕەو تڕۆو سەختگیر بوو، زۆرجار کۆنترۆڵی خۆی لە دەست دەداو هۆشی لە خۆی نەدەما. خۆیان گوتەنی وەکو هەورە تریشقە بەسەریاندا دادەباری. زیاتر لە چاوە تیژو زەقەکانی دەترسان کە هیچی لە نیگای تیژی پڵنگ کەمتر نەبوو. مەحاڵ بوو هیچی لێ بشاردرێتەوە. وەك دەڵێن پشتی سەریشی چاو بوو. کە خۆی بە زیندانەکەدا کردبا، دەیزانی لەوپەڕی حەسارەکەش چ هەیەو چ نیە. بۆیە زیندانیەکان ناویان نابوو (هەشت چاو). رەفتاری دەگەڵ زیندانییەکاندا یەجگار خراپ بوو، بە رەفتاری ملهوڕانەی خۆی، زیندانییەکانی هێندەی دی توڕە دەکرد. خۆ ئەگەر (فەرمانداری زیندانەکە) نەبوایە، کە گەورە ئەفسەرێکی نەرمو نیانو دڵفراوانو پشوو درێژو بە ئاوەز بوو، و یارۆی مێجەری هێور دەکردەوە، ئەوا کابرای مێجەر، بە ملهوری خۆی زۆری ئەزیەت دەدایەن. من ئێستاش لە خۆم دەپرسم چۆن خانەنشین کراو بە سەلامەتی دەرباز بوو. ئەم پیاوە پاش ئەوەی چەندین ساڵ زاڵمانە حوکمی ئێمەی کرد، ئەنجام لە خزمەت مەرەخەس کرا. ڕاستە پاشان درایە دادگای جەنگو لەوێندەر دادگایی کرا، بەڵام ئەم کارە قەرەبووی ئەو هەموو زوڵمەی نەدەکردەوە، کە لە ئێمەی کردبوو.

کاتێ زیندانییەکەیان بۆ ژووری پاسەوانی ( قەرەوڵخانە) هێنا، رەنگی زەرد هەڵگەڕا. ئەم زیندانییە پیاوێکی ئازاو بە ورە بوو، بەبێ دەنگی لەسەر ئەرزەکە رادەکشاو ملی بۆ سزای خۆی دەدا، کە لە شەلاقکاری دەبوونەوە وەکو ئەوەی هیچ نەبووبێ، هەڵدەستاو خۆی دەتەکاند. ئەم ئەشکەنجەیەی بە هەمان مەندی و هێمنیو ئارامی فەیلەسوفێکەوە تەحەمول دەکرد. راستە بەبێ خەتا سزایان نەدەدا،و زۆر بە پارێزەوە سزایان دەدا. بەڵام ئەمجارەیان خۆی بە بێ تاوان دەزانی. لێڕا بوو، مل بۆ ئەو بێدادیە نەدات. هەر بۆیەش ئەمجارەیان رەنگی هەڵبزڕکا بوو، لە کاتێکا بەوپەڕی ئارامی لە سەربازە پاسەوانەکان نزیك دەبووەوە، کێردێکی، لەو کێردانەی پینەدۆزان بەکاری دێنن، لە قۆڵی چاکەتەکەیدا حەشاردابوو. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێین کە چەقۆو خەنجەرو هەر ئامێرێکی تیژو بڕندە، لە زیندانییەکان قەدەغەو یاساغ بوو. بۆیە هەندێجار، پشکنەران لە ناکاودا، بەناو زیندانەکە دەکەوتنو زۆر بە وردی هەموو پەناو

پەسێرێکیان دەپشکنی. هەرکەسێك کێردو چەقۆو ئامێری بڕندەی لێگیرابا، دەست بەسەر ئامێرە بڕندەکەیدا دەگیراو سزای توندو قورس دەدرا. بەڵام چونکە دۆزینەوەو گرتنی هەر هەموو کێردو ئامێرە بڕندەکان زەحمەت بوو،و هیچ کارێکیش بەبێ چەقۆ ئەنجام نەدەدرا، بۆیە چەقۆو ئامێری بڕندە لە زیندانەکە نەدەبڕا، ئەگەر هەندێ لەو ئامێرە بڕندانە لە هەڵمەتێکی پشکنیندا گیرابان‌و دەستیان بە سەردا گیرابا، زۆری پێنەدەچوو زیندانییەکان کێردو چەقۆی تریان پەیدا دەکردەوە.

هەموو زیندانییەکان، بە پەلە خۆیان گەیاندە بن حەساری زیندانەکە، بە تاسەو نیگەرانیەوە لە درزەکانەوە تەمەشایان دەکرد بزانن چ دەقەومێ. چونکە قاو داکەوتبوو کە پترۆف لێبڕاوە ئەمجارە مل بۆ شەلاقکاری نەدات،و یارۆی مێجەر بکوژێت. بەڵام بۆ نەگبەتی کابرای مێجەر لەدوا ساتدا سواری گالیسکەکەی بوو، و سەرپەرشتیی جێبەجێکردنی سزاکەی بە ئەفسەرێکی دیکەی ژێر دەستی خۆی سپارد. زیندانییەکان دوایی گوتیان: "خودا نەجاتی دا!". ئیدی بیرۆکەی کوشتن لە مێشکی پترۆف پەڕیو بەوپەڕی خوێنساردی ملی بۆ قەساس و سزاکەی دا، چونکە لەگەڵ رۆییشتنی مێجەردا، تورەییەکەی دامرکایەوە. زیندانی تا ڕادەیەکی دیاریکراو ملکەچ‌و گوێڕایەڵە، کە لەوە تێپەڕی زۆر خەتەرو ترسناك دەبێت. هیچ شتێك لەوە سەیرتر نییە، پیاوێك دەبینی کە ساڵەهای ساڵ، کرو کپ، هێدی‌و هێمن، بەوپەڕی خوێنساردی، توندترین سزای قەبوڵ کردووە، قورسترین عەزابی کێشاوە، کەچی لە ناکاو لەسەر شتێکی زۆر بچووك، لەسەر هیچ دەهاڕوژێ، یاخی دەبێت، شێت‌و شبر دەبێت...

وەکو پێشترش گوتوومە، من بە درێژایی ئەو ساڵانەی کە دەگەڵ زیندانیانم بەسەر بردوون، بچووکترین نیشانەی شەرم و پەشیمانیم لێ نەدیتوون، زۆربەی زیندانییەکان لە دڵی خۆدا وایان بیردەکردەوە هەقی خۆیانە بە کەیفی دڵی خۆیان بکەن... پێموایە هۆی ئەم دڵڕەقیە دەگەڕێتەوە بۆ فڕناخی‌و لووتبەرزی‌و خۆبینی،وخۆنواندن‌و تەوازعە درۆینە. بە هەرحاڵ کێ دەتوانێ بڵێ پەی بە ناخ‌و کانگای دڵی ئەوانە بردووەو توانیویەتی ئەوەی لە خەڵکی پەنهانە بخوێنێتەوەو کەشف بکات ؟!... پێدەچێ ئەمە مەحاڵ بێت، دەنا هەڵبەتە من جارێك لە جاران، بە درێژایی ئەو هەموو ساڵە، دەمتوانی ئەگەر بە شێوەیەکی رەوتەنیش بووە، بچووکترین نیشانەی پەشیمانی یان عەزابی ویژدان بە سیمای یەکێك لەو زیندانییانەوە بدینم. هەڵبەتە دووبارەی دەکەمەوە کە هەرگیز شتی وام لە کەسدا نەبینی. شەرح‌و شرۆڤەی تاوانان بە گوێرەی بۆچوون‌و تیۆریانی پێشوەختەو ئامادە مەحاڵە، فەلسەفەی مرۆڤ بۆ هەڵسەنگاندن‌و حوکمدان لەسەر تاوان، لەوە ئاڵۆزترە کە وێناو تەسەور دەکرێت. بەڵام گومان لەوەدا نییە کە زیندانی‌و تاوانبار نە بە زیندان‌و گرتن، نە بە تاراوگەو نە بە سیستەمی کاری قورس و سوخرەو بێگار نایەتەوە تایم‌و چاك نابێت. هەرچەندە ئەمانە بە هۆیەك بۆ سزادانی ئەوو پاراستنی کۆمەڵگە لە شەڕی ئەو دادەنرێن‌و دەزانرێن، بەڵام لە راستیدا ئەم سزایانە هێندەی دی دەهریان دەکات‌و ڕق‌و بوغزیان دەخاتە دڵ،و زیاتر ڕمووەدەو تینوی کارە یاساغ‌و قەدەغەکانیان دەکات،و گۆساخی‌و بێ پەروایی‌و بێباکی زیاتریان لەلا دروست دەکات. هەروەها دڵنیام کە حەپسی ئینفرادی و (تاك سالولی)ش مەبەست‌و ئامانجی خۆی ناپێکێ، حەپسی ئینفرادی هەموو هێزو توانایەکی مرۆڤی تاوانبار

کۆنترۆڵ دەکات، روحی دەهاڕوژێنێ، دڵو دەروونی لاواز دەکات، دەیترسێنێ، پاشان وەکو مۆمیایەکی وشکی شێت ئاسا، دێتە دەرێو، وەکو نموونەیەك پیشان دەدرێت کە گوایە لە زیندان چاك بووەو لە تاوانەکەی خۆی ژێوان بووەتەوەو تۆبەی کردووە! جا ئەم تۆبەو پەشیمانیە، چەند مردوویەکی مۆمیاکراو لە کەسێکی زیندوو دەچێت، هەر ئەوەندە لە تۆبەو پەشیمانی ڕاستەقینە دەچێت. ئەو تارانبارەی کە لە کۆمەڵگە یاخی دەبێت، کۆمەڵگە دەبوغزێنێ، ڕقی لێهەڵدەگرێت، هەمیشە خۆی بە هەق دەزانێ: بە بۆچوونی ئەو کۆمەڵگە تاوانبارە نەك ئەو. ئەمە جگە لەوەی مادامێکی سزای خۆی وەرگرتووە، ئیدی لە هەموو خەتاو تاوانێك پاك بووەتەوە، تۆ واز لە جیاوازی بیروبۆچوونی خەڵکی لەمەڕ تاوان بێنە، هەرکەسەو بۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام وێڕای ئەمەش هەندێ تاوان هەیە لەلای هەموو کەسێك و لە گشت شوێنو کاتێکدا هەر تاوانەو بە تاوان دەژمێردرێ، هەر هەموو یاساو ڕێساو سیستەمو باوەڕەکان بێ چەندوچوون دانی پێدا دەنەن کە تاوانەو تا مرۆڤ مابێ و مرۆڤ هەبێ تاوانەو هیچ چەندوچوونو گەنگەشەیەك هەڵناگرێت . من بۆ یەکەمجار لە زینداندا گوێم لە چیرۆکی ترسناکترینو دڕندانەترین تاوان بوو، کە تاوانکارەکە بەدەم پێکەنینەوە، کە پتر لە پێکەنینی منداڵ دەچوو، دەیگێڕایەوە. بەعەمراتم ئەو چیرۆکەم لە بیرناچێت کە چۆن کوڕێك بابی خۆی کوشتبوو(٤)*، ئەمە پێشتر ئەفسەر بوو،و لەقەبی ئەشرافیەتو خانەدانی هەبوو. ئەم کوڕە مایەی کڵۆڵیو داماوی بابی بوو. هەڵبەتە کوڕێکی جەلۆو ناڕەسەن بوو. بابی هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووە بە ئامۆژگاریو قسەی خۆش بهێنێتەوە سەر ڕێگەی ڕاستو بە یەکجارەکی نەکەوێتە ئەو دۆزەخە بێ بنەوە کە بۆی دەخزا، بەڵام بێهودە، ئامۆژگاری دادی نەدا، لەم گوێیەوە دەهات لەوە گوێیەوە دەردەچوو. کوڕە تا بیناقاقای لە قەرزا بوو، وای مەزەندە دەبرد کە بابی جگە لە مەزراکەی سەروەتو سامانێکی دیکەشی هەیەو لەمی دەشارێتەوە، بابی خۆی کوشت تا بە زووترین کات بەشە میراتی بەربکەوێ. ئەم تاوانە دوای مانگێك ئەوجا کەشف بوو. لە ماوەی ئەو مانگەدا لە جاران پتر سەری کردە ڕابواردنو عەیش و نۆشو خۆشگوزەرانیو سەرسەریاتی. هێندە بێ شەرم بوو کە بە خۆی خەبەری دیار نەمانە نهێنی ئامێزەکەی بابی بە پۆلیس ڕاگەیاند. ئەنجام پۆلیس، لە غیابی کوڕەدا، جەنازەی پیرەمێردەیان لە ژێڕابێکی داپۆشراوی ناو حەوشەی ماڵەکەیاندا دۆزییەوە. سەرە سپییەکەی لە جەستەی جیا کرابووەوە،و خرابووەوە سەر جەستە رووتو قووتەکەی، یارۆی بکوژ بۆ سووکایەتی سەرینێکی نابووە ژێر سەرە بڕدراوەکە. کوڕ دانی بە تاوانەکەی خۆیدا نەنا، بەڵام بەڵگەی زۆری لەسەر بوو بە ماڵ، پلە سوپاییەکەی لێسەندرایەوە، لەقەبی ئەشرافیەتی لێسەندرایەوە حوکمی بیست دانە ساڵی کاری قورس(بێگارە زندان) بۆ بڕایەوە. جا من بە درێژایی ئەو ماوەیەی ناسیم چۆنم دیبێ باشە؟ گەنجێك بوو زیتەڵ، بێ پەروا، بێباك، ڕەنگو ڕووگەشو کراوە. لە ژیانما گەنجی وا بێ موبالاتو خەمساردو هەرزەو سووكو چروکم نەدی بوو، ئەگەر بڵێی گەوجو گێلش نەبوو ها... زیندانییەکانی دی ڕقیان لێ بوو، بە چاوی سووك تەمەشایان دەکرد، هەڵبەتە لەبەر ئەمە نەبوو کە ئەو تاوانە دزێوەی کردووە، کەس باسی ئەو تاوانەی نەدەکرد، لە مێژ بوو لە بیریان کردبوو،

بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە کەسێکی جەلۆو هەڵەو هەرزە، سووك‌و چرووك بوو، کەسێکی سەلارو سەنگین‌و بەویقار نەبوو.

ئەم کوڕە عادەتی وابوو جارجارێ بە دەم قسانەوە ناوێکی بابی بێنێ، لە بیرمە جارێکیان باسی ئەوەی دەکرد کە ماڵبات‌و بنەماڵەکەیان بە میرات لە ڕووی جەستەییەوە ساغ‌و سەلامەت‌و بە تواناو بەهێزن، گوتی: "بۆ نموونە باوکم وەربگرن، تا ئەو ڕۆژەی مرد تاقە جارێك نەخۆش نەکەوت !" هەڵبەتە مەحاڵە تەسەوری ئەوە بکرێت هەست سزیی حەیوانی بگاتە ئەم ئاستە ترسناکە، ئەمە کاری کردەنی نەبوو. کارێکی ئاسایی نەبوو. تاوانێکی ڕەوتەنی نەبوو، دەبێ زادەی نوقستانیەکی جەستەیی، دەرونی‌و روحی ئەوتۆ بێ کە زانست تا ڕۆژگاری ئێمە پەی پێ نەبرد بێ، هەرچەندم دەکرد باوەڕم نەدەکرد کە ئەم کوڕە، ئەو تاوانە دڕندانەیەی کردبێت، بەڵام هەندێ لە خەڵکی شارەکەی خۆی، کە ئاگایان لە وردو درشتی ئەم مەسەلەیە بوو، دڵنیایان کردم کە تاوانەکە ڕاستەو هیچ چەندو چوونێك هەڵناگرێت.

زیندانییەکان، جارێك گوێیان لێ بوو بوو کە بە دەم خەوەوە هاواری کردبوو: "بیگرە! توند بیگرە! سەری ببڕە، سەری ببڕە، سەری!..."

زۆربەی زیندانییەکان بە دەم خەوەوە قسانیان دەکرد یان لە خەوا وڕێنەیان دەکرد. جا ئەم قسانە بە شێوەیەکی گشتی دەربارەی کێردو خەنجەرو پاچ‌و ئامێری بڕندە بوون. هەندێجاریش لە خەوەکانیاندا سوێندیان دەخواردو جنێویان دەدا. ئەمانە دەیانگوت: "ئەوەندەیان لێداوین، ئەوەندەیان ئەشکەنجەداوین، هەناومان شل بووە، بۆیە بەدەم خەوەوە هاواردەکەین، دەقیژێنین.".

هەڵبەتە کاری قورس لە زیندانەکەی ئێمەدا کار نەبوو بەڵکو سوخرەو بێگار بوو، بە پێی یاسا لە چەند سەعاتێکی دیاریکراودا ئەنجام دەدرا، کەس ئەم بێگارەی پێ خۆش نەبوو، بەڵام هیچ چارێکیش نەبوو، ریش بوو بە ریشەوە دەبێ شانەی بۆ هەڵگری، کە زیندانییەکان لە کاری بێگار دەبوونەوە، بۆ زیندانەکە دەگەڕانەوە. ئیدی هەر زیندانییەك کاتی خۆی بە کاری دڵخوازی خۆیەوە دەبردە سەر، کە هەم وەختەکەی لێ بەسەر دەچوو.و هەم سووکە دەسکەوتێکی پەیدا دەکرد. ئەگەر ئەوە نەبووایە هیچ زیندانییەك لە زیندان‌دا هەڵی نەدەکرد. ئاخر چۆن هەڵبکەن، بە تایبەتی کە ئەمانە خوویان بە دڵڕەقی‌و سەرکێشییەوە گرتووە، لە دەرێی زیندان‌دا لە هیچ کارو کردەوەیەك نەپرینگاونەتەوەو ئێستا شەقی زەمانە بێ ئیش‌و بێکار لێرەی کۆ کردوونەتەوە،و کۆمەڵگە تڕۆی کردوون، ئاخر وەك دەڵێن شەیتان کار بۆ تەمەڵ‌و بێکاران دەدۆزێتەوە، ئیدی ئەم زیندانیانە چۆن دەتوانن هەڵبکەن، ئاسایی بژین؟ بە تایبەتی کە زۆربەیان لە هەرەتی لاویدان‌و ژیانیان لێدەچۆڕێ.

تەمەڵی و بێکاری گیانی تاوانکاری ئەوتۆ لە لای زیندانییان دەگەشێنێتەوە کە هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان بیریان لێنەکردبێتەوە.

مرۆڤ بەبێ کار هەڵناکات، بەبێ دەسکەوتی ئاسایی‌و ڕەوا ناژی. ئەگەر هەلومەرجی کاری بۆ فەراهەم نەبێت. گوێ بە هیچ نادات، ئەخلاقی دەگۆڕێ، ڕەفتارو تەبیعەتی دەشێوێ، ڕوو دەکاتە

دزێوترین تاوانان، دەبێ بە دڕندەیەك لەو گۆڕە. وەك دەڵێن شەڕ لە دەست بەتاڵی باشترە... زیندانیان هەر بە تەبیعەتو غەریزە بەمەیان دەزانیو بە حوكمی غەریزەی ماندۆستی، بۆ ئەوەی لە داڕوخانی بەردەوام رزگاربن، هەر كەسەو بە كارێكی دەستیەوە خۆی مژول دەكرد. لە رۆژانی درێژی هاویندا، وەختمان زۆر كەم بوو، بەشی كاری تایبەتی نەدەمایەوە، هەموو رۆژەكەمان بە بێگاری زیندانەوە بەسەر دەبرد، شەویش ئەوەندە كورت بوو، تێر خەو نەدەبووین. بەڵام زستان وا نەبوو. هەركە دنیا تاریك دەبوو، زیندانییەكانیان لە ژوورو قاوشەكان دەپەستاوت. هیچ چارێكیان نەبوو جگە لەوەی شەوانی دوورو درێژو تاقەتبەری زستان بە كارێكەوە ڕابوێرن. بۆیە لە شەوانی زستاندا هەر ژوورو قاوشێكی زیندانەكە، خۆبەخۆو بە شێوەیەكی پەڕجوئاسا دەبوو بە كارگەو وەرشەیەكی گەورە، هەرچەندە ئەمە زۆر قەدەغەو یاساغ بوو! ئەلهەقی كاركردن وەكو كاركردن قەدەغە نەبوو، بەڵكو ئامێرو ئەوزاری كاركردن قەدەغە بوو!... باشە كار بەبێ ئامێر و ئەوزاران دەكرێت!!.. بۆیە زیندانییان بەدزییەوە كاریان دەكرد... پێدەچوو ئیدارەی زیندانەكەش بەمە بزانن، بەڵام بڕێك چاوپۆشیان دەكردو خۆیان لە گێلی دەدا. گەلێك لە زیندانییەكان كە دەهاتنە زیندان دەست سپی بوون ، هیچ كارێكیان نەدەزانی، بەڵام بەرەبەرە لە هاوڕێكانیانەوە فێری كارو پیشە دەبوون، تا بەردەبوون، پیشەوەرو كرێكاری كارامەو لێهاتوویان لێدەردەچوو، قۆندەرەچیو كەوشدرو وبەرگ درو وپەیكەرسازو قفڵسازو نیگاركێشو كەندەكاریان تیا هەڵدەكەوت. تەنانەت جولەكەیەكیان تیا بوو بە ناوی ئەشعیا بومشتاین، ئەمە كاری زەڕنگەریو سوخۆریشی دەكرد. هەموو زیندانییەكان كاریان دەكرد، و دەستكەوتیشیان هەبوو، چونكە داوایەكی زۆر لەلایەن خەڵكی شارەوە، لەسەر شتەكانیان هەبوو. زرەی پارە لە نك یەخسیرو دەستبەسەران، هاوتای ئازادییە. ئەگەر پارەیەك بە خۆی شك بەریو گیرفانی گەرم بێ. تا رادەیەك خەمی دڵی دەڕەوێتەوە، با نەشتوانێ ئەم پارەیە خەرج بكات. (دەبێ ئەوەش بڵێین پیاو ئەگەر بیەوێ دەتوانێ لە هەموو شوێنو كاتێكدا پارە خەرج بكات، بە تایبەتی بە شتی حەرامو قەدەغە، كە مرۆڤ زۆری حەز لێدەكات، بۆ نموونە مەشروبو خواردنەوە لە زیندانیشدا دەست دەكەوت). زیندانییەكان، هەرچەندە سەبیلو پایپیان زۆر قەدەغە بوو، تووتنیان دەكێشا. پارەو تووتن زیندانییەكانی لە شەڕی تاوان دوور دەخستەوە : ئەگەر كار نەبووایە یەكیان دەكوشت، یەكتریان وێران دەكرد. وەكو چۆن جاڵجاڵۆكان بخەیە شووشەیەكەوە، یەكتر دەخۆن، بەو ئاوایە یەكتریان دەخوارد. وێڕای ئەوەش كارو پارە هەردووكیان قەدەغە بوون: زۆر جار ئیدارەی زیندان، شەبەیخونی دەكرد، بە وردی دەكەوتنە تەفتیشو هەر شتێكی قەدەغەیان دۆزیباوە دەستیان بەسەردا دەگرتو دەیانبرد، ئیدی زیندانییەكان چەند پارەو شتە قەدەغەكانیان قایم شاردباوە، هەندێكیان هەر دەدۆزرانەوەو دەستیان بەسەردا دەگیرا. ئەمە یەكێك بوو لەو هۆیانەی كە زیندانییەكانی هاندەدا پارەو شتی قەدەغە لای خۆیان گل نەدەنەوە،و هەرچۆنێك بووە بیدەن بە مەشرووبو بیخۆنەوە. ئەم حاڵەتە ڕەواجی بە قاچاغچیاتی مەشرووب دەدا. جا زیندانیی داماو سەرباری ئەوەی دەست بەسەر پارەو سووكە

دەسکەوتەکانیا دەگیرا، چونکە سەرپێچی لە بڕیارو یاساو ڕێساکانی زیندان کردبوو، زۆر بە توندی شەلاقکاریش دەکرا!...

هەرکە ماوەیەکی کەم بەسەر هەڵمەت و پشکنین و تەفتیشو گەڕانی مامورانی ئیدارەی زیندانەکەدا تێدەپەڕی، زیندانییەکان سەر لە نوێ، هاوشێوەی ئەو ئامێرو ئەوزارانەیان دەکڕییەوە کە دەستیان بەسەردا گیرا بوو... کاروباران ئاوەڕۆی خۆیان وەردەگرتەوە... مامورانیش بەم شتەیان دەزانی، بەڵام تا سەرپێچییەکی دی رووی نەدابا، هەقیان بەسەر هیچەوە نەدەبوو... زیندانییەکانیش ئەگەرچی ژیانیان لە ژیانی ئەو کەسانە دەچوو کە لەسەر گڕکانی فیزوف ئاکنجی بوون، هیچ گلەییو گازاندەیەکیان نەدەکرد.

خۆ ئەگەر یەکێك دەستو پێ سپی بوایەو هیچ کارو پیشەیەکی نەبوایە، هەوڵی دەدا بە هەر شێوەیەك بووە چەند کۆپیکێك پەیدا بکات. سەودای دەکرد، کڕینو فرۆشتنی دەکرد. هەندێکیان شتی کۆنەیان دەکڕیو دەفرۆشتەوە، شتی وایان دەکڕیو دەفرۆشت، جگە لە بابایەکی زیندانی بە بیری کەسدا نەدەهات کڕینو فرۆشتنیان پێوە بکری، یان هیچ نرخو بایەخێکیان هەبێت. پارە وەك دەڵێن لە قوڕگی شێرا بوو، زۆر جار زیندانی لە هەنبەر کارێکی قورسو زۆردا تەنیا چەند کۆپیکێکی کەمی وەردەگرت. بۆیە پارە لە زیندان‌دا بایەخێکی جیاوازتری هەبوو وەك لە دەرێی زیندان. هەندێ لە زیندانییەکان بۆ ماوەی هەفتەیەك پارەیان بە سووت وەردەگرت، سووکە قازانجێکیان لەمە دەست دەکەوت. زیندانییانی دەست بڵاو کە پارەیان پێنەدەما شڕوشیتاڵ و شمەکە کەمەکانی خۆیان دەبرد، دەیانخستنە ڕەهنەوە، لە هەنبەر ئەمەدا پارەیەکی کەمیان وەردەگرتو قازانجێکی زۆریان دەدا. خۆ ئەگەر خاوەنی شمەکەکان لەکاتی خۆیدا پارەکەی بۆ یارۆی سووتخۆر نەبردبایەوە، ئەوا سووتخۆرەکە بۆی هەبوو بێ چەندوچوون شمەکەکانی بخاتە هەڕاجەوەو هەرزانفرۆشیان بکاتو پارەکەی خۆی هەڵگرێتەوە. سووتخۆری لە زیندان‌دا بە ڕادەیەك رەواجی پەیدا کرد بوو و برەوی سەند بوو، کە کەلوپەلو شمەکە دەوڵەتیەکانیش، وەك جلوبەرگو پێڵاوو ئەو شتانەی هەموو کاتێ پێویست بوون، بە ڕەهن دەدران، دەخرانە بارمتەوە. کاتێ کە سووتخۆر ئەم جۆرە رەهنەی قەبوڵ دەکرد، سەوداو مامەڵەکە ئاراستەیەکی تری وەردەگرت .کابرای قەرز وەرگر، پاش ئەوەی پارەکەی وەردەگرت، دەچوو بۆ لای بەرپرسی چاودێری زیندانییەکان، خەبەری نەمانی شمەکە دەوڵەتیەکانی خۆی پێدەدا، ئیدی ئەم ماموره یەکسەر حوکمی لە کابرای سووتخۆر دەکرد کە ئەو شتە دەوڵەتیانە بگێڕێتەوە، هەڵبەتە ئەم حوکمە بێ هیچ گەنگەشەو ناڕەزاییەك ئەنجام دەدرا. خۆش ئەوە بوو رۆژێك لە رۆژان، لەسەر ئەم شتە قەرقەشە نەدەکەوتە نێوان سووتخۆرەکەو خاوەن شمەکەکان. کابرای سووتخۆر کڕوکپ، گرژو مۆن، وەکو ئەوەی لە مێژ بێ چاوەڕوانی ئەمە بووبێ شمەکەکانی دەگێڕایەوە... لە تۆ وایە لە دڵی خۆیدا نەهەقی کابرای قەرزداری نەدەگرتو دەیگوت ئەمیش لە جیاتی ئەو با هەر وایدەکرد... بۆیە ئەگەر شەڕە جنێوو دەمبۆڵەیەکیان بکەوتایە نێوان، زیاتر بۆ خۆ پەڕاندنەوەو پاکانە بوو، نەك زادەی ڕقو بوغزو کینە.

دزی لە نێو زیندانییاندا شتێکی باو بوو، بێ هیچ شەرمو شورەییەك، بە ئاشکرا دزییان لێکدی دەکرد. بۆیە ڕێگەیان دابوو، هەر زیندانییەك باوڵێکی چکۆلەی بە کلیلو قفڵی هەبێت،و شتەکانی خۆی تیا هەڵگرێ. بەڵام بەم حاڵەشەوە دزی هەر دەکرا، جا بزانە چتۆ دزگەلێکمان لە نێودا هەبوون.

لە بیرمە یەکێك لە زیندانییەکان، کە زۆریش دڵسۆزی من بوو (ئەم قسەیەم بە ڕاستیە ها) تەوراتەکەی دزیم، تەورات تاقە کتێب بوو کە زیندانییان بۆیان هەبوو پێیان بێتو بیخوێننەوە. یارۆ هەمان ڕۆژ ئیعترافی بۆ کردم کە ئەو تەوراتەکەی دزیوم، هەڵبەتە هۆی ئەم ئیعترافە پەشیمانی نەبوو، بەڵکو کە بینی بە پەرۆشەوە بۆ کتێبەکە دەگەڕێمو زۆر نیگەرانم بەزەیی پێدا هاتمەوە. هەندێ لە هاوزیندانییەکانمان قاچاغچێتی مەشرووباتیان دەکردو لەو ڕێگەیەوە دەستکەوتی باشیان دەستدەکەوت. کە لە ئێستا بە دواوە باسی دەکەم، چونکە ئەم سەوداو مامەڵەیە مایەی سەرنجەو ئەوە دێنێ هەڵوەستەیەکی لەسەر بکەم. بەشێکی زۆر ئەو زیندانییانەی بۆ ئێرە هێنرا بوون قاچاغچی بوون، لەسەر قاچاغ گیرا بوون، بۆیە هیچ سەیر نەبوو، سەرباری چاودێری توندو پاسەوانی بەردەوام، مەشرووبات بە قاچاغ بهێنرێتە ناو زیندانەکە... هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێم کە قاچاغچێتی تاوانێکە تایبەتمەندی خۆی هەیە... باوەڕدەکەن دەستکەوتو قازانج بەلای قاچاغچییەوە زۆر گرینگ نیەو هەموو کاتێ بە پلەی یەکەم نایەت ؟ ئەمە حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگرە. قاچاغچی بۆ قازانج کاری قاچاغ ناکات، بەڵکو خووی پێوە دەگرێت، لێی دەبێت بە پەیام: یانی قاچاغچی لە بواری خۆیدا شاعیرە. ریسك بە هەموو شتێکی خۆیەوە دەکات، خۆی دەخاتە ئەوپەڕی تالوکەوە، دەکەوێتە داوەوە، پەنا دەباتە بەر فەندەڵ فێڵان،و تەڵەکە بازی،و داهێنانی تیادا دەکات، لە تەنگانە دەرباز دەبێت،و سەریەشەی لە کۆڵ دەبێتەوە... کەچی زوو بە زوو وەك ئەوەی نەبای دیتبێ‌و بە بۆڕان، با دەداتەوە سەر کارەکەی جاران... مەراقو کەڵکەڵەی قاچاغچیاتی هیچی لە مەراقو کەڵکەڵەی قومار کەمتر نیە. زیندانییەکم ناسی، پیاوێکی زەلامی کەتەی بە دارو بار وتۆکمە، لە هەر هەموو ئەو زیندانییانەی کە دەمناسین، نەرمو نیانترو لاشەڕترو ملکەچو گوێڕایەڵتر بوو... پیاو زۆرجار لە خۆی دەپرسی چۆن ئەم مرۆڤە زیندانی کراوە؟ ئەمەو زیندان کوجا مەرحەبا! پیاوێکی ئەوەندە خۆش مەشرەبو ناسك ڕەفتارو خەڵك دۆست بوو، بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە لە زینداندا بردیە سەر لەگەڵ هیچ کەسێکدا بەشەڕ نەهاتبوو. خەڵکی رووسیای ڕۆژاوا بوو، ماڵیان لەسەر سنوور بوو، بە تاوانی قاچاغچێتی گیرابوو و هەواڵەی زندان کرابوو. بۆیە ئاسایی بوو بیر لەوە بکاتەوە بە قاچاغ مەشرووبات بێنێتە ناو زیندانەکە. چەندین جار لەسەر ئەو کارە سزا درابوو. مەگەر خودا بزانێت چەند لە شەلاقو جەڵدە دەترسا! دیارە ئەم ئیشە جگە لە قازانجێکی زۆر کەم هیچی تری بۆ ئەو تیا نەبوو... قازانجی گەورە قۆنتەراتچییەکە دەیبرد، قۆنتەراتچییەکە لەسەر حیسابی ئەو دەوڵەمەند دەبوو... ئیدی ئەم پیاوە هەرکاتێ کە سزا دەدرا وەکو پیرەژنان دەگریا، سوێندی گەورەی دەخوارد کە ئەم ئیشە تەرك دەکات... هەر مانگێك پابەندی سوێندەکەی خۆی دەبوو،و

پاشان بایدەدایەوەو دەگەڕایەوە سەر کارەکەی خۆیو سەر لە نویٚ تیٚ هەڵدەچووەوە... جا بە هۆی ئەو قاچاغچییانەوە، قەت مەشرووبات لە زاندانەکە نەدەبڕا.

هەڵبەتە پێویستە لێرەدا باسی دیاردەیەکی د یکەش بکەم، کە هەرچەندە بۆ زیندانییەکان باش بوو، بەڵام دەردیشی دەرمان نەدەکردن... ئەویش خێرو سەدەقە بوو. گومان لەوەدا نیە کە گەورە دەوڵەمەندانو چینە باڵاکانی کۆمەڵگای رووسی ئاگایان لەوە نیە کە کاسبکارانو چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگەی رووسی چەند بە خەمی لێقەوماوانو بەدبەختانەوەن(٥)*. رۆژ نەبوو خێرو سەدەقە بۆ زیندانەکەمان نەیەت، ئەم خێرو سەدەقانە بە زۆری نانی سپی بوو، و جار جارێکیش پارەو پولی تێدەکەوت. نانەکە بۆ زیندانییان نیعمەت بوو، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی تووشی بەدخۆراکی بوو بوون. ئەم خێرانە بە یەکسانی بەسەر زیندانییەکاندا دابەش دەکرا. خۆ ئەگەر خێرو سەدەقەکە کەم بوایە، نانو کولێرەکان لەت دەکران تا بەشی گشت زیندانییەکان بکات. هەرگیز ئەوەم لەبیر ناچێت کە یەکەم خێرو سەدەقەم پێکرا، سەدەقەکە بریتی بوو لە دراوێکی چکۆلە . تازە گیرا بووم، بەیانییەك، کە بە تەنیا دەگەڵ پاسەوانێکدا لە کار دەگەڕامەوە، تووشی دایكو کچێك بووم... کچەکە لە تەمەنی دەساڵیدا بوو، هێندە جوان بوو دەتگوت فریشتەیە... پێشتر جارێکم دیتبوو. ( ژنەکە بێوەژنی سەربازێکی گەنجی داماو بوو کە لە دادگای سوپاییدا حوکم درا بوو،و لە خەستەخانەی زینداندا، لەو سەردەمەدا کە من لەوێندەر بووم، مرد. ئەم دایكو کچە کە هاتبوون دوا ماڵاوایی لێبکەن، بە کوڵو بەدڵ بە دیارییەوە گریان ). کاتێ کە کیژۆڵەکە منی بینی کوڵمەکانی سوور هەڵگەڕان، شتێکی بە گوێی دایکیدا چپاند، دایکەکە لە جێی خۆی وێستا، چارەکە کۆپیکێکی لە زەمیلەکەی دەرهێنا، دایە دەست کچۆڵەکەوە، کیژێ بەغار بەدووما هاتو گوتی: "وەرە هاپۆ، ئەم کۆپیکە بگرە، لە ڕای مەسیح!" کۆپیکەکەی ئاخنیە دەستمەوە، لێم وەرگرت. ئەوسا بە خۆشی و شادی بەغار بۆ لای دایکی گەڕایەوە. جا لە مێژە ئەو کۆپیکە چکۆلەیەم وەکو بەشێك لە شتەکانم هەڵگرتووەو پاراستوومە....

***پەراوێز:***

***١-ئیکۆنە: پەیکەری یەکێك لە ئەولیاکان بوو کە هەمیشە لە سەمتی رۆژهەڵاتی ژوورەکاندا دادەنرا.***

***٢-شەقامی کەسك: دەستەواژەیەکی باوە مانای شەلاقکاری دەگەیەنیٚ: ئەو کەسەی کە شەلاقو جەڵدەی بۆ دەبڕایەوە، دەبوا بە نێوان دوو ریزە سەربازی شەلاق بە دەستدا بڕواتو هەر سەربازەو قامچییەك بە پشتیا بکێشێت.***

***٣-مێجەرەکە ناوی کریفتسوك بوو. بەڵام سەرۆکی زیندان جەنەرال فون گراف بوو.***

٤-ئەو کوڕەی کە بابی خۆی کوشتبوو،و دۆستویفسکی زۆری پێ سەیر بوو،و لەبەری گران بوو، بکوژە راستەقینەکە نەبوو، بکوژەکە برا بچووکەکەی بوو. ئەم تاوانە دوای بیست ساڵ کەشف بوو. دۆستویفسکی لە سەرەتای فەسڵی حەوتەمی بەشی دووەمی ( یادگارییەکانی خانەی مردووواندا) دێتەوە سەری و باسی دەکات.

٥-خەڵکی رووسیا بە زیندانییانی کارێن قورسیان دەگوت لێقەوماوان یان قەرەبەختان.

((٢))

## هەستە سەرەتاییەکان

٣-١

رۆژانی یەکەمو سەرەتاکانی هەوەڵی زیندانیەکەمم زۆر باش لەبیرە، زۆر بە روونی لە خەیاڵدانمدا خۆ دەنوێنن. بەڵام ساڵەکانی دواتر، تێکەڵ بوونو تەنیا شوێنەوارێکی گۆنگو کاڵو کەمڕەنگیان لە یادگەمدا بەجێهێشتووە. تەنانەت هەندێ قۆناغی ئەم ژیانە بە تەواوەتی لە بیرو لە خەیاڵمدا سڕاوەتەوەو تەنیا ئەوەندەم لە یادا ماوەتەوە کە بە راستی ساڵانێکی سەختو دژوار یەکهاوی وتاقەتبەر بوون.

بەڵام رووداوەکانی سەرەتای ئەسارەتەکەمم بە روونی لەبەرچاوە: دەڵێی دوێنێ روویانداوە. هەڵبەتە دەبوایە وابێ.

زۆر چاکم لە بیرە، ئەوەی لە سەرەتاوە سەرنجی راکێشامو مایەی سەرسامیم بوو، ئەوە بوو کە ئەم ژیانە هیچ شتێکی نا ئاساییو سەرنج ڕاکێشی تیا نەبوو، یانی شتێکی چاوەڕوان نەکراوی تیا نەبوو، جیاوازییەکی ئەوتۆی دەگەڵ ژیانی پێشوومدا نەبوو. تاوەکو ساڵانێکی زۆرم لە زیندان بەسەر نەبرد، پەیم بە دیاردە نا ئاساییو چاوەڕوان نەکراوەکانی ئەو جۆرە ژیانە نەبرد، هەنگێ زۆر حەپەسام، سەرم سوڕما، ئیدی تا بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە زینداندا مامەوە، ئەم حەپەسانو سەرسامییە بەری نەدام، بە هیچ جۆرێ نەمتوانی خوو بەم ژیانەوە بگرمو دەگەڵی ڕابێم.

لە سەرەتاوە هەستم بە نەفرەتو بێزارییەکی لە ڕادەبەدەر دەکرد، بەڵام کە گەییمە ناو زیندان، سەیر ئەوە بوو، وام هاتە بەرچاو و خەیاڵ کە ژیانی ناو زیندان لەوە ئاسانترو رەحەتترە کە لە رێگادا وێناو تەسەورم دەکرد.

ئەوە زیندانییەکانن، وێڕای ئەوەی دەستو پێ بە کۆتو زنجیرن، بە کەیفی خۆ، بە ئازادی بەنێو زیندانەکەدا دەگەڕێن، دێنو دەچن. شەڕە جنێو دەکەن، گۆرانی دەڵێن، کاردەکەن. دووکەڵ بە بادا دەدەن، مەینۆشی دەکەن ( ژمارەی مەینۆشان کەم بوو )، شەوانە کۆڕی وەرەقبازی ساز دەکەن. کارەکانیشم زۆر بەلاوە قورس نەبوو. وام هاتە بەر مەزەندەو خەیاڵ کە سەرچاوەی ماندوویەتیو ناڕەحەتی زیندانییەکان خودی کارە قورسەکە نیە. بە ماوەیەکی زۆر دوای ئەوە ئەوجا پەیم بەوە برد بۆچی ئەم کارە لە شانی زیندانییەکان ناخۆشو سەختو ناڕەحەتە. لەبەر قورسیو دژواری خودی کارەکە نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە بە زۆرەکی، بە خورتی، بەتۆپزی بوو، بە زەبری کوتەك بوو. بێگومان جووتیار لە زیندانییەکی بێگارچی پتر دەڕەتێ، رەنج دەداتو، کار دەکات، لە هاویندا شەوو رۆژ کاردەکات. بەڵام لە پێناوی بەرژەوەندیو قازانجی خۆیدا رەنج دەداتو کاردەکات، ئامانجەکەی ماقووڵ و پەسندە، مەرامی ئاشکرایە، بۆیە لە شانی ناخۆش نییە. بەڵام زیندانییەکی بێگارچی، کارێکی بەسەردا دەسەپێنرێ، کەمترین قازانجی خۆی تیا نیە، رەنجی بێوەرە. بۆیە هەندێجار بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر بویسترێ

مرۆڤێك له مرۆڤایەتی بخرێ، له ناو ببرێ، توندترین‌و ترسناكترین سزا بدرێ‌و بەجۆرێ بچەوسێنرێتەوەو ژێر پێیان بنرێ، سزایەكی ئەوتۆی بۆ ببڕدرێتەوە كه دڵڕەقترین جەلادو خوێنڕێژ لەبەری بلەرزێ، ئەوەندە بەسە كه بە تۆبزی كارێكی بێ ماناو بێهودەو بێسوودی بەسەردا بسەپێنرێ. هەرچەندە ئەو كارانەی دەدرێ بەسەر زیندانییەكاندا هیچ سوودێكی بۆ زیندانییەكان نیە، هیچ قازانجێكیان لێی دەست ناكەوێ، بەڵام خودی كارەكە بێهودەو پووچ نیە: زیندانی خشت دەبڕێ، زەوی دەكێڵێ، له مەزراو كێڵگەدا كاردەكات، قوڕكاری دەكات، خانوو چێدەكات، هەر هەموو ئەوانە كاری پەسندو ماقووڵن، هەوڵدەدا بە جوانی بیكات، له هاوڕێكانی خێراترو باشتر ئەنجامی بدات. بەڵام ئەگەر ناچارت كرد بۆ نموونە ئاو له دەفرێكەوە بكاتە دەفرێكی ترەوەو پاشان هەمان ئاو له دەفری دووەمەوە بگوازێتەوە بۆ دەفری یەكەم، یان ناچارت كرد ئاو له دنگا بكوتێ، لم له دەسكاوەندا بكوتێ، یان كۆمەڵێك گڵ‌و خۆڵ له شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر بگوازێتەوەو هەركە تەواو بوو دیسان بۆ شوێنی یەكەمی بگوازێتەوە، من دڵنیام هەنگێ كابرای زیندانی پاش چەند رۆژێك خۆی دەكوژێت، یان هەزارو یەك تاوانی ئەوتۆ دەكات كه ببێتە مایەی ئیعدامكردنی تا لەم نەنگی و شەرمەزاری‌و زەبوونی‌و عەزابە رزگار ببێت. ئەم جۆرە سزایە زیاتر له ئەشكەنجەو تۆڵەی ترسناكەوە نزیكە تا له تەمێ كردن‌و تەمێكاری. دیارە سزایەكی گەوجانەیەو هیچ ئامانج‌و ئاكامێكی پەسندی لێناكەوێتەوە.

به هەرحاڵ، من له وەرزی زستاندا، له هەیڤی كانوونی یەكەمدا (دیسامبەر) گەییمە زیندان، ئەو كاتانە له زیندانەكەماندا كار زۆر نەبوو. بۆیە هیچ وێناو بیرۆكەیەكم دەربارەی كاری هاوینان، كه پێنج هێندەی كار زستانان قورس بوو، له خەیاڵ‌و هزردا نەبوو. له زستاندا، زیندانییەكان دەبران بۆ روباری (ئێرتیش)و لەوێندەر كۆنە بەلەمانی دەوڵەتیان پێدەشكاندن. یان له كارگەو كارخانانی جۆراوجۆرا كاریان پێدەكرا، بەفری كەڵەكەبووی سەربانانیان پێ دەماڵدرا، یان كوورەی گەجیان دەسووتان... هتد. بەڵام چونكە رۆژگاری زستان كورتە، زوو له كاری رۆژانە دەبوونەوە،و بۆ زیندانەكەی خۆیان دەگەڕانەوە، بێ ئیش‌و بێ كار كاتیان بەسەر دەبرد، مەگەر كاری شەخسی خۆیان كردبا.

تەنیا سێیەكی زیندانییەكان بەجدی له خەمی كاردا بوون‌و حەزیان دەكرد كارێكی تایبەتی بۆ خۆ پەیدا بكەن‌و، سنعەتێك فێر بێن. ئیدی هەموو ئەوانی دی تەمەڵ‌و تەوەزەل، بێ ئیش‌و بێ كار، بێ هیچ ئامانجێك بەم ژوورو بەو ژووردا دەگەڕان، زمانیان له یەك دەدا، چاڵیان بۆ یەكتر هەڵدەكەندو جنێوو سخێفیان بە یەكدی دەدا. ئەوانەی پارەیەكیان هەبوایە دەكەوتنە تاقیبی مەینۆشی‌و خۆیان مەست دەكرد، یان له قوماردا دایان دەنا... هەر هەموو ئەمەیان له بێ ئیشی‌و دەستبەتاڵی‌و بێتاقەتی‌و بێزاریدا دەكرد... بەتێپەڕبوونی رۆژگار، پەیم بە جۆرە عەزاب‌و ئەشكەنجەیەك برد، كه یەجگار له عەزابی نەبوونی ئازادی، له عەزابی سوخرەو بێگاری بەسوێترو بە ئازارتر بوو، ئەویش سوكنەی هاوبەشی زۆرەكی بوو. زیندانی نەیدەتوانی بۆ ساتێكیش بە تەنیا بێ. هەرچەندە سوكنەی هاوبەش‌و هەڤژینی زۆرەكی، له زۆربەی شوێنان بەسەر خەڵكی دا دەسەپێنرێ، بەڵام ئەم هەڤژینییە زۆرەكیە، له هیچ شوێنێك وەكو زیندان دژوارو ناڕەحەت نیە:

چونکه خەڵکانێك هەن کەس لەگەڵیاندا هەڵناکات. من دڵنیام هەموو زیندانییەك، هەستی پێکردبێ یان نا، ئەم تاڵاوەی چەشتووە.

خواردن و خۆراکی زیندانییەکانم بەلاوە خەراپ نەبوو. زیندانییەکان بە خۆیان دەیانگوت خواردن و خۆراکی وان، لە هی هەموو زیندان و گرتووخانەکانی رووسیای ئەورووپی باشترە. بەڵام من، چونکە لەم زیندانە زیاترم نەدیووە، ناتوانم لە مبارەیەوە هیچ داوەرییەك بکەم. زیندانییەکان بۆمان هەبوو، بۆ خۆمان و بە خەرجی خۆمان خواردن بۆ خۆ دروست بکەین. ڕاستە گۆشت زۆر هەرزان بوو لە زستاندا ڕەتڵی لە دوو کۆپیکان و لە هاویندا لە سێ کۆپیك تێنەدەپەڕی، ئەوجاش تەنیا زیندانییانی پارەدار دەیانتوانی لەسەر حیسابی خۆ خواردن دروست بکەن. بۆیە زۆربەی هەرە زۆری زیندانییان خواردنی زیندانیان دەخوارد.

مەبەستیان لە ستایشی خۆراکی زیندان، تەنیا نانەکەی بوو کە بە کێشانە بەسەر ژوورەکاندا دابەش دەکرا نەك بەسەر نەفەرەکاندا، خۆ ئەگەر بەسەر نەفەراندا دابەش کرابا، زیندانییەکان حاڵیان شڕ دەبوو، بەلای کەمەوە، لەم حاڵەتەدا، سێ یەکیان هەمیشە برسی دەبوون، بەڵام هەر هەموویان لەم سیستەمە دابەشکردنە باوە رازی بوون. نانەکەمان زۆر بەتام و لەزەت بوو، لە سەرانسەری شاردا دەنگی دابووەوە: باشی نانەکەیان بۆ ئەوە دەگێڕایەوە کە گوایە نانەواخانەکانی زیندان زۆر بە چاکی دروست کرا بوون. بەڵام شۆرباکەمان تا حەزکەی دیمەنێکی ناشیرینی هەبوو، کەلەرمێکیان دەخستە مەنجەڵێ ئاوی گەورەوە،و لالوێچێ ساواریان لە چاوی دەکرد تا کەمێك خەست ببێتەوە، ئاوێکی بێ تام و خوێ بوو، بە ئاستەم رۆنیان تێدەکرد. هەوەڵجار زۆرم قێز لەو پێشکەو مێروانە دەکردەوە کە بە زۆری بەسەر شۆرباکەوە بوون. کەچی هاو زیندانییەکانم هەر گوێشیان لێ نەبوو، پێیان وابوو تام و لەزەتی شۆرباکە بەو پێشکەو سیسارکە رەشانەوەیە!

سێ رۆژی یەکەم دەگەڵ ئەوانی دیدا بۆ کاریان نەبردم، چونکە رەسمی زیندان وابوو، کە مدارای هەر تازە زیندانیەك بکرێ،و پشوویەکی کورتی سێ رۆژەی بدەنێ تا ماندوویەتی سەفەری رێگای لە گیان دەرچێت و کەمێك بحەسێتەوە. رۆژی دووەم چووم بۆ دوکانی ئاسنگەری تا کۆت و زنجیرەکانی دەست و پێم بگۆڕم، چونکە لە مۆدێلی باوی زیندانەکە جیاواز بوو، بە ئەڵقە ئەڵقە دروستکرابوو، بە زرینگە زرینگ، زیندانییەکان گوتەنی لە زەنگوڵە دەچوو. ئەم زنجیرانە لەسەر جلەوە لە دەست و پێ دەکران، بە پێچەوانەی زنجیری هاوبەندییەکانمەوە کە بە ئەڵقە دروست نەکرا بوون، بەڵکو چوار شیش بوون، هەر یەکەیان بە ئەندازەی قامکێك ئەستوور بوو، سێ ئەڵقەی پێوە بوو، لە ژێر جلەوە دەبەستراو، ئەڵقەیەکیان بە پشتێنێکی چەرمەوە بەسترا بوو، کە لەسەر کراسەوە وەکو پشتێن و لە جیاتی پشتێن دەبەسترا.

تاکو ئێستاش هەموو رووداوەکانی یەکەم بەیانی زیندانی خۆمم بە روونی لە یادو لەبەر چاوە. شەیپۆری بێدار باش، لەلای پاسگەی پاسگری نزیکی دەروازە گەورەکەی حەساری زیندانەکەوە لێدرا، دوای دە دەقیقەیەك ماموری ئیداری دەرگای زیندانەکەی کردەوە. زیندانییەکان یەك لە دوای یەك کەوتنە هەستان. لەبەر رووناکی ئەو مۆمەی کزکز لە ژوورەکەی ئێمەدا دەسووتا،

زیندانییەکان دەبینران کە چۆن لەسەر تەختە خەوەکانیان کە لە لەوح دروست کرابوون، هەڵدەستانو بە دەم سەرماوە هەڵدەلەرزین، بەدەم باوێشکەوە کێشمانی خۆیان دەدا.
زۆربەیان گرژو مۆن، تاقەتی قسەشیان نەبوو. هەندێکیان نیشانەی خاچیان دەکێشاو هەندێکیان تووكو نەفرەتو نەفرینیان دەکرد. هەڵمو هەوای ژوورەکە بۆ گنخاو (بۆ سارد) بوو. کە دەرگا دەکرایەوەو هەوای ساردی دەرەوە هێرشی دێنایە ژووریٚو وەکو گەردەلوول بە زیندانەکەدا لوولی دەخواردو دەسوڕایەوە، پیاو هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد. زیندانییەکان بە پاڵەپەستۆ خۆیان دەگەیاندە مەنجەڵە ئاوەکان،و هەرکەسەو لە نۆرەی خۆیدا کوپێك ئاوی دەردێناو قومیٚ دووانی لێدەخواردەوەو بەوەکەی تری دەستو چاوی پشیلەشۆر دەکرد. ئەم ئاوە لەلایەن سەقاوە ئامادە دەکرا، لە دوێنیٚ ئێوارەوە ئامادە دەکرا. سەقا، یەکێك بوو لە زیندانییەکان، ئیشی ئەوە بوو ژوورو قاوشەکان پاك بکاتەوە،و لەلایەن زیندانییەکان خۆیانەوە هەڵدەبژێردرا، سەقا نەدەچوو بۆ بێگار، چونکە ئیشی ئەوە بوو نوێنو یاتاخەکان ڕێك بخات، عاردەکە خاوێن بکاتەوەو گسك بدات، شەویٚ مەنجەڵی ئاوەکە بێنێتە ژووریٚو بەیانی بیباتە دەرەوە،و تەشتو کوپەی زیندانەکە لە ئاوی سارد پڕبکات تا بەیانیان بۆ شستوشۆ بەکارببریٚو بە ڕۆژ بۆ خواردنەوە.
یەکەم بەیانیم بوو لە زیندانا، کە دوو کەس لەسەر کوپێکی ئاو، لێیان بوو بە دەمەقالیٚ. یەکێکیان کە زیندانییەکی درێژ داهۆڵی، باریكوبنێسی، ڕەشتاڵە بوو،و کەللەی سەری یەکپارچە گریٚو گۆڵی سەیر بوو، بە دەست کەوتە دەڵەکدانی زیندانییەکی دیکەی خڕەڵەی، کوڵەباڵای، چوار شانەی، چڕو چاو سوور و بۆڵاندی:
– بۆ کویٚ؟ ریزەکە تێك مەدە، لە جێی خۆت بوەستە.
دووەم وەڵامی دایەوە:
– هێواش بابە، تۆزیٚ سەبرت بیٚ!
– بۆ هاوارم بەسەرا دەکەی؟ ئاگات لە دەمت بیٚ؟ برۆ بە ڕێی خۆتەوە! سەیری ئەمە ناکەن دەڵێی پەیکەرەو ڕەق ڕاوەستاوە! نا... نا... یەك زەڕە (فارتیکولیتانبوست)*(١)ی نیە...
وشەی (فارتیکولیتانبوست) کاری خۆی کرد... زیندانییەکان لە قاقای پێکەنینیان دا... زیندانییە کورتە باڵاکە، کەوا دیار بوو لە زیندانەکەدا ڕۆڵی بابایەکی لیبۆكو قۆشمە دەبینیٚ، بەمە زۆر خۆشحالٚ بوو. زیندانییە درێژ داهۆڵەکە، خێسەیەکی لێکردو بۆڵاندی:
– دەڵێی بەرازی دابەستەی، وا دیارە نانی زیندانت پێکەوتووە. ئەم بایە لەم کونەوە بێت تا سەری ساڵی ئایندە، تا کریسمیسی ئایندە، دوازدە بێچوومان بۆ دێنی!...
– ئەدی تۆ خۆت بەچی دەزانی؟ تەیرێکی زۆر جوانی؟....
– بە کەیفی تۆ!...
– کەواتە پێمان بڵیٚ، خۆت بە چ تەیرێك دەزانی؟
– ئەوەم کە دەی بینی...
– چۆن دەی بینم ؟

– پێم گوتیت: تەیر....

– بەڵام چ تەیرێك ؟

هەردووکیان کەوتنە خێسە لە یەکتری، خەریك بوو بە چاو یەکتریان دەخوارد. کوڵەباڵاکە چاوەڕوانی وەڵام بوو، کۆڵەمستی گوشی، لە تۆ وایە خۆی بۆ هێرش‌و پەلامار ئامادە دەکات. پێموابوو شەڕەکە مسۆگەرەو هەر ئێستا دەچن بەگژ یەکترا. هەموو ئەم شتانەم بەلاوە تازە بوو. بۆیە بە واقی وڕەوە تەمەشام دەکرد. بەڵام زوو بەزوو بۆم دەرکەوت کە ئەم قەرقەشەو دەم بۆڵانە، هیچ نیە،و گاڵتەجاڕییەکە، زیاتر بۆ خۆشی‌و پێکەنینی زیندانییەکانەو بە دەگمەن دەگاتە شەڕە دەست‌و، بە سەلامەتی دەبڕێتەوە. ئەم دیاردەیە نموونەیەکە لە دابە باوەکانی ناو زیندان.

کابرای درێژداهۆڵ، مەندو مەنگ، هێدی‌و هێمن لە جێی خۆی وەستا بوو،و تەمەشای ئێمەی دەکرد. دەیزانی هەموو چاومان بڕیوەتە ئەو و چاوەڕوانی وەڵامی ئەوین. چاك دەیزانی ئەگەر بەرگری لە قسەکەی خۆی نەکات‌و، نەی سەلمێنێ کە تەیرێکی گرینگە، کە کەسایەتیەکی... ئەوا دەبێت بە گاڵتەچی‌و گەپچاڕی خەڵکەکەو بە ئارەزووی خۆیان پێی پێدەکەنن. بۆیە نیگای پڕ لە تەوس‌و توانجی بڕییە خەنیمەکەی، بە جۆرێ لێی دەڕوانی لە تۆ وایە سیسرکێکی خستووەتە ژێر میکرۆسکۆب‌و تەمەشای دەکات. ئەوجا بە دەنگێکی نەرم‌و هێواش گوتی:

– من (کاجان)*(٢)م.

دەیویست بڵێ من تەیرێکم لە جۆرو تیرەی (کاجان). هەرکە ئەو وشەیەی لە زار هاتەدەر، ئامادە بووان لە قاقای پێکەنینان دا،و کەوتنە چەپڵە لێدان بۆ ئەو وەڵامە پڕ بە پێستە.

کابرای کورتە باڵای قەڵەو، کە بۆڕی خواردبوو،و ئەم بەزین‌و شکستەی زۆر لە دڵگران بوو، بەوپەڕی توڕەیی گوتی:

– تۆ تەیری کاجان نیت... بەڵکو حەیوانێکی هیچ‌و پووچی... و خۆی سازدا پەلاماری بدات، کە ئامادە بووان کەوتنە بەینەوەو بۆ ئەوەی مشت‌و مڕەکە گەورە نەبێتەوە جووتە رەقیبیان لێکدی جیا کردەوە.

یەکێك لە تەمەشاڤانان، لە دوورەوە لە جێی خۆیەوە هاواری کرد:

– ئەم دەمەقڕەیەتان لە چییە، بۆچی بە مست بەر نابنە یەکدی؟

وەڵام درایەوە:

– ناوبژیيان بکەن... دەنا یەکتر دەکوژن... ئێمە پیاوانی ئازاین... سەربێتە سەر راستی هەر یەکێکمان بە حەوت کەس دەوەستین... باکمان بە شەڕ نییە...

– بەڕاستی ئازان!... ئازایەتی هەر لە خۆیان دێت... یەکێکیان لەسەر نان دزین هێنراوە بۆ ئێرە... ئەویتریان لەسەر دزینی قاپە ماستی پیرەژنێك، کابرای جەلاد گرتیە ژێر قامچی و شل کوتی عەمری کرد...

کۆنە سەربازێکی نوقستانی جەنگ، کە پێدەچوو بۆ چاودێری‌و پاراستنی ئارامی زیندانەکە، لێرەدا دانرا بێ،و لە سوچێکی زیندانەکەدا، جێگەی خەوی تایبەتیان پێ دابوو، هاواریکرد:

– هێی... بەسە... بیبڕنەوە...

– ئاو کوڕینە! ئاو بۆ نیفالید پترۆفیچی براتان!... ئاو بۆ نیفالید*(٣) پترۆفیچی برامان بێنن... وا لە خەو هەستا!

کابرای نوقستانی جەنگ، بەدەم لەبەر کردنی پاڵتۆکەیەوە پرتاندنی: – برای تۆ؟ من برای تۆم؟ ئاخر منێك رۆژێ لە رۆژان بایی قروشێك مەشرووبم لەگەڵا نەخواردبێتەوە، بە عەمرانم نان‌و پیازێکم لەگەڵ نەخواردبێت، لە کوێ برای تۆم!!...

زیندانییەکان سەرژمێرکران... رۆژهەڵات... زیندانییەکان بە پاڵەپەستۆو بە قەرەباڵغی خۆیان بە مووبەقەکەدا کرد... ئێلەکەکانیان لەبەر کرد بوو، بەکڵاوە دوو رەنگەکانیانەوە وەستا بوون‌و بەشە نانی خۆیان لە یەکێك لە ئاشپەزەکان وەردەگرت. ئەم ئاشپەزانە لەلایەن زیندانییەکانەوە هەڵدەبژێردران، لە هەر مووبەقێکدا دوو ئاشپەز هەبوو... تەنیا ئەوان بۆیان هەبوو کێردو چەقۆ بەکار بێنن، هەم بۆ نان برین‌و هەم بۆ گۆشت جنین بەکاریان دێنا.

زیندانییەکان، بەناو مووبەقەکەدا بڵاو بوو بوونەوەو لە دەوری مێزەکان دانیشتبوون، هەموو کڵاو لەسەر، ئێلەك لەبەر، قایش لە پشت، حازرو ئامادە بوون بۆ چوونە سەر کار. هەندێکیان شۆربای (کفاس)یان لەبەردەما بوو، پارووە نانەکەیان پێدا دەکردو ئەوجا دەیانخوارد.

هەراو هەنگامەو ژاوە ژاوی ناو موبەقەکە لە کێشا نەبوو. وێڕای ئەوەش چەند زیندانییەك لە گۆشەیەکدا هێدی و هێمن بۆ خۆ قسەیان دەکرد.

زیندانییەکی گەنج کە لە تەنیشت پیرەمێرێکی بێ ددانی گرژو مۆنەوە دانیشتبوو گوتی:

– بابا ئانتونیچ بەیانیت باش، نان‌و نمەکت باش‌و نۆشی گیان.

پیرەمێرەکە، بێ ئەوەی چاوانی هەڵبڕێ، لە کاتێکا خەریك بوو بە پووکە بێ ددانەکانی نانەکەی دەجوو، گوتی:

– ئەگەر بەڕاستتەو رانابوێری، بەیانی تۆش باش!.

– ئانتونیچ وامدەزانی مردوویت! چەند کەرم!... بەڕاستی وام تەسەور دەکرد کە مردوویت!...

– تۆ جارێ بمرە، پاشان منیش بە دووتا دێم.

لە نزیکی ئەو دووانەوە دانیشتم. دوو زیندانی دیکەش لە دەستەڕاستی مندا بوون،و بەوپەڕی سەلاری‌و سەنگینی،و زۆر بە جددی قسانیان دەکرد. یەکێکیان گوتی:

– من لەوە ناترسم کەسێك دزیم لێبکات، بەڵکو لەوە دەترسم تەماح بمگرێت‌و بەخۆم دزی لە خەڵکی بکەم... کەس ناتوانێ دزی لە من بکات... ئەوەی بە تەمای دزی بێ لە من خەیاڵی خاوە...ئەوەی دزی لە من دەکات، هێشتا لە دایك نەبووە..

– تۆ خۆت بەچی دەزانی، چیت لە دەست دێ؟ تۆش وەکو ئەوانی دیکە زیندانییەکی ئاساییت‌و تەواو... لەوانی دی زیاتری؟... ئەگەر بەر دەستی ئەو دێڵە دڕە، ئەو لەگامە، ئەو حەشەرییە دەکەوی... بزانە چۆن دزیت لێدەکات‌و نایەڵێ هەر بە خۆتیش بزانی... پارەکەت لێدەسەنێ‌و هەر پێشت نالێ سوپاس. ئەمەی دەگەڵ خۆمدا کردووە. دەزانی چەند رۆژێك لەمەپێش هات بۆ ئێرە؟ گوتی: لە کوێ پەنایەك بدۆزینەوەو لە چاوی خەڵکی بەدوور بین؟ گوتم با بچین بۆ لای تیودوری جەلاد. کە خانوویەکی لە دەرێی شاردا هەبوو... ئەم خانووەی لە کابرایەکی چەپەڵی

جولەکە بە نێوی سالومونە گول کڕی بوو... دەیناسیت؟ ئەو جولەکەیەی کە لەم نزیکانەدا خۆی کوشت.

– بەڵێ دەیناسم... سێ ساڵێك لەمەپێش لێرە کۆنیاکی دەفرۆشت،و ناویان نابوو گریشکا... واتە مەیفرۆشە کوێر... ئا دەیناسم، باشی دەناسم...

– نا، تۆ هەڵەیت، نایناسیت... ئەوەی من دەیڵێم گریشکایەکی ترە...

– چۆن؟ گریشکایەکی تر؟ تۆ هەڵەیت نەك من. تۆ خۆشت نازانی چ دەڵێی... دەتوانم لە جیاتی شایەدێ چەندین شایەد بێنم کە تۆ هەڵەیت، بەخۆشت نازانی چ دەڵێی!...

– تۆ شایەد بۆ من دێنی؟ تۆ شایەد لە من دەگریت؟ ئاخر تۆ کێی؟ تا شایەد لە من بگریت؟ دەزانی لەگەڵ کێدا قسە دەکەی؟

– من کێم؟ من ئەوەم کە چەندین جار بەر لیسم داویت و هەر باسیشم نەکردووە. هێشتا تۆ خۆت گێڤ دەکەیەوەو بە من دەڵێی تۆ کێی؟

– تۆ منت بەر لیسان داوە؟ ئەوەی لە من دەدات هێشتا لە دایك نەبووە... ئەوەی لە من دەدات لە گۆڕدایە...

– تۆ کابرایەکی تووشی تاعوون بوویت !

– بریا گولی سیبیریا دەکەوتە گیانت!.

– بریا کەللەت بەر شمشێری ترك دەکەوت !...

ئەوسا ڕێژنەی سخێف و جنێوان وەکو بارانی بە خوڕزم دایکرد... زیندانییەکانی دی هاواریان کرد:

– تەمەشاکەن... دیشان هەرایانە، پیاو کە قەدری ژیانی نەزانی، ڕێگەی دروستی نەگرتە بەر دەبێ سەری خۆی کزبکات، وا دیارە ئەم دوو کوڕە ئازایە ئێرەیان زۆر پێ خۆشە، ئەی چۆن نانی حکومەت زۆر خۆشە!...

بە پەلە کەوتنە ناوبژیان، لێکیان دوورخستنەوە، شەڕە دەم ئاساییە، بگرە جۆرە سەرگەرمییەکیشە بۆ تەمەشاڤانان، بەڵام شەڕە مست و کۆتەککاری قەدەغەیە!... بە دەگمەن ڕوو دەدات!... چونکە مێجەر یان زیندانییەکان گوتەنی فەرمانداری زیندان پێی دەزانی و تەحقیقی وردی دەربارە دەکردو بە خراپی بەسەر زیندانییەکاندا دەشکایەوە. بۆیە زوو بە زوو هەر شەڕێکی جددی دەکوژێننەوە. زۆرجار شەڕکەران، هەر بە مەبەستی سەرگەرمی و تاقیکردنەوەو نواندنی بەلاغەت و فەساحەتی جنێوفرۆشی خۆیان، شەڕ دەنەنەوە، لە هەوەڵەوە زۆر بە گەرمی بەگژ یەکدا دەچن، بە جۆرێ بە ڕق و غەزەبەوە، لێکدی دادەڕسن، لە تۆ وایە لە هەر ئان و ساتێکدا یەکدی دەکوژن. کەچی پاش ئەوەی داخی دڵی خۆیان بە جنێوان هەڵدەڕێژن، پاشەکشە دەکەن و هەرکەسەو بە ڕێی خۆیدا دەڕوات. من ئەمەم زۆر بەلاوە سەیر بوو... ئەوەی لێرەدا گێڕامەوە مشتێك بوو لە خەرواری ئەو شەڕە دەمانەی کە ڕۆژانە لە زیندانەکەدا ڕوویان دەدا. پێشتر هەرگیز تەسەورم نەدەکرد دوو کەس هەر بۆ کەیف، بۆ خۆشی بکەونە شەڕە جنێو، لەزەت لە شەڕە جنێو بدینن! هەڵبەتە لێرەدا نابێ ئەنگێزەی خۆنوێنی و شۆرەتدۆستی مرۆڤ لەبیر

بکەین؟ ئەوە شەڕکەرەی زانیبای چۆن هونەرمەندانە، وەستایانە جنێوی مزر دەدات، لەلایەن زیندانییەکانەوە ستایش دەکرا... چەپڵەی بۆ لێدەدرا وەکو چۆن خەڵکی چەپڵە بۆ ئەکتەرێکی سەرکەوتوو لێدەدەن.

هەر لە یەکەم ڕۆژی زیندانمەوە، هەستم بەوە کرد کە هەندێ لە زیندانییەکان، بە ڕقەوە تەمەشام دەکەن، و هەندێکی تریان بە پێچەوانەوە بە دەوروخولما دەهاتن، بە تایبەتی ئەوانەی پێیان وابوو، پارەیەکم پێیە. بە دەورما دەهاتن، خۆیان لا شیرین دەکردم. فێریان دەکردم چۆن زنجیرەکانم ببەستم تا ئەزیەتم نەدات، باوڵێکی بە قفڵو کلیلیان بۆ پەیدا کردم تا دەرپێ و بیجامەکانی خۆم و ئەو کەلوپەلانەی تیا هەڵگرم کە ئیدارەی زیندان پێیان دابووم ( هەڵبەتە پارەی باوڵەکەم پێیان دا). هەڵبەتە بەداخەوەم دەبێ ئەوە بڵێم، بۆ ڕۆژی دوایی، دۆستە تازەکانم، هاوزیندانییەکانم، باوڵەکەیان لێدزیمو فرۆشتیانەوەو بە پارەکەی ئارەقیان خواردەوە! .

دوای ئەوە یەکێکیان زۆر ڕمووزەی من بوو، وێڕای ئەمەش هەر دەرفەتی بۆ رەخسابا، بێ هیچ شەرمو شورەییەك، شتێکی لێدەدزیم، بە جۆرێ شتەکەی دەدزی وەکو ئەوەی فەرز بێ لەسەری، وەکو ئەوەی موڵکی خۆی بێت: بۆیە نەمدەتوانی هیچ ڕقێکی لێهەڵگرم.

هەر لە زیندانییەکان خۆیانم بیست کە پیاو دەتوانێ خۆی چای بۆ خۆی دروست بکات، هەستم کرد وا چاکە قۆریەك پەیدا بکەمو خۆم چای بۆ خۆم دروست بکەم. قۆرییەکیان بەکرێ بۆ پەیدا کردم. ئاشپەزێکیانیش پێناساندم کە ئامادە بوو مانگانە بە سی کۆپیکان، ئەگەر ئازووقەو کەرەستەی خواردنی تایبەتی بکڕم، خواردنی دڵخوازی خۆمم بۆ ئامادە بکات... هەڵبەتە یەکسەر کۆمەڵێك قەرزیان لێ سەندم... جا نەك هەر ئەو ڕۆژە، بەڵکو لە یەکەم ڕۆژەوە سێ دانە جار هاتنەلامو و داوای قەرزیان لێکردم.

هەڵبەتە زیندانییانی خانەدانو ئەسڵزادە، دەبنە مایەی نەفرەتو رقی هاوزیندانییەکانی خۆیان. بە چاوی دۆستایەتی سەیر ناکرێن. هەرچەندە لە هەموو پلەو پایەو مافێکی خانەدانی کەوتبوونو بەڵام زیندانییەکان بە دۆستو هاوڕێیان نەدەزانین. ڕاستە هەمیشە وەکو خانەدان تەمەشایان دەکردین، بەڵام زۆرجاریش گاڵتەیان پێدەکردینو پێیان ڕادەبواردین، لێکەوتنی ئێمەیان لە گیان خۆش بوو. بۆ نموونە دەیانگوت:

– تۆ تەمەشا! تەمەشای ئەم نەجیمزادەیە! کە جاران بە گالیسکە بە ناو مۆسکۆدا دەڕۆیی، ڕێبواری دەکردە ژێرەوە! شای بە سەپان نەدەگرت! بەڵام ئێستا ئەو دەورو زەمانە گوزەشت! ئەو باوکەی مرد.

زیاتر ئەو کاتانە گاڵتەیان پێدەکردین کە لەگەڵ ئەواندا بۆ کار کردن دەبراین. چونکە ئێمە هێزو توانای ئەوانمان نەبوو، ئەلهەقی نەماندەتوانی وەکو پێویست یارمەتیان بدەینو هاوکاریان بکەین. هیچ شتێك هێندەی بە دەستهێنانی متمانەی خەڵکی قورس نییە، بە تایبەتی بە دەستهێنانی متمانەو خۆشەویستی ئەو جۆرە خەڵکانە.

لە هەموو زیندانەکەدا تەنیا چەند کۆنە نەجیمزادەو خانەدانێك هەبوون، پێنجیان پۆڵاندی بوون، زیندانییەکان زیاتر رقیان لەوان بوو تا لە نەجیمزادە رووسەکان ( پاشان بەدرێژی باسی

ئەو پۆلاندیانە دەکەم). پۆلاندییەکان (من هەر باسی زیندانییە سیاسیەکان دەکەم)، بە پارێزەوە مامەڵەیان دەگەڵ زیندانییەکاندا دەکردو زۆریان لە خۆ دەکرد کە دەگەڵیاندا بە نەزاکەت بن، رۆژی دوو قسەیان دەگەڵدا نەدەکردن، نەبوایە بە تووشیانەوە هەر قسەیان دەگەڵ نەدەکردن، بە ئاشکرا پێیانەوە دیار بوو کە حەزیان بە هاوڕێتی و دۆستایەتیان نییە. زیندانییەکان زۆر چاك هەستیان بەمە دەکردو، دووقات تۆڵەیان لێدەکردنەوە. لە جێی سندان قوزەڵقورتە.

دوای نزیکەی دوو دانە ساڵ ئەوجا توانیم دۆستایەتی هەندێ لە هاوڕێیانی زیندان بە دەست بێنم. ئیدی بەرە بەرە لێم نزیك بوونەوە، متمانەیان پێکردم، و زۆربەی هەرە زۆریان خۆشیان ویستمو بە ئینسانی باشیان زانیم.

ژمارەی کۆنە نەجیمزادەو خانەدانانی رووس لە زیندانەکەدا بە منەوە پێنج کەس بوو. باسی یەکێکیانم — تەنانەت پێش هاتنم بۆ زیندان– بیستبوو کە مرۆڤێکی بودەڵەی، شەڕخوازی، نامەردی، بەدئاکاری، گەندەپیاوەو جاسووسی بەسەر زیندانییەکانەوە دەکاتو خەبەریان لێدەدات. بۆیە لە یەکەم رۆژەوە خۆم لەم مرۆڤە دوورگرت. یەکێکی دیکەی ئەو پێنج کەسە، ئەو زیندانیە بوو، پێشتر باسم کردووە، کە بابی خۆی کوشتبوو. سێیەمیان ئاکیم ئاکیمیچ ناوێك بوو، کە بە عەمراتم پیاوی وا خۆشو خۆش ڕووم نەبینی بوو و تا ئێستاش هەر لە یادمەو لە تۆ وایە بەرانبەرم دانیشتووە: پیاوێك بوو درێژ، باریكو بنێس، سا ئەقڵ، کوێرە سیواتێکی یەجگار کەمی هەبوو، گەنگەشە کارێکی سەر سەختو منجڕ، دەتگوت ئەڵمانیە. زیندانییەکان گاڵتەیان پێدەکردو پێیان رادەبوارد، بەڵام لێشی دەترسان، چونکە پیاوێك بوو بە تەبیعەت جینگن، دەستوەشێن، بیانووگرو، شەڕانی.ئەم پیاوە لە هەوەڵەوە تێکەڵیان بوو بوو، خۆی کردبوو بە هاوتایانو زۆر جار قەرقەشەو شەڕە جوێنو دەمقڕەی دەگەڵ دەکردن. جا چونکە پیاوێکی سەر راستو ئابرومەندو پاكو دڵسۆز بوو، هەرکە دیتبای غەدرو زوڵم لە یەکێك دەکرێت، یەکسەر خۆی لە مەسەلەکە هەڵدەقورتاندو خۆی لێدەکرد بە خاوەن. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا تا بڵێی سادەو ساویلکەو کاڵفام بوو. کە دەگەڵ زیندانییەکاندا بەشەڕ دەهات، عەیبی دزێتی لێدەگرتن، دڵسۆزانە ئامۆژگاری دەکردن کە دەستبەرداری دزیی بن. هەر لە یەکەم رۆژەوە، بووین بە دۆست، و زوو بە زوو بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە. ماوەیەکی زۆر بە سەربازی لە قەفقازدا دەمێنێتەوە تا دەگاتە پایەی ئەفسەری پلە دوو. بۆ گێڕامەوە کە خۆبەخش بەپلەی سەربازی دەرجەدار پەیوەندی بە تیپێکی سوپایی سەر سنوورەوە دەکات. پاش چاوەڕوانیەکی زۆر بۆ پایەی ئەفسەری پلە دوو بەرز دەکرێتەوە،و دەگوازرێتەوە بۆ کۆساران‌و دەکرێت بە سەرۆكو فەرمانداری قەڵایەکی چکۆلە. ئیدی میرێکی چکۆلەی قەفقازیی ئەو دەڤەرە، ئەمەی لەبەر گران دەبێت، هەوڵدەدات قەڵاکە بسووتێنێ، شەوێك شەبەیخونێکی بۆ دەکات، بەڵام شکست دێنێ‌و بە ناچاری بە دەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە. ئیدی ئاکیم ئاکیمیچ دەکەوێتە بیری تۆڵە سەندنەوە لە میرە چکۆل، وادەنوێنێ کە نازانێت میرە چکۆل شەبەیخونی کردووەتە سەر قەڵاکەی، ئیدی دەنگۆیەکی وا لە نێو خەڵکیدا بڵاودەکاتەوە کە کۆمەڵێك یاخیو چەتەو رێگری ئەو چیاو چۆڵانە شەبەیخوونەکەیان کردووەتە سەر قەڵاکەی. دوای مانگێك لەو رووداوە، ئاکیم ئاکیمیچ، داوا لە

میرە چکۆل دەکات کە سەردانێکی دۆستانەو برادەرانەی بکات. ئیدی میرە چکۆل، بێ ئەوەی هیچ گومانێك بکات، بە سواری ئەسپەکەی دێت بۆ لای. ئاکیم ئاکیمیچ، سەربازەکانی خڕ دەکاتەوە،و لە بەردەم میوانەکەیدا، باسی ئەو خیانەت و تاوانە دەکات کە میوانەکەی کردوویەتی، زۆری سەرکۆنە دەکات،و زۆر بە وردی بۆی روون دەکاتەوە کە سووتاندنی قەڵایەکی دەوڵەتی چ تاوانێکی گەورەیە،و ئەرکی سەر شانی میرێکی سەر بە حکوومەت چیە، لە کۆتایی هەموو ئەو قسانەدا فەرمان بەسەربازەکانی دەدا کە یەکسەرو لە جێدا میر تیرباران بکەن، ئەوجا سەرانی خۆی لە وردو درشتی مەسەلەکە ئاگادار دەکاتەوەو پێیان ڕادەگەیەنێ کە میری بە سزای خۆی گەیاندووەو تیر بارانی کردووە. ئیدی ئاکیم ئاکیمیچ دەدرێتە دادگایەکی سوپایی، حوکمی ئیعدام دەدرێت، پاشان حوکمەکەی سووك دەکرێت،و وەکو مەحکومی دەرەجە دوو، وا تا دوانزە ساڵ، بۆ سیبیریا دەنێردرێت. ئاکیم لەلای من ئیعترافی کرد کە رەفتارەکەی یاسایی نەبووە، دەبوایە میرە چکۆل لە دادگایەکی مەدەنیدا دادگایی بکرێت نەك لەبەردەم ئەنجوومەنێکی سوپایی دا. کەچی ئاکیم وێڕای ئەوەش ئەوەی بە ئەقڵا ناچێت کە چ تاوانێکی گەورەی کردووە. لە وەڵامی هەموو ناڕەزانییەکانی مندا دەیگوت:

– ئاخر ئەو ئاگری نا بە قەڵاکەی منەوە، قەڵاکەی سووتاندم، دەبوایە چی بکەم ؟ چارم چ بوو یانی دەبوایە سوپاسی بکەم؟ دەستخۆشیم لێکردبا؟

هەرچەندە زیندانییەکان، گاڵتەیان بە ئاکیم ئاکیمیچ دەکرد، پێیان رادەبوارد،و پێیان وابوو دەمارێکی شێتی تیایە، بەڵام چونکە رێك‌و پێك‌و بە سەلیقەو کارامەو وردو لێزان بوو، رێزیان دەگرت.

هەموو سنعەتێکی دەستی دەزانی، چیت ویستبا بۆی دروست دەکردیت: قۆندەرە درووو بوو، پینەدۆز بوو، بۆیە چی بوو، نیگارکێش بوو، کەندەکار بوو، دارتاش بوو، قفڵساز بوو. هەموو ئەم کارو پیشانە لە زینداندا، لە هاوزیندانییەکانی خۆیەوە فێر بوو بوو، رەنگ نەبوو شتێکی دیبا، یەکسەرو زۆر بە باشی تەقلیدی دەکردەوە، ئیدی زەمیلەو سەندووق‌و لەیستۆك‌و فانۆسی کاغەزینی دروست دەکردو دەیدا بە یەکێك‌و لە شاردا بۆیان دەفرۆشت. جا بە هۆی کارەکەیەوە هەمیشە برێك پارەی هەبوو، ئیدی فانیلەو شۆرت‌و بالیفی نەرم‌و پێویستیانی دیکەی پێدەکڕی. بۆ خۆی جێگەیەکی نەرم‌و خۆشی فەراهەم کردبوو. ئەویش لە هەمان قاوشی مندا بوو، لە سەرەتای زیندانی بوونماندا زۆری مەحەبەت و چاکە لەگەڵدا کردم.

زیندانییەکان بەر لەوەی بۆ کارو بێگار لە زیندانەکە دەربچن، بە دوو ریز لە بەردەم بارەگای پاسەوانیدا(قەرەوڵخانە) دەوەستان‌و پاسەوانان بە تفەنگی سوارەوە بەرو پشتیان لێدەگرتن. هەنگێ ئەفسەرێکی بەشی ئەندازەو چاودێری کارو بێگارو چەند سەربازێك لەوانەی سەرپەرشتی کاری زیندانییەکانیان دەکرد دەهاتن. چاودێرەکە زیندانییەکانی دەژماردو دەستە دەستە بۆ ئەو شوێنانەی دەناردن کە دەبوا کاری تیا بکەن.

منیان دەگەڵ چەند زیندانییەکی دیکەا بۆ کارگەی ئەندازە نارد، ئەم کارگەیە لە دارو تەختە دروستکرا بوو، لە ناوەندی حەوشەیەکی گەورەدا بوو پڕ بوو لە کەرەستەو تفاقی بیناسازی.

کوورەیەکی کان توانەوەی تیا بوو، چەند وەرشەو کارگەیەکی دارتاشی،و قفڵسازیو بۆیەکاریشی تیا بوو. ئاکیم ئاکیمیچ، لە کارگەی بۆیەسازیدا کاری دەکرد: بۆیەی زەیتی ئامادە دەکرد، رەنگی تێکەڵ دەکردو دەگرتەوە، مێزو کورسیانی بە جۆرێ بۆیە دەکرد لە تۆ وایە دارساجی راستیە.

بە دەم چاوەڕوانی زنجیرو کەلەپچەی تازەوە، هەستە سەرەتاییەکانی خۆمم لەمەڕ زیندان، بۆ گێڕایەوە. وەڵامی دامەوە :

– هەق بە تۆیە، ڕاستدەکەی، لێرەدا خۆشییان بە چارەی نەجیمزادەو ئەسڵزادەدا نایەت، بە تایبەتی ئەگەر زیندانی سیاسی بێ، ئەوا خوا خوایانە ئەزیەتیان بدەن، خراپەیان دەرهەق بکەن. هەڵبەتە نابێ ئەمەمان پێ سەیربێت! چونکە تۆ لە خۆیان نیت، لەوان ناچیت: ئەوانە هەر هەموویان بەر لەوەی بگەنە ئێرە یان مسکێنو خوبزە بوون یان سەرباز، ئیدی چۆن دەشێت خۆشیان بوێی؟ جا با ئەوەشت پێ بڵێم کە ژیان لێرەدا سەختە، بەڵام سەختیەکەی وەك دەڵێن لە چاو سەختی ژیانی ئۆردوگاو گرتووخانە تەمبێکارییەکانی رووسیادا هیچ نیە. هەندێ لەو خەڵکانەی کە ئەوێیان دیتووەو لەوێندەر بەربوونو ئێستا لێرە زیندانین، زۆر ستایشی ئێرە دەکەن، دەڵێن ئێرە لە چاو ئەو گرتووخانانەدا بەهەشتە... نەك لەبەر ئەوەی کار لەوێندەر قورسترە،و دەڵێن ئیدارەی ئەوێندەر مامەڵەیەك دەگەڵ زیندانیانی دەرەجە یەکدا دەکەن (ئیدارەی ئەوێندەر، ئەم دیسپلینو زەبتو رەبتە سوپاییەی ئێرەی نیە) کە زۆر جیاوازە لە مامەڵەی ئیدارەی ئێرە. گوایە زیندانییان لەوێ وەك ئەوەیە لە ماڵی خۆیان بژین ( هەڵبەتە بەمل گوتیاری چونکە من بە خۆم نەمدیتووە)، جلی یەکجۆریان پێ لە بەرناکەن، سەریان ناتاشن، ئەگەرچی بەبۆچوونی من جلی یەکجۆرو سەرتاشین شتێکی زۆر باشە... نیشانەی رێكو پێکییە، دیمەنی جوانترە... کەچی ئەوان حەزی لێناکەن. ئیدی کۆمەڵگەیەکی هەڕەمەی سەیرە! هەموو جۆرێکی تیایە! سەرباز، چەرکەس، خوانەناس، ئەرتەدۆکس، جووتیارانێك کە خانەوادەی خۆیان بەجێهێشتووە، جولەکە، قەرەج،و خەڵکانێکی دی کە مەگەر هەر خوا بزانێ لە کوێندەرەوە هاتوون!... جا دەبێ ئەم هەڕەمە سەیرە پێکەوەو وەکو یەك خێزانوماڵبات هەڵبکەنو بژین، لە هەمان قاپدا نان بخۆن،و لەسەر هەمان تەختەبەن بخەون...و هیچ جۆرە ئازادییەك لێرە نییە: پیاو مەگەر بەدزییەوە دەردە دڵێك بکات... ئەگەر دوو پولی هەبوو دەبێ لە پێڵاوەکەیدا بیشارێتەوە...روو دەکەیتە هەر لایەك هەر زیندانەو زیندان... ئیدی لەم حاڵەدا پیاو بەدەست خۆی نییە بیر لە سەرکێشیو کاری خراپ دەکاتەوە.

ئەم شتانەم بەلاوە تازە نەبوون، پێشتریش دەمزانین. حەزم دەکرد پرسیاری مێجەرەکەی خۆمان لە ئاکیم ئاکیمیچ بکەم. ئیدی ئاکیم هیچی لێنەشاردمەوە، لە سیری تا پیازی بۆ گێڕامەوە، ئەلهەقی قسەکانی زۆریان دڵتەنگو نیگەران کردم!...

ئیدی رێکەوت وابوو دوو دانە ساڵی تەواو لە سایەی دەسەڵاتی ئەم ئەفسەرەدا بژیم. ئەوەی ئاکیم ئاکیمیچ بۆی گێڕابوومەوە، هەر هەمووی موو بە موو وا دەرچوو. ئەم ئەفسەرە مرۆڤێکی بەدخوو، توندە تەبیعەت،و ترسناك بوو، بە تایبەتی کە دەسەڵاتێکی ڕەهای بەسەر نزیکەی دوو

سەد مرۆڤەوە هەبوو. زیندانییەکانی بە دژمنی شەخسی خۆی دەزانی، دیارە ئەمە خەتاو هەڵەیەکی زۆر ترسناك بوو. کابرایەك بوو تا بڵێی جینگن، هەڵەشە، سەرەڕۆ،و دڵڕەش، کە توڕە دەبوو، ئەگەر بە ڕێکەوت چاکەو پیاوەتیەکی هەبا، ئەوەشی بە ئاوا دەدا.

هەندێجار کە توڕە دەبوو، وەکو چۆن بۆمبێك لە ناکاو، لە نیوە شەودا بتەقێتەوە بەو ئاوایە دەیدا بەسەر زیندانەکەدا، ئەوسا وای بە حاڵی ئەو زیندانییەی لەسەر پشت نووستبا یان بەسەر لای چەپدا خەوتبا، یەکسەر دەچووە سەری‌و دەیگوت: "دەبیٚ لەسەر لای ڕاست بنووی، ئەوە فەرمانی منە". زیندانییەکان هەم رقیان لیٚ بوو و هەم لێی دەترسان. دەموچاوێکی سووری ترسناکی هەبوو. هەموو زیندانیەکان دەیانزانی کە مێجەر بەتەواوەتی ملکەچ‌و گوێڕایەڵی فەرمانانی (فدکا)ی نۆکەرو خولامی خۆیەتی، سەگێکی هەبوو ناوی (تریزورکا)*(٤) بوو، ئەم سەگەی زۆر خۆشدەویست، کە سەگەکەی نەخۆش کەوت، خەریك بوو لە حەژمەتاندا شێت ببیٚ. کە فدکا، پێی ڕاگەیاند لە نێو زیندانییەکاندا یەکێك هەیە سەر لە بەیتاڵی دەردەکات،و زۆر نەخۆشی قورسی چاك کردووەتەوە، یەکسەر ئەو زیندانییەی بانگ کردو گوتی:

– فریام بکەوە، تریزورکام بۆ چارە بکە، ئەگەر چارەی بکەیت‌و چاك ببێتەوە زێڕو زیوی دنیات دەدەمیٚ...

ئەو پیاوە، جووتیارێکی سیبیریایی زیرەك‌و بە ئاوەز بوو، ئەلهەقی بەیتاڵێکی زۆر باش بوو، بەڵام بەر لە هەر شتێك جووتیارێکی فێڵباز بوو. دوای چەندین ساڵ، پاش ئەوەی ئەم مەسەلەیە کۆن بوو، و بەتەواوەتی بیر چووەوە. ئەم بەیتاڵە بەم جۆرە بۆ هاوڕێکانی گێڕابووەوە:

– سەگەکە لەسەر قەنەفەیەك ڕاکشا بوو، بالیفێکی نەرمی سپی لە ژێر سەردا بوو. تەمەشایەکی تریزورکام کرد. یەکسەر زانیم تووشی هەو وئیلتیهاب بووە، پێویستی بەوەیە خوێنی بەر بدریٚ، پێویستی بە حەجاماتە،و دڵنیا بووم کە دەتوانم چارەی بکەم، بەڵام لە دڵی خۆدا گوتم: "باشە تەقو تۆپی؟ هەنگیٚ من چی بکەم؟" ئیدی بە مێجەرم گوت: "نەخێر قوربان... زۆر درەنگ منت ئاگادار کردووە... ئەگەر دوێنیٚ یان پێریٚ بانگتان کردبام، ئێستا چاك بوو بووەوە... بەڵام تازە درەنگە، کار لەکار ترازاوە، هیچم لە دەست نایەت، فایدەی نیە هەر دەتۆپیٚ !".

ئیدی تریزورکا تۆپی.

جارێك بۆیان گێڕامەوە کە یەکێك لە زیندانییەکان ویستویەتی مێجەر بکوژێت. ئەم زیندانییە چەندین ساڵ بووە لە زینداندا بووە، پیاوێك بووە ملکەچ‌و گوێڕایەڵ، لە بێدەنگی‌و کەمدووی دا بەناوبانگ بووە: تەنانەت بە گێلۆکەو شێتۆکەیان داناوە. بەشی خۆی خوێندەواری هەبووەو شەوو ڕۆژ خەریکی خوێندنەوەی تەورات بووە. دەیانگوت کە زیندانییەکان هەموو دەنووستن، لە نیوەشەودا هەڵدەستا‌و مۆمێکی چکۆلەی دادەگیرساند، دەچووە نزیکی سۆپاکەو تەوراتەکەی دەکردەوەو تا بەیانی خەریکی خوێندنەوە دەبوو.

ڕۆژێك لە ریز دێتە دەریٚ‌و بە مامورو سەرپەرشتیاری کاروباری زیندانەکە دەڵێت، ناچێت بۆ کارو بێگار. ئەم خەبەرە گەییە مێجەر، بە ڕادەیەك توڕە بوو کە یەکسەر بە خۆی بۆ زیندانەکە هات. زیندانییەکە کە پێشوەختە پارچە کەرپووچێکی ئامادە کرد بوو و شارد بوویەوە، هەرکە

مێجەری بینی یەکسەر بەرەو رووی رۆیی‌و کەرپووچەکەی خێواندێ، بەڵام بەری نەکەوت. زیندانییەکە گیرا، دادگایی کرد، بۆ چەند ساتێك خرایە ژێر جەڵدەو شەلاقکاری... دوای ئەوە برا بۆ خەستەخانە، دوای سێ دانە رۆژ مرد. لەسەرە مەرگدا گوتبووی رقی لە کەس نییە، هەر حەزی کردبوو عەزاب بکێشێت، ئازار بچێژێت، وێرای ئەوەش سەر بە هیچ ئاین‌و دیانەتێك نیە. ئەلهەقی کە لە زینداندا ناوی دەهات زیندانییەکان بە خێرو بەرێزەوە ناویان دەبردو یادیان دەکردەوە.

لەو کاتەدا کە پێوەندو زنجیرەکانیان دەگۆڕیم، پێوەندو زنجیری تازەیان لێ دەبەستم، چەند کیژۆڵەیەکی چۆرەکفرۆش یەك لە دوای یەك خۆیان بە کوورەکەدا کرد. ئەمانە زۆربەیان منداڵ بوون، دەهاتن بۆ فرۆشتنی ئەو کولێرەو چۆرەکانەی دایکیان بۆیان ئامادە دەکردن. تا گەورە دەبوون ئەمە کاریان بوو، بە گەورەییش هەر سەری زیندانیان دەدا، بەڵام بۆ شت فرۆشتن نا... هەمیشە یەکێك لەوانەت لە دەوروبەری زینداندا دەبینی. هەندێ ژنی بەمێردیش لە نێو چۆرەکفرۆشەکان ونانفرۆشەکاندا هەبوون، هەر چۆرەکێك بە دوو کوپیك بوو، یانی هەرزان بوو، بۆیە زۆربەی زیندانییەکان دەیانکڕی...

جارێکیان زیندانییەکی دارتاشی، سەربۆزی، دەموچاوو سووری رووخۆشی دەم بە پێکەنینم بینی... ئەم زیندانییە دارتاشە، گاڵتەو سوعبەتی دەگەڵ کچۆلە چۆرەکفرۆشەکاندا دەکرد. بەر لە هاتنی ئەوان دەسەسرێکی سووری لە ملی ئاڵاند. پاش کەمێك ژنێکی قەڵەوی دەموچاوکونج لە رێوە گەیی، سەبەتەکەی لەسەر مێزی کاری دارتاشەکە دانا، دارتاشەکە بەدەم بزەیەکی پڕ لە متمانەوە لێی پرسی:

- دوێنێ دیار نەبوویت ؟

ژنەکە، بە جورئەتەوە گوتی:

- من هاتم، بەڵام تۆ لە هیچ کوێیەك دیار نەبوویت.

- هاتین، بەڵام پاشان بۆ شوێنێکی تریان بردین، ئەگینا یەکترمان هەر دەبینی... پێرێ هەموو دەستە خوشکەکانت هاتنە دیدەنیم...

- کێ‌و کێ بوون ؟

- ماریاشکا... خافروشکا... چیگوندا... دفوگروشفایاش (چوار کۆپیك بایی) هاتبوو....

یەکسەر لە ئاکیم ئاکیمیچ-م پرسی:

- باشە شتی وا دەبێت ؟

ئاکیم، چونکە خۆی پیاوێکی زۆر بێگەردو داوێنپاك بوو، چاوی داخست‌و بە شەرمەوە گوتی:

- بەڵێ، هەندێجار شتی واش دەبێت، هەندێجار ئەو شتانە روودەدەن، بەڵام زۆر بە کەمی. چونکە زۆر زەحمەتە، کۆسپی دنیای لەبەردەمە... بۆیە زیندانییەکان وێڕای هەموو حورمانێکی سێکسی زیاتر خوویان دەدایە بادەنۆشی‌و پارەکانیان لەو مەیدانەدا خەرج دەکرد. زۆر زەحمەت بوو بگەیتە ئەو جۆرە ژنانە. دەبوا لەسەر جێژوان‌و کاتەکەی رێبکەون، شوێنێکی پەنا بەدەست بێنن، کە ئەمە لە هەموو شتێك ئەستەمتر بوو، دەبوایە پاسەوانەکە ئیغفال بکەی یان دەمی چەور

بکەی و بەرتیلی بدەیتێ کە ئەمە نیمچە مەحاڵ بوو، دەبوایە پارەیەکی تا رادەیەك زۆر خەرج بکەی... کەچی وێڕای ئەوەش هەندێ دیمەنی ئاشقێنیم بە چاوی خۆم بینیوە... رۆژێکیان سێ کەس بووین، ناردبوویانین بۆ کەناری روباری ئارتیش کە کوورەی خشت سوورکردنەوە دابگیرسێنین. چەند سەربازێکی پاسەوانمان لەگەڵ بوون زۆر نەرمو نیان بوون،و چاوپۆشیان لێدەکردین، لە پڕ دوو ئافرەتی لەوانە پەیدا بوون. یەکێك لە زیندانییەکان، دیار بوو چاوەڕوانی دەکردن، گوتی:

- بۆچی ئەوەندە درەنگ کەوتن ؟ لە کوێ بوون ؟ لە ماڵی زفیرکوف بوون، وا نیە ؟

یەکێکیان بە پێکەنینەوە گوتی:

- زفیرکوف ؟ کە شەممە لە مانگ بڕا هەنگێ دەچم بۆ لای زفیرکوف.

ئەمە پیسترینو ناشیرینترین ژنی رووی زەوی بوو. تا خەیاڵ بڕبکا پیس بوو. پێیان دەگوت چیگوندا (هەرزانبایی)... دەگەڵ دەستە خوشکەکەی تریا دفوگروشفایا (چوار کۆپیك بایی)دا هات، کە لەویش پیستر بوو.

کابرای مێباز روویکردە ژنە چوار کۆپیك باییەکە و گوتی:

- ها... دەمێکە دیار نیت... چیە دەڵێی کەمێك لاواز بووی ؟

- بڵێم چی... جاران جوانو قەڵەو بووم، بەڵام ئێستا ئەوەندە لاواز بووم دەڵێی دەرزیم قووت داوە...

- هێشتا هەر دوای سەربازان دەکەوی ؟

- دە تەمەشا، تۆش هەمان قسەو بوختانێ خەڵکی دەلێیتەوە! جا با دوای سەربازانیش بکەوم چ قەیدیە ؟...

- واز لە سەربازان بێنە، دوای ئێمە بکەوە کچی باش... پارەمان پێیە...

ئیدی ئەم زیندانییە سەرتاشراوە، پێ بە کۆتو زنجیرە، جل دوو رەنگە، کە لە ژێر دەستی پاسەواناندا کاری دەکرد بێننە بەرچاوو بیری لێبکەنەوە...

کاتێ کە لە کارەکەم بوومەوەو پێیان گوتم دەتوانم بۆ زیندان بگەڕێمەوە، کۆتو زنجیریان لێبەستم، خوا حافیزیم لە ئاکیم ئاکیمیچ کردو بە پاسەوانی یەکێك لە سەربازەکان گەڕامەوە بۆ زیندان. ئەوانەی کە بە قۆنتەراتو لە بڕ کاریان دەکرد نەك بە سەعات، هەرکاتێ لە کار ببواوەن، چاوەڕوانی ئەوانی تریان نەدەکردو بۆیان هەبوو بۆ زیندان بگەڕێنەوە... بۆیە کە گەییشتمەوە زیندان، چەند زیندانییەکی دیکە لە پێش مندا گەییشتبوونەوە: باشترین رێگە بۆ ئەوەی زیندانییان بخەیتە سەر کارو بەجددی کار بکەن، ئەوەیە بەقەبەڵو لەبڕ (بە قۆنتەرات) کارەکەیان بدەیتێ، هەنگێ چەندیش کارەکە قورس بێ، بە نیوەی وەختی پێویست تەواوی دەکەنو هەنگێ ئازادن لەوەی یەکسەر بۆ زیندان بگەڕێنەوە بێ ئەوەی کەس دەست بێنێتە رێیان.

* * *

چونکە مووبەقەکە بچووك بوو، و هەموو زیندانییەکانی بە جاریٚ نەدەگرت، بۆیە گشت زیندانییەکان پێکەوە نانیان نەدەخوارد، ئەوانەی لە پێشەوە دەگەییشتن بەشە خۆراکی خۆیان دەخواردو هەڵدەستان‌و شوێنەکەیان بۆ زیندانییانی دی چۆڵ دەکرد. ویستم کەمێك شۆربای کەلەرم بخۆم، بەڵام چونکە پێی ڕانەهاتبووم، زۆرم لە دەم ناخۆش بوو و نەمخوارد، تۆزێ چام بۆ خۆم ئامادە کرد، پاشان دەگەڵ یەکێك لە زیندانییەکاندا، کە ئەویش وەکو خۆم کۆنە نەجیمزادەو خانەدان بوو، لە سووچێکی مێزەکەوە دانیشتم.

زیندانییان، دەهاتنە ژوورەوەو دەچوونە دەرەوە، هێشتا هەموویان نەهاتبوونەوە، بۆیە جێگا زۆر بوو. پێنج کەسیان، پێکەوە لە پشت مێزە گەورەکەوە ڕۆنیشتن، ئاشپەزەکە دوو کاسە شۆربای بۆ تێکردن، و تاوەیێکی گەورەی پڕ لە ماسی سوورەوەکراویشی بۆ دانان، پێدەچوو، ئەمانە بە بۆنەیەکی خۆیانەوە جەژن بگێڕن، بۆیە فراڤینیان لە کیسەی خۆیان دابووە ڕادان، پۆلاندییەك وەژوورکەوت‌و لە نزیکی ئێمەوە ڕۆنیشت.

زیندانییەکی باڵا بەرز بەدەم هاتنە ژوورەوەوە، چاوێکی بە گشت هاوڕێکانیدا گێڕاو بە دەنگی بەرز گوتی:

– من لێرەش نەبم دەزانم چی دەکەن.

پیاوێك بوو لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا، باڵابەرزو تۆکمە، زیرەکی‌و روو خۆشی بە سیمایەوە دیار بوو، لێوە ئەستوورو شۆڕەکەی دیمەنێکی پێکەنیناوی بە دەمووچاوی دەدا.لە نزیکی ئەو گروپەوە کە چەژنیان دەگێڕا، دانیشت‌و گوتی:

– ڕۆژتان باش ، هیوادارم باش خەوتبن ؟ بۆچی سڵاوەکەم ناسەننەوە... دەی هاوڕێیانی بەڕێزی کۆرسیکیم... عافێتتان بێت، نۆشی گیانتان بێت!... میوان ڕادەگرن.

– ئێمە کۆرسیکی نین!

– زۆر باشە، کەواتە تامبوفین. برایانی تامبوفینم.

– خەڵکی (تامبوف)ش نین، هیچت لە ئێمە دەست ناکەویٚ.. ئەگەر دەتەویٚ خۆت دەعوەت بکەی، و دابمەزرێنی، وا چاکە بچیت جووتیارێکی دەوڵەمەند بدۆزیتەوەو...

– قۆڕەی سکم لە برساندا سەعاتە ڕێیەك دەڕوات، پێم ناڵێن ئەو جووتیارە دەوڵەمەندە کێیە تا خۆمی بگەیەنمیٚ؟

– بڕۆ بۆلای گازین، ئەو بگرەو هەقت نەبێت!

– براینە گازین ئەمڕۆ خەریکی خواردنەوەیە. هەرچییەکی هەبیٚ خەرجی خواردنەوەوی دەکات!.

زیندانییەکی دیکە گوتی:

– بەلای کەمەوە بیست ڕۆبڵی پێیە... ئەگەر دەتەویٚ پارە بە دەست بێنی، هیچ شتێك لە بادە فرۆشی باشتر نیە، کیمیایە...

کابرا گوتی:

– کەواتە رام ناگرن ؟ باشە... خواردنی حکومەت دەخۆم.

– بۆچی ناچیتە لای ئەو دوو بەڕێزە چا بخۆیتەوە ؟...

زیندانییەکی دیکەی خەمبار لە سووچێکدا دانیشتبوو،و لەوەپێش تاقە وشەیەکی لە زار دەرنەچوو بوو، بە دەنگێکی کەرخ و خەمناك گوتی: ئەو بەڕێزانە بە چی دەزانن ؟

– دووخانەدان و ئەرستۆکراتی لێکەوتوون، ئێستا حاڵیان لە حاڵی ئێمە باشتر نیە.

زیندانییە لێو ئەستوورەکە، بە روو گەشی ڕوانیە ئێمەو گوتی:

– زۆرم حەز لە کووپێ چایە، بەڵام رووم نایە داوا بکەم... ئەوەندەش نەفس نزم نیم...

بە ئاماژەی دەست دەعوەتم کردو گوتم:

– فەرموو، ئەگەر حەزت لێیە وەرە چا بخۆرەوە.

لە مێزەکەی ئێمە هاتە پێشەوەو گوتی:

– چۆنم حەز لێ نییە؟ کێ هەیە حەزی لە چا نەبێت ؟

زیندانییە گرژو خەمناکەکە هەڵیدایە:

– تەمەشای ئەمە! کە لە ماڵی خۆی بوو شۆربای روون و نانی جۆیشی بە تەواوەتی دەستنەدەکەوت، کەچی لێرە، لە زینداندا، دەبێ چا بخواتەوە، وەکو ئەوەی ئەرستۆکرات (نەجیمزادە) بێ!

لێم پرسی:

– بۆچی لێرە کەس چا ناخواتەوە ؟

هیچ وەڵامێکی نەدامەوە. هەر بە پیاویشی نەزانیم.

– کۆلێرەی سپی، کولێرەی سپی! یەکەم سفتاح...

زیندانییەکی گەنج کۆمەڵێك کولێرە سپی وچۆرەکی بە ڕستێکەوە کرد بوو، دابووی بە شانیاو بە ژوورەکاندا دەیگێڕاو دەیفرۆشت.

ئەو ژنەی کە ئەم کولێرانەی دەدایە تا بۆی بفرۆشێت، لە هەنبەر هەر دە کولێرەدا، کولێرەیەکی دەدایە بۆ خۆی، ئیدی لەسەر ئەم کولێرەیە دەژیا.

بە دەم بانگی: – کولێرەی بچووك! کولێرەی بچووك! خۆی بە مووبەقەکەدا کردو پاشان لەسەری رۆیی:

– کولێرەی بچووك، کولێرەی مۆسکۆ، گەرم و نەرمە...حەزم دەکرد خۆم هەموویم خواردبا، بەڵام پارەکەم دەری نایەنێ. دەی کوڕینە فریاکەون، تەنیا یەك کولێرە ماوە... کێ داکی خۆی خۆشدەوێ با بیکڕێت، بە یادی دایکیەوە نۆشی گیانی بکات.

بەو قسەیە هەمووانی هێنایە پێکەنین،و چەند کولێرەیەکیان لێکڕی.

ئەوسا گوتی:

– گازین خەریکی خواردنەوەیە، زۆر سەرخۆشە! کە ئیشێکی باش ناکات!... ئەمڕۆ رۆژێکی لەبار نییە... کاتێکت زانی هەشت چاو (مەبەستی مێجەرە) خۆی کرد بە ژوورا... هەنگێ چیدەکات ؟

– دەیشارینەوە... سەرخۆشە ؟

– بەڵێ... فول سەرخۆشە... پیس هاڕوژاوە. شەڕ بە دارو بەرد دەفرۆشێت. هەرکەسێکی دەست بکەویٚ بە گژیا دەچێت.

– کەواتە کار دەگاتە شەڕە مست.

لە پۆڵاندییەکەی تەنیشت خۆمەوە پرسی:

– ئەوە باسی کێ دەکەن ؟

گوتی:

– باسی گازین دەکەن.. ئەمە زیندانییەکە کە بادەفرۆشی دەکات.. هەرکاتێ شتێکی قازانج کردو پارەیەکی دەست کەوت، تا دوا کوپیك دەخواتەوە. کە دەخواتەوە، ئیدی دەبێ بەدڕندەیەك لەو گۆڕە. تەبیعەتی ئاگرینی سەردەکات. بەڵام بەر لەوەی بخواتەوەو سەرخۆش ببێ، پیاوێکە هێدیو هێمنو بێوەی... بەڵام کە خواردییەوە ئیدی لە دەست دەردەچێت، دەست دەداتە کێردو پەلاماری خەڵکی دەداتو دەبێ فریا بکەونو کێردەکەی لێ بسەنن.

– چۆن دەتوانن لێی بسەنن ؟

– دە دوانزە کەس بەسەریا دەرژێن،و ئەوەندەی لێی دەدەن تانیوە گیان دەبێت، ئیدی دەکەوێو لەخۆی دەچێت. کە بورایەوەو بوو بە جەنازە هەنگێ لەسەر تەختەبەندەکەی (تەختە خەو) پاڵی دەخەنو پاڵتۆکەی خۆی پێدا دەدەن.

– باشە ناترسن بمرێت ؟!

– ئەو لێدانەی لەو دەدرێت، لە هەرکەسێکی تر بدرێت بێگومان روح دەرنابات، بەڵام ئەو گیان سەختە... لە رادەبەدەر بەهێزو بتەوە، لەم زیندانەدا کەس لەو بەهێزترو بتەوتر نیە... دوای ئەو هەموو تێهەڵدانو دارکارییە، سبەی بەیانی هێندە چالاكو گورجو گۆڵ لە خەو ڕادەبێت وەکو ئەوەی نەبای دیبێ و نە باران، وەکو ئەوەی هیچ شتێ رووی نەدابێ...

لە پۆڵاندییەکم پرسی:

– ئەرێ بێرەحمەت، پێم ناڵێی ئەوانە کە نانی خۆیان دەخۆنو من چای خۆم دەخۆمەوە، بۆچی چاویان لە چایەکەی منە، بۆچی حەسوودیان بە من دێت..

– مەسەلە چایەکە نییە، هیچ پەیوەندییەکی بە چایەکەوە نییە... ڕقیان لە خۆتە: تۆ نەجیمزادە نیت ؟ یانی لەوان ناچیت. بۆیە حەزدەکەن بت بێزێننو شەڕت پێ بفرۆشنو بەگژتا بێن، تۆ چاوەڕوانی شتی خراپتر بکە. ژیانی ئێمە لێرەدا زۆر سەختو دژوارە. ئەگەر ژیانی زیندانییەکان سەخت بێ، ئەوا ژیانی ئێمەمانان دووجار سەختە، هەم وەکو زیندانیو هەم وەکو نەجیمزادە، بۆیە دەبێ زۆر بە سەبرو حەوسەڵە بین تا دەگەڵ ئەم ژیانەدا ڕابێین، خووی پێوە بگرین. دڵنیابە بە هۆی ئەم خۆراكو چایەوە کە بە خۆت دەیکڕی، سەریەشەی زۆرترت بۆ دەنەنەوە، خۆ زۆر کەسی دیکەش خۆراكو چای تایبەتی خۆیان هەیە، ئەمە بۆ ئەوان ئاساییە، بەڵام بۆ تۆ ئاسایی نییە.

پۆڵاندییەکە ئەو قسەیەی کردو هەستاو ڕۆیی. دوای چەند دەقیقەیەك قسەکانی هاتنە دی.

***پەراوێز:***

***١-ڤارتیکولیتانبوست : ئەم وشەیە هیچ مانایەکی نیە. زیندانییەکە وایەزانی وشەیەکی فەرەنسیەو مانای خۆشرەفتاری دەگەیەنێ، بۆیە بەردەوام بە تەشەرو تەڵفیزییەوە بەو مانایە بە کاری دێنا.***

***٢-(کاجان) هیچ تەیرێك بەو ناوەوە نیە. وشەی کاجان لە هەندێ زمانی رۆژهەڵاتیدابە مانای شا یا میر دێت.***

***٣-"نیفالید" وشەیەکی سەروگوێ شکێنراوی فەرەنسیە لە (ئەنفالید)ەوە وەرگێراوە، بە مانای "نوقستانی جەنگ" دێت.***

***٤-کفاس خواردنەوەیەکە لە خوساندنی نانی رەش و ئاردی جۆ دروست دەکرێ.***

((٣))

## هەستە سەرەتاییەکان

٢-٣

هێشتا م...کی(١)* ( ئەو پۆڵاندییەی کەباسم کرد ) بە تەواوەتی نەگەیی بووە دەرێ کە گازین بەلارەلار خۆی بە مووبەقەکەدا کرد. فوول سەرخۆش بوو، زۆرم بەلاوە سەیر بوو، کە بە ڕۆژی ڕووناك ئەو دیمەنە لە زینداندا بدینم، بە تایبەتی لە کاتێکدا کە دەبوا هەموو زیندانییەکان بۆ کارو بێگار بڕۆن، کە کابرای مێجەر یەجگار بە زەبتو ڕەبتو سەختگیر بوو،و زۆرجار لە ناکاو خۆی بە ژوورو قاوشەکاندا دەکرد، ئەمە سەرباری ئەوەی ئەفسەرەکەی ژێر دەستی شەوو ڕۆژ خەریکی پاسەوانی بوو و بۆ ساتێکیش زیندانەکەی بەجێ نەدەهێشت، ئەمە جگە لە پاسەوانو دەرەجەدارانو چاودێرانی ناو زیندانەکە کە چاوپۆشیان لە کەمترین سەرپێچی نەدەکرد. بۆیە ماوەیەکی زۆرم پێویست بوو تا لەم جۆرە ڕووداوانە، کە لە سەرەتادا وەکو لەگەزو مەتەڵان بوو بە لامەوە، تێ بگەمو بچمە بنجو بناوانیو ڕیشەیان بدۆزمەوە.

پێشتر باسی ئەوەم کرد کە زۆربەی هەرە زۆری زیندانییەکان هەریەکەو کارو پیشەیەکی دەزانی، هەڵبەتە ئەم کارو کارکردنە زادەی پێویستییەکی ئاسایی بوو. ئەو کاتانەی لە بێگارو کاری حکومەتی دەبوونەوە، بۆ خۆیان کاریان دەکرد، هەم کاتەکەیان بەسەر دەبردو هەم پارەیەکیانیش بەدەست دێنا. خەڵکی زیندانی،پارەیان جگە لە ئازادی لە هەموو شتێکی دی خۆشتر دەوێ. بگرە بە هاوتای ئازادی دەزانن، زیندانی کە چەند کوپێکێکی لە گیرفانی خۆیدا شك برد زۆر دڵخۆش دەبێت، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر پارەی نەبێت هەمیشە پەستو خەمگینە، هێندە بێزارو نائومێد دەبێت، لەگینە لە پێناوی تۆزە پارەیەکدا تاوانی گەورەش بکات. هەر چەندە پارە لە زینداندا ئەو بایەخە گەورەیەی هەبوو، لە دڵی زیندانییەکاندا شیرین بوو، بەڵام زۆریش لەلایان نەدەمایەوە، چونکە پاراستنو پاشەکەوت کردنی یەجگار ئەستەمو قورس بوو. چونکە یان لێیان دەگیراو دەستی بەسەردا دەگیرا، یان لێیان دەدزرا. مێجەر کە لە ناغافڵدا بۆ تەحەڕی ژوورو قاوشەکان دەردەچوو، هەرکە زانیبای زیندانییەك کەمێك پارەی پاشەکەوت کردووە یەکسەری دەستی بەسەردا دەگرت، هەنگێ ئەو پارانە بۆ چاککردنی خواردنی زیندانییەکان تەرخان دەکرا، چونکە ئیدارەی زیندان هەر پارەیەکی لەو بابەتەی بۆ هاتبا، بۆ چاککردنی خۆراکی زیندانەکەی تەرخان دەکرد. خۆ ئەگەر مێجەریش پەی بە شوێنی پارەکانیان نەبردایە، ئەوا زۆربەی کات دەدزران. مەحاڵە زیندانیی متمانە بە کەسێك بکاتو دڵی بێت پارەی خۆی لا دابنێت. بەڵام وێڕای ئەوەش زیندانییەکان ئاخری ڕێگەیەکیان بۆ پاراستنی پارەکانیان دۆزییەوە. پیرەمێرێك هەبوو سەر بە یەکێك لە ئاینزاکانی شاری فیاتکا*(٢) بوو،و ئەمە پەنای بردبووە دەڤەری ستارودوب، ئیدی ئەم پیرەمێرە پاشەکەوتی زیندانییەکانی هەڵدەگرتو دەشاردەوە. حەز دەکەم بە چەند وشەیەك باسی ئەم پیاوە بکەم: پیاوێك بوو لە تەمەنی شەست ساڵیدا ، لاواز، کورتە باڵا، سەری ماشو برنجی تەواو بوو. کە یەکەمجار دیتم زۆری سەرنج

راکێشام، له‌ هیچ شتێکدا له‌ زیندانییه‌کانی دیکه‌ نه‌ده‌چوو. نیگای هێنده‌ مه‌نگ‌و ئارام‌و پڕ ئاشتی‌و ناسك بوو، که‌ حه‌زم ده‌کرد به‌رده‌وام ته‌مه‌شای چاوه‌ ساف‌و گه‌شه‌کانی بکه‌م. زۆرجار قسه‌مان ده‌گه‌ڵ یه‌ك ده‌کرد، به‌ ده‌گمه‌ن پیاوی وا دڵپاك، نه‌فس به‌رز،و خۆش خوو،و جوان ره‌فتارم دیتووه‌. ئه‌م پیاوه‌ به‌ هۆی تاوانێکی گه‌وره‌و ترسناکه‌وه‌ حوکم درا بوو و به‌ بێگاری هه‌واڵه‌ی تاراوگه‌ کرابوو. ژماره‌یه‌ك له‌ هاودینه‌کانی له‌ ستارودوب (ده‌ڤه‌ری چرنیجوف) هه‌ڵگه‌ڕابوونه‌وه‌و بوو بوون به‌ ئه‌رته‌دۆکسی. حکومه‌ت به‌ هه‌موو توانایه‌کی خۆیه‌وه‌ هانی دابوون له‌سه‌ر ئه‌و رێبازه‌ به‌رده‌وام بن،و هه‌موو یاخییه‌کانی دیکه‌ش بێنێته‌ سه‌ر هه‌مان رێگا. ئیدی پیره‌مێر ده‌گه‌ڵ توندڕه‌وانی دیکه‌ی ئاینزاکه‌دا لێده‌بڕێن به‌رگری‌و داکۆکی له‌ (ئاینه‌ کۆنه‌که‌) بکه‌ن. که‌ حکومه‌ت ده‌که‌وێته‌ دامه‌زراندنی کڵێسایه‌کی ئه‌رته‌دۆکسی له‌ شاره‌که‌یان، ئاگر به‌ کڵێساکه‌وه‌ ده‌نه‌ن‌و ده‌یسووتێنن. ئیدی به‌ هۆی ئه‌و کاره‌وه‌، یارۆی پیره‌مێرد ده‌گیرێت‌و ره‌وانه‌ی تاراوگه‌و زیندانی سیبیریا ده‌کرێت. ئه‌م پیره‌مێرده‌ پیاوێکی ده‌وڵه‌مه‌ند بوو، خه‌ریکی بازرگانی بوو. ژن‌و منداڵه‌کانی خۆش ده‌ویست، به‌ڵام وێڕای ئه‌وه‌ش به‌وپه‌ڕی وره‌به‌رزی رێگای تاراوگه‌ی گرته‌به‌ر، پێی وابوو ئه‌م ره‌نج‌و زه‌حمه‌ته‌ له‌ پێناوی باوه‌ڕه‌که‌یدا (ئاینه‌ کۆنه‌که‌) ده‌کێشێت‌و ئه‌مه‌ی له‌ گیان خۆش بوو.

پیاو، پاش ئه‌وه‌ی ماوه‌یه‌ك ده‌گه‌ڵ ئه‌م پیره‌مێره‌دا به‌سه‌ر ده‌بات، به‌ ناچاری له‌ خۆی ده‌پرسێت: "ئه‌م پیاوه‌ چۆن توانیویه‌تی یاخی ببێ، به‌گژ حکومه‌تدا بچێت؟" چه‌ند جارێك ویستم باسی ئاینه‌که‌یم بۆ بکات، خۆی ده‌دزییه‌وه‌، باسی ئاینه‌که‌ی نه‌ده‌کرد، به‌ڵام هیچ قه‌ڵسی و توڕه‌یییه‌ك له‌ وه‌ڵامه‌کانیدا نه‌بوو. که‌چی وێڕای ئه‌وه‌ش ئاگری له‌ کڵێسایه‌ك به‌ردا بوو و سووتاندبووی... هه‌رگیز حاشای له‌و کاره‌ نه‌ده‌کرد: قه‌ناعه‌ت ته‌واوی به‌وه‌ هه‌بوو که‌ ئه‌م تاوانه‌ی یان خۆی گوته‌نی ئه‌م شه‌هاده‌تکاریه‌ (العمل الاستشهادی) مایه‌ی سه‌ربه‌رزی‌و شانازی خاوه‌نه‌که‌یه‌تی. زۆر جار پرسیارم لێده‌کردو ده‌مویست قسه‌ی لێده‌ربێنم‌و له‌و رێگه‌یه‌وه‌ زیاتری بناسم، به‌ڵام بێهوده‌. قه‌ت رۆژێ له‌ رۆژان لووتبه‌رزی،و فیزو ده‌عیه‌و خۆ په‌سندیم لێی نه‌بینی. زیندانییانی دیکه‌شمان له‌گه‌ڵ هه‌بوون که‌ سه‌ر به‌ هه‌مان ئاین‌و ئاینزای ئه‌رته‌دۆکسی بوون، زۆربه‌یان خه‌ڵکی سیبیریا بوون، ئه‌مانه‌ زیره‌ك‌و زیته‌ڵ بوون وه‌کو زۆربه‌ی جووتیاران. ئه‌مانه‌ حه‌زیان له‌ مشت‌و مڕو گه‌نگه‌شه‌و موناقه‌شه‌ بوو، هه‌ڵبه‌ته‌ به‌ شێوازی خۆیان، کوێرانه‌ پابه‌ندی ئاینه‌که‌ی خۆیان بوون، و به‌ ئاشکرا حه‌زیان له‌ موناقه‌شه‌ بوو. به‌ڵام عه‌یبیان زۆر بوو! له‌ راده‌به‌ده‌ر لووتبه‌رزو فڕناخ‌و خۆپه‌سند بوون، رێك به‌ پێچه‌وانه‌ی هاوڕێ پیره‌که‌مانه‌وه‌ که‌ له‌ هیچ شتێکدا له‌وان نه‌ده‌چوو. هه‌رچه‌نده‌ زۆر له‌وان پتر شاره‌زای ئاینه‌که‌ بوو، له‌وان رۆشنبیرترو خوێنه‌وارتر بوو، به‌ڵام هه‌میشه‌ خۆی له‌ باس‌و گه‌نگه‌شه‌ی ئاینی دوور ده‌گرت، ته‌بیعه‌ت نه‌رم، خۆشخوو، رووخۆش بوو، هه‌میشه‌ شادو ده‌م به‌ پێکه‌نین بوو، به‌ڵام پێکه‌نینه‌که‌ی وه‌کو پێکه‌نینی زیندانیه‌کانی دی ناخۆش و ته‌وسامێز نه‌بوو، به‌ڵکو نه‌رم‌و خۆشنه‌وا بوو، و زیاتر له‌ پێکه‌نینی منداڵێکی بێگه‌رد ده‌چوو، که‌ ده‌گه‌ڵ سه‌ره‌ سپییه‌که‌یدا زۆر ده‌گونجا. (ره‌نگه‌ ئه‌گه‌ر بڵێم که‌سایه‌تی پیاو له‌ میانه‌ی پێکه‌نینه‌که‌یه‌وه‌ ده‌ناسرێت بکاته‌ زێده‌ڕۆیی،و بۆچوونێکی

هەڵەبێ، بەڵام ئەوەی من سەرنجم داوە ئەوەیە کە پێکەنینی پیاوی باش خۆش‌و دڵگیرە، پێکەنینی پیاوی خراپ‌و دڵڕەش بە پێچەوانەوەیە.) زیندانییەکان زۆریان ڕێزی ئەم پیرەمێردە دەگرت، بەڵام ئەمە تووشی لە خۆبایی بوونی نەکرد بوو. زیندانییەکان پێیان دەگوت (باپیرە)، قەت هەستیان بریندار نەدەکرد، دڵیان نەدەڕەنجاند، هەنگێ زانیم کە ئەم پیرەمێردە چۆن توانیویەتی کاریگەرییەکی زۆر بەسەر پەیڕەوانی ئاینەکەیەوە پەیدا بکات. هەرچەندە ئەم پیرەمێردە، بە رواڵەت ورەبەرزو ئارام‌و ڕووخۆش بوو، گوێی بە دژواری ژیانی زیندان نەدەدا، بەڵام دەردو ئازارێکی بەسوێ لە ناخیا شەپۆلی دەداو هەوڵی دەدا ئەم دەردو ئازارە پەنهانەی خۆی لە هەمووان بشارێتەوە. من بە ڕێکەوت پەیم بەم ئازارە پەنهانەی برد. لە بیرمە شەوێکیان، نزیکەی سەعات سێی بەرەبەیان لە خەو ڕابووم، گوێم لە دەنگی گریانێکی سووك بوو. تەمەشای دەوروبەری خۆم کرد، سەیرم کرد پیرەمێرەکە لە پاڵ سۆپاکە دانیشتووەو ( هەمان سۆپای کە پێشتر ئەو کابرایەی ویستی مێجەر بکوژێت لە پاڵیا نوێژی دەکرد )و دەستنووسی کتێبە ئاینییەکەی خۆی دەخوێندەوە. گوێم لێبوو بەدەم گریانەوە دەپاڕایەوە: "خودایا پشتم تێ مەکە! خودایا هەر تۆی پەنای بێ پەنایان! خودایا ورەم بدەیە... منداڵە چکۆلە داماوەکانم، منداڵە کلۆڵەکانم!... ئەی ئازیزترین ئازیزانم... جارێکی دیکە هەرگیز ناتان بینمەوە..." مەگەر هەر خوا بەخۆی بزانێ هەنگێ چەندم سوو لێ خوارد!.

ئێستا ئەم پیرەمێردە بوو بوو بە ئەمیندارو بانقی پارەی زیندانییەکان. لە زیندانەکەدا وا باو بوو – مەگەر خوا بزانێ لەبەرچی؟ – کە کەس ناتوانێ دزی لە پیرەمێرد بکات. دەیانزانی ئەو پارەو پاشەکەوتانە لە شوێنێکدا دەشارێتەوە، بەڵام کەس نەی توانی بوو ئەو شوێنە بدۆزێتەوە. کاتێ کە تەواو لە یەکدی نزیك بووینەوە بە خۆی نهێنگەی پارەکانی بە من‌و پۆڵاندییەکە نیشاندا. بیری لە شتێکی سەیر کردبووەوە، لە نێو یەکێك لەو عامودانەوە کە بە سفتی‌و بە چوار دەوری زیندانەکەدا داکوترا بوون‌و حەساری زیندانەکەیان پێك هێنا بوو، لقێك هاتبووە دەرێ، ئەگەر بەسەر پێیی سەیرت کردبا واتدەزانی بە عامودەکەوە بەستراوەو مەحاڵە دەربهێنرێ یان لێی بکرێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا بە ئاسانی دەردەهێنراو دەخرایەوە شوێنی خۆی، هەڵبەتە بۆ شاییەك لە نێوان عامودەکەو لقەکەدا هەبوو. ئیدی باپیرە ئەم بۆشاییەی کردبوو بە قاسەی پارەکان‌و کەس مەزەندەی بۆ نەدەچوو.

جا ئێستا با بێمەوە سەر باسەکەی خۆم. باسی ئەوەم دەکرد کە زیندانییەکان بۆچی پارەیان زۆر پێ نەدەما ؟ زیندانی پارە زۆر لەلای خۆی گل ناداتەوە، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی پاراستن‌و هەڵگرتنی زەحمەتە، بەڵکو لەبەر وەزع‌و حاڵە کۆمەڵایەتییە تایبەتیەکەشیان... بابایەکی زیندانی بە تەبیعەت تامەزرۆو تینوی ئازادیە!و زۆرجار ناچارە ساڵ بە ساڵ، بێئەوەی کەمترین ئومێدی بە ئازادی هەبێ، درێژە بەم ژیانی ئەسارەتی دوور لە ئازادیە بدات. جا لەم حاڵەدا نە هەقیەتی بیر لەوە بکاتەوە، بە هەر نرخێ بووە، ئەگەر بۆ چەند ساتێکیش بووە لە ڕێگەی بادەنۆشیەوە، خەمی خۆی بە بادا بدات ؟ پیاو زۆری پێ سەیرە کە خەڵکانێك دەبینێ بە دڵ‌و گیان، بە سەبرو حەوسەڵەیەکی زۆرەوە، شان دەدەنە بەرکار، تەنیا بۆ ئەوەی هەرچییەکیان بەرەنجی شان‌و

ئارەقەی ناوچەوان‌و بە ماوەیەکی زۆر پەیدا کردووە، لە یەك رۆژاو بە کەرەتێك تا دوا قرۆش لە پای بادەنۆشیدا دابنەن!... ئەوسا سەر لە نویێ تێهەڵدەچنەوەو شان دەدەنە بەر کارو چەندین مانگ چاوەڕوان دەکەن تا کات‌و وەختی بۆنەیەکی تازە دێتە پێشیێ. هەندیێ لە زیندانییەکان مەراقیان جلی جوان‌و ناوازەیە، پارەکانیان دەدایە پانتۆڵی عەنتیکە، چاکەت، پاڵتۆی سیبیریایی... بەلاّم لە هەموو شت زیاتر حەزیان لە کراسی هندی دەکرد، حەزیان لە پشتێنی چەرمی ئاوزوونەدار دەکرد.

شیکپۆشان، لە بۆنەو جەژناندا*(٣) جوانتریان جلکی خۆیان لەبەر دەکرد: خۆزگە دەتبینین چۆن بۆ خۆ نواندن ئەم ژوورو ئەو ژووریان دەکرد! هێندە دڵیان بە جلە تازەو جوانەکانیان خۆش بوو دەتگوت منداڵن. ئەلهەقی زیندانییان لە زۆر شتدا منداڵی گەورەن. جا ئەم هەموو جلە تازەو جوانانە کوت‌و پڕ نەدەما، زۆرجار لە هەمان رۆژی کرینیدا، بۆ ئێوارەکەی دیار نەدەما، یانی خاوەنەکانیان یا دەیانخستنە رەهنەوە یان تالاّنفرۆشیان دەکرد یان لێیان دەدزرا. دیارە بۆنەو ئاهەنگ‌و جەژنەکان کاتیان دیار بوو، ئیدی یان جەژن‌و ئاهەنگە ئاینییەکان بوو، یان جەژن‌و بۆنەی لە دایکبوونی شەخسی*(٤) بوون. ئەو کەسەی جەژنی لە دایکبوونی خۆی دەگێڕا، کە وەکو هەمیشە بەیانی لە خەو هەڵدەستا، مۆمێکی دێنا، لەبەردەم پەیکەری مریەمی پاکیزەدا دایدەنا،و ئەوسا نوێژو نزاو دوعای دەکردو، هەنگیێ جوانترین جلی لەبەر دەکردو، دەچوو، خواردنی تایبەتی، لەکیسەی خۆی بەڕادان دەدا. گۆشت‌و ماسی‌و... دەکڕی‌و ئیدی بە تاقی تەنیا وەکو گاجووت بەر دەبووە خواردن... بە دەگمەن هاوڕێیەکی خۆی بۆ ئەم بۆنەو ئاهەنگە دەعوەت دەکرد. دوای ئەوەی مڕ دەبوو ئەوجا نۆرەی مەی‌و بادە دەهات: زیندانی بەکەیفی دڵی خۆی دەیخواردەوە، مەستی مەست دەبوو، ئەوجا بەلارە لار دەکەوتە گەڕان بە ژوور قاوشەکاندا، بەدەم رێکردنەوە بەسەر هەر شتێکدا کە هاتبا رێگەی دەکەوت‌و دەیویست بە هەموو هاوڕێکانی نیشان بدات کە سەرخۆش و مەستە، تا رێزو حورمەتی بگرن. چونکە گەلی رووسی بە شێوەیەکی گشتی هاوسۆزی دەگەڵ خەڵکی مەستدا دەنوێنن. بەلاّم لە زینداندا، هەستی زیندانییان لە هەنبەر مەستاندا زیاتر رێزو حورمەتە نەك سۆزداری. مەستی‌و بادەنۆشی لە زینداندا جۆرە نیشانەیەکی ئەرستۆکراتیەتە. ئیدی ئەم زیندانیە هەر کاتیێ ئارەزووی شادی‌و گۆرانی کردبا، مۆزیکژەنێکی بانگ دەکردو پارەی دەدایە کە مۆسیقای بۆ لێبدا. جا لە زینداندا کابرایەکی پۆلاّندیمان دەگەڵ بوو کە لە عەسکەری هەلاّتبوو، کورتە بالاّیەکی ناشیرینی رەزا قورسی بەدفەساڵ بوو... بەلاّم کەمانچەژەنێکی باش بوو، هەمیشە کەمانجەکەی پیێ بوو. ئەم پیاوە جگە لە کەمانجەژەنی هیچ کارێکی تری نەدەکرد. جارجاریێ لە رێگەی ئەم کەمانجەژەنیەوە پارەیەکی کەمی پەیدا دەکردو هەر زیندانییەکی مەست دەیتوانی بەکرێی بگریت‌و گویێ لە ئاهەنگ‌و ئاوازە شادو روح بزوێنەکانی بگرێت. ئیدی ئەم پیاوە دەبوایە کون بە کون، ژوور بە ژوور، قاوش بە قاوش دوای زیندانییە مەستەکە بکەوێت‌و بە هەموو توانایەکیەوە ئاوازی شادی بۆ لێبدات. زۆرجار ماندوویەتی بە سیمایەوە دەردەکەوت، لە دووبارە کردنەوەی لە رادەبەدەری ئەم مۆسیقایە بێزار دەبوو، بەلاّم چاری نەبوو دەبوا بە گوێی وەلی نیعمەتەکەی بکات کە هاواری

بەسەردا دەكرد: "دەی بژەنە، پارەت وەرگرتووە، خۆ بە خۆڕایی ناژەنی." هەنگێ لەسەر هەمان ئاواز، بەتین‌و تاوێكی زیاترەوە بەردەوام دەبوو.

جا ئەو زیندانییە مەستانە زیاتر بە پشتیوانی هاوڕێكانیان خۆیان خومار وشاد دەكرد، چونكە دەیانزانی ئەگەر لە تایم دەربچن یان بە ڕێكەوت مێجەر بێت بەسەرا، هاوڕێكانیان دەیان بەنەوە سەر جێگاكانیان، دەیانشارنەوەو نایەڵن مێجەر پێیان بزانێ. ئەم خزمەتە، خزمەتێكی خۆڕایی بوو. بێ هیچ نیازو مەبەستێك دەكرا، هیچ قازانج‌و بەرژەوەندییەكی لە دوا نەبوو. هەڵبەتە پاسەوان‌و چاودێرو دەرەجەدارو سەربازو كارمەندانی زیندانەكەش چاوپۆشیان لەم بادەنۆشیانە دەكرد. چونكە بە تەجرەبە دەیانزانی یارۆی مەست‌و شەنگۆڵ هیچ ئاژاوەو هەرایەك نانێتەوە. هەركاتێ بهاڕوژێ یان بیەوێ هەراو هەنگامە بنێتەوە، هاوڕێكانی هێوری دەكەنەوەو بەرهەق‌و كۆنترۆڵی دەكەن. هەروەها دەیانزانی بە قەدەغەكردنی بادەنۆشی، هەموو كاروبارێكی زیندانەكە ژێرو ژوور دەبێت‌و دەشێوێ. جا پرسیار ئەمەیە : ئەم زیندانییانە چۆن مەی‌و خواردنەوەیان دەست دەكەوت ؟

زیندانییەكان هەر لە ناو زیندانەكەداو لە مەیفرۆشەكانیان دەكڕی ( زیندانییەكان بەو كەسانەیان ، كە ئەم كارەیان دەكرد دەگوت مەیفرۆشان، ئەمە كاسبیەكی بە قازانج بوو، هەر چەندە ژمارەی مەینۆشان‌و ئاهەنگ گێڕان كەم بوو، چونكە خەرجی ئەم ئاهەنگ‌و بۆنانە، لە چاو كەم دەرامەتی زیندانییەكاندا یەجگار زۆرو گران بوو ). ئەم كاسبیە بە شێوەیەكی سەیرو عەنتیكە دەستی پێدەكرد، بەردەوام و تەواو دەبوو. زیندانییەكی دەست‌و پێ سپی دێت، هیچ كارێك نازانێت‌و، نایەوێ هیچ كارێكیش بكات،‌و حەزیش دەكات‌و سوورە لەسەر ئەوەی كە بەزووترین كات دەوڵەمەند ببێ، ئیدی هەركە تۆزێ پارەی دێتە دەست، بڕیار دەدا بكەوێتە كڕین‌و فرۆتنی مەی‌و بادە. دیارە ئەمە ڕێسك‌و قومارێكی ترسناكە، جورئەتێكی گەورەی دەوێ، چونكە یارۆی ریسككار هەر قومار بە خودی خۆی ناكات، هەر خۆی ناخاتە تالوكەوە، بگرە ماڵەكەشی دەخاتە مەترسیەوە، بەڵام كابرای مەیفرۆش گوێ بەم كۆسپ‌و مەترسیانە نادات. لە هەوەڵەوە بەخۆی، بە قاچاغ مەیەكە دێنێتە ناو زیندان، چونكە هێشتا دەستمایەیەكی ئەوتۆی نیە، ئیدی مەیەكەی دەفرۆشێت‌و خێرێكی باش دەكات.چەشە دەبێت‌و ئەم كارە دووبارەو سێبارە... دەكاتەوە. خۆ ئەگەر ئیدارەی زیندان پێی نەزانی، ئەوەندەی پارە دەستدەكەوێ كە كارو كاسبیەكەی گەورەتر بكات... هەنگێ دەبێت بە قۆنتەراتچی، بە سەرمایەدار : شاگردو مەعمیل‌و هاوكار دەدۆزێتەوەو بەمەش هەم لە تالوكەو مەترسیان دوور دەكەوێتەوەو هەم قازانجێكی زیاترو بێ سەریەشەتری دەستدەكەوێ. چونكە لەم حاڵەدا شاگردو هاوكارەكانی لە جیاتی ئەوو لە پێناوی ئەودا ڕیسك دەكەن.

زیندان، هەمیشە پڕە لە زیندانییانی لات‌و بێكارو دەست‌و پێ سپی، بەڵام لە بری ئەوە بوێرو نەترسن، چاپك‌و چەلەنگن. بوێری‌و سەركێشی تاقە دەستمایەو سەرمایەیانە، زۆرجار لێدەبڕێن ئەم دەستمایەی خۆیان بخەنە كار، ئیدی پێشنیاز بۆ یارۆی مەیفرۆش دەكەن كە بە قاچاغ مەی بۆ بگەیەننە ژوورو قاوشەكانی زیندان. هەڵبەتە ئەم مەیفرۆشە لە شاریشدا خەڵكانێكی هەن،

ئیدی سەرباز بێ یان کاسبکار یان ژن کە بە پارەی ئەو مەی دەکڕن ( دیارە ئەمانە بە کرێیەکی دیاری کراو ئەو کارە دەکەن، کە بە شێوەیەکی گشتی کرێیەکی کەمە )و دەیهێنن‌و لە شوێنێکی تاقەت دەکەن کە زیندانییە قاچاغچییەکە پێی بزانێ، نزیك بێت لەو وەرشەو کارگەیەوە کە زیندانییەکە کاری تیا دەکات، دیارە قاچاغچییەکە لە ڕێگای گەڕانەوەدا بۆ زیندانەکە لە هەر بوتڵە کەمێك دەخواتەوەو پاشان بە ئاو پڕی دەکاتەوەو... زمانی حاڵی دەڵێت: "دەتەوێ ئەوەیە ناتەوێ هەر ئەوەیە. سوێسکەت دەوێ ئەوە قوڵتە، قوڵتەت دەوێ ئەوە قوڵتە "... دیارە یارۆی مەیفرۆش ناتوانێ هیچ شتێك بکات‌و دەبێ مەمنونی بەختی خۆی بێت کە بەو شێوەیە مەیەکەی بۆ هاتووەو، پارەکەی لێنەدزراوە. ئەو قاچاغچییەی، کە مەیفرۆشەکە بۆ لای مەعمیل‌و وەسیتەکەی دەنێرێ، ڕیخەڵۆکێکی مانگا، کە پێشتر بە جوانی خاوێن کراوەتەوەو کەمێك ئاوی تێ کراوە بۆ ئەوەی وشك نەبێتەوەو نەشکێت، لە ژێر جلەکانییەوە دەشارێتەوەو بۆ کابرای وەسیتی دەبات... ئیدی لێرەوە بوێری‌و لێزانی ئەو زیندانییانە دەردەکەوێ... دەبێ یەجگار کارامەو تەڕدەست بن، دەنا کەشف بن، ئابڕویان دەچێت : دەبێ فێڵ لە پاسەوانەکە بکەن، نەیەڵن ئەو زیندانییانەی لەگەڵیاندا بۆ کار دەچن پێی بزانن، پاسەوانەکان بە زۆری سەربازی ئیجباری بوون. ئیدی ئەگەر قاچاچچیەکە زیرەك بوایە، نە پاسەوانەکە هەستی پێدەکردو نە هاوڕێ زیندانییەکانی پێدەحەسیان. بۆ نموونە ئەگەر کوورەچی‌و وەستای کەرپووچان بوایە، سەردەکەوت بۆ سەر کوورەی کەرپووچەکان، هەڵبەتە پاسەوانە سەربازەکە لەم حاڵەدا دوای نەدەکەوت تا بزانێ چی دەکات‌و چی ناکات. ئیدی کەس نەیدەزانی‌و نەیدەبینی لەو سەرەوە چیدەکات.لەو سەرەوە ڕیخەڵۆکەکەی، دوور لە چاوی خەڵك، تەژی مەشرووب دەکردو دەگەڕایەوە.کە کاتی گەڕانەوە بۆ زیندان دەهات، دراوێکی پازدە یان بیست کۆپیکی ئامادە دەکردو، چاوەڕوانی پاسەوانەکەی بەر دەرگای دەکرد. پاسەوانەکە، هەر زیندانییەکی بە وردی‌و بە جددی دەپشکنی، پاشان دەرگاکەی بۆ دەکردەوە، یارۆی قاچاغچی بە ئومێدە کە پاسەوانەکە شەرم بکات‌و ناوگەڵی‌و شوێنە حەساسەکان نەپشکنێت، بەڵام شتی وا نەبوو، پاسەوانەکە ئەگەر زیرەك‌و کارامە بێ، هەر بە چاو پەی بە شوێنی مەشرووبە قاچاغەکە دەبات،و هەنگێ زیندانییە قاچاغچییەکە هیچ چارێکی نەدەما تەنیا ئەوە نەبێ بە دزییەوە پارچە دراوەکە بخاتە دەستی پاسەوانەکەوە. ئیدی بەم شێوەیە مەیەکە زۆرجار بە سەلامەتی دەگەییە دەست کابرای مەیفرۆش. خۆ ئەگەر ئەم نەخشەیە سەری نەگرتبا، ئەوا یارۆی قاچاغچی دەبوا مل بۆ سزا بدات. کابرای پاسەوان (عەریف) ڕاپۆرێکی بۆ مێجەر دەنووسی،و مێجەر فەرمانی دەدا کە بەوپەڕی توندی قاچاغچی قەرەبەخت بەر جەڵدەو شەلاقان بدرێ‌و، دەست بەسەر مەیەکەدا دەگیرا... کابرای قاچاغچی، ملی بۆ سزایەکە دەداو هەرگیز ناوی قۆنتەراتچییەکەی (مەیفرۆشەکە) نەدەهێنا، نەك لەبەر ئەوەی بەم ئیعترافە ئابڕووی دەچوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی هیچ خێرو قازانجێکی پێنەدەگەیاند، چونکە ئەگەر ناوی دابا یان نا ئەو شەلاقکاری دەکرا، خۆ ئەگەر ناوی دابا ئەوپەڕەکەی کابرای قۆنتەراتچی دەکرد بە شەریکە سزای خۆی، بەڵام ئەو پێویستی بە

کابرای مەیفرۆشە، دنیا هەر ئەمڕۆ نیە، چۆن زمانی لێدەدات! هەرچەندە، ئەگەر کەشف ببیٚو نەتوانیٚ مەیەکە بگەیەنێتە ناو زیندان تاقە پولێك کرێی نادرێتیٚ.

زمان لێدانو بوختانو بەدگۆیی لە زینداندا باوە. کەچی زیندانییەکان لە جاسووسو سیخوڕان تووڕە نابنو لە خۆیان دوور ناخەنەوە، بگرە زۆرجاریش دۆستایەتیان دەکەن، خۆ ئەگەر یەکێك بیەویٚ بە زیندانیەکانی بسەلمێنیٚ کە بوختان و زمان لێدان کارێکی ناشیرینە. ئەوا کەس نە لێیٚ دەگاتو نەگوێی لێدەگرێت. ئەو نەجیمزادەیەی کە پێشتر باسم کرد، ئەو پیاوە نامەردو خوێڕیو ترسنۆكو نەفس نزمەی کە هەر گەییمە زیندانەکە پەیوەندیم دەگەڵ بڕی، دۆستو برادەری (فدکا)ی خولامی مێجەر بوو، هەرشتێك لە زیندانەکەدا روویدابا بۆی دەگێڕایەوە، هەڵبەتە فدکاش بۆ ئاغای خۆیی دەبرد. هەموو زیندانییەکانیش بەمەیان دەزانی، بەلام کەس بیری لەوە نەدەکردەوە لەسەر ئەو شتە سزای بدات، یان گلەیی لێبکات. بەلام وادیارە لە خەتی باسەکەم دەرچووم، با بێمەوە سەر باسەکەی خۆم:

هەر کاتیٚ مەشرووبەکە گەیشتبایە زیندان، مەیفرۆشەکە کرێی یارۆی قاچاخچی دەداو دەکەوتە حیسابو چێکی قازانجو زەرەری خۆی. تا ئێستا بەس پارەی داوەو هیچی تر، یانی کالاکە زۆری لەسەر کەوتووە، بۆیە چار نیە بۆ ئەوەی خێرو قازانجێکی دەست بکەویٚ دەبیٚ یەکاو یەك ئاوی زولالی تێکەلاو بکاتو هەنگیٚ بیٚ خەم، چاوەڕوانی مشتەریو کڕیار دەکات. ئەمەش چاوەڕوانیەکی زۆری ناویٚ، چونکە زیندانیی هەرکە بۆنی کرد، بە بۆنەو بیٚ بۆنە، لە هەوەڵی هەر رۆژێکی هەفتەدا: ئەوەی بە درێژایی چەندین مانگ بەرەنجی شانو ئارەقی نێو چەوان پاشەکەوتی کردووە، دەیهێنیٚو بە یەك کەرەت دەیدات بەمەیو تەواوی دەکات. زیندانیی بەدبەخت لە مێژ بووە خۆی بۆ ئەو رۆژە ئامادە کردووە، شەوانی درێژی زستان خەونی پێوە دیتووە، بە دەم کاری قورسو بێگاری تاقەتبەرەوە بە ئومێدی هاتنی ئەم رۆژە ژیاوەو، ئەمێستا ئەو رۆژە چاوەڕوانکراوەی لیٚ هەلاتووە: پارەکەی بە مۆڵی لەلا ماوە نە دەستی بەسەرا گیراوەو نە لێی دزراوە، ئازادە لەوەی بە کەیفی دڵی خۆی خەرجی بکات، ئیدی بەپەلە بە خۆیو پاشەکەوتەکەیەوە بۆ لای مەیفرۆشەکە دەچێت، ئەویش یەکسەر یەك قاپی دەداتیٚ کە یەکاو یەك ئاوە. هەرکە شتێکی لێخواردەوە،و قاپەکە تۆزێك بە تاڵ بوو، خێرا مەیفرۆشەکە بە ئاو بۆی پڕ دەکاتەوە، یانی لە ئەنجامدا هەر پێکە مەیەك شەش هێندەی نرخی ئەسلی خۆی لە دەرێی زینداندا، لەسەر زیندانییەکە دەکەوێت. ڕەنگە وا تەسەوربکەن کە بەم پێودانگە، زیندانییەکە دەبیٚ مەیەکی یەجگار زۆر بخواتەوە تا سەرخۆشو مەست ببێت،و پێش ئەوەی مەست ببێت پارەیەکی زۆر بدات... بەلام لە ڕاستیا زیندانیی، وێڕایی روونی مەیەکەو کەمی کحولەکەی، زۆر زوو، چونکە درەنگ دەخواتەوەو بە زەبری شوێنەکەیو یاساغی مەی، بەدەنی پاراوی مەی نیە، زۆر زوو و بە چەند پێکێکی کەم مەستو سەرخۆش دەبێتو، وێڕای ئەوەش تا دوا پولی تەواو دەکات هەر دەخواتەوە، پاشان دەچێت کەلو پەلە تازەکەی دەفرۆشێت یان بەرەهنی دەدات تا لەسەر خواردنەوە بەردەوام بێت، هەڵبەتە مەیفرۆشەکە مامەڵەی قەرزو بارمتەکاریش دەکات، جا زیندانییەکە کە شمەکە شەخسیەکانی، هەڵبەتە کەمن، تەواو بوو ئەوسا دەچێت ئەو

شمەكو كەلوپەلانەی، حكومەتی پێی داوە، دەخاتە ڕەهنو بارمتەوە. پاش ئەوەی هیچی بە دەستەوە نامێنی، پارەی دوا كراسو دوا شڕو شیتاڵی خەرج دەكات، كە بەیانی بە خوماری لە خەو ڕادەبێت، دەچێت لە كابرای مەیفرۆشە دەپاڕێتەوە كە بە قەرز پێكێكی خومارشكێنی بداتێ، هەڵبەتە مەیفرۆشەكە قەترەی بە قەرز ناداتێ، ئیدی ئەو بەستەزمانە بە نائومێدیو خەمینی دەگەڕێتەوە. ئەوسا لەو ڕۆژەوە، دیسان دەكەوێتە كار، چەندین مانگ ڕەنج دەدا، خۆی ئەزیەت دەدات،و خەو بەو ڕۆژە خۆشەوە دەبینیو بە یادی ئەو ڕۆژەوە دەژی... بەرە بەرە وەخۆ دێتەوە، ورە پەیدا دەكاتەوەو چاوەڕوانی ڕۆژێكی دیكەی لەو بابەتە ڕۆژانە دەكات، ڕاستە ڕۆژێكی دوورە، بەڵام كەسێ نەمرێ هەر دەیبینێ. جا كاتێ كە مەیفرۆشەكە پارەیەكی باش پەیدا دەكات، یانی نزیكەی سەد ڕۆبڵێك، هەنگێ مەی دەكرێت، بەڵام ئەمجارەیان ئاوی تێكەڵ ناكات، چونكە بە تایبەتی بۆ خۆیی دادەنێ: ئیدی مامەڵەو كاسبی بەسە... با ئەویش خەمێ بەبادا بداتو كەمێك ڕابوێرێ. خۆ مردن هەڵنەگیراوە!... ئیدی ڕۆژێك بۆ ئاهەنگەكە دەست نیشان دەكرێت ( و دەمی پاسەوانو كارمەندو چاودێرە چكۆلەكان چەور دەكات تا ڕێی بدەن ). لەم ئاهەنگەدا هەم بادەنۆشیو هەم موسیقاو هەم خواردنی دانسقەو تایبەتی فەراهەمە... ئەم ئاهەنگە جاری وایە چەند ڕۆژێك بەردەوام دەبێت،و كە زەخیرەی مەشرووبی تەواو دەبێ، دەچی بۆ لای مەیفرۆشەكانی دیكەو تا دوا قرۆشی خەرج نەكات دەستبەرداری خواردنەوە نابێت. جا بە درێژایی ڕۆژانی ئەم ئاهەنگە، زیندانییەكان چاودێری ئەو هاوڕێیانەیان دەكەنو هەوڵدەدەن كە ئەگەر مێجەر یان ئەفسەری خەفەر لە پڕ خۆیان بە زیندانەكەدا كرد، هاوڕێ ئاهەنگێڕەكەیان بشارنەوەو نەیەڵن مێجەر پێی بزانێت، بەڵام وێڕای ئەوەش زۆر جار مێجەر كە لێیان بەگومانە، دەیاندۆزێتەوەو هەنگێ یارۆی مەستو سەرخۆش دەبرێ بۆ ژووری قەساس، ئەگەر پارەیەكی پێ مابێ، دەستی بە سەردا دەگیرێو پاشان شەلاقكاری دەكەن، كە لێ دەبنەوە، كابرای مەست وەكو سەگێك لە سیاناو هاتبێتە دەرێ، خۆی دەتەكێنێو بۆ زیندانەكە دەگەڕێتەوە، دوای چەند ڕۆژێك دەست بە بادە فرۆشی دەكاتەوە.

لە نێو زیندانییەكاندا هەندێجار خەڵكی تۆلازو مێباز هەبوون. ئەمانە بەزەبری پارەیەكی زۆر هەندێجار سەربازێك لە سەربازە پاسەوانەكانیان فریو دەدا، بەدزییەوە لە زیندانەكەیان دەبردنە دەرێو لە جیاتی بۆ كارو بێگاریان بەرن، دەچوون بۆ جندەخانەیەكی قەراغ شار. لەوێندەر، لە ماڵێكی كروكپ دا، ئاهەنگێكی گەورەی پڕ مەسرەفیان سازدەكرد. ئەو سەربازانەی كە قاییل دەبوون، یەكێك لەو جۆرە زیندانییانە بۆ ئەو جۆرە شوێنانە بەرن بەرتیلێكی زۆریان وەردەگرت، بۆیە هەندێجار بە تەماحی پارەی زۆر، زەمینەیان بۆ ئەو جۆرە كارە خۆشدەكردو دەرفەتیان بۆ دەڕەخساند. هەڵبەتە زۆر ئاسایی بوو ئەو جۆرە سەربازانە كەشف بنو، بگیرێنو بخرێنە زیندانەوەو بە خۆیان ببنە زیندانی. دیارە ئەم كارە زۆر بە نهێنیو دزییەوە دەكرا. پێویستە ئەوەش بڵێم كە ئەم كارە یەجگار كەمە، چونكە خەرجیەكی زۆری دەوێ،و هەوادارانی تۆلازی و مێبازی پەنا دەبەنە بەر ڕێگەی هەرزانتر.

دوای ماوەیەکی کەم لە هاتنم بۆ زیندان، زیندانییەکی گەنجی جوانخاس‌و ڕەزا شیرین سەرنجی ڕاکێشام: ناوی سیروتکین بوو. ئەم کوڕە لە زۆر رووەوە لە لەگەزو مەتەڵ دەچوو. لە هەوەڵەوە سیمای سەرنجی ڕاکێشام. تەمەنی لە ٢٣ ساڵ تێنەپەڕی بوو، لە (بەشی تایبەتی) زینداندا بوو، واتا حوکمی ئەبەدی‌و بێگار درابوو، بەو پێیە دەبوا وا تەمەشا بکرێ کە لە تاوانبارە سوپاییەکان ترسناکترە. کوڕێك بوو هێمن، ناسك، قسە خۆش‌و، کەمدوو، بەدەگمەن پێدەکەنی. چاوانی شین، پێستی ناسك، قژی زەرد، هێندە منداڵ‌و بێگەرد دەینواند، پیاو باوەڕی نەدەکرد تاوانێکی ئەوتۆی کرد بێت، شایستەی زیندانی تایبەتی‌و بێگار بێت. هەرچەندە هیچ ئیش‌و کارێکی نەدەکرد، بەڵام ناوبەناو پارەیەکی کەمی دەهاتە دەست. لە ژیانما خەڵکی وا تەمەڵ‌و تەوەزەلم نەبینی بوو،و جل‌و بەرگەکەی شڕۆڵە بوو. خۆ ئەگەر کەسێك بە خێری خۆی بۆ نموونە کراسێکی سووری دابووایە، لە خۆشیا لە پێستی خۆی نەدەهێوری، کراسەکەی لەبەر دەکردو بۆ خۆنواندن، سەرانسەری زیندانەکەی وەژێر پێیانەوە دەدا. سیروتکین، نە بادەنۆشی دەکردو نە قومار، کوڕێکی لاشەڕو بێ کێشە بوو. زۆربەی جار، کاتی دەستبەتاڵی بە پیاسە لە حەوشی زیندانەکەدا بەسەر دەبرد. هەردوو دەستی لە بەرکی پانتۆڵەکەی دەنان، هێدی هێدی ڕێی دەکرد، خەمین‌و خەمبار بە دەم ڕێوە لەگڕ فکران دەچوو. بیری لە چی دەکردەوە، نازانم. خۆ ئەگەر بانگ کرابا‌و دەربارەی هەندێ شت پرسیاری لێکرابا، یان داوای شتێکی لێکرابا، بەو پەڕی ڕێزو نەزاکەتەوە وەڵامی دەدایەوە. زۆر بە روونی‌و ڕەوانی قسەی دەکرد، بێ ئەوەی وەکو خەڵکی تر چەنەبازی‌و دریژدادڕی بکات : لە کاتی قسە کردندا، وەکو ئەوەی منداڵێکی دە ساڵان بێ، بە شەرمێکی منداڵانەوە تەمەشای دەکردیت. ئەگەر پارەیەکی هاتبا دەست ئەو شتانەی پێ نەدەکڕی کە بە لای زیندانییەکانی ترەوە پێویست بوو، بۆ نموونە ئەگەر کراسەکەی دڕابا نەیدەدا بۆی بدورنەوە، پێڵاوی تازەی نەدەکڕی، زیاتر نانی سپی‌و کێك‌و کولیچەو چۆرەکی دەکڕی. جا ئەم کولێرەو چۆرەك‌و کولیچانەی هێندە بە تاسوق‌و لەزەتەوە دەخوارد لە تۆ وایە منداڵێکی حەوت ساڵانە. زیندانییەکان ناویان نابوو ( هەتیوە چکۆلەکەی قازان )و هەر بەو ناوەشەوە گازیان دەکرد: " هێی سیروتکین، هەتیوە چکۆلەکەی قازان !".

ئەگەر هاوزیندانییەکانی بێ کار بوایەن، یان ئەگەر سەرقاڵی کاریش بوایەن ئەو بە بێ ئیش‌و کار بەسەر ژوورەکاندا دەگەڕا. ئەگەر کەسێك سوعبەتێکی دەگەڵ کردبا یان گاڵتەی پێکردبا،کە زۆرجار ئەمەی دەهاتە ڕێ- بێ ئەوەی تاقە قسەیەکی لە زار بێتە دەر پشتی تێدەکردو بۆ شوێنێکی دی دەڕۆیی. خۆ ئەگەر گاڵتەکە هەندێ بێتام بوایە لە شەرماندا سوور دەبووەوە، زۆر جار لە خۆم دەپرسی دەبێ چ تاوانێکی کردبێ، وا بۆ زیندانی تایبەتی‌و بێگارکاریان ناردووە. ڕۆژێك نەخۆش بووم‌و لە خەستاخانە کەوتبووم، (سیروتکین)ش لە قەرەوێڵەیەکی تەنیشتی منەوە کەوتبوو، ئێوارەیەك لەگەڵی کەوتمە قسان، زۆر بە ئاوو تاو و بێ پەردە بۆی گێڕامەوە کە چۆن بووە بە سەرباز و چۆن دایکی لە کاتی بەڕێکردنیدا گریاوە، چۆن لە سەربازیدا ناڕەحەتی زۆری دیتووە،و چۆن ژیانی سەربازی لێبووە بە دۆزەخ،و ئەفسەران‌و سەربازان چەند سەختگیرو

دڵڕەق بوون،و چۆن لەسەر هیچ ترین شت توڕە دەبوون،و چۆن بەرپرس‌و گەورەکانی هەمیشە لێی ناڕازی بوون‌و ڕقیان لێی بووە.

لێم پرسی:

– باشە سیروتکین تۆ بۆچی بۆ ئێرە نێردراوی ؟ بە تایبەتی بۆ بەشی تایبەتی ؟

گوتی:

– بەڵێ ئالکساندەر پترۆفیچ!... تەنیا یەك ساڵم لە خزمەتی سوپاییدا بەسەر برد: بۆیەش بۆ ئێرەیان ناردم چونکە سەرهەنگ گریگۆری پترۆفیچی سەرۆکی خۆمم کوشت.

ئەمەم بیستبوو، بەڵام باوەڕم نەدەکرد... باشە چۆن توانیت بیکوژی سیروتکین گیان ؟

– ئەوەی بیستووتە ڕاستە، ژیانم ئەوەندە سەخت‌و دژوار بوو، ناچار بووم ئەو کارە بکەم.

– ئەدی سەربازانی دی چۆن تەحەمولی ئەو ژیانە دەکەن ؟ ژیانی سوپایی لە سەرەتاوە قورس‌و دژوارە، بەڵام پاشان وردە وردە ڕادێی‌و دەبی بە سەربازێکی کارامەو باش. وادیارە دایکت زۆر نازداری کردویت‌و بۆیە وا نازدار دەرچوویت... من دڵنیام تا هەژدە ساڵان هەر بە شیرو کێك بە خێوی کردویت!...

– ئەریّ، دایکم زۆری خۆش دەویستم... دوای سەفەری من نەخۆش دەکەویّ‌و لە جێدا دەکەویّ‌و هەڵناسێتەوە... بەڵام چبکەم ژیانی سوپاییم یەجگار لەبەر سەخت‌و ناڕەحەت بوو! هەموو شتێك ئاوەژوو بوو... سزا لەسەر سزایان دەدام... بۆچی ؟ ئەگەر بڵێی زۆریش گوێڕایەڵ بووم، هەموو فرمانێکم جێبەجیّ دەکردن، سەرپێچی یاسام نەدەکرد، هەرگیز مەشرووبم نەدەخواردەوە، دزیم نەدەکرد، قەرزم لە کەس نەدەکرد... زۆر خراپە پیاو فێری قەرز ببێت... وێڕای ئەوەش هەموو ئەوانەی دەوروبەرم خەڵکی زبرو دڵڕەق بوون، کەس لەگەڵیاندا هەڵی نەدەکرد... هەندێجار دەخزیمە سووچێکەوەو بۆ خۆم تێر دەگریام... بەڵێ... تێر دەگریام، لە هۆڕژنی گریانم دەدا... ڕۆژێك، تۆ بڵێ شەوێك، کردیانم بە ئێشکگر... وەرزی پایز بوو، با بە گڤ‌و هوڕ خۆی بە نێو لق‌و پۆپی درەختەکاندا دەکرد. دنیا هێندە تاریك‌و نوتەك بوو چاو چاوی نەدەبینی. زۆر خەمبار بووم، بە تاقی تەنیا دەهاتم‌و دەچووم... نێزەکەم لە تفەنگەکەم کردەوەو فرێم دایە سەر ئەرزەکە. لوولەی تفەنگەکەم خستە سەر سینگم، پۆستاڵەکەم لە پێی ڕاستم داکەندو قامکە گەورەی پێم نا بە پەلەپیتکەی تفەنگەکەمەوە، فیشەکەکە دەرنەچوو. نەتەقی. بە وردی سەیری تفەنگەکەم کرد، کەمێك باروتی دیکەم تێکردو دیسان لوولەکەیم کردە سینگم... ئەمجارەش فیشەکەکە دەرنەچوو... لە دڵی خۆدا گوتم: "چارە ؟". ئەوجا پۆستاڵەکەم لە پیّ کردەوە، نێزەکەم خستەوە سەر تفەنگەکە، تفەنگەکەم لە شان کردو کەوتمە هاتوچۆ. لە دڵی خۆدا گوتم: بۆ کوێم دەنێرن با بمنێرن، من چیتر سەربازی ناکەم. پاش نیو سەعاتێك یارۆی سەرهەنگ بە خۆو مەفرەزەیەکەوە کە بۆ تەفتیش دەرچوو بوو، هات. لێم نزیك بووەوە، گوتی: "سەربازی ئێشکگر واهی تفەنگ هەڵدەگرێت ؟" منیش بیّ سیّ‌و دوو هەر کردم بە تفەنگەکەداو نێزەکەیم لەودا ختم کرد. لە تۆڵەی ئەمەدا چوار هەزار شەلاقیان لێدام‌و پاشان بۆ ئێرە ( بەشی تایبەت) یان هەواڵە کردم.

سیروتکین درۆی نەدەکرد، بەڵام وێڕای ئەوەش نازانم بۆچی بۆ ئێرەیان ناردبوو . سزای ئەم جۆرە تاوانانە سووکترە. سیروتکین تاقە زیندانیەك بوو، کە دەموچاوێکی جوانی هەبوو. هاوڕێکانی دیکەی لە بەشی تایبەتیدا، کە ژمارەیان پازدە کەس بوو، زۆر بەدفەساڵو ڕەزا قورس بوون! پیاو قێزی لەسەروچاویان دەکردەوە! زۆریان سەریان بۆز بوو بوو. پاشان دێمە سەر باسی ئەم گروپە. سیروتکین، دۆستایەتی دەگەڵ گازینی مەیفرۆشدا خۆش بوو، ئەو گازینەی کە لە سەرەتای ئەم فەسڵەدا باسم کرد .

ئەم گازینە، ئینسانێکی ترسناك بوو. هەر کەسێك بیدێنێ یەکسەر هەست دەکات کە پیاوێکی ترسناكو بێ ڕەزایە، ترسو نیگەرانی دەخاتە دڵەوە. من پێموایە لەم دنیایەدا هیچ کەسێك هێندەی ئەو شەڕانیو دڕو دڕندە نییە. لە بیرمە پێشتر لە " توبولسك " دوو کەسم بینی یەکێکیان چەتەو ڕێگر بوو بە ناوی کامنیفو ئەویتریان زیندانییەکی هەڵاتووی عەسکەری فێرار بوو بە ناوی (سولوکوف) کە پیاو کوژێکی بێ ڕەزا بوو، بەڵام هیچیان وەکو ئەم گازینە قێزەونو مایەی نەفرەت نەبوون. ڕێك دەتگوت جاڵجاڵۆکەیەکی زەلامەو لە قاڵبی ئینساندایە، تاتاری بوو. لە سەرانسەری زیندانەکەدا، کەسی لەو تۆکمەترو بەهێزتری تیا نەبوو. تەژەیەکی ناقۆڵا بوو، بەدەنێکی هەرقلیانەی هەبوو، کەللەیەکی سەیرو شێواو زۆر زەلامی هەبوو کە هەترەشی پیاوی دەبرد. زیندانییەکان چیرۆکی سەیر سەیریان دەربارە دەگێڕایەوە : هەندێك دەڵێن سەرباز بووەو لە سوپا هەڵاتووە، هەندێکی دی دەڵێن لە کانەکانی (نرچیسنك)*(٥) هەڵاتووەو چەند جارێك بۆ سیبیریا دوور خراوەتەوەو هەموو جارەکان هەڵاتووەو ئەنجام دەستگیریان کردووەو حوکمی ئەبەدی بە بێگارەوە دراوەو بۆ ئەم زیندانەی ئێمەیان ناردووە. دەڵێن زۆری حەز لە منداڵکوژی بووە، منداڵەکەی خەڵەتاندووەو پاشان بۆ شوێنێکی دوورو چەپەکی بردووە، تێر ترساندویەتیو عەزابی داوەو هەرکە کوڵی دڵی دامرکاوەتەوە، بەوپەڕی ئارامیو خەمساردیو خوێنساردی، بەوپەڕی لەزەتەوە کوشتویەتی. ڕەنگە هەموو ئەم حیکایەتو چیرۆکانە درۆو بوختان بن،و دیمەنی ناشیرینو قێزەونو ترسناکی گازین لە خەیاڵی زیندانییەکانی دروست کردبن، دوورش نیە ڕاستو دروست بن، چونکە دەگەڵ سەرو سەکوتو سیمای ئەودا تێکیان دەکردەوە. بەڵام ئەم گازینە ئەگەر مەستو سەرخۆش نەبوایە، پیاوێك بوو شایستە ڕەفتارو مەندو مەنگ. هێدیو هێمن، شەڕی بە کەس نەدەفرۆشت، خۆی لە قەرقەشە دووردەگرت، چونکە خۆی بە گەورەتر لەوانی دی دەزانیو بێزی نەدەهات بێتە ئاستی ئەوان. زۆر کەم قسەی دەکرد. بەڕاستی هەموو هەڵسوکەوتو ڕەفتارێکی سەنگین بوو. هەرچەندە زیرەکی بە نیگایەوە دیار بوو، بەڵام نیگاشی وەکو زەردەخەنەکەی تەشەرئامێزو نێشدار بوو. گازین دەوڵەمەندترین مەیفرۆشی زیندانەکە بوو. ساڵی دووجار زیاتر نەیدەخوارەدەوە، کە سەرخۆش دەبوو ئیدی جەوهەرو حەقیقەتی هۆڤیانەو دڕندانەی دەردەکەوت. کە بەرە بەرە دەکەوتە نەشئەو خەیاڵ دەبوو، دەکەوتە تانەو تەشەری ژاراویو پێشوەختە ئامادەکراو، لە زیندانییەکان. تا زیاتر مەست دەبوو، دڕندەتر دەبوو، کە مەستی مەست دەبوو، هەنگێ دەستی دەدایە کێردو هەر کەسێك بهاتبا پێش پەلاماری دەدا، زیندانییەکان چونکە لە هێزو قوەتی هەرقلیانەی ئاگادار

بوون، له هەوەڵەوە خۆیان لێدەدزییەوەو خۆیان پەنا دەدا. بەڵام ئەنجام لەم هێرشە ناو بە ناوانەی بێزارو بێتاقەت دەبن، بڕیار دەدەن کۆتایی بەم حاڵە بێنن، چەکی بکەن، بە هەر شێوەیەك بووە کێردەکەی لە دەست دەربێنن، ئیدی کە مەستی مەست دەبوو، لە پڕ دە(١٠) زیندانیی بە جارێ پەلاماریان دەدا، بگرە کوێت دێشێت، هێندەیان لێدەدا تا لە پەلوپۆ دەکەوت و لە هۆش دەچوو. ئەو لێدانەی لە گازینیان دەدا لە هەر کەسێکی دیکە درابا روحی دەرنابرد، کەچی گازین هەر باکیشی پێ نەبوو. پاش ئەوەی لە پەلوپۆیان دەخست، لە پۆستینەکەی خۆیانەوە دەپێچاو فڕێیان دەدایە سەر جێگاکەی خۆی و دەیانگوت: " با بە کەیفی خۆی بنوێت ". کەچی گازین بۆ بەیانی وەك ئەوەی نە بای دیتبێ نە باران، ساغ و سەلامەت لە خەو ڕادەبوو. کڕوکپ، مات و خەمین بۆ سەر کار دەڕۆیی.

کە گازین دەیخواردەوە، زیندانییەکان خەمیان لێدەهات، چونکە دەیانزانی چ ئاکامێکی بەد چاوەڕوانیەتی، گازین بە خۆیشی ئەمەی دەزانی، کەچی هەر سوور بوو لەسەر خواردنەوەو فوول سەرخۆش دەبوو.

چەند ساڵێك بەم شێوەیە بوری، زیندانییەکان سەیریان کرد گازین، باریك و بنێس بووە، هێزو قوەتەکەی جارانی نەماوەو روو لە شکستە. نەخۆشی سەری تێکردووەو هەمیشە لەش بەبارە. زوو زوو سەری خەستەخانە دەدات. زیندانییەکان دەیانگوت: "خەریکە پیر دەبێت و لە گوڕ دەکەوێ ".

گازین، ئەو ڕۆژە خۆی بە مووبەقەکەدا کرد، کابرا پۆڵاندییە کورتە باڵا کەمانچەژەنەکەشی بە دواوە بوو. گازین لە ناوەندی قاوشەکەدا بە بێدەنگی وەستا. بە وردی روانیە یەك بە یەکی زیندانییەکان. کەس ورتەی لێوە نەهات. کە چاوی بە من و هاوڕێکەم کەوت، نیگایەکی تەوسامێزی کردین، ژارخەنێکی ترسناکی بە ڕوودا داین. ئەوجا بە لارە لار لە مێزەکەمان نزیك بووەوە، بە بزەیەکی پڕ غرووڕەوە گوتی:

– پێم ناڵێن پارەی ئەم چایە تایبەتیە لە کوێ پەیدا دەکەن ؟

من و هاورێکەم بە تیلەی چاو یەکترمان تێگەیاند باشتر وایە هیچ وەڵامێکی نەدەینەوە... چونکە ئەگەر وەڵامەکەمانی بەدڵ نەبێت، هێندەی دی دەهری دەبێت و خۆی شێت دەکات.

گازین لەسەری ڕۆیی:

– هەڵبەتە پارەیەکتان هەیە، نا، دەبێ پارەیەکی زۆرتان هەبێت، وا بە کەماڵی ئیسراحەت چا دەخۆنەوەو چا بۆ خۆتان سازدەکەن. باشە ئێوە بۆ چا خواردنەوە بۆ ئێرە هاتوون، ئێرە زیندانی ئەبەدییە یان چاخانە ها ؟... بۆ وەڵامم نادەنەوە تا بزانم چۆن...

کە زانی لێبڕاوین وەڵامی نەدەینەوەو گوێی نەدەینێ، بە پەلە بەرەو ئێمە هات، دەموچاوی سوور هەڵگەڕاو لە ڕق و توڕەییدا دەلەرزی. بە ڕێکەوت سەندوقێکی تەختەی قورس بە دوو شەقاوێك لەو لای ئێمەوە بوو، ئەم سەندووقە بەشە نانی نیوەڕۆو ئێوارەی زیندانییەکانی تیا هەڵدەگیرا،و بەشی نیوەی زیندانییەکانی دەکرد. سەندووقەکە لەو کاتەدا ڤاڵا (بەتاڵ) بوو، گازین بە هەردوو دەستی هەڵیگرت،و پەیتا پەیتا بەسەر سەرمانەوە رایدەوەشاند. لەگێن بوو هەر

ساتێك بیکێشێت بە سەرماناو پانو پلیشمان بکاتەوە. هەرچەندە تاوانی کوشتن یان هەوڵی کوشتن دەبووە مایەی سەریەشەو هاوردنو بردنێکی زۆر بۆ زیندانییەکان ( چونکە تەحقیقێکی زۆرو بە درێژایان دەگەڵدا دەکرا ) بۆیە زۆرجار دەکەوتنە ناوبژیو نەیاندەهێشت شەڕو ئاژاوەیەکی ئەوتۆ بەرپا ببێ کە ئاقیبەتی بۆ خۆیان باش نەبێت، کەچی کەسیان بە هانای ئێمەوە نەهاتن، هەموو خۆیان کرد بە کەڕەی شەربەتو چاوەڕوانی ئەوە بوون چ روو دەدات و بە ئاشکرا بەو وەزعە نالەبارەی ئێمە خۆشحاڵ بوون... چونکە کەس بە تاقە وشەیەکیش بەرگری لێنەکردین ! کەس هاوارێکی لە گازین نەکرد! ڕقی زیندانییەکان لە نەجیمزادەکان بە رادەیەك بوو، کە حەزیان دەکرد ئێمە بەو حاڵە نالەبارو ترسناکەوە بدینن... بە ئاشکرا ئەوەیان پێوە دیار بوو... بەڵام خۆشبەختانە وەزعو حاڵەکە بەخێر گەڕا، ڕێك لەو کاتەدا کە گازین خەریك بوو ئەو سەندووقە زەلامەی دەدا بە سەرماندا، زیندانییەك بە پەلە لە قاوشەکەی خۆیەوە هاتو هاواری لە گازین کرد:

– گازین ئەوە لە کوێی، مەشرووبەکەیان دزیت!

گازین سەندووقەکەی دا بە عاردیداو بەلەز لە مووبەقەکە وەدەرکەوت. زیندانییەکان گوتیان: " خودا ڕەحمی پێکردن !" خودا فریایان کەوت... تا ماوەیەکی زۆر ئەو رستەیەیان گوتو گوتەوە.

ئێستاش نەمزانی ئاخۆ بە ڕاستی مەشرووبەکەیان دزی بوو، یان ئەمە تەگبیرو تەکتیکێك بوو بۆ رزگار کردنی ئێمە...

هەمان ئێوارە، بەر لەوەی دەرگای قاوشەکان دابخرێ، لە کاتێکدا لە بن دیواری حەوشەی زیندانەکەدا پیاسەم دەکرد... خەمێکی قورس سەرودڵی گرتم... هەرچەند وا باوە کە یەکەم ڕۆژی زیندان تاڵترین ڕۆژە، بەڵام لەوەتای هاتبوومە ئەم زیندانە، خەمو پەژارەی وام بە خۆوە نەدیتبوو. ئەو ئێوارەیە بیرۆکەیەك بەرۆکی مێشکی گرتبوومو بەری نەدەداو نەدەدا، بیرۆکەیەك بە درێژایی مانەوەم لە زینداندا دەستبەردارم نەبوو.... بیرۆکەی پرسیارێك بوو کە نە ئەوساو نە ئێستا وەڵامەکەیم دەست نەکەوت. پرسیارەکەش ئەمە بوو: باشە دەکرێ، تاوانێك بە تاوانێکی دی بەراورد بکرێ ؟ بۆ نموونە دوو پیاو هەر یەکەیان تاوانێکی کوشتنی ئەنجام داوە... هەلومەرجو چۆنیەتی هەردوو تاوانەکە زۆر بە وردی خراوەتە بەر تاقیقو لێکۆڵینەوە... دەبینی دادگا یەك حوکمو یەك سزایان دەدات... لە کاتێکدا جیاوازییەکی زۆر لە نێوان هەردوو تاوانەکەدا هەیە! یەکێك لەو دوو پیاوە لەسەر شتێکی زۆر بێ بایەخ کردەی کوشتنی ئەنجام داوە... بۆ نموونە لەپێناوی سەلکێك پیازدا... لە ڕێگە تووشی کابرایەکی دێهاتی بووە، هیچی پێ نەبووە جگە لە سەلکێ پیاز.

– وەڵڵا... لەسەر جووتیارێکی دێهاتی کە جگە لە سەلکێ پیاز هیچی تری پێ نەبووە، حوکمی ئەبەدی دراومو بۆ زیندانی بێگاریان ناردووم!....

– هەی گەوج خۆت! پیازێك بایی یەك کۆپیکە، خۆ ئەگەر سەد جووتیارت کوشتبا ئەوجا سەد کۆپیکت دەست دەکەوت... یانی یەك ڕۆبڵت دەست دەکەوت، باشە سەد ڕۆبڵ ئەوە دێنێ، ئاخر سەد ڕۆبڵ خۆی چیەو قیمەتی چیە؟...

بۆ نموونە پیاوی دووەم لەسەر مەلەسەی نامووس، نامووسی ژنەکەی، خوشکەکەی، کیژەکەی کابرایەکی ملهوڕی ستەمکاری خوێڕی لە خوێنی خۆیدا گەوزاندووە، یان کابرایەکی فیرار و ئاوارەو سەرگەردان کە خەریکە لە برسانا دەمرێت‌و دەستەیەك سەرباز گەمارۆی دەدەن‌و بەرگری لە ئازادی‌و ژیانی خۆی دەکات. ئایا ئەمە وەکو ئەو بەرەڵلاو بێ ویژدانەیە کە هەر بۆ کەیف‌و لەزەت منداڵان دەکوژێت. تا لەزەت لەوە ببینێ کە خوێنە گەرمەکەیان بەسەر دەستیا بڕژێ، لەزەت لەو دیمەنەیان ببینێ کە وەکو چۆلەکەی سەربڕاو بە بەرچاوییەوە لەقەفرتێ بکەن ؟ ئەو پیاوکوژانە هەموویان هەواڵەی زیندانی بێگاری دەکرێن. ڕەنگە ماوەی زیندانیەکەیان یەکسان نەبێت. بەڵام جۆری سزاکان کەمە، لە کاتێکا جۆری تاوانەکان بە هەزارە. جۆری تاوانەکان بە ئەندازەی جۆری مجێزو تەبیعەتەکانە، گریمان مەحاڵە لە سزادانەدا ئەم زوڵمە لابرێ‌و نەهێڵرێ، گریمان مەحاڵە ئەم کێشەیە چارەسەر بکرێ... گریمان چاومان لەم زوڵم‌و ستەمە پۆشی... گریمان ئەم بێ ئینسافیە نە دەبوو... بەڵام زوڵم‌و بێ ئینسافیەکی تر هەر هەیە، ئەویش پەیوەندی بە جۆری سزاکەوە هەیە، کە دەبوایە بە پێی تاوانەکە جیاواز بووایە... لەوەیە زیندانییەك وەکو مۆم لە زینداندا بتوێتەوەو دابڕزێ، لەوەیە زیندانییەکی دیکە بە عەمراتی ئەوەی بە بیردا نەهاتبێ کە زیندان بەم ڕادەیە خۆش‌و ئاوەدان بێ‌و بتوانێ ئەم هەموو دۆست‌و ئاشنایە پەیدا بکات‌و بە خۆشی دەگەڵیاندا هەڵبکات!... بەڵێ لەم جۆرە خەڵکانە، لە زیندانی بێگاردا هەن. جا وەرە ئەم جۆرە خەڵکە دەگەڵ ئێنسانێکی دڵناسکی ڕۆشنبیری ویژدان بێداردا بەراورد بکە.... ئەوەی هەستی پێدەکات زۆر بە ئازارترە لە خودی سزاکە، ئەم هەستە وەکو مۆریانە دەداتە دڵی‌و بەرە بەرە دەیکوژێت. ئەو حوکمەی خۆی دەربارەی تاوانەکەی خۆی داویەتی‌و بەسەر خۆیدا سەپاندووە، زۆر لە حوکمی دادگاو یاسا توندترە. کەچی وێڕای ئەوەش ناچارە دەگەڵ زیندانییەکی تردا بژی کە بۆ تاقە جارێکیش بیری لە تاوانەکەی خۆی، ئەو تاوانەی لە سەری سزادراوە، نەکردووەتەوە،و بگرە هەر خۆیشی بە تاوانبار نازانێت!... تەنانەت خەڵکانێك هەن، خەڵکانێکی کلۆڵ‌و داماو، بە ئانقەست تاوانان دەکەن تا بۆ زیندانی بێگاری بنێردرێن‌و لە شەڕی ژیانی ئازادی ڕزگار بن کە بارە بەسەریانەوەو زیندانیان پێ خۆشترە لەو ژیانە... ئیدی ژیان پڕە لە کوێرەوەری‌و نەگبەتی... لەوەیە ئەو جۆرە خەڵکانە نانی ژەمێکیان دەست نەکەوتبێ، بە سکێ تێرو بە دە سك برسی بووبن، و هەر کردەی ئەوان بوو بێ‌و بردەی ئاغا بوو بێ.... خۆ ئەگەر مەسەلەکە هەر کارو بێگار و سوخرە بێ، کارو بێگاری زیندان ئاسانترە، هەر نەبێ تێر بە سکی خۆی نان دەخوات،و خواردنەکەی مسۆگەرە... ئەمە جگە لەوەی کە ڕۆژانی جەژن‌و یەك شەمموان گۆشت دەخوات‌و بەشە خێرو سەدەقەی خێرەومەندانی بەر دەکەوێت‌و، دەتوانێ ئێواران کار بکات‌و پارەیەکی کەم بۆ خۆی پەیدا بکات... هەڵبەتە ئەو ژینگەو کۆمەڵگەیەی لە زینداندا ئاشنای دەبێت بۆ خۆی شتە. زیندانییان خەڵکانێکی چالاك‌و چەلەنگ‌و وریان، هەموو شتێك دەزانن‌و لە عۆیەی هەر کارێك دێن... تازە زیندانیی کە دێتە ناو ئەم ژینگەو کۆمەڵگەیەوە، بە ئیعجابەوە دەڕوانێتە هاو زنجیرەکانی خۆی... پێشتر شتی وای نەدیتووە... بۆیە وا هەست دەکات ڕێی کەوتووەتە ناو باشترین‌و شایستەترین خەڵکەوە!....

باشه ماقووله هەمان سزا بۆ ئەم خەڵکە جیاوازە ببڕدرێتەوە ؟ بەڵام بۆچی سەری خۆمان بە کێشەیەکەوە بیەشێنین کە چاری نیە، پرسیارێك بکەین کە وەڵامی نیە!.... بێسوودە. ئەوا تەپڵەکە لێی دا، کاتی ئەوە هاتووە بۆ قاوشەکە بگەڕێمەوە....

*پەراوێز:*

*١- م...کی شۆڕشگێڕی پۆڵاندی ئالکساندر میرتسکییە کە لەساڵی ١٨٤٦دا کە حوکمی دە ساڵ زیندانی بێگاری درا پاشان پێش ئەوەی ماوەی دیاریکراو تەواو بکات فرمانی بەخشینی بۆ دەرکرا.*

*٢- شاری فیاتکا، کە دەکەوێتە خاکی لتوانیاوە لە کۆتایی سەدەی هەڤدەیەمدا بوو بە مەڵبەندو پەناگەی ئەم ئاینزایەی کە دژایەتی ریفۆرمەکانی پەتریارك نیکون دەکات.*

*٣- ناوی سیروتکین لە وشەی سیروتاوە وەرگیراوەو بە مانای سێوی دێت.بە کەسێك دەگوترێ " هەتیوی قازان " کە نەدارو هەژار بێت.*

*٤- نرچیسنك: شارێکە لە ترانسبایکالی ئەمە مەڵبەندی کانان بوو، زیندانیانی بێگاری دەرەجە یەك بە بێگاری بۆ ئەوێندەر دەنێردران.*

((٤))

## هەستە سەرەتاییەکان

٣-٣

پاش ئەوەی سەرژمێریان کردین، دەرگای قاوشەکانیان لەسەر داخستین، سەرو قفڵی تایبەتیان لە هەر دەرگایەك دا، زیندانیەکان تا گەردی بەیانی لە ژوورەوە مانەوە:

دەرەجەدارێك دەگەڵ دوو سەربازدا، ناوەکانیان خوێندینەوەو سەر ژمێریان کردین. ئەگەر ئەم سەرژمێری‌و تەفتیشانە لەلایەن ئەفسەری گاردەوە سەرپەرشتی کرابا، هەنگێ لە حەوشەی زیندانەکەدا ریز دەکراین. بەڵام زۆربەی کات ئەم پشکنین‌و ناوخوێندنەوەیە لە ناو خودی قاوشەکاندا دەکرا. زۆرجار سەربازەکان سەرژمێرییەکەیان لێ تێکدەچوو،و هەڵەیان دەکرد، بۆیە دەهاتنەوەو سەر لە نوێ تێهەڵدەچوونەوەو یەك یەك بە سەریان دەکردینەوە، تا بە تەواوەتی لە دروستی ژمارەکە دڵنیا دەبوون، هەنگێ دەرگای قاوشەکانیان لەسەر دادەخستین‌و دەڕۆییشتن. هەر قاوشێك نزیکەی سی کەسی تێدا بوو، بۆیە تەختە خەوەکان زۆر لە یەکترەوە نزیك بوون. جا تا کاتی خەو دەهات هەر زیندانییەك خۆی بە کارێکەوە مژول دەکرد.

تاقە کێشکچی زیندانەکە ئەو سەربازە نوقسانە بوو کە پێشتر باسم کرد، ئەمە نوێنەری شەوانەی ئیدارەی زیندان بوو، شەوێ لەگەڵ ئێمەدا دەمایەوەو دەنووست. جگە لەو، لە هەر ژوورێکدا زیندانییەکی کۆنی خۆشڕەفتار لەلایەن مێجەرەوە بۆ چاودێری دادەنرا. هەندێجار ئەم چاودێرانەش لە بڕیارەکانی زیندان دەردەچوون‌و تاوانێکیان دەکرد. لەو حاڵەدا شەلاقکاری دەکران‌و تڕۆدەکران،و زیندانییەکی دیکەی ڕەفتار پەسەندیان لە جیاتی ئەو هەڵدەبژارد. جا عەریف‌و چاودێری قاوشەکەی ئێمە ئاکیم ئاکیمیچ بوو. زۆرم پێ سەیر بوو کە ئەم داماوە دەیویست لە ڕێگەی جنێوو هەڕەشەوەو بە تۆبزی زیندانییەکان بێنێتە ڕەداو کۆنترۆڵیان بکات، بەڵام زیندانییەکان نەك هەر بە گوێیان نەدەکرد، بەڵکو گاڵتەشیان پێدەکرد. بەڵام سەربازە نوقسانەکە باشتر بوو، خۆی لە کاروباری زیندانییەکان هەڵنەدەقورتاند،و ئەگەر جارجار قسەیەکی کردبا، تەنیا بۆ خۆ پەڕاندنەوە بوو و هیچی تر. بە بێدەنگی لە سوچێکەوە دادەنیشت‌و خەریکی پینە کردنی پێڵاوەکانی خۆی دەبوو. ئەوەندە بێدەنگ‌و کەمدوو بوو، زیندانییەکان نە هەستیان پێدەکردو نە ئاوڕیان لێدەدایەوە.

لە یەکەم ڕۆژی زیندانمەوە، سەرنجێکم لا چێبوو کە پاشان دروستی‌و ڕاستی ئەو سەرنجەم بۆ دەرکەوت، سەرنجەکە ئەوە بوو کە هەر هەموو ئەوانەی زیندانیی نەبوون‌و، بە حوکمی وەزیفە، هەڵسوکەوتیان دەگەڵ زیندانییەکاندا هەبوو، ئیدی لە دەرگاوانانەوە بیگرە تا دەگاتە پاسەوانان‌و چاودێران‌و کارمەندانی ناو زیندانەکەو تا خودی فەرمانڕەوای زیندانەکە، هەر هەموویان بۆچوونێکی هەڵەو موبالەغە ئامێزیان لەمەڕ زیندانییەکان هەبوو، ئەویش ئەوە بوو کە هێندە لە زیندانییەکان بە گومان بوون کە پێیان وابوو هەرکە دەرفەتیان بۆ بڕەخسێت، لەسەر هیچ ترین شت بە کێردی رووتەوە پەلاماریان دەدەن.زیندانییەکان بەم ترسەی زیندانەوانەکانیان

دەزانی،و لەو رووەوە زۆر بەخۆدەفشێن‌و سینگیان دەردەپەڕاند. بۆیە باشترین بەرپرس بەلای زیندانییەکانەوە ئەوەیە کە ئەڕباب‌و رووخۆش‌و سەوداخۆش بێ‌و، لێیان دڕدۆنگ‌و بەگومان نەبێت‌و متمانەی پێیان هەبێ. کە لەوەیە بتوانێ بەم متمانەیە بۆ لای خۆی ڕایان بکێشێت. لە بیرمە یەك دوو جار بەرپرسان بەبێ گاردی تایبەتی‌و شەخسی هاتنە زیندانەکە. و هەرگیز لە بیرم ناچێت کە زیندانییەکان چەند سەرسام بوون، بە چ گەرم‌و گوڕی‌و جۆش‌و خرۆشێکەوە کەوتنە پێشوازیان.. هەڵبەتە هیچ ڕیاو ڕیاکارییەك لەو رەفتارەیاندا نەبوو! چونکە میوانی بوێرو ئازا رێزو حورمەتی بەخۆیەوەیە، خۆبەخۆ سام‌و هەیبەتی خۆی بەسەر زیندانییەکاندا دەسەپێنێ. خۆ ئەگەر رۆژێ لە رۆژان، جارێ لە جاران کارێکی نابەجێش بکرێت لە حوزوری ئەودا ناکرێت. هەڵبەتە حاڵەتی ترس لە زیندانییەکان شتێکی گشتی بوو، بەڵام من پێموایە ئەمە حاڵەتێکی بێ بنەمایە. ئایا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بیچم‌و هەیئەتی تاوانامێزی زیندانی، جۆرە نەفرەت‌و گومانێك لە دڵدا دروست دەکات ؟ بە مەزەندەی من ئەم ترسە دەگەڕێتەوە بۆ هەستێکی تایبەتی، ئەویش ئەوەیە هەرکە لەو یەکەم رۆژەوە پێ دەنەینە ناو زیندان، ئەو هەستەمان لا دروست دەبێ، کە مەحاڵە پیاو، وێڕای هەموو هەوڵێك وێڕایی هەموو ئیجرائاتێك، بتوانێ مرۆڤێکی زندوو، بزۆز بگۆڕێت بۆ جەنازەیەکی مردوو، کڕوکپ‌و ئارام، سۆزەکانی ئەم مرۆڤە خەفە بکات ، گیانی تۆڵەو بەرخودان و ئارەزووی ژیانی لەلا بسڕێتەوە،و خولیاو کەڵکەڵەی وەدی هێنانی ئەو ئارەزووانەی لەلا نەهێڵێ. بە هەرحاڵ من دووپاتی دەکەمەوە کە ترس لە زیندانییانی بێگاری، کارێکی نا بەجێیەو ئەو ترسناکە نین وەکو وێنا دەکرێ. مرۆڤ چەند هێڕو گۆساخش بێت، بەو ئاسانیە، بە کێردەوە پەلاماری هاوڕەگەزی خۆی نادات. خۆ ئەگەر بەرێکەوت بویەری وا ڕوویدات، ئەوەندە کەمە لە نرخی نەبوودایە. هەڵبەتە من لێرەدا باسی ئەو زیندانییانە دەکەم کە حوکم دراون،و سزای خۆیان بەرێدەکەن. بگرە هەندێ لەوانە خۆشحاڵن کە حوکم دراون‌و لە زینداندا گیرساونەتەوەو چارەنووسیان یەك لایی بووەتەوە، ئیدی ئینسان ژیانێکی تازە دەگرێتەبەر. ئەوانە هێدی‌و هێمن، ملکەچ‌و گوێڕایەڵ، بۆ خۆ دەژین‌و دەست بە کڵاوی خۆوە دەگرن. سەبارەت بە ئاژاوەچییەکان، زیندانیەکان بە خۆیان کۆنترۆڵیان دەکردن‌و نەیاندەهێشت لە خەت دەربچن. زیندانیی، چەند بێباك‌و چەند بێ پەراو سەرکێش بێ، لە زیندان دا، لە هەموو شتێك دەترسێت. بەڵام ئەو تاوانبارەی کە هێشتا چارەنووسی یەکلایی نەبووەتەوە وانیە. ئەم تاوانبارە سڵ لە هیچ ناکاتەوە، لاری نیە لە خۆڕایی‌و بێ هیچ ئەنگێزەیەکی ڕکونی، تەنیا لەبەر ئەوەی سبەینێ دادگایی دەکرێت‌و چارەنووسی یەکلایی دەکرێتەوە، پەلاماری هەر کەسێك بدات. چونکە ئەگەر تاوانێکی تازە بکات، کەیسەکەی ئاڵۆز دەبێت‌و دادگایی‌و سزاکەی دوا دەکەوێت... دیارە ئەم جۆرە گیانی دژمنکارییە پاکانەو سۆنگەی خۆی هەبوو، لە پێناوی ئامانجێکدا ئەنجام دەدرا... زیندانیی لەم حاڵەتەدا دەیەوێ بە هەر نرخێ بووە "چارەنووسی خۆی بگۆڕێت"، دەیەوێ یەکسەر ئەم چارەنووسەی بگۆڕێت. جا هەر بەم بۆنەیەوە حەزدەکەم بویەرێکی دەروونی زۆر سەیرتان بۆ بگێڕمەوە کە بە چاوی خۆم بینیم.

سەربازێکی کۆن لە نێو زیندانیە سوپاییەکاندا هەبوو، لەبەر لاساری‌و بێ سەروبەری حوکمی دوو ساڵ زیندانی بە بێگارەوە درا بووو بۆ ئێرە نێردرا بوو. ئەم سەربازە هەم فیشاڵباز بووو هەم ترسنۆك. ئەم دوو سیفەتە بە دەگمەن بە جارێ لە یەك سەربازی رووسیدا کۆدەبنەوە. سەربازی رووسی بە شێوەیەکی گشتی خۆ هەڵکێش‌و فیشاڵبازنین. خۆ ئەگەر لە نێو سەربازانی رووسدا سەربازێکی فیشاڵبازو خۆ هەڵکێشت بینی، ئەوا بزانە کە ترسنۆك‌و خاپینۆك‌و حیلە بازە. ئەو سەربازەی کە باسی دەکەم ناوی دوتوف بوو، کە ماوەی مەحکومیەتەکەی تەواو کرد گەڕایەوە بۆ تیپەکەی خۆی کە لەسەر سنوور بوو. بەڵام وەکو هەموو ئەوانەی کە گوایە بە مەبەستی چاکبوون زیندانی دەکرێن، لە جیاتی چاك ببێ خراپتر بوو بوو. زۆربەی ئەوانە کە بەر دەبوون هەر دوو سێ هەفتەیەك لە دەرێی زینداندا هەڵدەکەن ، خێرا تاوانێك دەکەن‌و بۆ زیندان دەنێردرێنەوە، دیارە ئەمجارەیان حوکمی قورستر دەدرێن، حوکمی پازدە ساڵ‌و بیست ساڵ دەدرێن. جا (دوتوف)ـەکەی لەمەڕ خۆشمان هەمان شتی بەسەر هاتبوو. وەختێ ئازاد کرا، پاش سێ هەفتە دزی لە هاوڕێیەکی خۆی دەکات، پاشان لە سیستەمی سوپایی یاخی دەبێت، دەیدەن بە دادگای سوپایی‌و حوکمی شەلاقکاری دەدرێت، لە رۆژی پێش جێبەجێ کردنی سزاکەیدا، ئەفسەری ئێشکگر سەردانی ژوورەکەی دەکات، دوتوف چونکە کابرایەکی بێ غیرەت‌و ترسنۆك دەبێت، بە کێردەوە پەلاماری ئەفسەری نێوبراو دەدات . دیارە سوور دەزانێ کە ئەو کارە، تاوانەکەی قورستر دەکات‌و مودەتی حوکمەکەی درێژتردەبێت. ئەم تاوانە هەر بۆ ئەوە دەکات کە ساتە ترسناکەکەی سزاکەی بەلای کەمەوە بۆ چەند رۆژێك یان چەند سەعاتێك دوابخات. ئەوەندە ترسنۆك‌و بێ باشار دەبێت کە نەك ناتوانێ یارۆی ئەفسەر بکوژێت بگرە ناتوانێ زامداریشی بکات. هەڵبەتە ئەم تاوانەی تەنیا بۆ ئەوە کردبوو کە تاوانێکی نوێ بخاتە سەر تاوانە کۆنەکەی‌و سەر لە نوێ دادگایی بکرێتەوەو سزاکەی بۆ چەند رۆژێکی کەم دوا بکەوێ.

هەڵبەتە ساتی پێش جێبەجێکردنی سزا، لە روانگەی مەحکوم بە شەلاقکارییەوە، یەجگار ترسناك وسامناکە. زۆرجار رێکەوتووە کە ئەو جۆرە مەحکومانەم بە رۆژێك پێش جێبەجێکردنی سزاکانیان دیتوە. زۆرجار لە نەخۆشخانەدا دەمبینین، ئەو سەردەمانە زوو زوو نەخۆش دەکەوتم‌و دەچوومە نەخۆشخانە... هەڵبەتە بە بەزەیی ترین خەڵك لە رووسیادا دەرهەق بە مەحکومان، پزیشکان بوون. ئەو جیاوازییەی کە زیندانەوان‌و کارمەندانی کارگێڕی زیندان لە نێوان مەحکومان‌و خەڵکی ترا دەیان کرد، دکتۆران نەیان دەکرد. لەوە دەچێ جەماوەری خەڵك‌و دکتۆران دەگەڵیاندا بە بەزەیی بن، چونکە تاوانبار هەرگیز لەسەر تاوانەکەی، ئیدی تاوانەکەی هەرچییەك بوایە لۆمە نەدەکرا، بەڵکو لێی خۆش دەبوون، بە تایبەتی ئەگەر سزای خۆی وەرگرتبا.

گەلی رووسیا بە خۆڕایی تاوانی ناو نەناوە نەگبەتی‌و قەرەبەختی، بە خۆڕایی تاوانباری ناو نەناوە قەرەبەخت، ئەم پێناسەیە خۆی لە خۆیدا مانایەکی قووڵ، مانایەکی گرینگ‌و ترسناکی هەیە، بە تایبەتی کە پێناسەیەکی خۆڕسك‌و نەستییە... جا با بێمەوە سەر باسەکەی خۆم، پزیشك‌و دکتۆران ئەو پەناگە ئاساییەن کە زیندانییان، بە تایبەتی ئەوانەی کە مەحکومن بە

شەلاقکاریو فەلاقە، پەنای بۆ دەبەن... تۆمەتبار کە دەدرا بە دادگای سوپایی، بەمەزەندە دەیزانی کەی حوکم دەدریٚ، جا بۆ ئەوەی خۆی لەو حوکمە بدزێتەوە،و بەو ئومێدەی چەند رۆژێك ئەو ساتە ترسناکە دوابخات، خۆی نەخۆش دەخستو داوای دەکرد ڕەوانەی نەخۆشخانە بکرێت، کە لە خەستەخانە معایەنەو معالەجە دەکراو ئیزن دەدرا، دەیزانی هەر دوای دەرچوونی لە خەستەخانە رووبەڕووی ئەو ساتە ترسناکە، ساتی جێبەجێکردنی فەلاقەو شەلاقکارییەکە دەبێتەوە. بۆیە دەبینی زیندانییان لەو رۆژەدا یەجگار پەریشانو نیگەرانن. ڕاستە هەندێکیان هەوڵدەدەن ئەو نیگەرانیە بشارنەوەو خۆیان کە بەرچاوی خەڵکیدا نەشکێننەوە، بەڵام بەری رۆژ بە بێژنگ ناگیریٚ، ئەم رواڵەتبازییە بەسەر کەسدا تیٚ ناپەڕێنریٚ. هەموو کەسێك هەست بەدژواری ئەم ساتە دەکات ، بەڵام لەبەر هەستە مرۆڤانیەکەو هاوسۆزیو هاوخەمی دەگەڵ مەحکومەکەدا، بێدەنگ دەبیٚو قسە ناکات. من سەربازێکی گەنجم دەناسی کە بە تۆمەتی پیاوکوژی قورسترین حوکم درا بوو، حوکمی حەپسی بێگار... حوکمی ئەوپەڕی شەلاقکاریان بۆ بڕی بووەوە، ئیدی رۆژێك بەر لە جێبەجێکردنی حوکمەکە، لێدەبڕیٚ یەك قاپ مەشرووبی تێکەڵ بە بڕنووتی بخواتەوە. لە نێو ئەو جۆرە مەحکوومانەدا وا باوبوو کە پێش جێبەجێکردنی حوکمەکە شتێك بخۆنەوەو خۆیان مەست بکەن، چونکە پێیان وابوو مەستان بە ئەندازەی هۆشیاران هەست بە دەردو ئازار ناکەن. ئەم مەشرووبەیان بە قاچاغ وەدەست دێنا. هەڵبەتە پارەیەکی زۆریان پێدەدا... ئامادە بوون بۆ ماوەی شەش دانە مانگ خۆ لە پێویست ترین شت بێبەش بکەن، بەڵام دەستبەرداری ئەوە نەبن کە بە ماوەیەکی کەم بەر لە جێبەجێکردنی سزاکە، قاپیٚ مەشرووب نەخۆنەوە. جا ئەم سەربازە قەرەبەختو داماوە، پاش ئەوەی مەشرووبەکەی خواردەوە یەکسەر نەخۆش کەوت، کەوتە ڕشانەوە، خوێنی هەڵدێنا، لە خۆ چوو، بە بێهۆشی بۆ نەخۆشخانە برا. دوای چەند رۆژێك نیشانەی سیلی لێدەرکەوت،و دوای چەند مانگێك لە هەڕەتی لاویدا بەو نەخۆشیە مرد ، ئەو دکتۆرانەی کە خەریکی معالەجەی بوون ئێستاش هۆی نەخۆشیەکەیان نەزانی.

هەرچەندە خەڵکی ترسنۆكو بیٚ ورە لە نێو زیندانییەکان زۆر بوون، بەڵام وێڕای ئەمەش خەڵکی یەجگار بە جەرگ و ئازایان تیادا بوو، ئەوەی لێی نەدەترسان ئەشکەنجەی جەستەیی بوو، من خەڵکم لێدەناسین وەك دەڵێن کون لە جەرگیانا نەبوو، زۆرم لەو جۆرە خەڵکانە بە چاوی خۆم دیتوون، تاکو ئێستاش دیمەنی یەکێك لەو ڕێگرانەم لە یادە کە چۆن گەییە خەستەخانە.

رۆژێکی خۆشی هاوین بوو، لە نەخۆشخانەکەماندا دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە ئێوارەی ئەو رۆژە ڕێگری بەناوبانگ ئورلوف لە زینداندا، شەلاقکاری دەکرێتو پاش ئەوە بۆ نەخۆشخانە دەبریٚ. ئەو زیندانییانەی کە لە نەخۆشخانەکە بوون، دەیانگوت سزاکەی یەجگار قورس دەبێت، بۆیە هەر هەموویان نیگەرانو پەریشان بوون. لێتانی ناشارمەوە منیش بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەوە بووم کە ناڤبری بگاتە خەستەخانە، چونکە زۆر واریقاتو حیکایەتی ترسناکیان لێدەگێڕایەوە. دەیانگوت لە تاوانکردنا هاوتای نەبووەتەوە، لە هیچ تاوانێك ناپرینگێتەوە، دێوێکە لەو گۆڕە، پیرەمێرد، منداڵ، هەر بۆ کەیف، بۆ لەزەت دەکوژێت. ئەم پیاوە ورەیەکی

پۆلایینی هەبووەو زۆر بە تواناو هێزی خۆی نازیوەو سەرکێش‌و یاخیەکی ئەوتۆ بووە کە بە هیچ شتێك رام نەبووەو کۆنترۆڵ نەکراوە. بە هەرحاڵ لە ئەنجامدا، دەستگیر دەکرێت‌و لە سۆنگەی تاوانە زۆرەکانیەوە حوکم دەدرێت‌و شەلاق‌و جەڵدەیەکی زۆری بۆ دەبڕدرێتەوە. کە هێنایان شەو بوو. قاوشەکە نوقمی تاریکی بوو، زیندانیەکان مۆمیان هەڵکرد، رەنگ بە رووی ئورلوفەوە نەما بوو، هۆشی لەبەر بڕابوو. قژە رەشە زوخاڵ ئاساکەی تێك ئالا بوو، پشتی شەقار شەقار بوو بوو، تەواو ئاوسا بوو، و شین هەڵگەڕا بوو، و یەکپارچە پەڵەخوێن بوو. زیندانیەکان بە درێژایی شەو پەرستاریان دەکرد،وکەمادەکانیان بۆ دەگۆڕی، لەسەر لا پاڵیان دەخست، هەتوانیان لە زامەکانی پشتی دەدا، وەکو خزمێکی نزیکی خۆیان سەرپەرشتی‌و پەرستارییان دەکرد.

بۆ سبەینێ وەهۆش هاتەوە، هەستا، یەك دووجار بە قاوشەکەدا هاتوچوو. زۆرم پێ سەیر بوو، چونکە بە نیوەگیانی بۆ خەستەخانەکەیان هێنا بوو. نیوەی شەلاق‌و جەڵدەکانیان لێدا بوو. بەڵام دکتۆر رایگرتبوون چونکە قەناعەتی وابوو بوو کە ئەگەر هەموو جەڵدەکانی لێبدرێ، بەرگە ناگرێت‌و دەمرێت. ئەم تاوانبارە، زۆر لاواز بوو، لە زینداناو بە دەم چاوەڕوانی سزاوە هێندەی دی لاواز بوو بوو. ئەوەی جارێك زیندانییانی مەحکوم بەشەلاق‌و جەڵدە بدینێ، هەرگیز سیمای پەژمردەو نیگای ئاگرینیان لەبیر ناکات. ئورلوف زوو بە زوو وەخۆ هاتەوەو چاك بووەوە، ئەمە زادەی ورە بەرزی خۆی بوو. ئورلوف کەسێکی ئاسایی نەبوو. لە رووی لاپەرەسەنی‌و فزوڵیەتەوە ناسیاویم دەگەڵ پەیدا کرد، بە درێژایی یەك هەفتەی تەواو، بە کاوە خۆو زۆر بە وردی خستمە بەر سەرنج. لە عەمرانم خەڵکی وا بە سەبرو حەوسەڵە، بێباك‌و ورە بەرزم نەبینی بوو. لە بیرم دێت کە لە توبولسکدا، پیاوێکی دیکەی لەم بابەتەم بینی، پیاوێك بوو زۆر بە ناوبانگ، سەردەستەی کۆمەڵە چەتەو رێگرێك بوو. پیاوێك بوو بە راستی دڕو دڕندە، زەڕەیەك پیاوەتی تیا بەدی نەدەکرا، ئەگەر نەشت ناسیبا، هەر بە یەکەم نیگا بۆت دەردەکەوت چ ناڕەسەنێکە، دڕندەیی لە چارەی دەباری. ئەوەی لەو پیاوەدا مایەی ترس بوو. گەوجێتیەکەی بوو، هێڕو نەژنەوی وەك خۆی نەبوو. تەماحی دنیا هێندە بەسەریا زاڵ بوو، هەرکە دەتبینی یەکسەر دەتزانی لە هەموو مرۆڤایەتیەك شۆردراوەتەوەو تەنیا تێرکردنی حەزو ئارەزووە جەستەیی‌و حەیوانیەکانی خۆی لا مەبەستەو هیچی تر... لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیای دڵنیام کە کورنیف ( ناوی کورتیف بوو ) ئەگەر بیستبای حوکم دەدرێت‌و ئەشکەنجەیەکی جەستەیی وەکو ئەوەی ئورلوف دەدرێت، لەرزی لێدەهات،و هەرکەسێکی بەردەست کەوتبا، بێ چەندوچوون، بێ هیچ سڵکردنەوەیەك سەری دەبڕی. ئورلوف دەقاو دەق پێچەوانەی ئەو بوو، روحی بەسەر جەستەیدا زاڵ بوو، گاڵتەی بە دەردو ئازار دەهات، بەسەر خۆیدا زاڵ بوو، سەری بۆ کەس دانەدەواند! گاڵتەی بە قەساس دەهات‌و، لە دنیادا لە هیچ شتێك نەدەترسا. تواناو هێزێکی لە ڕادەبەدەری هەبوو، بە حەوسەڵەو پشوو درێژ بوو، ئەگەر خولیاو کەڵکەڵەی مەبەست‌و ئامانجێکی بکەوتبایە سەر، دەستبەردار نەدەبوو تا بە ئاواتەکەی نەگەییشتبا. ئەوەی کە زۆرم بەلاوە سەیر بوو، کابرایەك بوو بەرزە فڕو لووتبەرز، لە بەرزییەوە دەیڕوانیە خەڵکی، هەڵبەتە ئەمەی بۆ خۆ نواندن‌و ویقار نەدەکرد، شتێکی دەستکرد نەبوو، بەڵکو بە تەبیعەت فڕناخ‌و روحزل بوو. باوەڕ

ناکەم ڕۆژێ لە ڕۆژان کەسێك کاری تێکردبێ. بە خەمساردیو بێ موبالاتی دەیڕوانیە هەموو شتێك، و گوێی لە هیچ نەبوو، و قەت فشەی بەکارو کردەوەکانی خۆیەوە نەدەکرد. هەرچەندە دەیزانی کە زیندانیەکان زۆر بەڕێزەوە تەمەشای دەکەن و حورمەتی دەگرن، بەڵام هەرگیز بەمە لە خۆی بایی نەدەبوو،و خۆی بەسەر کەسدا نەدەنواند. هەرچەندە خۆنواندنو بەخۆ نازین دوو نەخۆشی بوونو لە هەموو زیندانییەکدا هەبوون، پیاوێکی زیرەك بوو. سەر ڕاستو قسە لە ڕوو، بەڵام چەنەبازو فرەوێژ نەبوو. چەند پرسیارێکم لێکرد، بە ڕاشکاویو بێ هیچ پێچو پەنایەك وەڵامی دامەوە کە خوا خوایەتی بە زووترین کات چاك ببێتەوە، تا پاشماوەی سزاکەی لە کۆڵ ببێتەوە. چاوێکی لێ داگرتمو گوتی: هەنگێ هەموو شتێك تەواو دەبێ: سزای خۆم وەردەگرمو دەگەڵ کاروانێکی زیندانییاندا بۆ فرچنسك دەڕۆم... دەرفەت دێنمو هەڵدێم... بەڵێ هەڵدێم، بڕیارێکەو داومە! بەڵام خۆزگە زامەکانی پشتم زوو سارێژ دەبوونەوە! پێنج ڕۆژێك لەگەڵ ئێمەدا مایەوە، بە درێژایی ئەو پێنج ڕۆژە، بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەو ساتە بوو کە لە نەخۆشخانە دەربچێت، پیاوێك بوو هەندێجار زۆری حەزی لە شۆخیو سوعبەتان دەکرد. گەلەك خۆش مجێز دەبوو. جا من هەوڵم دەدا سوود لەو دەمانە وەربگرمو لە بارەی سەرکێشییەکانی خۆیە پرسیاری لێبکەم. هەرچەندە حەزی نەدەکرد باسی خۆی بکات، بەڵام بە ئاستەم برۆکانی وێك دێنانەوەو بەوپەڕی ڕاستگۆییو ڕاشکاوی وەڵامی دەدامەوە. بەڵام کاتێ زانی من گەرەکمە دای بپشکنمو دزە بکەمە قوڵایی ناخیەوەو شوێنەواری پەشیمانی لە دەرونیا بدۆزمەوە، یەکسەر ڕەفتاری گۆڕا، نیگایەکی پڕ غروورو تەوسامێزی ئەوتۆی کردم وەك ئەوەی منداڵێکی گەوج بمو حەز بکات قسەی دەگەڵ بکات، بگرە جۆرە بە زەیی و سۆزێکیشم دەرهەق بە خۆم، لە سیمایدا بەدی کرد. دوای چەند ساتێکی کەم، بێ هیچ تەوسو توانجێك پڕ بە زار لە قاقای پێکەنینی دا. پێموایە دوای ئەوەش هەرکاتێ قسەکانی منی بیر کەوتبێتەوە لە قاقای پێکەنینی داوە. ئەنجام، هەر چەندە هێشتا زامەکانی پشتی بە تەواوەتی سارێژ نەبوو بوونەوە، ناوی خۆی نووسی کە گەرەکیەتی لە نەخۆشخانە وەدەربکەوێ‌و. منیش کە چاك بوو بوومەوە، لە هەمان ڕۆژاو پێکەوە لە نەخۆشخانەکە دەرچووین. من بۆ زیندان گەڕامەوە، بەڵام ئەو بۆ ئەو شوێنە برایەوە کە پێشتر تیایا زیندانیی بوو. کە لە یەکدی جیا بووینەوە بە گەرمیو توندی دەستی گوشیم، ئەمە بەلای ئەوەوە نیشانەی لوتفو مەحەبەت بوو دەرهەق بە من، پێموایە بۆیە ئەوەی کرد چونکە لەو ساتەدا کەیفی قنج و دڵی خۆش بوو. بێگومان بە بودەڵەو بچووکی دەزانیم، چونکە من کەسێکی لاوازو بێدەسەڵات بوومو لە هەموو ڕوویەکەوە مایەی بەزەیی بووم، مرۆڤێك بووم ملی بۆ ئەو قەدەرو چارەنووسە داوە کە لە ناوچەوانی نووسراوە. بۆ سبەینێ باقی شەلاقەکانیان لێدا.

کە شەوێ دەرگاکانی قاوشەکەیان لەسەر داخستین، ژوورەکەمان شێوەیەکی تری وەرگرت، ڕێك شێوەی ماڵی وەرگرت، شێوەی ماڵێکی ئاواو ئاوەدان. تەنیا لەم کاتەدا دەمتوانی بە ئاسانی هاوزیندانییەکانم بدینم، چونکە زیندانییەکان تەنیا بە شەو هەست بە جۆرە ئاسوودەییو دڵنیاییەك دەکەنو وەکو یەك خێزان دەنوێنن. زیندانییەکان بە ڕۆژەوە نیگەران بوون، چونکە بەردەوام چاوەڕوانی ئەوە بوون، پاسەوان وکارمەندان و چاودێرانی زیندانەکە، لە ناکاودا خۆ بە

ژوورا بکەن... بەڵام شەوێ، هەرکە دەرگاکان دادەخران، هەرکەسەو بە ئاسوودەیی‌و ئارامی لە جێی خۆی دادەنیشت،و خۆی بەکارێکەوە مژول دەکرد... لە پڕ ژوورەکە رووناك دەبووەوە، چونکە هەرکەسەو شەم‌و شەمدانی خۆی دێناو لای خۆیەوە دای دەگیرساند، هەر زیندانییەك شەمدانی خۆی هەبوو،و لە تەختە دروستکرا بوو، ئیدی یەکێك دەکەوتە پینەدۆزی‌و پێڵاو درونەوە، یەکێکی دی جلکی دی دەدروەوە. تا شەو زیاتر ڕادەشکا، هەواکە دووکەڵاوی تر دەبوو... گروپێك لە سووچێکا، لەسەر بەڕەیەك دادەنیشتن‌و دەکەوتنە وەرەقبازی. لە هەر ژوورێکدا زیندانییەك هەیە کە ڕایەخێکی چکۆلەی هەشتا سانتی‌و مۆمێکی گەورەو دەستەیەك وەرەقی کۆن‌و چڵکنی هەیە، ئەمە کەرەستەی قومار بوو. خاوەنەکەی بەکرێی دەدا. شەوی بەپانزە کوپیکی دەدا. ئەمە پیشەی بوو. قوماربازەکان زیاتر یاری بیست‌و یەکیان دەکرد، ئەمە یاری بەخت بوو. هەر زیندانییەك کۆمەڵێك دراوی مسینی لە بەردەم خۆیدا دادەنا، کە هەموو داراییەکەی بوو، ئیدی هەڵنەدەستا تا یان دوا قرۆشی خۆی دەدۆڕاند یان هەموو هاوڕێکانی جۆڕدەدا... گەمەکە تا درەنگە شەوانێك بەردەوام دەبوو، هەندێجار تا سپێدەی دەخایاندو زۆرجار تا چەند دەقیقەیەکی پێش کرانەوەی دەرگاکان هەر بەردەوام دەبوون. لە قاوشەکەی ئێمەو هەروەها لە قاوشەکانی دیکەشدا نەدارانێك هەبوون کە هەموو دارو نەداری خۆیان لە قوماردا، یان لە بادەنۆشیدا دۆڕاند بووو، لە دەست دابوو. هەندێکی دی هەبوون هەر لە ئیجادی نەدارو نەبوو بوون. بە نەداری هاتبوونە دنیاوە. کە باسی ئەمە دەکەم مەبەستم ئەوەیە لە نێو میللەتی ئێمەدا خەڵکانێك هەن‌و دەبن، مەرجیش نیە تەمەڵ‌و تەوەزەل بن، لە هەموو بارودۆخێك دا هەر بە نەداری‌و سواڵکەری دەمێننەوە، چونکە قەدەر سواڵکەریی بەسەردا سەپاندوون. ئەمانە بە خۆیان سواڵکەر تەبیعەتن، هەرچیەك بکەن هەر بە سواڵکەری دەمێننەوە، جڵەویان لە دەستی خۆیاندا نیە، خاوەن بڕیاری خۆ نین، بێ باشارن، لە ژێر کۆنترۆڵی خەڵکێکی تردان،و هەر بەو حاڵەوەو لە سایەی کەسێکی تردا، بە تایبەتی کەسانی دەسبلاوی نۆکیسە.دەمێننەوە. ئەو خوازەڵۆکانە، هەموو هەوڵێکیان لێ بارە، قەت خۆبەخۆ پەلاماری کارێك نادەن، بەڵام هەمیشە خزمەتدەکەن،و لە سایەی فەرمانی کەسێکی تردا دەژین، وادروست بوون کە خزمەتکاری خەڵکی تر بن‌و خزمەتی خەڵکی تر بکەن. بۆیە لە هیچ بارودۆخێکدا دەوڵەمەند نابن‌و بە ئاوات‌و مەبەستی خۆ ناگەن... هەر بە سواڵکەری‌و دەسەندەخۆڕی دەمێننەوە... لە ناو هەموو چینەکانی کۆمەڵگەدا لەو بابەتە کەسانەم دیتوون، لە نێو هەموو سنفەکاندا، لە ناو هەموو دەستەو تاقمەکاندا، تەنانەت لە دنیای ئەدەبیشدا لەو جۆرە کەسانەم دیتوون. هەڵبەتە لە هەر زیندانێکداو، لە هەر ژوورێکی زیندانیشدا دەبینرێن...

هەرکە کۆڕی قومار سازدەبوو، یەکێك لەو گەدایانە بانگ دەکرا، شەوی بە پێنج کۆپیکان بە کرێیان دەگرت... ئیشەکەی ئەوەبوو بەو شەوی ساردی زستانە کە زۆر جار پلەی سەرما دەگەییە سی ژێر سفر، لە ڕارەوە تاریکەکەدا بۆ ماوەی شەش حەوت سەعاتان ئێشك بگرێت‌و گوێ هەڵبخات‌و هەر دەنگ‌و ڕەنگێکی بیست‌و بینی، یەکسەر خەبەر بە قومارباز‌ەکان بدات تا فریای خۆ بکەون. چونکە هەندێجار مێجەر یان ئەفسەری ئێشکگر، لە دەرەوە تیشك‌و رووناکی

مۆمەكانی ناو ژوورو قاوشەكانیان دەبینیو بە دزییەوەو لە پڕ گەردەلوول ئاسا خۆیان بە قاوشەكاندا دەكردو قومارچیەكان فریا نەدەكەوتن مۆمەكان بكوژێننەوە، دوكانی قومارەكەیان بپێچنەوەو، خۆیان بكەنە خەوتوو.. ئیدی رێك بەسەر تاوانەكەیانەوە دەگیران. جا چونكە یاریچیەكان لەگەڵ ئەو جۆرە ئێشكگرەدا زۆر سەختگیر بوون، ئەو جۆرە شەبەیخونانە كەمتر روویان دەدا.. وەكو چۆن زۆر شتی ترم بە لاوە سەیر بوو و مایەی سەرنج بوو، بەو ئاوایە ئەم دیاردەیەشم یەجگار بە لاوە سەیر بوو.. ئاخر پێنج كۆپیك تەنانەت لە زیندانیشدا هیچ نیە، زۆر كەمە. كەچی ئەم پیاوە خۆپەرستانە لە كابرای ئێشكگر توڕە دەبوونو دەیانگوت: "بە كرێمان گرتوویت،و مەجبوری خزمەتمان بكەیت !" ئیدی ئەمە چەندو چوونی هەڵنەدەگرت.. مادامێكی كرێی خۆی وەرگرتووەو بە خوایشتی خۆی چووەتە ژێر باری ئەو ئیشە، دەبێ نەك هەر ملكەچو گوێڕایەڵ كاری خۆی ئەنجام بدات، بەڵكو دەبێ منەتباریش بێ. مەمنوونی ئەو كەسە بێت كە بە كرێی گرتووە.. هەندێ زیندانیم دیتوون كە بێ حیساب، پارەیان خەرج كردووەو بە ڕاستو چەپدا تەخشانو پەخشانیان كردووە، كەچی فێڵیان لەو كەسە كردووە كە خزمەتی كردوون.. زیاتر لە جارێك ئەم دیاردەیەم ، لە پتر لە زیندانێكدا بە چاوی خۆم دیتووە.

وەكو پێشتر گوتم، هەموو زیندانییەكان، دەكەوتنە كاركردن جگە لە پێڕی قومار خەریكی یاری خۆدەبوونو چوار پێنج زیندانیی دیكە كە هەركە دەرگاكان دادەخران دەخەوتن. تەختەخەوەكەی من نزیكی دەرگاكە بوو، جێگاكەی ئاكیم ئاكیمیچ بەرانبەر جێگاكەی من بوو،.. كە دەخەوتین سەرمان لێكی دەدا. ئاكیم تا سەعات دەو یازدەی شەوێ كاری دەكرد، فانۆسێكی چینی ڕەنگاو ڕەنگی دروست دەكرد كە یەكێكی خەڵكی شار داوای لێكردبوو بۆی دروست بكات،و پارەیەكی باشی لەم كارە وەردەگرت. ئاكیم لەم كارەدا یەجگار مەعلانو لێزان بوو، زۆر وردو جددی بوو، سستیو خاوە خاوی نەدەزانی. كە لە كار دەبووەوە كەرەستەو ئامێرەكانی كۆدەكردەوەو جوان تاقەتی دەكردن، حەسیرەكەی دێنا نوێژو عیبادەتی خۆی دەكردو پاشان لێی دەخەوت. ئاكیم ئاكیمیچ پیاوێك بوو گوێڕایەڵ، بێ كێشە، دوور لە هەر سەرپێچییەك... هەڵبەتە وەكو هەموو خەڵكێكی ئەقڵ مامناوەندی خۆی بە كەسێكی زیرەك دەزانی. لە سەرەتادا هیچ نەچووە دڵمەوە، هەرچەندە بووە مایەی ئەوەی كە ئەو ڕۆژە زۆر بیر بكەمەوە. پێم سەیر بوو كە پیاوێكی وەكو ئەم پیاوە بەم دەستڕەنگینیە، لە جیاتی لە دەرەوە بێو خەریكی سنعەتێك بێ، لە زیندانی بێگاریدا بێت. بە هەرحاڵ جارێكی تر، لەم نووسینەدا دێمەوە سەر باسی ئاكیم ئاكیمیچ.

با جارێ بێمە سەر باسی هەندێك لە هاوزیندانییەكانی ترم. قەدەری من وابوو چەند ساڵێك لەم زیندانو قاوشەدا بەسەر بەرم. ئەوانەی دەوروبەرم، بە خوتو خۆڕایی بوون بە هاوڕێی هەموو ساتێكی ژیانم. هەڵبەتە منیش بە زەبری فزوڵیەتو لاپرەسەنی حەزم دەكرد هەموو شتێكیان دەربارە بزانم! هاوسێكانی دەستە چەپم گروپێكی خەڵكی قەفقاز بوون. هەر هەموویان بە هۆی چەتەییو رێگرییەوە حوكم درابوون، دیارە جۆرو ماوەی حوكمەكانیان جیاواز بوو.. ئەمانە دوانیان لەزگی بوون،یەكیكیان چەركەسیو، سیانیان تاتاری داغستانی بوون. چەركەسیەكەیان، پیاوێكی گرژومۆن بوو، مەگەر بەدەگمەن، دەنا قسەی دەگەڵ بەشەردا نەدەكرد، كە ژێراو ژێر

نیگایەکی کردبای، بزەیەکی هوڤیانەی ترسناکی بە ڕوودا دەدایت. بەڵام لەزگییەکان، یەکێکیان پیرە مێرێکی لووت درێژی دەنووکە داڵاشیو، درێژ داهۆڵێکی لاواز بوو، سیمای هاواری دەکرد کە چەتەو ڕێگرە. بەڵام هاوڕێکەی کە ناوی (نورا) بوو، وا نەبوو، هەرکە یەکەمجار دیتم، چووە دڵمەوەو حەزم لە چارەی کرد. پیاوێکی چوار شانەی کورتە باڵای تۆکمە بوو، هێشتا گەنج بوو، قژی زەرد، چاوانی شینو کەپووی بەرز، سیمای زیاتر لە سیمای فنلاندی دەچوو... وەکو هەموو ئەوانەی کە زۆربەی ژیانیان بە سواری ئەسپو بەسەر ئەسپەوە دەبەنە سەر، لاقەکانی خوار بوون، ئازای بەدەنی شوێنەواری کۆنە زامی قەمەو سونگی و فیشەك بوو. ئەم پیاوە، هەرچەندە یەکێك بوو لە چیاییە گوێڕاڵو بێوەیەکان، بەڵام ژێراو ژێر بەگەڵ یاخیو ڕێگرەکان کەوتبوو،و کەوتبووە پەلاماردانی رووسەکان. چونکە پیاوێکی رووخۆشو سوعبەتچی بوو هەموو زیندانییەکان خۆشیان دەویست. بێ هیچ خوتەو بۆڵەیەك ملی بە کارەوە دەنا، هەمیشە هێدیو لەسەرخۆ بوو. زۆری ڕق لە دزیو ناپاکیو دەست پیسیو حیلەبازیو بادەنۆشی بوو، بەو جۆرە کارانە زۆر پەستو تۆڕە دەبوو، کاری نامەردانەو بێ ئابڕوانەی پێ قووت نەدەچوو، بەڵام وێڕای ئەوەش، بەگژ کەسدا نەدەچوو، بەڵکو بە نەفرەتو بێزارییەوە هەڵدەستاو لەو ناوە دوور دەکەوتەوە. بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە لە زیندان‌دا بوو تاقە دزییەکی نەکرد، کارێکی نەکرد گلەییو گازاندەی بێتە سەر. پیاوێکی زۆر بە دینو پڕ عیبادەت بوو، سەری چووبا نوێژی نەدەچوو، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی دەگرت، پابەندی ئاینی خۆی، ئیسلام بوو، زۆرجار تاکو بەیانی هەر خەریکی شەونوێژ دەبوو. هەموو زیندانییەکان خۆشیان دەویستو، بە پیاوێکی سەنگینو ئابڕومەندیان دەزانی... زیندانییەکان ناویان نابوو (نورا شێر)و ئیدی ئەم ناوە بوو بە نازناوی هەمیشەیی. زۆر دڵنیا بوو کە ئەگەر ماوەی حەپسییەکەی تەواو بکات، دەگەڕێتەوە بۆ قەفقاز، لە راستیدا بەو ئاواتەوە دەژیا، دڵنیام ئەگەر ئەو ئاواتەی نەبوایە، لە داخا دیقی دەکردو دەمرد. هەر یەکەم ڕۆژ کە گەییمە زیندان – لە نێو هەموو زیندانییەکاندا، سەرنجم لەسەر ئەو گیرسایەوە، ئاخر چۆن ئەم سیما هێدیو هێمنو پاكو میهرەبانە لە نێو ئەو هەموو سیما گرژو مۆنو عەبوسو خەمناکانەی دیدا جیا ناکرێتەوەو نابێتە مایەی سەرنج! دوای نیو سەعاتێك هات بەلامەوە، بە سۆزو لوتفێکی زۆرو بەدەم بزەیەکی شیرینەوە دەستی بە شانمدا هێنا. لە سەرەتاوە نەمزانی دەیەوێ چیم پێ بڵێت، چونکە زمانی رووسی بە باشی نەدەزانی. بەڵام دوای تۆزێکی دی هەمدیس هاتەوەو بەدەم بزەیەکی پڕ لە سۆزو دۆستایەتیەوە دەستی بە شانمدا هێنا. سێ دانە ڕۆژ، ئەم ڕەفتارەی دووبارە کردەوە، پاشان بۆم دەرکەوت کە ویستویەتی بەم ڕەفتارەی هاودەردیو هاوخەمی خۆیم بۆ دەرببڕێ،و بڵێ بەزەیی بە حاڵما دێتەوە، دەزانێ چەند دڵم تەنگە،و ئەم یەکەم ساتانەی زیندان چەند دژوارو قورسە، دەیویست بە زمانی بێ زمانی بڵێت ئامادەیە دۆستایەتیم بکات، پشتیوانیم لێبکاتو بمپارێزێت. لە خۆت غەریبێ نورای میهرەبان، نورای ئازیزو سادەو ساویلکە!

تاتارەکانی داغستان، سێ کەس بوون، ئەمانە برا بوون. دوانیان روو لە پیری بوون، سێیەمیان کە عەلی ناو بوو، گەنج بوو، لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا بوو، بە ڕواڵەت لە تەمەنی خۆی بچووکتریش

دەینواند. ئەمە لەلای منەوە دەنووست. بە عەمراتم پیاوی وا قۆزو جوانم نەدی بوو، سەرو سیمای جوانی، ئاوێنەی دڵو دەروونو روحی جوانی بوو. مەمنوونو سوپاسگوزاری قەدەر بووم کە ئەم کوڕەی کردبوو بە دراوسێمو نەکەوتبوومە لای زیندانییەکی ترەوە. سیمای ئاوێنەیەکی بێگەرد بوو و دڵو دەروونە پاکەکەی دەنواند. هەمیشە بزەیەکی شیرینی منداڵانە بەسەر لێویەوە بوو، چاوە رەشو درشتەکانی سۆزو میهرو ئاسوودەییان لێدەباری، کە چاوم بە نیگا خەمینەکانی دەکەوت، هەرچی خەمو پەژارەو نا ئومێدیو نیگەرانیەکم هەبوو دەڕەوینەوەو هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد.

رۆژێك کە لە ماڵەوە دەبێت برا گەورەکەی (پێنج برای هەبوو، دووانیان لە زیندانێکی تر، لە کانەکانی سیبیریادا بوون) ئەمری پێدەکات کە شمشێرەکەی هەڵگریو سواری ئەسپەکەی ببیو دوای بکەوێ. چیانیشینانی قەفقاز وا پەروەردە کراون کە کوێرانە گوێڕایەڵی گەورەکانی خۆیان بکەن. بۆیە عەلی بێ چەندوچوون، بێ ئەوەی بپرسێت کێوە دەچنو بەنیازی چین، دوای براکانی خۆی کەوت. تومەز براکانی بە نیازی رێگری بوون. بەمجۆرە هەر سێ برا دەچن رێگە بە کاروانێکی بازرگانی دەگرن، کاروانەکە هی پیاوێکی ئەرمەنی دەبێت، پیاوە دەکوژنو ماڵەکەی تالآن دەکەن. بۆ نەگبەتی کارەکەیان لە ناوچەکەدا دەنگ دەداتەوەو کەشف دەبن، ئیدی هەر شەش برایەکە دەستگیردەکرێن، حوکم دەدرێن، دوای شەلاقکاری، هەواڵەی تاراوگەو بێگارە زیندانانی ( سجن الاعمال الشاقە) سیبیریا دەکرێن. دادگا بە حکومەکەی عەلی دا دەچێتەوەو سزاکەی بۆ سووك دەکرێ، دەبێ بە چوار ساڵ زیندانی بە بێگارەوە. براکانی زۆریان خۆشدەویست، خۆشەویستی و رەفتاریان دەگەڵ عەلی دا زیاتر باوکانە بوو تا برایانە. عەلی تاقە خەمڕەوێنی زیندانو تاراوگەیان بوو. هەرچەندە بە تەبیعەت گرژو پەستو مۆن بوون، بەڵام هەمیشە بەدەم ئەوەوە پێدەکەنین. هەرکاتێ قسەیان دەگەڵ کردبا — کە زۆر بە کەمی دەیاندوان، چونکە بەلای ئەوانەوە لەوە منداڵتر بوو، کە باسی شتی جددی و شتە قووڵەکانی ژیانی لەگەڵدا بکرێ— رووی گرژو پەستیان دەگەشایەوە، یەکسەر هەستم کرد، ئەمانە وەکو چۆن منالێك دەدوێنرێو سوعبەتی دەگەڵ دەکرێ، بەو ئاوایە قسە دەگەڵ عەلیدا دەکەن، خۆ ئەگەر بە شەرمو نەزاکەتەوە وەڵامێکی دابانەوە، خێرا تەمەشایەکی یەکتریان دەکردو بە خۆشیەوە بە روویا دەگرژینەوە. عەلی، ئەوەندە حورمەتی براکانی دەگرتو شەرمی لێدەکردن کە قەت پرکێشی نەدەکرد، سەری قسەیان لەگەڵدا بکاتەوە، بە شەرمێکەوە کزکۆڵەی دەکردو چاوەڕوانی دەکرد تا ئەوان سەری قسان بکەنەوەو بیدوێنن. کاتێ کە بیر لەوە دەکەمەوە ئەم کوڕە بە درێژایی چوار دانە ساڵ، لە چ ژینگەیەکی ترسناكو نالەبارو گەندەڵدا ژیاوە، ژینگەیەك کە هەواکەشی لەو تاوە، سەرم سوڕدەمێنێ چۆن بەو حاڵەوە توانیویەتی بەو دڵپاکیو بێگەردیە، بەو ئابڕوومەندییە خۆڕسکەوە، بەو دڵاواییەوە، بەو دروستکارییەوە بمێنێتەوەو ئاکارو ئەتواری نەلەوتیو خووی شەڕ نەبێت... ئەمە سرێکە هیچ شرۆڤەو ڕاڤەیەك پەی پێ نابات... سەرباری هەموو ناسکیو شیرینیو نەرمونیانیو پاکیەکی ، دواتر بۆم دەرکەوت کە تەبیعەتێکی مەردانەو ورەیەکی یەجگار بەرزی لە هەنبەر ناخۆشیو تەنگاناندا هەبوو. بە ئەندازەی کیژێکی عازەب بە حەیاو

حورمەتو پاك بوو، بە هیچ پەست نەدەبوو بە كاری نادروست و ناشیرین و نەنگین نەبیٚ، كە كاریٚكی نەنگین یان ناهەقیو زوڵمی دیتبا چاوی دەپەڕییە تەوقی سەری ، چاوە رەشەكانی دەكرانەوەو گڕی تووڕەییان لیٚدەبووەوە، بەمە هیٚندەی تر جوان دەبوون، هەرچەندە لەوانە نەبوو سووكایەتیو بیٚ حورمەتیو زیٚدەگاڤی لە كەس قەبوولٚ بكات، بەڵام خۆی لە شەڕو قەرقەشە لادەدا، خۆی لە جنیٚوو سخیٚفان دەدزییەوە،و بەتەنگ حەیاو حورمەتو ویقاڕو ئابڕووی خۆیەوە بوو. جا شەڕ لەگەڵ كیٚدا بكات ؟ هەموو خۆشیان دەویستو مدارایان دەكرد... لە سەرەتاوە لە دوورەوە، زۆر بە نەزاكەتەوە، رەفتاری دەگەڵ مندا دەكرد، منیش هەندیٚ ئیٚوارە دەم دواند، ئیدی زوو بە زوو هۆگری یەكتر بووین. لە ماوەی چەند مانگیٚكدا بەباشی فیٚری زمانی رووسی بوو، ئەم تواناو بەهرەیە لە براكانیا نەبوو، چونكە هەرگیز نەگەییشتنە ئەو ئاستەی بە باشی بە رووسی قسان بكەن. هەر لە سەرەتاوە هەستم كرد عەلی گەنجیٚكی زیرەك، خاكیو هەستیارو بە ئاوەزە. عەلی گەنجیٚكی كەم ویٚنە بوو. تاكو ئیٚستاش شانازی بەو رۆژانەوە دەكەم كە ئەوم تیا ناسی، بە خۆشترین رۆژانی ژیانی خۆمیان دەزانم. هەندیٚ كەس هەن هەر لە خۆوە دەچنە دڵەوە، تەبیعەتیان هیٚندە بەرزە، هیٚندە جوانە، خودا بەهرەیەكی ئەوتۆی داونەتیٚ كە پیاو تەسەور ناكات رۆژیٚ لە رۆژان ژەنگ هەڵبیٚننو گەندەڵ بن... پیٚویست ناكات كەس نیگەرانیان بیٚو خەمیان لیٚبخوات، بۆیە من هەرگیز لە عەلی نەدەترسام، متمانەو باوەڕی تەواوم پیٚی هەبوو... تۆ بڵیٚی ئیٚستا لە كویٚ بیٚ ؟

ماوەیەكی زۆر بوو هاتبوومە زیندان، رۆژیٚك لە سەر تەختە خەوەكەم ڕاكشابووم، نقومی خەیاڵاتی دوورو دریٚژی خۆم بووم، بیرەوەریانی تاڵو بە سویٚ لە ناخی ناخما شەپۆلیان دەدا. عەلی كە بە دەگمەن بەبیٚ ئیش دادەنیشت، لەو كاتەدا كاری نەدەكرد، هیٚشتا وەختی خەویش نەهاتبوو. جەژنی رەمەزان بوو، بۆیە هەر سیٚ برا بەبۆنەی جەژنەوە كاریان نەدەكرد. عەلی لەسەر گازی پشت راكشاوەو هەردوو دەستی خستوونەتە ژیٚر سەریو خۆی داوە بە دەم خەیاڵەوە. لە پڕ لیٚی پرسیم:

– چیە، پیٚدەچیٚت زۆر خەمبار بیت ؟

بە سەرسامی تەمەشام كرد، ئەم پرسیارە لە كەسیٚكی وەكو عەلییەوە كە هەمیشە لەخەمی ئەوەدا بوو دڵی كەس نەیەشیٚنیٚو هەستی كەس بریندار نەكات، دوور بوو. بەڵام كە لە سیمای وردبوومەوە، یەكسەر هەستم كرد ئەم پرسیارەی بە خۆڕایی نەكردووە، خەمو پەژارەیەكی قووڵم لە سیمایدا خویٚندەوە كە پیٚدەچوو زادەی ئەو بیرەوەرییە شیرینو خەمناكانە بیٚت كە لە خەیاڵیدا دەخولانەوە. ئیدی زانیم بەخۆی لەو ساتەدا یەجگار خەمبارو دڵتەنگە. یەكسەر وەڵامم دایەوە: "بەڵیٚ منیش خەمینو دڵتەنگم." هەناسەیەكی قووڵی هەڵكیٚشاو بزەیەكی خەمناكی كرد. زۆرم حەز لە زەردەخەنەكەی بوو، یەكپارچە میهرو لوتف بوو. كە پیٚدەكەنیو بزەی دەهاتیٚ دوو ریزە ددانە مرواری ئاساكەی دەردەكەوتن. دانەكانی هیٚندە جوان بوون، لەوە بوو جوانترین گووراوی دنیا ئیٚرەییان پیٚ بەریٚت.

گوتم: "عەلی گیان، پێموایە بیر لەوە دەکەیەوە کە ئەمڕۆ لە داغستاندا چۆن جەژن دەگێڕن! بێگومان دەبێ ئاهەنگی جەژنی لەوێندەر زۆر خۆش بێ....

چاوانی عەلی پرشنگیان داو، بە تاسەیەکی زۆرەوە گوتی: بەڵێ وایە، بەڵام چۆن زانیت من بیر لەوە دەکەمەوە ؟

– چۆن نازانم عەلی گیان ؟ باشە جەژن لەوێندەر خۆشتر نیە تا لێرە ؟

– تکایە، باسی ئەمە مەکە.

– هەڵبەتە ئێستا لەوێندەر وەرزی گوڵانە، دەشتو دەر بە گوڵ خەمڵیوە،و هەموو شوێنێکی وڵاتەکەتان وەکو بە هەشتی بەرینە!.

– تکات لێدەکەم باسی مەکە .

دیار بوو نیگەران بووە.گوتم:

– باشە عەلی تۆ خوشکت هەیە ؟

– بەڵێ، بەڵام تۆ ئەو پرسیارە بۆ دەکەی ؟

– ئەگەر لە تۆ بچێت، یەجگار خشکۆکە!

– منی چی؟ خواشمان یەك نییە. شاجوانی سەرانسەری داغستانە. جوانی وا نەبووەو نابێتەوە! دڵنیام لە عەمراتت کیژی واجوانت نەدیتووە. دایکیشم ژنێکی جوان بووە.

– دایکت خۆشی دەویستی ؟

– توخوا ئەوە پرسیارە؟ دەترسم لە داخ‌و خەفەتا مردبێ. زۆری خۆش دەویستم، من گەوهەری عەزیزو یەك دانەی ئەو بووم. لە خوشکەکەم‌و لە هەموو براکانم خۆشتری دەویستم... ئەمشەو هاتە خەوم‌و وەکو بارانی بوهارێ فرمێسکی بەسەردا باراندم.

عەلی لە پڕ قسەکەی بڕی و ئیدی بە درێژایی ئەو شەوە زاری هەڵنەهێناو تاقە وشەیەکی لە دەم نەهاتە دەر، بەڵام لەو شەوە بە دواوە، خوا خوای دەرفەتێکی بوو کە قسەم دەگەڵدا بکات، بەڵام ئەوەندە بەحورمەت‌و بە ئەدەب بوو، ڕێی بە خۆی نەدەدا ئەو لە قسەکردندا دەست پێشکەر بێت، چەندی پێ خۆش بوو کە قسەم دەگەڵی دەکرد! زۆر باسی قەفقازو ژیانی رابردووی خۆی دەکرد، براکانی خۆیان لە قسەکانمان هەڵنەدەقورتاند، پێیان ناخۆش نەبوو کە عەلی قسەی دەگەڵ من دەکرد، بەپێچەوانەوە پێدەچوو پێیان خۆش بێت، کە دەیانبینی روو بە عەلی دەدەم‌و دەیلاوێنم‌و خۆشم دەوێ، ئەوانیش زیاتر مدارایان دەکردم‌و لێم دەهاتنە پێشێ.

عەلی، لە کاروباری دەرێدا کۆمەکی دەکردم، لە ناو زیندانیشدا زۆر دڵی ڕادەگرتم‌و ئیشێکی نەدەکرد کە بیزانیایە بە دڵم نییە، زۆری مدارا دەکردم، هەڵبەتە ئەمەی تەنیا لە پیاوەتی خۆی دەکرد، دەنا هیچ نیازو تەماحێکی بە من نەبوو، تەنیا هاوسۆزی‌و خۆشەویستییەکی بێ ریاو ڕووبینی بوو. عەلی لە فێر بوونی کاری دەستیدا زۆر زیرەك‌و بەهرەمەند بوو. لە ماوەیەکی کورتدا فێری خەیاتی بوو، فێری پینەدۆزی بوو و تەنانەت بڕە شارەزاییەکی لە دارتاشیشدا پەیدا کرد... لە زینداندا هەر ئەو ئیشانە هەبوو... برایەکانی شانازییان پێوە دەکرد.

رۆژێك پێمگوت: گوێ بگره عەلی، بۆ نایەی فێری خوێندنو نووسینی رووسی ببی؟ زانینی رووسی لە ئایندەداو لە دەڤەری سیبیریادا، بە کەڵکت دێت ؟

– من زۆرم حەز لێیە! بەڵام کێ فێرم دەکات ؟

– پێموایە خەڵکی خوێنەوار لێرە زۆرن. ئەگەر حەزدەکەی من فێرت دەکەم.

– هەر حەز! مەمنوونت دەبم.

ئەوسا بە پەرۆشەوە لەسەر تەختە خەوەکەی هەستا، دەست لەسەر سینگ ڕاوەستاو، نیگای پڕ پاڕانەوەو منەتباری تێ بڕیم.

لە سبەی شەوەوە دەستمان بە دەرس خوێندن کرد. پاچڤەیەکی رووسی ئینجیلم پێ بوو، ئەمە تاقە کتێب بوو کە لە زینداندا قەدەغە نەبوو. عەلی لە ماوەی چەند هەفتەیەك، بە هۆی ئەم کتێبەوەو بە بێ فێر بوونی ئەلفبا، بە تەواوەتی فێری خوێندنەوە بوو، و دوای سێ هەیڤان بەتەواوەتی فێری نووسینیش بوو، زۆری حەز لە خوێندن و نووسینو فێر بوون بوو.

رۆژێك کە پێکەوە، بە دوو قۆڵی ئامۆژگاری کێومان دەخوێندەوە، هەستم کرد هەندێ لە ئایەتەکان بە دەنگێکی تایبەتیو پڕ سۆزەوە دەخوێنێتەوە، لێم پرسی ئەوەی خوێندیەوە بە دڵی بوو، نیگایەکی تیژی کردم، دەموچاوی سوور هەڵگەڕاو گوتی: – بەڵێ عیسا پێغەمبەرەو بە زمانی خواوە دەدوێ. تۆ بزانە ئەم پەیڤانە چەند چوانن !

– باشە کام ئایەتەت زیاتر بە دڵ بوو ؟

– ئەو ئایەتەی دەڵێت: " لە دژمنانتان ببورن! دژمنانتان خۆش بوێ، خراپە دەرهەق بەکەس مەکەن." کە قسەگەلێکی جوانن!

عەلی ئاوڕێکی لە براکانی، کە گوێیان لە قسەکانی ئێمە دەگرت، دایەوەو زۆر بە گەرمو گوڕی چەند قسەیەکی دەگەڵ کردن. هەر سێ برا ماوەیەکی زۆر بە جدی قسەیان کرد، جووتە براکەی ناو بە ناو سەریان بۆ دەلەقاندو، پشتیوانیان لە دروستی قسەکانی دەکرد. پاشان بە دەم بزەیەکی جدیییەوە رویان کردە من ( بزەکەیانم زۆر لە گیان خۆش بوو، چونکە بە جدیان بوو )و تێیان گەیاندم کە عیسا پێغەمبەرێکی مەزنەو باسی ئەوەیان کرد کە پەرجووی گەورەی کردووە، یەکێك لەوانە باڵندەیەکی لە قوڕ دروستکردووەو فووی پێدا کردووە، روحی کەوتووەتە بەرو لە شەقەی باڵی داوەو فریوە. هەستم دەکرد پێیان وایە بە ستایشکردنی عیسا، دڵی من خۆش دەکەن. عەلی بەستەزمانیش زۆری دڵ بەوە خۆش بوو کە دەیبینی برایەکانی ئەوەندە دەگەڵ مندا میهرەبانن.

سەرکەوتووانە عەلیم فێری خوێندنەوە کرد. ئەمجار نۆرە هاتە سەر نووسین. کاغەزو قەڵەمو مەرەکەبم بۆ پەیدا کرد ( عەلی قەبووڵی نەکرد من ئەو شتانە بکڕم، بە خۆی پارەکەی دا ) لە ماوەی دوو مانگدا عەلی فێری نووسین بوو. براکانی سەریان لەم پێشکەوتنە لەزەی عەلی سوڕما، لە رادەبەدەر خۆشحاڵ بوون، لە خۆشیا نەیاندەزانی چۆن سوپاسگوزاریو منەتباری خۆیانم بۆ دەربڕن، کە لە کارگەدا (وەرشە) کارمان دەکرد، بە شانازییەوە کۆمەكو بەردەستیان دەکردمو لەزەتیان لەم کارەی خۆیان دەبینی. سەبارەت بە عەلی، هەر باسی مەکە، بە ئەندازەی براکانی

خۆی خۆشی دەویستم. هەرگیز ئەو رۆژەم لەبیر ناچێت کە ئازاد کرا. لە قاوشەکە بردمیە دەرێ، دەستی لە گەردنم وەریناو ما بگری. قەت پێشتر ماچی نەکرد بووم‌و لەبەر چاومدا نەگریا بوو. بە دەم گریانەوە گوتی:

– تۆ زەحمەتێکی زۆرت بە منەوە کێشاوە، چاکەیەکی زۆرت دەگەڵ کردووم، ئەوەی تۆ بۆ منت کردووە داک‌و بابم بۆیان نەکردووم، خودا ڕاوەستاوت بکات. من هەرگیز، تا ماوم تۆ لە بیر ناکەم، بەعەمراتم...

ئاخۆر دەبێ ئێستا لە کوێ بێ ؟ عەلی دۆستی دڵپاک‌و ئازیزم دەبێ لە کوێ بێ ؟

جگە لە چەرکەسییەکان، شەش کەسی پولاندیش لە قاوشەکەماندا بوون، ئەمانە گروپێکی تایبەتی بوون،و هەمیشە بەیەکەوە بوون، هێندەی کرابا تێکەڵ بەزیندانییەکانی دی نەدەبوون‌و، پەیوەندییان دەگەڵ خەڵکیدا ئەوەندە کزبوو لە نرخی نەبوودا بوو. پێشتریش باسی ئەوەم کرد بوو کە بە هۆی گۆشەگیری‌و دوورەپەرێزیان لە زیندانییانی رووس، بێزراو بوون. ئەمانە زۆر هەستیارو بە گومان‌و حولحولی تەبیعەت‌و دەمدەمی مگێزو شپرزە بوون. ژمارەیان شەش کەس بوو، دووانیان خوێنەواربوون کە پاشان بە درێژیی لەم سەربورەدا باسیان دەکەم، لە ئاخرو ئۆخری ماوەی زیندانیەکەمدا، هەندێجار کتێبم بە ئەمانەت لەو دووانە وەردەگرت. کە یەکەم کتێبی ئەوانەم خوێندەوە، کارێکی دەروونی سەیری تێکردم... پاشتر دێمە سەر باسی ئەو هەستە سەیرانەی کە لەلام دروست بوون، هەرچەندە وەکو رۆژی روون لەلام عەیانە کەم خوێنەر وەکو پێویست لەو هەستانەی من دەگەن، چونکە هەندێ شت هەیە مرۆڤ تا بە خۆی نەی جەربێنێ بە ئاسانی لێی تێناگات. ئەوەی دەمەوێ لەمبارەیەوە بیڵێم ئەوەیە مەحرومیەت لە لەزەتە فیکری‌و مەعنەوییەکان زۆر قورسترو دژوارترە لەمەحرومیەت‌و ئازاری جەستەیی.

راستە کەسێکی عەوام‌و دێهاتی کە دەخرێتە زیندان، لە ماڵ‌و منداڵ‌و کەسوکارو ئازیزانی دادەبڕێت، بەڵام لەکۆمەڵگەو ژینگەکەی خۆی دانابڕێت، لە هەمان کۆمەڵگەداو بگرە لە کۆمەڵگەیەکی باشترو پێشکەوتووتردا دەگیرسێتەوەو خۆی دەبینێتەوە. بەڵام ئەو پیاوە رۆشنبیرو خوێنەوارەی کە هەمان حوکم‌و سزای کابرای عەوام دەدرێت، ئازارەکەی زۆر قورسترە، جگە لەوەی لە ماڵ‌و منداڵ‌و کەسوکارو ئازیزانی خۆی دادەبڕێت، لە زۆر شتی دیکەش مەحرووم‌و بێبەش دەبێت. دەبێ دەست لە هەموو عادەتێکی خۆی، لە هەموو سەرچاوەیەکی هزری خۆی کە بەشێکە لە ژیانی، بشۆرێت‌و بە ناچاری بۆ ئاستێکی نزمی ئەوتۆ بێتە خوارەوە کە پێی ڕازی نیە. یانی مێشکی خۆی بە مردنی بەرە بەرە بسپێرێت،و خۆی بە هەڵمژینی هەوایەکی دی ڕابهێنێ، ئیدی لە ماسییەك دەچێت لە ئاو دەرهێنرابێ‌و فڕێ درابێتە سەر لمەلانێك‌و کەوتبێتە هەلەکەسەما. ئیدی ئەو حوکم وسزایەی بە پێی یاسا بۆ ئەم دوو جۆرە تاوانبارە یەکسانە، بۆ کابرای خوێنەوار دە ئەوەندە کابرای عەوام ناخۆش‌و بە ئازارە. ئیدی ئەمە حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگرە، هەرچەندە تەنیا باسی ئەو لایەنە مادیانەمان کرد کە دەبێ دەستیان لێ بشوات.

پۆلاندییەکان یەك گروپ بوون‌و پێکەوە دەژیان، لە نێو هەموو زیندانییەکاندا، تەنیا دەگەڵ زیندانییەکی جولەکەدا بەینیان خۆش بوو، بۆیە خۆشیان دەویست چونکە پیاوێکی قۆشمەو حەنەکچی بوو، نوکتەی بۆ دەگوتن‌و دەیهێنانە پێکەنین‌و خەمی دەڕەواندنەوە. بە هەرحاڵ ئەم جولەکەیە وێڕای ئەوەی هەموو زیندانییەکان قەشمەریان پێدەکردو پێیان رادەبوارد، بە شێوەیەکی گشتی پیاوێکی خۆشەویست و روح سووك بوو. ئەمە تاقە جولەکە بوو لە ناوماندا. ئێستاش کە بیرم دەکەوێتەوە خۆم لەبەر پێکەنین ناگرم. هەرچەند سەیرم دەکرد رێك (یانکل)ـە جووی قارەمانی چیرۆکی تاراس بوڵبای (گۆگۆڵ)م بیردەکەوتەوە کە کاتێ خۆی رووت دەکردەوە تا دەگەڵ ژنەکەیدا جووت ببێ، رێك لە فەرخە مریشك دەچوو. جا بە ڕاستی لێکچوونێکی سەیر لە نێوان ئەشعیا فومیچ ( ئەمە ناوی جولەکەکەی لەمەڕ خۆمان بوو )و فەرخە مریشکی پەڕو باڵ هەڵوەریودا هەبوو، دەتگوت دوو لەتی یەك سێون. ئەشعیا فومیچ تەمەنی هەبوو، نزیکەی پەنجا ساڵێك دەبوو، کورتە بالأیەکی ڕیوەڵە بوو، فێڵبازێکی زۆر گەوج، فشەکەرو خۆ هەڵکێشێکی فرە ترسنۆك بوو. دەموچاوی یەکپارچە چرچ‌و لۆچ بوو، گۆناو تەوێڵی پڕبوون لە شوێنەواری خاڵکوتان. هەرچەند تەمەشای بە ژن‌و بالأو جەستەی وردیلەیم دەکرد، نەمدەتوانی باوەڕبکەم کە ئەم کابرایە چۆن بەرگەی شەست دانە شەلاقی گرتووەو نەمردووە. تاوانی کوشتنی لەسەر ساغ بوو بووەوە. ئەمە ڕەچەتەیەکی دکتۆری لە گیرفاندا بوو کە چەند جولەکەیەکی دی یەکسەر دوای خاڵکوتانەکەی، بۆیان وەسف کردبوو. گوایە ئەو هەتوانەی لەم رەچەتەیەدا نووسرابوو، بە کەمتر لە دوو هەفتە جێ زامەکانی سارێژ دەکردەوە، بەلأم ئەشعیا فومیچ نەی وێرا بوو ئەم هەتوانە بەکار بێنێ. چاوەڕوانی دەکرد بیست ساڵی حەپسەکەی تەواو بکات‌و لەو دەڤەرەدا بگیرسێتەوە ئەوجا هەتوانە شفا بەخشەکەی بەکاربێنێ. پێی دەگوتم: " ئەگەر ئەم هەتوانە بەکار نەیەنم ناتوانم ژن بێنم، خۆ هەر چۆنێ بێ دەبێ ژن بێنم ". ئیدی بووین بە دۆست. هەمیشە رووخۆش، بە کەیف‌و بە دەماخ بوو. لەوە نەدەچوو ژیانی زیندانی زۆر بەلاوە ناخۆش بێت، ئەم پیاوە پیشەی زەڕنگەری بوو، چونکە جگە لەو هیچ زەڕنگەرێکی دیکە لە شارەکەماندا نەبوو، ئیشی زۆر بوو،و بازاڕی گەرم بوو و داخوازییەکی زۆر لەسەر ئیشەکانی هەبوو، و فریا نەدەکەوت، بۆیە لە بێگار عەفو کرا بوو. وەکو هەر جولەکەیەك بە سووت قەرزی بە زیندانییەکان دەدا، تا شتێکیان بە بارمتە لا دانە نابا قەرزی نە دەدانێ. ماوەی قەرزدانەکەشی تەنیا یەك هەفتە بوو. لە پێش منا هاتبووە ئەم زیندانە،و یەکێك لە پۆلاندییەکان بۆی گێڕامەوە کە بە چ شکۆیەکەوە هاتبووە زیندان، ئەمە حیکایەتێکی دوورو درێژی هەیەو پاشان کە دێمەوە سەر ئەشعیا فومیچ دەیگێڕمەوە.

زیندانییەکانی دیکەی قاوشەکەمان بریتی بوون لە چوار کەس لەو یاخیانەی کە سەر بە ئاینزاکەی کابرای پیرەمێری خەڵکی ستارودوب بوو، لەگەڵ دوو یان سێ کەسی خەڵکی رووسیای بچووك کە هەموویان خەڵکی گرژو مۆن‌و عەبوس بوون. لەگەڵ گەنجێکی بیست‌و سێ ساڵان دەموچاو چکۆلەی کەپوو باریکی دەندووکە دالأشیدا کە هەشت کەسی کوشتبوو، لەگەڵ گروپێکی تەزویرچی پارەو پول دا کە یەکێکیان لێبۆکی ژوورەکەی ئێمە بوو، لەگەڵ کۆمەڵە

کەسێکی دیکەی سەر تاشراوی، سەروچاو شێواوی بەغیل‌و بوغزن‌و خەمبارو دڵتەنگ کە بە رق‌و کینەوە دەیانڕوانیە هەموو ئەوانەی دەوروبەریان‌و ئامادە نەبوون قسە دەگەڵ کەسدا بکەن‌و بە درێژایی سالآنێکی زۆر ئەوە پیشەیان بوو. هەر هەموو ئەم سیمایانەم، لە یەکەم رۆژی سامناکی زیندانییەکەمدا وەکو تاپۆو تارماییان بەدی کرد، زیندانی چی، ژینگەیەکی بۆگەن‌و دووکەڵاوی‌و بەدبۆو پڕ لە جنێوی سووک‌و بازاڕی‌و قەرقەشەو دەمبۆڵەو تەوهینی ژەهراوی‌و قاقاو پێکەنینی تەوسەئامێزو زرەی زنجیرو کەلەپچە. لەسەرتەختە خەوێکی رەق‌و تەق‌و بێ رایەخ ڕاکشام، چاکەتەکەم کرد بە سەرین‌و لە ژێر سەرم دانا ( هێشتا سەرینم وەرنەگرتبوو )و پاڵتۆکەم بەخۆما دا. بێهودە هەوڵم دا خۆم‌و ئەم ژینگە تازەیە بە خەوتن فەرامۆش بکەم. ژیانی تازەم لەم ساتەوە دەستی پێدەکرد. و ئایندەش شتی ئەوتۆی پێ بوو کە نە بیرم لێکردبووەوەو نە خەیاڵ.

((٥))

## مانگی یەکەم

### ١-٢

دوای سێ ڕۆژ، ئەمرم پێکرا کە دەگەڵ زیندانییەکانی دیکەدا بۆ کارو بێگار بچمە دەرێ. تاکو ئێستاش ئەو ڕۆژەم بە ڕوونی لە بیرە، هەر ەندە ئەگەر دەگەڵ بارودۆخی گشتیمدا بەراورد بکرێ، شتێکی تایبەتی تیا نەبوو. بەڵام ئیدی هەستو سەرنجی بەراییم بوو: لەو ساتەدا زۆر بە دیقەتو بە تاسەوە تەمەشای هەموو شتێکم دەکرد. هەڵبەتە ئەو سێ ڕۆژە دژوارترین ڕۆژانی زیندانیم بوو. بەڵام لە دڵی خۆمدا دەمگوت: "ڕۆژانی سەفەر تەواو بوو. ئەوا ئیدی گەیشتمە ئەم تاراوگەو گرتووخانەیەی کە دەبێ ساڵانێکی زۆری تیا بەسەربەرم. لەمە بەدوا دەبێ لێرە، لەم کاولەدا بژیم. ئێرە دەبێت بە ماڵم. بە دڵی تەنگو دەروونی لێوان لێوی ژانو گومانەوە خۆم بەم ماڵەدا دەکەم." "کێ دەزانێ چ پێشهاتێك دێتە ڕێم ؟ لەوەیە دوای ساڵانێکی زۆر، کاتێ کە لێرە دەرم دەکەن، پێم ناخۆش بێت، بیری ئێرە بکەم !" هەندێجار پیاو کە پەی بە دژواریو گەورەیی کلۆڵی خۆی دەبات، هەست بە قورسی ئەو بەڵاو نەگبەتیە دەکات کە بەرۆکی گرتووە، لەزەتێکی زۆر دەبینێ.

جا من کە بیرم لەوە دەکردەوە لەگینە ئەو ڕۆژەی کە ئێرە بەجێ دێڵم، پێم ناخۆش بێت، بیری ئێرە بکەم، زۆر دەترسام. ئیدی لەو ساتەوە ئەوەم لا چەسپی کە " مرۆڤ حەیوانێکە لەگەڵ هەموو شتێکدا ڕادێ "... ئەم پێناسەیە بە ڕادەیەك پڕ بە پێستی مرۆڤە کە ئەقڵ نایبڕێ... بەڵام ئەوە هەمووی خەیاڵ پڵاو بوو، ڕۆژگار بڕیاری لەسەر دەداو ساغی دەکردەوە، کاری ڕۆژگارو ئایندە بوو، واتە ئایندەم هێشتا نادیار بوو. بەڵام ئێستام، ژینگە تازەکەی دەوروبەرم ترسناك بوو، دژایەتی دەکردم... یان بەلای کەمەوە من وام دەبینی... هاوڕێ تازەکانم، هاوزیندانییەکانم بە دڕدۆنگیو گومانەوە لێیان دەڕوانیم، فزوڵیانە چاودێری هەموو هەڵسوکەوتێکیان دەکردم، مامەڵەو ڕەفتاریان دەگەڵ مندا، دەگەڵ کۆنە ( نەجیمزادەیەك دا ) کە تازە کەوتبووە ناویانو دەبوایە لە ئێستاوە ببێ بە ئەندامێکی کۆمەڵگەکەی وان، زۆر ڕەق بوو، بگرە پڕ لە کەربو کینەش بوو، ئەمەم زۆر لەبەر گران بوو، بە ڕادەیەك عەزابی دەدام، کە پڕ بە دڵ حەزم دەکرد بچم بۆ کار، تا بە چاوی خۆم ڕادەی کلۆڵی خۆم بدینم، تا منیش وەکو ئەوانی دی بژیم، ببم بە یەکێك لەوان، بە زووترین کات ببم بە هاودۆزەخی ئەوان. لە سەرەتادا زۆر شتم نەدەبینی، لە زۆر بویەرو ڕووداوان تێنەگەیشتم: بۆ نموونە نەمدەتوانی دژمنایەتیو دۆستایەتیان لێکدی جیا بکەمەوە. بەڵام هاوخەمیو هاودەردیو هاوسۆزی هەندێ لە زیندانییەکانی دەوروبەرم سێبوریان بە دڵەی خەمناکم بەخشیو ورەیان بەرز کردمەوە. یەکێك لەوانە ئاکیم ئاکیمیچ بوو، کە لە هەر هەموویان میهرەبانترو دڵسۆزتر بوو، لە ڕادەبەدەر مدارای دەکردم. هەروەها چەند کەسێکی دیکەی باشو میهرەبانم لە نێو ئەو خەڵکە گرژو پەستو مۆنەدا بەدی کرد. لە دڵی خۆدا گوتم:

"له هەموو شوێنێکدا خەڵکی باش‌و خراپ هەن! کێ دەزانێ، ڕەنگە هەندێك لەوانەی لێرەن. له خەڵکانی دەرەوەی ئێره، یانی دەرێی ئەم زیندانه خراپ تر نەبن." هەرچەندە ئەو قسەیەم بۆ خۆ دەکرد، بەڵام دڵنیا نەبووم تا چ ڕادەیەك دروستە! ناسینی بەشەر کارێکی ئاسان نیە!... بۆ نموونه له نێو زیندانییەکاندا یەکێك هەبوو نێوی سوشیلوف بوو. هەرچەندە ئەم پیاوە بەردەوام لەگەڵ مندا بوو، بەڵام تا ماوەیەکی زۆریش وەکو پێویست نەمناسی. هەرچەند باسی باش‌و خراپ دێتە گۆڕێ، یەکسەر ئەوم بیر دەکەوێتەوە. سوشیلوف، خزمەتکاری من بوو، خزمەتی دەکردم، هەروەها زیندانییەکی دیکەش بە نێوی ئۆزیب خزمەتی دەکردم، هەر لە یەکەم ڕۆژی زیندانمەوە ئاکیم ئاکیمیچ بۆی دەست نیشان کردم‌و هانیدام که وەکو ئاشپەزی تایبەتی لای خۆم ڕایگرم. ئیدی بەڵێنی دا، هەرکاتێ کە خواردنی زیندانم بە دڵ نەبوو، یان تواناى ئەوەم هەبوو لە کیسەی خۆم خواردنی تایبەتی دروست بکەم، مانگانە خواردنم بۆ ئامادە بکات. ئۆزیب یەکێك بوو لەو چوار ئاشپەزەی کە زیندانییەکان لە نێو خۆیاندا بۆ هەردوو موبەقەکەیان هەڵدەبژاردبوون. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم کە ئەم ئاشپەزانە ئازاد بوون لەوەی ئەم کارە قەبووڵ یان ڕەفز بکەن، هەروەها بۆیان هەبوو، هەرکاتێ حەزیان کردبا واز لەم کارە بێنن. ئەمانە بۆ بێگارو سوخرەکاری نەدەبران، ئیش‌و کاریان نان کردن‌و خواردن‌و شۆربا لێنان بوو. زیندانییەکان بە مانەیان دەگوت ( کەیبانۆ )! هەڵبەتە مەبەستیان لە بەکارهێنانی ئەو زاراوەیە تەوس‌و توانج نەبوو، چونکە زیرەکترین‌و دەست پاکترین زیندانییان بۆ ئەم کارە هەڵدەبژێردران، بەڵکو هەر بۆ گاڵتەو شۆخی ئەو ناوەیان لێنرابوو. ئەوانیش هەرگیز بەم نازناوە قەڵس نەدەبوون. ئۆزیب بەردەوام بە کەیبانۆی زیندان هەڵدەبژێردراو هەڵدەبژێردرایەوە، ئەویش بە دڵ‌و بە گیان ئەم کارەی دەکردو مەگەر زۆر بێزارو بێتاقەت بوایە، یان هەندێجار کەڵکەڵەی قاچاغی مەشرووبی بکەوتایەتە سەرو دەرفەتی بۆ ڕەخسابا، دەنا دەستبەرداری ئەم کارەی نەدەبوو. هەرچەندە لەسەر قاچاغ‌و قاچاغچیاتی حوکم درابوو، بەڵام لە پاکی‌و دروستکاری‌و ئابڕومەندیدا کەم وێنە بوو،‌و وێڕای ئەمەش لە ڕادەبەدەر ترسنۆك بوو، زۆر لە شەلاق دەترسا، هەمیشە وهەرچیەکی کردبا، شەلاقی لەبەر چاو بوو. کابرایەکی هێدی‌و هێمن، بێوەی بوو، لەگەڵ خەڵکیدا خۆشڕەفتارو مامەڵە نەرم بوو، دەگەڵ کەسدا بەشەڕ نەدەهات. سەرباری هەموو سلۆکی‌و ترسنۆکییەکی، هەر دڵی بە قاچاغ‌و قاچاغچیاتیەوە بوو،‌و بە خۆی نەدەوەستا، بەدڵ شەیداو دڵبەندی قاچاغچیاتی بوو. وەکو هەموو ئاشپەزەکانی دیکە قاچاغچیاتی مەشرووباتی دەکرد... بەڵام دەسکەوتی زۆر لە گازین کەمتر بوو، چونکە نەیدەوێرا بە بەردەوامی هەمان ڕیسکی گازین بکات. من بەینم دەگەڵ ئوزیب دا زۆر خۆش بوو.

هەڵبەتە خواردنی تایبەتی زۆری تێنەدەچوو، یانی مەرج نەبوو پیاو زۆر دەوڵەمەند بێ ئەوجا بتوانێ خواردنی تایبەتی بۆ خۆی فەراهەم بکات: خواردنە تایبەتیەکەی من مانگانە نزیکەی یەك ڕۆبڵی تێدەچوو، هەڵبەتە بێجگە لە نان کە ئیدارەی زیندان دەیان داینێ، هەندێجار، بە تایبەتی کە برسێتی زۆری بۆ دێنام، وەکو هەر زیندانییەك شۆرباکەی زیندانم دەخوارد، شۆربای کەلەرم بوو، هەرچەندە لە سەرەتاوە دڵم لەم شۆربایە تێك هەڵدەهات، بەڵام پاشان بە تەواوەتی لەگەڵی

ڕاهاتم. گۆشت له سیبیریا زۆر هەرزان بوو، ڕۆژی نیو کیلۆیەکم گۆشت دەکڕی، هەر دوو کۆبیکێك لەسەرم دەکەوت. ئەو سەربازە نوقستانانەی کە بۆ چاودێری، له قاوش‌و ژوورەکاندا دانرا بوون، ڕۆژانه بۆ بازاڕ دەڕۆیشتن‌و، هەر زیندانییەك پێویستی به هەرچییەك بوایه بۆیان دەکڕی‌و بۆیان دێنایەوە. ئەم کارەیان بەبێ بەرانبەر دەکرد، مەگەر یەکێك ناو به ناو به خوایشتی خۆی بەخشیشێکی زۆر کەمی پێدابان.... ئەو کارەیان لەبەر خاتری ئاسوودەیی خۆیان دەکرد، نەیاندەویست سەریەشه بۆ خۆیان چێبکەن، چونکه ئەگەر ئەو کارەیان نەکردبا، ژیانیان له زیندانەکەدا لێدەکرا به دۆزەخ. تووتن‌و چای‌و گوشتیان بۆ زیندانییەکان دەکڕی، یانی جگه له مەشرووب، ئیدی هەر پێویستییەکی ترت پێ ڕاسپاردبان، بۆیان جێبەجێ دەکردی، کەسیش ئەو داوایەی لێنەدەکردن....

ئوزیب، چەندین ساڵ بەو دەقەوە لەگەڵم مایەوە، ڕۆژانه توێژاڵە گۆشتی بۆ سوور دەکردمەوە... بەڵام چۆنی سوور دەکردەوە، ئەمە نهێنی تایبەتی خۆی بوو. له هەمووی سەیرتر من به درێژایی ئەو ماوەیه دوو کەلیمه قسەم دەگەڵی نەکرد: چەند جارێك ویستم قسەی دەگەڵ بکەم، بەڵام پێدەچوو نەتوانێت قسه دەگەڵ کەسدا بکات. هەر پرسیارێکت لێکردبا، بزەیەکی به ڕوودا دەدایت‌و له کورتی دەی بڕییەوەو به نا یان به بەڵێ وەڵامی دەدایتەوە. بەڕاستی پیاوێکی سەیر بوو، به کەلەش هەرقلێك بوو لەو گۆڕە، به ئاوەز منداڵێك بوو حەوت ساڵان.

(سوشیلوف)ش یەکێك بوو لەو کەسانەی کە خزمەتیان دەکردم، ئەم پیاوه خۆ بەخۆ، بەبێ ئەوەی من پێی بڵێم یان ڕووی لێ بنەم خووی به منەوە گرتبوو، خۆیشم نازانم کەی ئەرکی خزمەتکردنی منی له ئەستۆ گرت. ئیشی سەرەکی ئەوە بوو کە جلەکانی بۆ دەشۆردم. جا بۆ ئەم مەبەستە، واتە بۆ کوڵ‌وکانی .له ناوەڕاستی حەساری زیندانەکەدا ئەستێڵێك هەبوو، زیندانییەکان له دەوری خڕدەبوونەوەو جلەکانیان له جوڕنەی دەوڵەتیدا دەشۆرد . سوشیلوف، جگه له شۆردنی جلەکانم، کۆمەڵێك وردە خزمەتی دیکەشی دەکردم: کتریییەکم هەبوو ئاوی بۆ گەرم دەکردم، بەڕاست‌و به چەپدا هەڵدەسووڕا، هەرکارێکم پێ بسپاردایه بۆی ئەنجام دەدام، هەر پێویستییەکم هەبوایه خێرا جێبەجێی دەکرد، هەرکاتێ چاکەتەکەم دڕابا یان هەڵتەقیبا بۆی دەدرومەوە، مانگی چوار جار پێڵاوەکانی بۆ بۆیاخ دەکردم. زۆر به پەرۆشەوە ئەم کارانەی ئەنجام دەداو به ئەرکی سەرشانی خۆیی دەزانی. به کورتی ژیانی خۆی وەقفی خزمەتی من کردبوو، چارەنووسی خۆی به چارەنووسی منەوە بەستبوو، خۆی له هەموو کاروبارێکی من هەڵدەقورتاندو خۆی بەخاوەنی هەموو کاروبارێکم دەکرد. قەت به بیریا نەدەهات بۆ نموونه پێم بڵێ: " ئەوەندە کراسەت هەیە،... چاکەتەکەت دڕاوە"، بەڵکو دەیگوت: "ئەوەندە کراسەمان هەیە... چاکەتەکەمان دڕاوە...." ئیدی له ڕادەبەدەر پابەندی من بوو بوو، پێموایه من بوو بووم به نموونەو ئایدیالی بەرزی هەموو ژیانی. ئەم پیاوه هیچ کارو پیشەیەکی دەستی بەڵەد نەبوو، هەموو دارو نەداری دنیای بریتی بوو لەو چەند قروشه کەمەی کە من ناو به ناو دەم دایه... کەچی هەمیشه بەوە ڕازی بوو کە دەمدایە. یەکێك بوو لەو کەسانەی کە بەبێ خزمەتی خەڵکی نەدەژیا. لەوە دەچوو بۆیە هۆگری من بووبێ چونکه لەوانی دی به لوتف تر بووم دەگەڵی‌و

کرێیەکی باشترم دەدایە. سوشیلوف یەکێك بوو لەوانەی کە هەرگیز ناتوانن پارەیەك بە دەست بێنن یان ئەگەر بە دەستی بێنن بتوانن بە ڕێك و پێکی کاروباری خۆیانی پێ ڕایی بکەن، سوشیلوف یەکێك بوو لەو بابەتە خەڵکانەی کە قومارچییەکان بە کرێیان دەگرتن کە بە درێژایی شەو لە ڕاڕەوەکەدا پاسەوانی بکەن و گوێ هەڵخەن و هەرکە گوێیان لە سرتەو سرپەو ورتەو خشپەیەك بوو کە نیشانەی هاتنی مێجەر بێ، خێرا قومارچییەکان ئاگاداربکەنەوە تا فریای خۆیان بکەون،و دوکانی قومارەکەیان بپێچنەوە و خۆیان بکەنە خەو. ئەمانە بۆ شەوێکی تەواو پێنج کۆپیکیان کرێ وەردەگرت. خۆ ئەگەر شەوێك بە ڕێکەوت مەفرەزەی تەفتیش قومارچییەکانی غافڵ گیر کردبا، پاسەوانەکە پێی نەزانیبان، ئەوا نەك هەر ئەو پێنج کۆپیکەشیان نەدەدایە، بەڵکو دارکارییەکی باش دەکراو تێهەڵدانێکی زۆریشی دەخوارد. ئەوەی ئەم جۆرە خەڵکانە جیا دەکاتەوە ئەوەیە زۆر بێ ڕوو، کەم نموودو بێ سەنگ و پێگەی کۆمەڵایەتین، لە هەموو شوێن و کاتێکا بە دەرەجەی دووەم و سێیەم دێن. ئیدی ڕەنگە بە دەستی خۆشیان نەبێ، لە خەڵقەتەوە واهین.

سوشیلوف، بەشەرێکی زۆر بەستەزمان و داماو بوو، کە سەیرت دەکرد هێندە سڵ و سلۆك بوو دەتگوت تازە یەکێك لێی داوەو غەدری لێکردووە... ئیدی وا دروست بوو بوو. بەڵام هیچ کەسێك لە قاوشەکەی ئێمەدا ڕێی بە خۆی نەدەدا پەنجەیەکی تێوەبدات... هەمیشە دڵم بە حاڵی دەسووتا، بەخۆیشم نەمدەزانی بۆ بەزەییم پێیدا دەهاتەوە؟ زۆرجار هەوڵم دەدا بیدوێنم، بیهێنمە قسان، بەڵام بێهودە، چونکە قسەی نەدەزانی... خودا خودای بوو ئیشێکی پێ بسپێرم، یان بەپەلە بۆ کارێکی بنێرم... تا لە قسەکردن بخەلەسێ. کابرایەك بوو نە باڵا بەرز نە باڵا کوڵ، نە ناشیرین نە قۆز، نە گەوج نە زیرەك، نە پیر نە گەنج... زۆر زەحمەت بوو پیاو بتوانێ سیفەتێکی تایبەتی بداتە پاڵ... دەموچاوی کەمێك کونج بوو... و قژی زەرد بوو... هەرچەند سەیرم دەکرد، سەرم دێناو سەرم دەبرد لە بابەتی سیروتکین دەچوو... کابرایەك بوو گێلۆکەو حولحولی و بێ موبالات و خەمسارد. هەندێجار زیندانییەکان گاڵتەیان پێدەکردو تەشەریان لێدەدا چونکە کە بۆ سیبیریان هێنا بوو لە ڕێگەدا خۆی بە کراسێکی سوورو رۆبڵێکی زیو گۆڕی بووەوە. مانای گۆڕینەوە لە قاموسی زینداندا ئەوە بوو کە دوو مەحکووم بە خوایشت و ڕەزامەندی ناوی خۆیان بگۆڕنەوە، هەریەکەیان سزاو حوکمی ئەویتریان هەڵبگرن. ڕەنگە ئەمە شتێکی سەیرو باوەڕنەکردەنی بێتە بەرچاو، بەڵام ئەمە حەقیقەتێکی بێ چەندوچوون بوو. ئەم باوە کۆنە کە ڕەنگ و ڕیشەی لە داب و نەریتانی کۆندا بوو، تاکو ئەو کاتەش کە منیان هاوڕێ دەگەڵ کاروانێك مەحکوومدا هەواڵەی تاراوگەی سیبیریا کرد هەر مابوو. لە سەرەتادا باوەڕم نەدەکرد، بەڵام پاش ئەوەی بە چاوی خۆم ئەو سەودایەم بینی، ئیدی دڵنیا بووم لەو باوە.

جا با بێینە سەر چۆنیەتی ئەم سەوداو ئاڵو وێرە: قافڵەیەك لە مەحکوومان بەرەو سیبیریا بەڕێدەکەوێ. ئەم قافڵەیە هەموو جۆرە مەحکوومێکی تێدایە: هی وایان هەن مەحکوومن بە بێگارە زیندان (سجن الاعمال الشاقە)، هەندێکیان مەحکوومن بەکارکردن لە کانەکاندا، هەندێکیان مەحکوومن بەوەی ماوەیەك لە ئۆردوگای دوورخراوان بمێننەوەو هیچی تر... ئەم قافڵەیە لە ڕێگا

بۆ نموونە لە دەڤەری پرم لا دەدات، لەوێندەر یەکێك لە مەحکوومانی بێگارە زیندان رایدەگەیەنێ کە حوکمەکەی خۆی بگۆڕێتەوە. وای دابنێ ئەمە ناوی میخائیلۆفەو بە هۆی تاوانێکی گەورەوە مەحکوومە بە بێگارە زیندان‌و، نایەوێ بۆ ساڵانێکی دوورو درێژ، دوور لە ئازادی، لە زینداندا بژی. ئیدی کەڵکەڵەی ئەوەی دەکەوێتە سەر کە خۆی دەگەڵ کەسێکی تردا بگۆڕێتەوە. دیارە ئەمە پیاوێکی فێڵبازو دنیادیدە دەبێت، دەزانێ کوێ گاڵ دێنێ‌و کوێ پەموو، دەبێ چ بکات‌و چ نەکات، چاو بە مەحکوومەکاندا دەگێڕێ، دەیەوێ کەسێکی سادەی ساویلکەی، هێدی‌و هێمن بدۆزێتەوە کە سزایەکی زۆر سووکترو کەمتر لەوەی ئەوی بۆ بڕابێتەوە... بۆ نموونە مەحکووم بەوە بێ کە لە کانەکاندا کار بکات، یان بۆ چەند ساڵێکی کەم حوکمی بێگارەزیندان درا بێ، یان تەنیا حوکمی دوور خرانەوە درابێ. ئەنجام یەکێك دەدۆزێتەوە، وای دابنێ ئەم نەگبەتە ناوی سوشیلوفە، ئەمە کۆنە مسکێنەو سزاکەی تەنیا دوور خستنەوەیەکی ئاساییە بۆ تاراوگەو هیچی تر.. ئەم پیاوە هەزارو پێنج سەد فەرسەخی بە پێیان بڕیوە، بە درێژایی ئەو ڕێگەیە برسی‌و ماندوو تاقە کۆپێکێکی لە بەرکدا نەبووەو ئێستاش هیلاك‌و ماندوو و مردوو جگە لەو خواردنە خراپ‌و بێتامەی کە دەوڵەت بە ئەندامانی کاروانەکەی دەدا، تاقە قرۆشێکی پێ نەبوو، پارەوە نانێکی پێ بکڕێ‌و بیخوات، جگە لە جلکی رەسمی زیندان کە نە لە بای دەپاراست‌و نە لە سەرماو باران هیچی تری شك نەبرد لەبەری بکات. پارەی نەبوو ناو بە ناو پارووە نانێکی بەلەزەتی پێ بکڕێت... بۆیە لە پیناوی چەند قرۆشێکدا خزمەتی هەموو زیندانیەکان دەکات... میخائیلۆف دەچێت بەلایەوە، قسەی دەگەڵ دەکات، دۆستایەتی پەیدا دەکەن.. لە قۆناغی دواتردا کە لادەدەن، میخائیلۆف دۆستەکەی دەعوەتی خواردنەوە دەکات، سەرخۆشی دەکات. ئەوجا پێشنیاز دەکات کە ناوی خۆیان بگۆڕنەوە... پێی دەڵێت: "من ناوم میخائیلۆفە، مەحکوومم بە بێگارە زیندان، راستە بێگارە زیندانی پێ دەڵێن، بەڵام دەگەڵ زیندانییەکانی دیدا ناچمە زیندانی ئاساییەوە، بەڵکو دەچمە زیندانی تایبەتی، جا چونکە ئەم زیندانە تایبەتیە، بێگومان لە زیندانی ئاسایی باشترە!".

ئەم زیندانی تایبەتە (أحکام خاصە) بەر لەوەی هەڵوەشێنرێتەوە زۆربەی فەرمانبەرانی دەوڵەتی، تەنانەت ئەوانەی شاری پترسبۆرگ-ش نە ناویان بیست بوو و نە دەیانزانی کەوتووەتە کوێندەر. ئەم زیندانە تایبەتیە کەوتبووە جێیەکی زۆر لاچەپ‌و نەدیوتەی یەکێك لە ناوچەکانی سیبیریا،و زۆر زەحمەت بوو خەڵکی پێی بزانن. ژمارەی مەحکوومانی ئەم زیندانە تایبەتیە زۆر کەم بوو، ( لە کاتی مندا لە هەفتا کەس تێنەدەپەڕی ). پاشان زۆر کەسم بینی کە لە سیبیریادا کاریان کردبوو، شارەزای تەواوی سیبیریا بوون‌و ساڵانێکی زۆریان لەوێندەر بەسەر برد بوو، کەچی نە دەیانزانی (زیندانی تایبەتی) چیەو نە ناویان بیستبوو. لە یاسای تاواندا تەنیا بە پێنج شەش دێرێك ناوی هێنرا بوو: " لە زیندانی.... بەشێکی تایبەتی بۆ تاوانبارانی زۆر ترسناك دادەنرێ، تا ماوەو جۆری حوکم‌و سزاو بێگاری توندتریان بۆ دیاری بکرێت... هتد). زیندانییەکان بە خۆشیان هیچ شتێك دەربارەی ئەم زیندانە تایبەتییە نازانن: ئاخۆ ئەبەدییە یان کاتییە ؟ ئەوی ڕاستی بێ ماوەی حوکمی زیندانی تایبەتی دیار نییە، ئیدی

ماوەیەکە تا ( ئەو رۆژەی کە ماوەو جۆری حوکمو سزای توندتر رێك دەخرێ ) درێژە دەکێشێت، یانی ئەوسەری دیار نییە، ئیدی نە سوشیلوفو نە هیچ یەکێك لە ئەندامانی کاروانو قافڵەکەو نە میخائیلۆف بە خۆیشی سەریان لە مانای ئەو دوو وشەیە دەردەچوو، بەڵام میخائیلۆف بە حوکمی گەورەیی و ترسناکی تاوانەکەی و بە گوێرەی ئەو سزایەی بۆی بڕابووەوە کە بریتی بوو لە ٣-٤ هەزار جەڵدە تەسەورێکی دەربارەی چۆنیەتی و پێکهاتەی ئەو زیندانە تایبەتیە هەبوو. بێگومان بۆ شوێنێکیان نە دەنارد کە بە دڵی ئەو بێت... بەڵام سزاکەی سوشیلوف سووك بوو، تەنیا دوور خستنەوە بوو بۆ یەکێك لە تاراوگەکان، یانی لە چاو سزاکەی میخائیلۆفدا هیچ نەبوو. میخائیلۆف کوڕو شەشی بوو، ڕێوی بە پیرییەوە هاتبوو، مردوو لەوەی پاکتر دەشوردرێ ؟... خێرا لە هاوڕێکەی دەپرسێت: " حەز دەکەی ناوەکانمان بگۆڕینەوە ؟ سوشیلوڤ بەلەنگاز مەستە، کابرایەکی ساویلکەو دڵپاکە، کە دەبینێ میخائیلۆڤ هاوڕێی ئەو هەموو چاکەیەی دەگەڵ دەکات، مەی دەرخوارد دەداتو پارەی دەداتێ، ئەوەندە لە خەمی ئەودایەو پێیڕا دەگات ئیدی لە رووی وەفاداریو نمەکناسیەوە لە روو دادەمێنێ و بە تەقە دەکەوێو ناتوانێ داواکەی رەفز بکات. هەروەها لە زیندانییەکانی دیکەی ژنەوتبوو کە ناو گۆڕینەوە ئاسایییەو زیندانییانی دیکەش ئەم سەودایەیان کردووە، بۆیە ئەگەر ئەویش ئەمە دەگەڵ هاوڕێکەیدا بکات نە عەیبەو نە شەرمە. ئیدی بەمجۆرە ئەو دوو پیاوە بۆ خۆ دەسازێنو رێکدەکەون. میخائیلۆڤ فێڵباز ناوی هاوڕێکەی بە کراسێکی سوورو رۆبڵێکی زیو دەکڕێتو سوشیلوف بە شایەدی چەند شایەدێك کراسو رۆبڵێك وەردەگرێتو مامەڵەکەیان سەر دەگرێت. بۆ سبەینێ سوشیلوف وە ئاگادێتەوەو سەرخۆشی بەری دەدات، بەڵام هاوڕێکەی دیسان مەی دەرخوارد دەداتەوەو، ئەویش دیسان بەتەقە دەکەوێو ناتوانێ مامەڵەکە ڕەفز بکات... ئیدی سوشیلوف چەشە دەبێتو لە پێشا بایی رۆبڵەکە دەخواتەوەو زۆری پێناچێت کراسەکەش بۆ مەی دەفرۆشێت. هەنگێ میخائیلۆف پێی دەڵێت: "ئەگەر بە تەمای ژێوان ببیتەوەو نکۆڵی لە مامەڵەو سەوداکەمان بکەیت، پارەو کراسەکەم بدەوە." سوشیلۆف رۆبڵی زیو لە کوێ بێنێ. خۆ ئەگەر رۆبڵەکە رەت نەکاتەوە، ئەوا ئەندامانی کاروانەکە ناچاری دەکەن. زیندانییەکان حەزناکەن پیاو لە بەڵێنی خۆی ژێوان ببێتەوە، بۆیە سوشیلوف لەسەرێتی قسەی خۆی بباتەسەرو، وا وەیلا بە حاڵی ئەگەر قسەی خۆی نەباتە سەر... ئیدی ئەوەندەی تێهەڵدەدەن دەیگەیەننە حاڵی مەرگ، لەگینە بشیکوژن....

چونکە ئەگەر زیندانییەکان تەنیا بۆ تاقە جارێك رێگە بدەن ئەو جۆرە سەودایە، سەودای ناو گۆڕینەوە هەڵبوەشێنرێتەوە، ئیدی ئەم سیستەمی ناو گۆڕینەوەیە لە بناغەوە هەڵدەوەشێتەوەو بە تەواوەتی لە ناودەچێت... جا ئەگەر پیاو بتوانێ لە قەولو بەڵێنی خۆی پاشگەز ببێتەوەو پاش ئەوەی پارەکەو وەردەگرێت، مامەڵەکە هەڵوەشێنێتەوە، ئیدی کێ پابەندی شەرتو بەڵێنان دەبێت ؟ مەسەلەکە لە نۆڕینو دیدگای زیندانییەکانەوە، مەسەلەی مەرگو ژیانە، پەیوەندی بە هەموویانەوە هەیە، بۆیە ناتوانن نەرمی بنوێننو سازشی لەسەربکەن. سوشیلوف ئەنجام بۆی دەردەکەوێ کە بە هیچ جۆرێ ناتوانێ پاشگەز ببێتەوە یان خۆی بدزێتەوە، سوور دەزانێ هیچ شتێك لەو داوەی دەرباز ناکات کە تێی کەوتووە، بۆیە بە ناچاری مل دەدات. هەنگێ سەودایەکە

له سەرانسەری کاروانەکەدا دەنگ دەداتەوەو بڵاودەبێتەوە، خۆ ئەگەر گومانو ترسی ئەوە پەیدا ببێ کە یەکێك خەبەریان لێبدات، هەنگێ دەمی کابرای گومان لێکراو چەور دەکرێو بە بەرتیل بێدەنگ دەکرێت... ئیدی چی لەوانە... میخائیلۆف یان سوشیلۆف، کامیان بۆ زیندانی تایبەتی دەبرێن با ببرێن ئەمە کەی کێشەی ئەوانە. ئەوانە مەی خۆیان خواردووەتەوە، بەرتیلی خۆیان وەرگرتووە، ئیدی مەگەر گڵ ئەو نهێنییەیان لە زار بژنەوێ. لە قۆناغی دووەمدا، زیندانییەکان سەرژمێر دەکرێن، ناویان دەخوێنرێتەوەو چێك دەکرێ . کە بانگی میخائیلۆف بکرێت، سوشیلۆف وەڵام دەداتەوە: بەڵێ! ئەگەر سوشیلۆف بانگ بکرێ، میخائیلۆف بەرسڤ دەداتەوە: بەڵێ!.... ئیدی کاروان وەرێ دەکەوێ، کەس نە لە دوور و نە لە نزیك باسی ئەو سەودا ژێراو ژێرو نهێنییە ناکات، وەك ئەوەی هیچ شتێك رووی نەدابێت. کە کاروان دەگاتە توبولسك زیندانی یەکان لێکدی جیا دەکرێنەوە، هەر کۆمەڵە بە گوێرەی حوکمو سزاکەی خۆی بۆ شوێنێ رەوانە دەکرێ. میخائیلۆف بۆ تاراوگەی موهاجیرنشین ڕەوانە دەکرێتو سوشیلۆف-یش لەلایەن کۆمەڵێك پاسەوانی زۆرەوە بۆ زیندانی تایبەتی وەپێش دەدرێ، بۆی نیە داوای هیچ بکات یان هیچ ناڕەزاییەك دەربڕێ، چونکە بەڵگەی بە دەستەوە نیە، خۆ ئەگەر سکاڵاش تۆمار بکات، ئەم کێشەیە چەندین ساڵ دەخایەنێو هیچ شتێکی لەم سکاڵایە دەست ناکەوێ، کەس شایەدی بۆ نادات، و کەسیش نازانێ شایەدەکان کەوتوونەتە کوێوە، گریمان دۆزرانشەوە، شایەدی بۆ نادەنو خۆیان لە گێلی دەدەنو هیچ ناڵێن. جا ئێستا باسی سوشیلۆف-تان بۆ دەکەم کە چۆن بە تاقە رۆبڵێکی زیو و کراسێکی سوور خۆی هەرزانفرۆش کردو بۆ زیندانی تایبەتی نێردرا. و بوو بە گەپجاڕی زیندانییەکان. زیندانییەکان لەسەر ئەوە گاڵتەیان پێنەدەکرد کە ئەو سەودایەی کردووە، هەرچەندە بە شێوەیەکی گشتی ئەو گێلە پیاوانەیان دەبوغزاند کە کارێکی ئاسانیان دەگۆڕییەوە بە کارو بێگارێکی قورس، بەڵکو لەسەر ئەوە گاڵتەیان پێدەکرد چونکە بە نرخێکی زۆر هەرزان، بە کراسێکی سوورو رۆبڵێکی زیو، کە نرخێکی یەجگار کەمە، ئەو سەودایەی کردووە. چونکە ئەوانەی ئەو سەودایەیان دەکرد داوای پارەیەکی زۆریان دەکرد ( هەڵبەتە زۆر بە گوێرەی دەرامەتی زیندانییەکان ). یانی سی چل رۆبڵێکیان وەردەگرت، کەچی سوشیلۆف سنعەتەکەی بە رادەیەك رەزیل کردبوو کە شایستەی گاڵتە پێکردنیش نەبوو.

منو سوشیلۆف ماوەیەکی زۆر پێکەوە ژیاین، یانی بە تەواوەتی هۆگری یەکدی بوو بووین.. رۆژێك هات داوای پارەی لێکردم، بە ڕێکەوت ئەو رۆژە کارەکانی بۆ ئەنجام نەدابووم. بەوپەڕی توندیو دڵڕەقی وەڵامم دایەوە: " تۆ بۆ داوا کردنی پارە ئازایت، بەڵام گوێ بە دەستورەکانم نادەیت ". بەڕاستی کارێکی خراپم کرد، قەت لە خۆم نابورم. سوشیلۆف هەنگێ هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، بە پەلەو گوێڕایەڵانە رۆیی تا کارەکەم بۆ ئەنجام بدات، بەڵام لە ناکاو گۆڕا، خەم دایگرت. دوو رۆژ بوری، هەر بەو دەقەوە، خەمینو خەمبار دیار بوو، باوەڕم نەدەکرد بەو رادەیە قسەکەم لە دڵ بگرێ. دەمزانی زیندانییەکی دی بە نێوی ئانتوان فاسیلیف، قەرزێکی کەمی لەسەرێتیو پێی لێکردووەتە کەوشەوەو ئێستەرەم ئەو قەرزە ناچیزەی لێدەوێتەوە. لەوەیە سوشیلۆف-ش شنقڕی پێ نەبێو زاتیش نەکات داوا لە من بکات، ئیدی بانگم کردو گوتم: "

گویٚ بگره سوشیلۆف گیان! پیٚموایه، بۆیه دەتویست داوای پاره له من بکەی تا قەرزی ئانتوان فاسیلیف بدەیتەوه، فەرموو ئەوه پارەو بچۆ قەرزەکەی بدەوەو حیسابی خۆتی لەگەلٚ پاك بکەوه!
" لەسەر تەختە خەوەکەی خۆم رۆنیشتبووم. سوشیلۆف بەسەرسامی لەبەردەممدا وەستا، زۆری پیٚ سەیر بوو که من به خۆم دەمەویٚ پارەی بدەمیٚ، له کاتیٚکا هەموو هەقیٚکی خۆیم دابوویه، بۆیه چاوەڕوانی ئەوه نەبوو تا ماوەیەکی دی هیچی بدەمیٚ، بەخۆشی رووی نەدەهات رووم لیٚ بنیٚ. سوشیلۆف نیگایەکی ئەو ئەسکەناسەی کرد که بۆم راگرت بوو، ئەوجا نیگایەکی خۆمی کرد، پشتی تیٚکردمو له ژوورەکه وەدەرکەوت. زۆرم پیٚ سەیر بوو، به پەله وەدەرکەوتم و دووی کەوتم، سەیرم کرد لەو دیو قاوشەکەوه سەری ناوه به حەساری زیندانەکەوه له درزی بەینی عامودو لەوحەکانەوه دەڕوانیٚتە دەریٚ.
لیٚم پرسی:
– سوشیلۆف گیان چیته ؟
وەلاٚمی نەدامەوه. ئەوەی بەلامەوه سەیر بوو ئەوه بوو ڕوندك له چاوانی قەتیس مابوو. ئەوجا به دەنگیٚکی لەرزۆك‌و بیٚ ئەوەی تەمەشای من بکات، گوتی:
– ئەلکساندەر پترۆفیچ... تۆ پیٚت وایه من بۆ پاره خزمەتی... تۆ دەکەم... بەلاٚم من... من...!".
بەدەم ئەو قسەیەوه هیٚندە به توندی وەرسوڕایەوه، که تەویٚلٚی به توندی کەوت به دیواری حەوشەکەداو له هۆڕژنی گریانی دا. ئەمه یەکەمجار بوو که له زینداندا پیاویٚك بدینم بگری. به هەزار زەحمەت کەوتمه دلٚدانەوەی و ئاشتم کردەوه. ئەگەرچی لەوەدوا زۆر به جدی ترو گەرمتر له جاران خزمەتی دەکردمو پیٚمڕادەگەیی، بەلاٚم به هەندیٚ هیٚمای نا دیارو نیشانانی پەنامەکیدا بۆم دەردەکەوت که له ناخی دلٚیەوه، لیٚم خۆش نەبووه، ئەو سەرزەنشتە توندەی منی له بیر نەکردووه،و قەت گەردەنم ئازا ناکات. کەچی خەلٚکانی دی پیٚیان ڕادەبوارد، سەریان دەکردە سەری‌و تەشەریان لیٚدەداو جنیٚویان دەدایەو هیچ تورە نەدەبوو، لیٚیان نەدەتۆراو، بەعزی دەگەلٚ نەدەکردن‌و قسەی لیٚ دانەدەبڕین. بەلٚیٚ مەحالٚه پیاو مرۆڤیٚك بەتەواوەتی‌و به دروستی بناسیٚت، تەنانەت ئەگەر سالاٚنیٚکی زۆریش دەگەلٚیا بژی .
هەر لەبەر ئەوەش بوو که زیندان له سەرەتاوه و له روانگەی منەوه ئەو مانایەی نەبوو که دواتر لەلام پەیدا بوو. سەرباری ئەوەی زۆر به وریایی سەرنجی هەر دیاردەو رووداویٚکم دەدا، کەچی نەمتوانی پەی به گەلیٚك لەو رووداوو پیٚشهاتانه بەرم که پاشان چاویان کردمەوه. ئەوانەی که له سەرەتاوه سەرنجیان ڕاکیٚشام به ڕای من خەلٚکانی دیارو بەرز بوون. بەلاٚم نا من هەلٚه بووم. چونکه جگه له شویٚنەواریٚکی قورسی خەمناکی ئومیٚدکوژ هیچی تری له دلٚ و دەروونم بەجیٚ نەهیٚشت. ئەوەی که پتر ئەم ئەنجامگیرییە تایبەتییەی لەلا چەسپاندم، دیدارم دەگەلٚ (ئا... ف)دا بوو. ئەمه زیندانییەك بوو که کەمیٚ پیٚش من کەوتبووه زیندان، هەوەلٚین رۆژانی زیندانی لیٚکردم به ژەهری مار، هیٚندەی دی ئازاره روحیەکانی زیاد کردمو ژیانی لەبەر چاو خستم. پیسترین نموونەی بیٚ فەڕی و دوونیەتی‌و بچووکی بوو، به ئاستەمیش سۆزو هەستی مرۆڤانی‌و شەرمو شکۆو مەردایەتی تیا نەبوو. ئەم گەنجە کۆنه نەجیمزاده بوو ( پیٚشتریش باسم کردووه)

سیخوڕی بۆ مێجەر دەکرد، هەر شتێك لە قاوشەکاندا رووی دابا، وترابا، کرابا، خێرا دەیگەیاندە مێجەر، چونکە دۆستی گیانی بە گیانی (فدکا)ی نۆکەری مێجەر بوو. ئەمە هەر بە منداڵی خوێندنو قوتابخانە تەرك دەکات، روو دەکاتە سەر سەرێتیو بێ ئەخلاقیو داوێن پیسی، کە کەسوکارو دایكو باوکی پێدەزانن و دەیانەوێ جڵەوی بگرن، دەگەڵیاندا بەشەڕ دێت، دەتۆرێو روو دەکاتە پترسبۆرگ، لەوێندەرش لە سەر هەمان رەوشی نا پەسند بەردەوام دەبێت. کە پارەی دێتە تەواو بوون، لە پێناوی پارەدا کۆ لە هیچ تاوانو بوختانو درۆیەك ناکاتەوە. بڕیار دەدات خوێنی دە پیاوی بێتاوان، لە پێناوی پاراوکردنی ئارەزووە حەیوانیە نزمەکانی خۆیدا بکاتە کاسەوە، ئیدی بە جۆرێ لە زەڵکاوی مەیخانەو سۆزانی خانانی پترسبۆرگدا نقوم دەبێو خۆی دەدۆڕێنێ، کە بەشداری لە پیلانێکی خەتەرناکدا دەکاتو کەشف دەبێ و دەگیرێتو حوکم دەدرێو بۆ بێگارە زیندانی سیبیریا رەوانە دەکرێت. ئەوە سەرەتای ژیانی ئەو کوڕە بوو.

وەکو گوتم ئەم کوڕە گەنج بوو، وێنای ئەوە دەکرا کە ئەم جەزرەبە ترسناکەی پێی کەوت، بیجوڵێنێو چاوی بکاتەوەو بە خۆیدا بچێتەوە و بڕێك خۆی بگرێتەوەو رەفتاری بگۆڕێت. بەڵام بەوپەڕی خوێنساردی و خەمساردی، بێ هیچ ترسو دوودڵییەك ملی بۆ ئەم چارەنووسە تازەیەی خۆی دا. تاقە خەمی ئەوە بوو کە ناچار دەبێ کاربکات، و بۆ هەتا هەتایە لە کەیفو رابواردنو عەیشو نۆشو شەهوەتڕانی بێ بەش دەبێت. کە ناوی زیندانی بە باڵادا بڕا، نەك هەر چاك نەبوو، بەڵکو زیاتر رووی لە خراپە کردو پاکانەی بۆ هەر دوونیەتو نامەردیو بەدئاکارییەکی خۆی دەکردو دەیگوت: " من کە بە زیندانی بێگار مەحکووم بم، ئیدی هەقی خۆمە بە کەیفی دڵی خۆم بکەم، بێ هیچ شەرمو شورەییەك بە ئارەزووی دڵی خۆم بکەمو بێ دڵی خۆم نەکەم " بەو ئاوایە تەمەشای خۆی دەکرد. هەڵبەتە من لێرەدا وەکو دیاردەیەکی نەشازو سەیر باسی دەکەم. من چەندین ساڵم لە نێو تاوانکارانو خوێنڕێژانو چەقۆکێشانو شەلاتیو سەرسەریاندا بەسەر برد، بەڵام بە عەمرانم خەڵکی وەکو ئەم کوڕە دوونیو نامەردو بەدئاکارو نەفس نزمو گۆساخم نەبینی. گەنجێکمان لەگەڵدا بوو، کە ئەسڵزادەو نەجیمزادە بوو، ئەمە باوکی خۆی کوشتبوو (پێشتریش باسم کردووە) بەڵام ئەمە لە زۆر رووەوە، لە (ئا...ف) مرۆڤانی ترو نەفسبەرزترو مەردانەتر بوو. بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە لە زینداندا بووم، (ئا...ف)م وەکو تۆپەڵە گۆشتێك دەبینی کە ددانو گەدەی هەبوو، تامەزرۆی پیسترین لەزەتی حەیوانی بوو، برسی دزێوترین رابواردنی هۆڤیانە بوو، ئامادە بوو لە پێناوی رابواردنێکی حەیوانیدا هەر مرۆڤێك بکوژێت. هیچ زێدەڕۆییەك لەم قسانەمدا نیە، (ئا...ف) نموونەیەکی هەرە باڵای حەیوانیەت بوو، حەیوانیەتێك کە حیسابی نە بۆ پرەنسیپ، نە بۆ یاساو رێسا، نە بۆ رەوشتو ئاکاران دەکرد. باکی بە هیچ نەبوو. جا چەند قێزم لە پێکەنینو بزە تەوسامێزو پڕ تەشەرەکەی دەبووەوە! بەڕاستی گووراوێکی سەیرو شێواو بوو! هەر چییەك لەو زیندانەدا بکرایەو بگوترایە دەیگەیاندە مێجەر. کەچی وێڕای ئەوەش زیرەك، جوانخاس، و تاڕادەیەك خوێنەوار بوو... نا! نا! بڕوا بکەن ئاگرو پەتاو قاتوقڕی و گرانیو برسیەتیو هەموو جۆرە کارەساتو بەڵایەك ئەهوەنترو باشترە وەك لە بوونی ئەو جۆرە کەسە لە کۆمەڵگەدا. وەکو پێشتر باسم کرد،

شۆڤاریو بوختانو زمان لێدان له زینداندا باوه، ئەمه بەرەنجامی هەرەسی روحیو دەروونیو داڕوخانی ئەخلاقییەو، زیندانییەکان لەبەریان گران نیەو پێی قەڵس نابن. به پێچەوانەوه بەینیان دەگەڵ (ئا... ف)ی هاوڕێماندا خۆش بوو، رووپامایيان دەکرد، لێی نزیك دەبوونەوه،و ئەوەندەی مدارای ئەویان دەکرد، مدارای ئێمەمانانیان نەدەکرد. چونکه له مێجەرەوه نزیك بوو،و مێجەر مامەڵەیەکی تایبەتی دەگەڵ دەکرد، ئەمه جۆره سامێکی پێ بەخشی بوو،و زیندانییەکان بەچاوی رێزەوه تەمەشایان دەکرد. ئەم کوڕه وای بردبووه مێشکی مێجەرەوه که گوایه نیگارکێشەو دەتوانێ پۆرترێتان بکێشێت ( هەروەها وای له زیندانییەکانیش گەیاند بوو که گوایه ملازم بووه له گاردی تزاردا ) ئیدی مێجەر له چوونه بێگاری بەخشی بوو،و بانگی کردبوو بۆ ماڵەکەی خۆی، تا بەهره هونەرییەکانی بخاته کارو پۆرترێتێکی بۆ بکێشێت. که له ماڵی مێجەر دەگیرسێتەوه، میانه دەگەڵه (فدکا)ی نۆکەرو خولامی مێجەردا پەیدا دەکات، فدکا کاریگەرییەکی زۆری بەسەر مێجەری ئاغایەوه دەبێتو بەم پێیه کاریگەری بەسەر هەموو زیندانییەکانەوه دەبێت... جا ئەم (ئا... ف)یە لەسەر داوای مێجەر راپۆرتی له هەمووومان دەنووسی. کاتێ مێجەر سەرخۆش دەبوو، لێی دەدا، جنێوی پێ دەدا، به جاسووسو شۆڤارو دوو زمانی ناو دەبرد. زۆرجاریش وا رێدەکەوت دوای ئەوەی تێروپڕی تێ هەڵدەداو جنێوبارانی دەکرد، دەچوو لەسەر کورسییەك دادەنیشتو فرمانی پێدەدا که بێت درێژه به کێشانی پۆرترێتەکەی بدات. هەرچەنده مێجەر (ئا... ف)ی به نیگارکێشێکی گەوره دەزانیو به برولوف*(۱)ی دەشوبهاند ( ئیدی ناوی ئەم نیگارکێشه به ناوبانگەی، برولوف بیستبوو ) بەڵام وێڕای ئەوەش به هەقی خۆیی دەزانی لێیبداتو بەر زللەی بدات، له دڵی خۆیدا دەیگوت: "با نیگارکێشیش بی، تۆ زیندانییەکیو تەواو، من گەورەو بەرپرسی تۆم، هەقی خۆمەو چۆنم بوێ ئاوا رەفتارت دەگەڵ دەکەم ". تەنانەت هەندێجار فەرمانی پێدەکرد که پێڵاوەکانی بۆ دابکەنێ، یانێ ئەو تەنەکەی میزەی بۆ بێنێ که شەوانه میزی تێدەکرد... دوای ماوەیەکی زۆر ئەوجا مێجەر هەستیکرد که ئەم کوڕه هیچ بەهرەیەکی نیه. نزیکەی یەك دانه ساڵ ئیشی لەسەر کرد، ئەوجا زانی ئەم کوڕه پێی رابواردووه، پاش ئەوەی پۆرترێتەکه له تەواو بوون نزیك بووەوه، مێجەر هەستی کرد ئەم وێنەیه له هەرکەسێك بچێت لەو ناچێت... مێجەر زۆر توڕه بوو، تێروپڕی دارکاری کردو ناردیەوه بۆ بێگارەزیندان... هەڵبەته ئاساییه که (ئا... ف) ئەمەی پێناخۆش بێت: سووی بۆ ئەو رۆژه خۆشانه دەخوارد که له ماڵی مێجەردا بێ ئیشو بێکار خۆی دەلستەوه، سووی لەو ورده دیاریانه دەخوارد که ناو به ناو بەری دەکەوت، ئەی ئەو شیرینیانه بۆ ناڵێی که لەسەر خوانەکەی مێجەری دەدزی، ئەدی جیا بوونەوەو دوورکەوتنەوەی له فدکا بۆ ناڵێی، ئەو خواردنه خۆشو به تامانەی که به دوو قۆڵی له مووبەقەکەی مێجەر دەیان ماشییەوه بۆ ناڵێی... .

کاتێ که (ئا... ف) لەلایەن مێجەرەوه تڕۆ کراو له نازو نیعمەت کەوت، ئیدی مێجەر وازی له چەوساندنەوەی (م) هێنا. هەڵبەته (ئا... ف) ڕقی له (م) بوو، هەر دەرفەتێکی دەستکەوتبا مێجەری لێ هاندەدا. کاتێ (ئا... ف) هاته زیندان، (م) زۆر تەنیاو گۆشەگیرو خەمین بوو... خۆی

له هەموو زیندانییەکان دوور دەگرت، لێیان بێزار بوو، رقی لێیان دەبووەوە. نەیدەزانی چۆن لێیان نزیك ببێتەوەو دەردی دڵی هەڵڕێژێ‌و باری دەروونی کەمێك سووك بکات. له جیاتی هەوڵبدات بیانناسێت و لێیان بگات، دەی کورهاندن، دەی بوغزاندن، دیارە ئەوانیش هەمان هەڵوێستیان بەرانبەری هەبوو، جێی سندان قوزەڵقورتە. ئیدی وەزعی زۆر ناخۆش بوو. (م) نەیدەزانی (ئا... ف) بۆچی کەوتووەتە بێگارەزیندان‌و چ تاوانێکی کردووە. ئیدی (ئا...ف) یەکسەر هەست بە وەزعی نالەباری (م) دەکات، خۆی لێ نزیك دەکاتەوە، تێی دەگەیەنێ کە ئەویش وەکو (م) لەسەر مەسەلەیەکی سیاسی دەستگیرکراوەو حوکمی بێگارەزیندان دراوە... ئیدی (م)ی بەلەنگاز خۆشحاڵ دەبێت کە ئەنجام لە نێو ئەو زیندانییانەدا هاوسنفێکی خۆی دەدۆزێتەوەو گوایە دەبێت بە دۆستی تەنگانەی. ئیدی بە پەلە لێی نزیك دەبێتەوە، دڵخۆشی دەردی دەداتەوەو تەنانەت برێ پارەشی دەداتێ، و خواردنی تایبەتیشی بۆ فەراهەم دەکات،و دەیکات بە شەریکی هەمووشتێکی خۆی.... بەڵام (ئا... ف) کە لە خوێریاتی‌و نامەردیدا بەشی کەسی نەهێشتبووەوە، لە سپڵەیی‌و دوونیەتدا هاوتای نەبوو، زوو بە زوو، لە جیاتی ئەو هەموو کەرەمە، ئەو هەموو چاکەو پیاوەتیەی کە (م) دەگەڵی کردبوو، زوو بە زوو دەکەوێتە دژایەتی (م)و بەدەم قسەو باسی خۆیانەوە چ زەمێکی مێجەرو زیندانەکەی کردبوو، بە مێجەری گەیاندبوو. ئیدی مێجەر پشم‌و غەزەب لە (م) هەڵدەگرێت‌و بە جارێ ژیانی لێ تاڵ دەکات،و ئەگەر فەرمانداری زیندانەکە جارجارێ جڵەوی مێجەری نەگرتبا، لەوە بوو هەر بیکوژێت... هەڵبەتە (م) زوو بۆی دەرکەوت کە ئەم نامەردی‌و کەتنە لە ژێر سەری (ئا... ف) دایە. بەڵام (ئا... ف) هەر خۆشی شێلو نەکرد، بە پێچەوانەوە هەوڵی دەدا (م) بدینێ تا مۆرەی لێبکات‌و بە ژارخەنەکانی هێندەی دی پەست‌و بێزاری بکات. (ئا... ف) بەو رەفتارە زۆر خۆشحاڵ دەبوو، لەزەتی لەو خوێڕیاتیەی خۆی وەردەگرت. (م) چەند جارێك لەو رەفتارەی (ئا... ف) ئاگاداری کردمەوە. ئەم مرۆڤە بەدفەڕە پاشان دەگەڵ پاسەوانێك لە پاسەوانەکانی زینداندا هەڵهات. لە کات‌و شوێنی خۆیدا چیرۆکی ئەم هەڵاتنەیتان بۆ دەگێڕمەوە... ئێستا حەزدەکەم ئەوەتان بۆ بگێڕمەوە کە ئەم پیاوە لە سەرەتادا بە دەوروخولی مندا دەهات، وایدەزانی من بە حیکایەت‌و مەسەلەکەی نازانم. جارێکی دی دەیڵێمەوە کە لە سەرەتاوە ژیانی لێ تاڵ کردم، لە داخ‌و خەفەتا لە پێستی خۆم نەدەهێوریم، ئۆقرەم لەبەر بڕا بوو، جێم بە خۆ نەدەگرت. ئیدی ترسێکی وام لێ نیشت دەمگوت قەت لەم ژینگە پەرپووتە، لەم خوێڕی خانەیە هەڵناکەم، وام وێنا دەکرد هەرچییەك لەم ژینگەیەدا هەیە، هەرهەمووی بەو جۆرەیەو بۆ ئاهی سوێندش پیاوێکی پیاوانەی تیا نیە، بەڵام پاشان وا دەرنەچوو، بە هەڵە وام تەسەور کردبوو هەر هەموو ئەوانەی لە زیندانەکەدان لە (ئا–ف) .... دەچن.

لە سێ رۆژی یەکەمدا، ئەگەر لەسەر تەختە خەوەکەم پاڵکەوتبام ئەوا پاڵدەکەوتم، دەنا ئیش‌و کارم ئەوە بوو بە ناو زیندانەکەدا دەسوڕامەوە. (ئاکیم ئاکیمیچ) زیندانییەکی باوەڕ پێکراوی پێناساندبووم. کە ئامادە بوو بە کرێیەکی کەم چەند کراسێکم بۆ بدورێت، دەوڵەت قوماشەکەی دەداینێ. هەروەها بە گوێی (ئاکیم ئاکیمیچ)م کرد، ڕایەخێکم بۆ خۆ بەکرد دا. ڕایەخەکە بریتی

بوو له نمەدێك كه بەرگی قوماشی تێ گیرا بوو، نمەدەكه زۆر تەنك بوو، هەر بەقەد كولێرەیەك ئەستوور دەبوو، بۆ كەسێك فێری نەبوایه زۆر زبرو رەق بوو. ئیدی ئاكیم ئاكیمیچ هەموو پێویستییەكانی تری بۆ فەراهەم كردم، تەنانەت به دەستی خۆی لێفەیەكی لەو كۆنه چۆغانەی كه ئیدارەی زیندان بەسەر زیندانییەكانیدا دابەش دەكرد، بۆ دروست كردم، پارچەیەكی لەم كۆنه پانتۆڵو پارچەیەكی لەو كۆنه چاكەت، كه لەبەر كۆنی، خاوەنەكانیان به كاریان نەدەهێنان بڕیو دانیه دەم یەكەوەو پیره لێفەی بۆ دروست كردم. هەڵبەته هەموو ئەو كۆنه جلكانەم به پارەی خۆم له زیندانییەكان كڕی. ئەو كەلوپەلانەی كه دەوڵەت بەسەر زیندانییەكاندا دابەشی دەكردن، تا ماوەیەكی دیاری كراو بەكاردەهێنران، پاش تەواو بوونی ماوەی دیاریكراو – ماوەكه ئیدارەی زیندان دیاری دەكرد – ئیدی دەبوو به موڵكی زیندانییەكان. هەنگێ زیندانییەكان دەیان خسته مەزادەوەو له ناو زیندانەكەدا دەیانفرۆشتەوە. جا كۆنترین كەلوپەلو جلو بەرگ، ئەوەی كه سواڵكەرو گەداش له دەرێ له بەریان نەكردبا، له زیندان‌دا كڕیاری بۆ پەیدا دەبوو و نرخی خۆی دەكرد. ئەمەم زۆر بەلاوه سەیر بوو، به تایبەتی له سەرەتاوە، له هەوەڵی تێكەڵاو بوونما دەگەڵ ئەم جیهانەدا. هەرچەنده پاشان بووم به یەكێك لەو خەڵكانە، بووم به بەشێك لەم جیهانە، بووم به زیندانییەك وەكو هەر زیندانییەكی دی، به ڕواڵەت چوومه خووی ئەوانەوە، هەمان خوو وخدەی ئەوانم وەرگرت، بەڵام ناخو دەروونم وەكو خۆی مایەوە. ئەمەم زۆر پێ سەیرو عەنتیكه بوو، وەكو ئەوه بوو قەت رۆژێ له رۆژان شتی وام نەبیستبێ، هەرگیز تەسەوری بوونی شتی وام نەكردبێت. بەڵام چونكه پێش ئەوەی بگەمه زیندانەكه هەندێ شتم لەمەڕ زیندان بیستبوو دەمزانی چ شتێك له زیندان‌دا دەبینم، ئەوەی دیتن له دڵو دەروونی دروستكردم، بیستن دروستی نەكرد بوو. بۆ نموونه دەشیا تەسەوری ئەوه بكەم كه خەرگەو پەڕۆ كۆنان بایەخیان هەبێو پاره بكەن؟ كەچی لێفەكەی خۆم لەو خەرگەو پەڕۆ كۆنانه دروستكرابوو! زۆر ئەستەمه بتوانم باسی ئەو جاوو چۆغەیه بكەم كه بۆ زیندانییەكان دەكرا به كراس: رێك لەو چۆغەو جاوه خاكیو ئەستووره بوو كه بۆ سەربازان دەكرا به جل، بەڵام هەركه ماوەیەكی كەم لەبەر دەكرا ئیدی تاڵكێش دەبووو دەتەقیو دەدڕا. چاكەتی یەكجۆر دەبوایه بەشی یەك ساڵی تەواو بكات. بەڵام هەرگیز بەشی ئەو ماوەیەی نەدەكرد، چونكه زیندانیی كاری دەكرد. بارو كۆڵی قورسی هەڵدەگرت، ئیدی قوماشی چاكەتەكه بەرگەی نەدەگرتو زوو دەدڕا. پاڵتۆی یەكجۆر دەبوایه بەشی سێ دانه ساڵ بكات، له ماوەی ئەم سێ ساڵەدا له جیاتی جلو بەرگ، نوێن،و لێفەو بالیف–ش بەكاردەهێنرا بەڵام قوماشەكەی قایم بوو. وێڕای ئەوەش له كۆتایی ساڵی سێیەمدا به دەگمەن پاڵتۆیەك دەبینرا به قوماشو پارچەی د یكه پینه نەكرابێ. هەرچەنده له كۆتاییدا شڕو وڕ دەبوو، بەڵام كڕیاری بۆ پەیدا دەبوو، هەر پاڵتۆیەك به چل كۆبیك، خۆ ئەگەر نیوداشت بوایه نرخەكەی دەگەییه ٦٠–٧٠ كوبیكان.

پێشتر باسی ئەوەم كرد كه پاره گرینگترین دەور له ژیانی زیندانیدا دەبینێ. به دڵنیاییەوە دەیڵێم ئەو زیندانییەی هەندێك پارەدار بوایە. ده هێندەی ئەوەی هیچی نەبوایە، باری سووكترو سەری سەلامەت تر دەبوو. بەرپرسەكانمان دەڵێن: "مادامێكی دەوڵەت (حكوومەت) هەموو

پێویستییەکی زیندانیی دابین دەکات، ئیدی پارەو پوڵی بۆ چیە ؟". بەرپرسەکانمان وا بیر دەکەنەوە. وێڕای ئەوەش من دووبارەی دەکەمەوەو دەڵێم: هەرکاتێ زیندانییان لە مۆڵکایەتی تایبەتی بێبەش بکرێن، لەوە مەحرووم بکرێن کە شتێکی تایبەت بە خۆیان هەبێت، شێت دەبن، یان وەکو مێش دەمرن، یان تاوانی ئەو تۆ دەکەن کە نە کەس بینبێتیو نە کەس بیستبێتی... هەندێکیان لە بێزاریو بێتاقەتیدا، هەندێکیان لە داخو کەسەردا، هەندێکیان بۆ ئەوەی سزای زیاتر بدرێن خۆیان گوتەنی: " هەر باشە، وەزعو حاڵیان تۆزێ دەگۆڕێ ". جا ئەو زیندانییەی کە بە ڕەنجی شانو ئارەقەی نێوچەوان،و هەزارو یەك ڕیسكو سەرکێشی چەند کۆبیکێکی پەیدا کردبێ، پاشان ببینی هەمان زیندانی عەینی منداڵ، پارەکەی بە ڕاستو بە چەپدا بە فیڕۆ بداتو بە شتی نابەجێ خەرجی بکات، ئەمە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کە بایەخی پارە نازانێ، بەڵکو ئێمە لە هەوەڵەوە وا تەسەور دەکەین کە بایەخی پارە نازانێ. زیندانیی زۆری حەز لە پارەیە، بۆ پارە شێت دەبێت... خۆ ئەگەر پاشان بە فیڕۆی دەدات، لەبەر ئەوەیە پێی وایە شتێکی باشتر لە پارەکە بە دەست دێنێ... با بزانین ئەو شتەی بەلای زیندانییەوە لە پارە باشترە، لە پارە بە نرخترە چیە ؟ ئەو شتە ئازادیە... یان ئازادییەکی وەهمیە... خەونی ئازادیە.. زیندانییان هەموویان بە خەون دەژین.. خەیاڵپەروەرن...و پاشان بە درێژی باسی ئەمە دەکەم. ئێستا باسی ئەوە دەکەم کە بە خۆم گوێم لە زیندانییانێك بووە کە مەحکووم بە بیست ساڵ بێگارەزیندان بوونو بەوپەڕی ئارامی گوتوویانە: " کە ئیشەڵڵا ماوەی زیندانییەکەم تەواو بوو، هەنگێ..." هەڵبەتە وشەی زیندانیی خۆی لە خۆیدا بە مانای مەحرووم بوونی ئەو کەسەیە لە ئازادی. بۆیە کە ئەم کەسە پارەکانی خۆی خەرج دەکاتو بە فیڕۆی دەدات، ئەمە خۆی لە خۆیدا جۆرە مومارەسەیەکی ئازادیە، بە گوێرەی ویستی خۆی ڕەفتار دەکات، ڕەفتارێکی ئازادانەیە... یانی سەرباری کۆتو زنجیران، وێڕای ئەو حەسارە بەرزەی دنیای ئازادی لە چاو ون دەکاتو وەکو حەیوانێکی دڕندە ئابلوقەی دەدات. سەرباری هەموو ئەمانە دەتوانێ مەشرووبات پەیدا بکات، بچێتە نك سۆزانیان،و بگرە هەندێجار "ئەمە زۆر کەمە" بە بەرتیل کارێکی وا بکات پاسەوانو چاودێرەکانی بە تایبەتی سەربازە نوقسانو دەرەجەدارەکان، چاوپۆشی لێبکەنو.. هەروەها دەتوانێ، لەبەردەم هاوزیندانییەکانیدا خۆی هەڵبکێشێتو بۆ خۆیو بۆ ئەوانیشی بسەلمێنێ کە جۆرە ئازادییەکی هەیە زیاتر لەو ئازادیەی ڕێی پێدراوە. زیندانیی پێویستی بەوەیە وا بنوێنێ کە ئازادیو پایەیەکی زیاترو گەورەتر لەوەی هەیە کە تەسەور دەکرێت، بۆی هەیە ڕابوێرێ. هەراو هەنگامە بنێتەوە، خەڵکی ئەزیەت بدات،و ئەگەر حەزبکات زیندەبەچاڵیشیان بکات! ئەم داماوە دەیەوێ شتی وا بکات کە سوور دەزانێ مەحاڵە: بۆیە زیندانییان حەزدەکەن خۆ بنوێننو بەخۆ بنازن،و موبالەغەی خەیاڵیو کۆمیدی بە کەسایەتی کڵۆڵی خۆیانەوە بکەن.. کاتێ کە پارەکانیان بە فیڕۆ دەدەن. ڕیسك بە شتێکەوە دەکەن. ئەم ڕیسککاریە لە نك وان خۆی لە خۆیدا نیشانەی ژیانو ئازادیە، کە ئەمە ئەوپەڕی ئاواتو ئارەزوویانە. بۆ نموونە پیاوێکی ملیونێر بێننە بەرچاوی خۆتان کە پەتیان لە ملی کردبێتو بیانەوێ ئیعدامی بکەن، یانی ئەم پیاوە ئارەزوو ناکات هەرچیماڵی هەیە لە پێناوی یەك هەناسەدا بیدات ؟

لەوەیە زیندانییەك، ساڵانێكی زۆر، بەئارامی بەسەر بەرێت، ئەوەندە خۆشڕەفتارو بیٚ كێشەو بێوەی بیٚ كە بیكەن بە عەریفو چاودێر، كەچی هەمان پیاو لە ناكاوێكدا دەبیٚ بە شەیتان، یاخی دەبیٚ، كۆ لە هیچ تاوانێك ناكاتەوە، ئیدی كوشتن بیٚ یان زەوتكردن یان...! دیارە بەرپرسەكانی سەریان سوور دەمێنیٚ، خەڵكی باوەڕناكەن. دەبیٚ هۆی ئەم یاخیبوونە لە ناكاوە كە كەس چاوەڕوانی نەدەكرد چیٚ بیٚ ؟ هۆی ئەم یاخیبوونو تەقینەوە كوتوپڕە چاوەڕوان نەكراوە، ئارەزوویەكی چەمووشی خەمناكی نیگەرانی غەریزییە كە كوتو پڕ بەسەریا دێتو هانیدەدات خۆی بنوێنیٚ، خودی خۆی بسەلمێنیٚ... بڵیٚ من هەم... ئەوە شەپۆلە هەستو سۆزێكە كە بینەر تێی ناگات، بۆیە پێی سەیر دەبیٚ،و نازانیٚ چۆن داوەری لەسەر بكات... ڕێك لە نۆرە ڤۆو پەركەم دەچێت. ئێوە مرۆڤیٚ بێننە بەرچاو كە بە زیندوویەتی نێژرابیٚو لە پڕ وەئاگا بێتەوە: هەڵبەتە ئەم مرۆڤە دەكەوێتە لێدانی قەپاغی تابووتەكەی، لێدان نەك گاڵتە. هەوڵدەدا قەپاغەكە لا بدات، هەرچەندە ئەقڵی ئەم كارە نابڕێتو ئەقڵ پێی دەڵیٚ هەوڵی بێسوودە، بەڵام ئەقڵ ناتوانیٚ ئەم خولیاو كەڵكەڵانە هێور بكاتەوە، دایان بسەكنیٚ. هەڵبەتە نابیٚ ئەوەشمان لە بیر بچێت، هەر هەوڵێكی زیندانیی بۆ خۆنواندنو خۆ سەلماندن لەلای بەرپرسەكەی دەكاتە جۆرە تاوانێك، ئیدی شێوازی خۆنواندنەكەی ترسناك بیٚ یان ئاسایی فەرق ناكات. جا كە ئەمە وابیٚ، یانی ڕیسك هەر ڕیسك بیٚ، سەرپێچی هەر سەرپێچی بیٚ، یاسا شكێنی هەر یاساشكێنی بیٚ، هەنگیٚ زیندانییش شولی لێهەڵدەكێشیٚو كۆ لە هیچ تاوانێك ناكاتەوە ئەگەر تاوانی كوشتنیش بیٚ. یەكەم هەنگاو زەحمەتە، ئیدی زیندانیی بەرە بەرە چەشە دەبیٚ، سیوای دەبێتەوە، تا وای لێدیٚ جڵەوی لە دەست بەردەبیٚو خۆی پیٚ كۆنترۆڵ ناكرێت. بۆیە واچاكە زیندانییان بەرەو ئەمجۆرە توندڕەوییە نەبرێن... تا هەمووان بە ئارامیو ئاسوودەیی بژین... بەڵیٚ، بەڵام ئەمە چۆن دێتە دی ؟

***پەراوێز:***

***١- برولوف (١٧٩٩ - ١٨٥٢) نیگاركێشێكی رووسی فەرەنسی نەژادە.***

## مانگی یەکەم

٢-٢

کاتێ کە هاتمە زیندان، پارەیەکی کەمم هەبوو، بەڵام هەموویم لە گیرفانما هەڵ نەگرتبوو، دەترسام دەستی بەسەردا بگرن. باقی پارەکەم لە ئەستەری بەرگی ئینجیلەکەمدا شاردبووەوە. ئینجیل تاقە کتێب بوو کە لە زینداندا رێ دەدرا پێت بێ. ئەم ئینجیلەم لە شاری توبولسك(١) دەست کەوتبوو، ئەو دوورخراوانە دایانمێ کە دەیان ساڵ بوو لە تاراوگەدا دەژیان. لە سیبیریادا خەڵکانێك هەبوون کە ژیانی خۆیان وەقفی یارمەتیدانی قەرەبەختان کردبوو،و بڕیاریان دابوو هەر قەرەبەختێك بە برای خۆیان بزانن. وەکو منداڵی خۆیان تەمەشای قەرەبەختانیان دەکرد. جا ئەم خێرخوازیو هاوسۆزیو هاوخەمییەیان زۆر پاك بوو، دوور بوو لە هەر غەرەزو مەبەستو بەرژەوەندییەك. جا حەزدەکەم لێرەداو لە چەند وشەیەکدا نموونەیەك لەو جۆرە خێرخوازییە بگێڕمەوە کە بە چاوی خۆم دیتم.

لەو شارەی کە زیندانەکەمانی تیا بوو. بێوەژنێك هەبوو بە نێوی (ناستازیا ئیڤانوڤنا). کەسمان نە ئەم ژنەمان دەناسی،و نە پەیوەندی ڕاستەوخۆمان دەگەڵیدا هەبوو. ئەم ژنە ژیانی خۆی وەقفی دوورخراوان بەگشتیو بێگارەزیندانییان بە تایبەتی، کردبوو. نەمدەزانی بۆ ئەمەی دەکرد. لە دڵی خۆدا دەمگوت تۆ بڵێی خزمێکی، کەسێکی قەرەبەخت بوو بێ ؟ یان خۆشەویستێکی ئازیزی هەمان سزاو حوکمی ئێمە درا بووبێ، وا ئەم هەموو مێریڤانیە دەگەڵ ئێمەدا دەکات ؟ بە هەرحاڵ هەرچییەکی لە دەست هاتبا لە پێناوی ئێمەدا دەیکرد. بەڵام لە شتێکی زۆر کەم بترازێ، هیچی تری لە دەست نەدەهات، چونکە بە خۆی یەجگار هەژارو دەستکورتو نەبوو بوو.

بەڵام ئێمەی زیندانی، هەستمان دەکرد، لە دەرێی زیندانەکەدا دۆستێکی یەجگار دڵسۆزو میهرەبانمان هەیەو زۆرمان دڵ پێی خۆش بوو. زۆرجار هەواڵی دەرەوەی بۆ دەگواستینەوە، یەجگار تامەزرۆی هەواڵ بووین، کە زیندانم بە جێهێشتو، دەمویست بۆ شارێکی د یکە بڕۆم ، دەرفەتم بۆ هەڵکەوت کە لە ماڵەکەی خۆیدا سەرێکی لێبدەمو تەعاروف لەگەڵدا بکەم، لە قەراخی شاراو لە ماڵی یەکێك لە خزمەکانیدا ئاکنجی بوو و دەژیا.

ناستازیا ئیڤانوڤنا نە پیر بوو نە گەنج، نە جوان بوو نە ناشیرین. مەحاڵ بوو پیاو بزانێ ئاخۆ زیرەکە یان گەوج، خوێنەوارە یا نەخوێنەوار. بەڵام بە کردەوەکانیا دیاربوو کە چ چاکە خوازێکە، میهرو مێریڤانی لێدەباری، خوا خوای بوو هاوسۆزیت دەگەڵ بکاتو شتێك بکات کە دڵت خۆش بکات. پیاو هەموو ئەم سۆزانەی لە نیگا ناسكو شیرینو میهرەبانەکانیا دەخوێندەوە. لەگەڵ هاوڕێیەکی دیکەی(٢) زیندانمدا، قەدەرێکی باشمان لە نك وی بەسەر برد. چاوی لە چاو نەدەگواستینەوە، بەدەممانەوە پێدەکەنی، بەدڵ گوێی لێدەگرتین، پشتیوانی لە راو بۆچوونەکانمان دەکرد، بە پەرۆشەوە دەهاتو دەچوو تا باشترین خواردنو خواردنەوەمان بۆ فەراهەم بکات، هەرچەند ژنێکی هەژارو بێنەوا بوو، بەڵام یەکسەر چاو کولیچەو شیرینی بۆ

هێناین. خۆ ئەگەر دەوڵەمەند بوایە، خزمەتی زیاتری دەکردین، چونکە هیوایەتی ئەوە بوو ئێمەی زیندانییان دڵخۆش بکات.

کاتێ کە هەستاین ماڵاوایی لێبکەین‌و بڕۆین، سەرو و پاکەتی چکۆلەی لە کارتۆنی دروستکراوی، بۆ یادگاری پێشکەش کردین. بەخۆی ئەم دوو پاکەتەی دروستکرد بوو، و بەو جۆرە کاغەزانەی کە لە بەرگی کتێبی حیسابی قوتابخانان دەگیرێت، بەرگی تێ گرتبوون، هەر بۆ جوانی تیلمە کاغەزێکی زەردی ئاڵتوونی بە چواردەورا کێشا بوون، لەوە دەچوو ئەو تیلمە کاغەزانەی لە یەکێك لە دوکانەکان بەتایبەتی بۆ ئەو مەبەستە کڕی بێت.

کە دیارییەکەی داینێ بە شەرمێکەوە گوتی:

– مادام جگەرە دەکێشن رەنگە ئەم پاکەتانە بە کەڵکتان بێت.

من لە زۆر کەسم بیستووەو لە زۆر شوێنم خوێندووەتەوە کە باڵاترین خۆشەویستیمان دەرهەق بە دەرو دراوسێ، جگە لە خۆ پەرستی هیچی تر نییە، واتە گەورەترین خۆشەویستی ڕەگی لە خۆپەرستیدایە، من تێناگەم، نازانم چ خۆپەرستیەك لە رەفتاری ئەم ژنەدا هەیە ؟ خۆپەرستیەکەی لە کوێ دایە ؟.

من کە چوومە زیندانەوە هەرچەندە پارەیەکی زۆرم پێ نەبوو، بەڵام دڵم نەهات دەست بە رووی ئەو زیندانییانەوە بنەم کە لە یەکەم ساتەوە روویان لێنام‌و داوای قەرزیان لێکردم.ئەوەشم پێناخۆش نەبوو، پاش ئەوەی کڵاویان لەسەرنام، جاری دووەم‌و سێیەم‌و چوارەمیش بۆ قەرز هاتنەوە. پیاو راست بڕوات لەوە پەست‌و زویر بووم، کە بە پیاوێکی گێل‌و گەوجیان دەزانیم،و لە دڵی خۆیاندا گاڵتەیان پێدەکردم. لەبەر هیچ نا، لەبەر ئەوەی بۆ جاری پێنجەم سووکە قەرزێکم دەدانێ. بێگومان وایان تەسەور دەکرد کە بە فێڵەکەیانم نەزانیوەو کڵاویان لەسەرم ناوە. جا من دڵنیام ئەگەر دەرم کردبان‌و سیکترم کردبان‌و قەرزم پێ نەدابان زۆریان رێزو حورمەت دەگرتم، بەڵام چ بکەم بە دەستە خۆم نەبوو، نەمدەتوانی دەست بە روویانەوە بنەم‌و رووشکێنیان بکەم، ئەگەرچی هەندێجار زۆریش تووڕە دەبووم.

هەڵبەتە لە رۆژانی یەکەما، زۆرم مەبەست بوو بزانم لە کوێ پێ دابنەم، رەفتارم دەگەڵ هاو زیندانیەکانمدا دەبێ چۆن بێت. هەستم بەوە دەکرد کە ئەم ژینگەیە بۆ من زۆر تازەیە، من بەم ژینگەیە نامۆم،و کەوتوومەتە تاریکستانێکی ترسناکەوەو مەحاڵە پیاو بتوانێ دە دانە ساڵ لە تاریکستاندا بەسەر بەرێت. بۆیە لێبڕام بە گوێرەی ویستی ویژدان‌و بە کەیفی دڵی خۆم رەفتار بکەم. هەرچەند دەمزانی ئەم هەڵوێستە لە ڕووی تێۆرییەوە یاساو رێسایەکی باشە، بەڵام واقیع شتێکی دیکە بوو، پڕبوو لە بویەرو ڕووداوی لە ناکاو و چاوەڕوان نەکراو. سەرباری هەموو ئەو وردەکار و خەمانەی کە لە زینداندا هەم بوون، ئەو وردە خەمانەی کە پێشتر باسم کردن‌و ئاکیم ئاکیمیچ زوو بە زوو بەهانامەوە هات‌و لە دابینکردنیاندا یارمەتی دام، نیگەرانیەکی ترسناك بەرۆکی گرتبووم‌و دڵی دەگوشیم‌و رۆژ بە رۆژ پتر عەزابی دەدام. هەندێجار ئێواران کە لەسەر قاڵدرمەکانی زیندانەکە دەوەستام‌و تەمەشای ئەو زیندانییانەم دەکرد کە لە کارو بێگار دەگەڕانەوەو هێدی هێدی بە حەوشەکەدا رێیان دەکردو خۆیان بە مووبەقەکەدا دەکرد یان بە

پێچەوانەوە لە مووبەقەکە وەدەردەکەوتن‌و خۆیان بە قاوشەکەدا دەکرد، لە دڵی خۆدا دەمگوت من زیندەبەچاڵ کراوم. ئەمە " زیندەبەچاڵ خانەیە !" بە وردی دەمڕوانیە هەڵس‌و کەوت‌و سەروسیمایان.دەمویست ئاکارو تەبیعەتیان لە رەفتارو سەروسیمایاندا بخوێنمەوە.بە بەردەممدا دەسوڕانەوە، دەهاتن‌و دەچوون، هەندێکیان گرژو مۆن‌و عەبوس دەهاتنە بەرچاو، هەندێکیان رووخۆش‌و شادو دەم بە پێکەنین – ئەم دوو حاڵەتە لە زینداندا زۆر بەرچاو دەکەون– هەندێك شەڕە جنێویان دەکرد، هەندێك هێدی‌و هێمن قسانیان دەکرد، هەندێك دوور لەخەڵکی، بە دەم رێکردنەوە لە فکران ڕادەچوون،و زۆر شەکەت‌و بێتاقەت دەهاتنە بەرچاو، هەندێك کڵاوەکانیان بە تیلاگی سەرەوە نابوو و شایان بە سەپان نەدەگرت،و ئاسمانیان بە چاتۆڵ دەزانی( تەنانەت لێرەش!) پاڵتۆکانیان دابوو بە شانیانداو بەوپەڕی متمانەوە چاویان دەگێڕاو ئێرەو ئەوێیان بە نیگا دەکێڵا،و بەوپەڕی گۆساخی‌و بێ شەرمی قسەی بێ پەردەیان دەردەپەڕاندو تانەو تەشەریان دەوەشاند. لە دڵی خۆمدا گوتم : " ئیدی ئێرە دەبێ بە شوێنم، ئێرە دەبێ بەو جیهانەی کە حەزی لێناکەم‌و، چارم ناچارە دەبێ چەندین ساڵی تیا بەسەر بەرم..."

لە سەرەتاوە حەزم دەکرد هەندێ شت لە ئاکیم ئاکیمیچەوە دەربارەی تەبیعەت‌و خووی زیندانییەکان بزانم. لە هەوەڵی زیندانیەکەمدا خواردنی سەرەکیم چای بوو. حەزم نەدەکرد بەتەنێ بم. هەموو رۆژێ (ئاکیم ئاکیمیچ)م دەعوەتی چا دەکرد، ئەویش خوا هەڵناگرێ بۆ چا خواردنەوە سەری پێوەی نەبوو، بگرە بە خۆی کۆنە سەماوەرکەمانی دادەگیرساند، ئەم سەماوەرە لە تەنەکەی سپی دروستکرا بوو. دەستکردی خودی زیندانییەکان بوو، لە (م...)م بە کرێ گرتبوو. جا بە دەم عەسرە چاوە پرسیاری تەبیعەت‌و خووی زیندانییەکانم لە ئاکیم ئاکیمیچ دەکرد.

ئاکیم ئاکیمچ لە پەرداخدا چای دەخواردەوە (چەند پەرداخێکی هەبوو) کە چایەکەم بۆ تێ دەکرد. بەوپەڕی بێدەنگی‌و ویقارو نەزاکەتەوە چاکەی دەخواردەوە. کە لێ دەبووەوە سوپاسی دەکردم‌و، یەکسەر دەچووەوە سەری لێفەکەی من‌و دەستی بە درومان دەکردەوە. بەڵام نەیدەتوانی ئەوەی من مەبەستمە پێم بڵێ، تەنانەت نەیدەزانی بۆچی زانینی تەبیعەت‌و خووی زیندانییەکانم لێ بووە بە مەراق. بە دەم بزەیەکی ساویلکانەوە، کە ئێستاش لەبەر چاومە، گوێی لە پرسیارەکانم دەگرت‌و وایدەزانی گوێزی بۆ دەژمێرم. بۆیە لە دڵی خۆدا گوتم: "نا، فایدەی نییە، پێویست ناکات پرسیار لە کەس بکەم. پێویستە ئەوەی گەرەکمە بیزانم، بەخۆم کەشفی بکەم‌و بیدۆزمەوە."

رۆژی چوارەمی زیندانیەکەم، سپێدە زوو، هەموو زیندانییەکان بە دوو ریز، لە مەیدانە چکۆلەکەی بەر ژووری پاسەوانیدا(قەرەوڵخانە)، لە نزیکی دەروازەکەی زینداندا ریزکران. سەربازان، لەپاش‌و پێشەوە، بە تفەنگی سوارو سونگی لەسەر، حارز وئامادە دەوریان گرتبوون. سەرباز بۆی هەبوو، ئەگەر زیندانییەك هەوڵی هەڵاتن بدات، یان ئاژاوە بنێتەوە تەقەی لێبکات، بەڵام ئەگەر بە ناهەق و بەبێ هۆ تەقەی کردبا، مەسئول دەبوو. تەنیا کاتێ رێی تەقەکردن دەدرا

که ئەگەر زیندانییەکان یاخی بوایەن یان هەڵاتبان. بەڵام کێ هەبوو، بەو ڕۆژی ڕووناکەو بە بەرچاوی خەڵکیەوە هەوڵی ڕاکردن بدات یان هەڵێ ؟!...

ئەفسەرێکی بەشی ئەندازە لەگەڵ شوفێرێك(٣)وچەند دەرەجەدارێکی سوپایی‌و چەند ئەندازیارێك‌و، چەند سەربازێکی سریەی کار گەییە جێ. ناوی زیندانییەکان خوێنرایەوە. یەکەم وەجبە ئەوانە بەرێ کران کە لە وەرشەو کارگەی خەیاتی کاریان دەکرد: ئەوانە لە زیندانەکەدا کاریان دەکردو جل‌و بەرگیان بۆ هەموو زیندانییەکان ئامادە دەکرد. پاشان نۆرەی ئەوانە هات کە لە کارخانەکاندا کاریان دەکرد. دوای ئەوان نۆرەی ئەوانە هات کە بۆ ئەنجامدانی وردە کارو بێگار بۆ دەشت‌و دەر دەنێردران. من یەکێك بووم لەوانە... ژمارەمان بیست زیندانی بوو. لەو دیو زیندانەکەوە، دوو کۆنە بەلەمی دەوڵەتی لە قەراغ ڕووبارێکدا بوون، کە لە کەڵك کەوتبوون‌و بە کەڵکی هیچ نەدەهاتن، نێردراین بۆ ئەوێ، تا هەڵیان بوەشێنینەوەو تەختەکانیان خەسار نەبێت. ئەلهەقی ئەو تەختانە بە کەڵکی هیچ نەدەهاتن، چونکە داری سووتەنی لە شارا زۆر هەرزان بوو، ناوچەکەش یەکپارچە جەنگەڵ‌و دارستان بوو.

هەر بۆیە ئەو کارو بێگارانەیان پێدەکردین تا بە دەستی بەتاڵ دانەنیشین‌و سەرقاڵمان بکەن.و زیندانییەکان هەموو ئەمەیان چاك دەزانی، بۆیە زۆر بە تەمەڵی‌و خاوی کاریان دەکرد. ئەم جۆرە کارانە زۆر جیاواز بوون، لە کاری جددی یان لەو کارانەی کە لەبڕ دەدرا بە زیندانییەکان.. هەنگێ زیندانییەکان گوڕیان دەبەستەوەو چالاکانە دەکەوتنە کار... بە چاوی خۆم زیندانییانم دەبینی چۆن خۆیان ماندوو دەکرد تا بە زووترین کات کارەکە تەواوبکەن، هەڵبەتە نەك لەبەر ئەوەی سوودو قازانجێکیان دەست دەکەوت، بەڵکو لەبەر ئەوەی قسەی خۆ بەرنە سەر. هەڵبەتە ئەو جۆرە کارە ڕواڵەتیانەی کە ئێمە ئێستا خەریکی بووین، لە بڕو بە قۆنتەرات نەدەدرا، بۆیە لەم حاڵەتانەدا کارەکە تا سەعات یازدەی پێش نیوەڕۆ بەردەوام دەبوو، لە سەعات یازدەدا تەپڵی پایدۆس لێیدەداو زیندانییەکان بۆ زیندان دەگەڕانەوە.

ڕۆژێکی خۆش بوو، دنیا یەك پارچە تەم‌ومژ بوو، بەفر خەریك بوو دەتوایەوە. هەموو گروپەکەمان بەدەم زڕەی زنجیرەوە بەرەو کەناری ڕووبارەکەی پشتی زیندانەکەمان دەڕۆییشتین. لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا زڕە زڕ لە زنجیرو پێوەندەکانی ژێر جلەکانمانەوە هەڵدەستا، جا زڕە زڕێکی وشك‌و ناخۆش. دوو سێ نەفەرمان چوون بۆ عەمار تا ئامێرو ئەوزاران بێنن. من دەگەڵ ئەوانی دیدا کەوتمە ڕێ. شتەکەم لەلا ناخۆش نەبوو، چونکە خوا خوام بوو بە چاوی خۆم کارەکە بدینم‌و بزانم ئەو سوخرەو بێگارەی پێمانی دەکەن چیەو چۆنە ؟! بزانم چۆن بۆ یەکەمجار لە ژیانما سوخرەو بێگار دەکەم ؟ ئێستاش هەموو ڕووداوەکانی ئەو بەیانیەم بە وردی لە بیر ماوە. لە ڕێگادا تووشی کابرایەکی ریشنی خەڵکی شارەکە بووین، کە ئێمەی بینی لە جێی خۆی وەستاو دەستی بۆ گیرفانی برد. یەکێك لە زیندانییەکان، لە ئێمە دابڕا، کڵاوەکەی داکەندو بەپەلە بەرەو کابرا ڕایکرد، تومەز کابرا خێری قەرارداوە، پێنج کوبیکی خستە کڵاوەکەیەوەو زیندانییەکە بەلەز بۆ لای ئێمە گەڕایەوە. هەر ئەو بەیانیە پێنج کوبیکەکە خەرج کرا، درا بە چۆرەك‌و بە یەکسانی بەسەرماندا دابەش کرا. جا گروپەکەمان هەموو جۆرە مجێزو تەبیعەتێکی

تیابوو، خەڵکانێکمان تیا بوون گرژو مۆنو پەستو بێدەنگ. هەندێکی دی دنیایان دابووە بەر کلکان، شادو بە کەیفو رووخۆش گوێیان بە هیچ نەدەدا... خەڵکێکی دی هەبوون لە بەینی خۆیاندا، بە خاوەخاو قسانیان دەکرد. یەکێکمان تیا بوو ئەوەندە شادو بە کەیف بوو، لە پێستی خۆی نەدەهێوری، مەگەر هەر خوا بزانێ بۆچی ئەوەندە شادو بە دەماخ بوو. بە درێژایی رێگا هەڵدەقوونایەوە، هەڵدەبەزییەوەو زڕەی لە زنجیرو پێوەندەکەی هەڵدەستانو گۆرانی دەگوتو دەرەقسیو سەمای دەکرد. ئەم پیاوە نێوی سوراتۆف بوو، پیاوێکی قەڵەوی چوار شانە بوو، ئێستاش لە بیرمە، یەکەم رۆژ بوو کە گەیی بوومە زیندان، یەکەم رۆژی زیندانم بوو، لە کاتێکا زیندانییەکان بەسەر ئاوەکەوە کەڵەکەیان کردبوو تا دەستو دەموچاویان بشۆن، ئەم سۆراتۆفە دەگەڵ هاورێیەکی خۆیدا لەسەر ئەوە کردبووی بەشەڕ کە پێی گوتبوو لە تەیری کاجان دەچێت. جا ئەوەی کە گۆرانی دەگوت ئەم سوراتۆفە بوو کە ئێستاش پاش بەندەکەیم لەبیر ماوە:

*من لە دوور بووم*

*لە رێی ئاشی*

*ژنیان بۆ هێنام*

*بێ پرسو راوێژی.*

هەر لە بالالایکای کەم بوو..هەڵبەتە هەندێ لە زیندانییەکان ئەم کەیفو خۆشییەی ئەویان لا ناخۆش بوو، بگرە بە تەڵفیزیشیان دەزانی. ئەوەتا یەکێکیان بەدەم خوتەو بۆڵەوە، هەرچەندە شتەکە هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نیە دەڵێت:

– ئەرێ ئەم وەڕە وەڕە چیە ؟

یەکێکی دی، کە بە زمانەکەیا دیارە خەڵکی رووسیای بچووکە، دەڵێت:

– گورگ تەنیا یەك گۆرانی دەزانی، ئەویش ئەم کابرا تولائیە لێی دزی ( تولائی: خەڵکی شاری تولا).

سوارتۆف. یەکسەر وەڵامی دایەوە:

– تولاییمو هیچ عەیب نیە... بەڵام بیستوومە لە بۆلتافادا بەناوی میوەوە هەویریان دەرخوارد داویت و خەریك بووە بخنکێیت.

– درۆ دەکەی! ئەدی تۆ چت دەخوارد ؟ شۆربای کەلەرم بە توێکڵی زەیزەفۆنەوە!

سێیەم گوتی:

– یەکێك نەزانێ دەڵێت ئەمە شەیتان هەر گوێزو بادەمی داوەتی، بە گوێزو بادەم بە خێوی کردووە...

سوارتۆف، سوکە هەناسەیەکی هەڵکێشاو وەکو یەکێك پەشیمان بێ لەوەی بەناز پەروەردەکراوە ، روو لە هەمووان گوتی:

– ئەلهەقی برادەرینە من لە منداڵیدا نازی زۆرم دراوەتێ و بە نازداری گەورە بووم، خواردنم قۆخ و نانی بەلەزەت بوو، برایەکانم ئێستاشی لەگەڵ بێ، لە مۆسکۆدا گەورە بازرگانن. بازرگانی جوملەن و زۆر دەوڵەمەندن، وەکو دەزانن!..

– ئەدی تۆ، چیت دەفرۆشت ؟

– هەر مرۆڤەو خەسڵەت و مگێزی خۆی هەیە... من بۆ نموونە کە یەکەمین دوو سەد... وەرگرت...

زیندانیەکی لاپرەسەنی فزوڵی کە گوێی لەو ژمارە گەورەیە بوو، لە جێی خۆیەوە هەڵیدایە:

– دوو سەد رۆبڵ ؟ مەحاڵە.

– نا،.. نا دۆستی ئازیز... دوو سەد رۆبڵ نا... بەڵکو دوو سەد شەلاق...

– لۆقا! ڕابە لۆقا.

زیندانییەکی لاوازی کورتە باڵای لووت درێژی دەنووکە داڵاشی بە توڕەیی و پەستی وەڵامی دایەوە

– ئەگەر خەڵکانێك هەبن و بۆیان هەبێ هەر بە لۆقا بانگم بکەن... ئەوا تۆ بۆت نیە، دەبێ بە ناوی تەواوەتی خۆمەوە: لۆقا کوزمیچ بانگم بکەی.

هاوڕێکەی گوتی:

– دەی باشە.. با لۆقا کوزمیچ بی... عەمرت نەمێنێ!

– نا... نا بۆت نیە بە لۆقا کوزمیچ گازم بکەی... بەڵکو دەبێ پێم بڵێی: مامی بەڕێزم.

– دەك ڕەزای مامی بەڕێزم بخواتەوە!... بە راستی تۆ شایستەی ئەوە نیت پیاو بە تاقە وشەیەکیش بتدوێنێ... من دەمویست باسی شتێکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە کەچی تۆ هەموویت لە بیر بردمەوە.. جا برادەرینە ئێوە گوێ بگرن، کە چۆن بە هۆی ئەو شتەوە زۆر لە مۆسکۆ نەمامەوە... دوا پازدە جەڵدەیان لێدام و... پاشان هەواڵەی ئێرەیان کردم... ئەوە حاڵ و حیکایەتەکە بوو!

زیندانیەکی دیکە کە بە وردی گوێی لێدەگرت گوتی:

– بۆچی هەواڵەی ئێرەیان کردیت ؟

– ... پرسیاری نابەجێ مەکە! لەبەر ئەوە دەوڵەمەند نەبووم... بە ڕادەیەك تاسەمەندی دەوڵەمەندی بووم کە ناتوانن وێنای بکەن!

گەلێك لە زیندانیەکان دەستیان بە پێکەنین کرد...

سوراتۆف یەکێك بوو لەو خەڵکە قۆشمەو حەنەکچیانەی کە بە ئەرکی خۆیانی دەزانن خەڵکانی خەمین و دڵتەنگ بێننە پێکەنین و دڵیان خۆش بکەن و خەمیان بڕەوێننەوە، بەڵام لە پاداشتی ئەم ئەرکەیاندا جگە لە جنێوو قسەی سووك هیچی تر وەرناگرن.. یەکێکە لە نموونە تایبەتیەکان کە ڕەنگە پاشان باسیان بکەم.

لۆقا کوزمیچ گوتی:

– تۆ تەمەشا تەمەشا، هەر لە سمۆرە دەچێ، یەکێکە لە سمۆرە زیتەڵو ئازاکانی سیبیریا!... هەر کەوڵەکەی سەد رۆبڵ زیاتر دەکات...

سوراتۆف پالتۆیەکی لەبەر بوو، لە کۆنیا هاوتای نەبوو، یەك پارچە پینە بوو... پنەکانیش زۆربەیان هەڵتەقی بوون‌و پێیدا شۆڕ بوو بوونەوە...

زۆر بە وردی سەراپای لۆقای دایە بەرنیگا. ئەوجا گوتی:

– با پاڵتۆکەم شڕو شەپڕێو بێ، هیچ نەکات، لێ هاورێیان کەللەم زۆر گرانبەهایە، زۆر بەنرخە، پارەیەکی زۆر دەکات. کاتێ کە ماڵاواییم لە مۆسکۆ کرد زۆر دڵم بەوە خۆش بوو کە کەللەم لە گەڵمدایە... بە دوعا مۆسکۆ گیان... سوپاس بۆ ئەو گەرماوە پاك‌و خاوێنەت، بۆ هەوای پاکت... بۆ ئەو شەلاقانەی لە پشتت دام... جا دۆستی ئازیز، پێویست بەوە ناکات سەیری پاڵتۆکەم بکەیت.

– چیە گەرەکتە تەمەشای سەرت بکەم!

لۆقا کوزمیچ هاواریکرد:

– جا بریا سەریشی سەری خۆی بوایە... بە خێر داویانەتێ کاتێ کە قافڵەکە بە تومین دا رەت بووە، بەخێرو سەدەقە داویانەتێ.

– سوراتۆف، تۆ کارگەت هەبوو ؟

زیندانیەکی خەمین‌و روو گرژ گوتی:

– کارگەی چی؟ رووتەی واو کارگە ؟ پێنە دۆزێکی داماو بوو... چەرمی لەسەر بەردان خۆشە دەکرد.

سوراتۆف. بێئەوەی گوێ بە وتە تەوسامێزەکانی یارۆ بدات‌و بیباتە سەر خۆی گوتی:

– ڕاستە، ماوەیەکی باش خۆم بە پینەدۆزییەوە خەریك کرد، بەڵام بە درێژایی ئەو ماوەیە تەنیا یەك جووت پێڵاوم دروستکرد.

– باشە کەس لێی کڕیت ؟

– بەڵێ ... گەنجێکم لێ هەڵکەوت، دیاربوو خودا غەزەبی لێگرتبوو، بێگومان داك‌و بابی لێی رازی نەبوون، بۆیە یەزدان غەزەبی لێگرت‌و بەوە سزای دا کە بۆ لای منی ناردو ئەو جووتە پێڵاوەی لێکڕیم!.

هەموو ئەوانەی دەوروبەری سوراتوف لە قاقای پێکەنینیان دا. ئەوجا سکوراتوف بە کاوەخۆ درێژەی بە قسەکەی داو گوتی:

– پاشان، جارێکی دیکە لە بێگارەزیندان دا، جووتێ پێڵاوم بۆ مولازمی یەکەم ستیڤان فیدریچ پورمورتزیف پینەکرد.

– باشە کارەکەتی بەدڵ بوو ؟

– نە بە خوا هاوڕێیان... بە پێچەوانەوە، هێندەی جنێو دامێ کە بەشی هەموو ژیانم بکات... ئەوسا بەر شاپانی دام! هێندە تورە بوو ئاگری لێدەباری! ئۆف لە دەست ئەم غەداری سۆزانیە... ژیانم لە بێگارە زیندانداا... ئەم سۆزانیە خیانەتی لێکردم!

ئەوجا بەدەم هەڵبەزو دابەزو سووڕو چەقەنەوە گوتی:

*ڕاوەستە، سەبر بکە.*

*با مێردەکەی ئاکلینا*

*لە ماڵ بێتە دەر*

ئەو زیندانیەی کە لە رووسیای بچووکەوە هاتبوو، لە جێی خۆی جما، لە کاتێکا کە شان بە شانی من دەڕۆیی، مۆڕەیەکی لێکردو لە بن لێوانەوە بۆڵاندی:

– کە بێ حەیایە.

یەکێکی دیکە بە هێمنی گوتی:

– ئەم پیاوە خێری بەخشراوەتەوە.

هەرچی سەرم هێناو سەرم برد سەرم لەم لەگەزو مەتەڵە دەرنەکرد کە بۆچی حەنەکچیاتیو شادمانی سکوراتوفیان لەلا ناخۆش بوو، بۆچی زیندانیانی رووخۆشو گاڵتەچیان دەبوغزاند. هەڵبەتە لە هەوەڵەوە پێموابوو چ کابرای وردیلەی خەڵکی رووسیای بچووکو چ ئەوانی تر، غەرەزو ناکۆکی تایبەتیان دەگەڵ سکوراتوفدا هەیە. بەڵام هەر زوو بۆم دەرکەوت کە مەسەلەکە وا نییە وەکو من بۆی چوو بووم، هەموو خەتایەکی سکوراتوف ئەوە بوو کە بە درۆوە خۆی قورس نەدەگرت، وەکو زیندانییەکانی دیکە رواڵەتباز نەبوو،و ئەوان گوتەنی پیاوێکی "بێ خێر بوو". هەڵبەتە زیندانییەکان، هەموو گاڵتەچیو حەنەکچیەکانیان نەدەبوغزاند،و هەمان رەفتارو مامەڵەی سکوراتوفیان دەگەڵ نەدەکرد. چونکە لەنێو قۆشمەو حەنەکچیەکاندا خەڵکان هەبوون حازروەڵامو بەدەم، دەیانزانی چۆن داکۆکی لە خۆ دەکەن،و تانەو تەشەریان لە کەس قبووڵ نەدەکرد، بۆیە زیندانییەکان، ناچار رێزیان دەگرتنو خۆیان لێدەپاراستن. یەکێکی لەو جۆرە کەسانە لە نێو گروپەکەماندا بوو، گەنجێکی جوانخاسی هەمیشە شادو رووخۆش، دوای ماوەیەکی زۆر ئەوجا حەقیقەتی ئەو کوڕەم بۆ دەرکەوتو وەکو پێویست ناسیم. گەنجێکی باڵا بەرزی بە خۆوە بوو، خاڵێکی گەورەی جوان بەسەر گۆنایەوە بوو: دەموچاوی پێکەنیناوی بوو، هەرچەندە کوڕێکی سەلارو سەنگینو ئەقڵمەند بوو. ئەم کوڕەیان بە "دۆزەرەوە" ناو دەبرد، چونکە کاتی خۆی لە هێزی ئەندازە کاری کردبوو، ئێستا لە بەشی تایبەتیە. پاشان دێمە سەر باسی.

هەڵبەتە زیندانیە جددییەکان، وەکو یارۆی رووسیای بچووک بە دیتنی هاوڕێ حەنەکچیەکان قەڵس دەبوون، بەڵام وەکو ئەو دەریان نەدەبڕی. زیندانەکەمان خەڵکانێکی تیا بوو حەزیان بە خۆ دەرخستن دەکرد، حەزیان دەکرد لەوانی دی باڵاتر بنوێنن، ئیدی بە کارزانی بوایە یان بە رەفتاری جیاواز یان بەتواناو هێز یان بە زیرەکیو هوشیاری بوایە. ژمارەیەکی زۆریان هێزو زیرەکیان هەبوو، دەگەییشتنە ئەو ئامانجانەی کە دەیانویست، یانی دەسەڵات بەسەر هاوڕێکانیاندا پەیدابکەن. جا ئەوانە دژایەتیەکی توندی یەکتریان دەکرد،و هەڤرکی زۆریان هەبوو. جا ئەوانە خاکیانەو بە میهرو رێزەوە دەیانڕوانیە زیندانییەکانی دی. بە خۆڕایی و بە بێ هۆ خۆیان لە قەرەی شەڕو قەرقەشە نەدەدا. جا لەبەر ئەوەی رەئی ئیدارەی زیندان بەرانبەریان

باش بوو، بە شێوەیەك لە شێوەكان كاروبباریان بەڕێوە دەبرد، واتە دەستیان دەڕۆیی. كەسیان بۆ نموونە لەسەر ئەو گۆرانیانەی كە دەگوتران نەدەهاتنە جواب و نەیان دەكرد بە شەڕ: یانی نە دەهاتنە ئەو ئاستە نزمە. هەر هەموو ئەوانە، بە درێژایی ئەو ماوەیەی كە لە زینداندا بەسەرم برد، لەگەڵما خۆش مامەڵەو رەفتار بوون، بەڵام زۆریش روویان نەدەدامێ، پاشان بە درێژیی باسی ئەمەش دەكەم.

گەییشتینە كەنار رووبارەكە. ئەو كۆنە بەلەمەی كە دەبوایە هەڵی بوەشێنینەوە، لە بەستەڵەكی ناو رووبارەكە چەقی بوو. ئەوبەری رووبارەكە تا چاو بڕەكات هەر دەشت و مێرگی شینباو بوو، بە راستی ئاسۆو دیمەنێكی خەمناك بوو. چاوەڕوانی ئەوە بووم كە هەموو زیندانییەكان یەكسەرو بە جددی دەست بە كار بن، بەڵام بە پێچەوانەوە هەر مێشیش میوانیان نەبوو. ئەوەتا هەندێكیان بۆ خۆ بە خەمساردی لەسەر ئەو كۆتەرە دارانەی كە لەو ناوە كەوتوون دانیشتوون. زۆربەیان كیسە توونتنەكانیان لە نێو پوتەكانیان دەرهێناوەو "ئەم توونتنە هەر بە گەڵایی، بەبێ چاككردن لە بازاڕا دەرفرۆشرێ، ڕەتڵی بە سێ كۆپیك) سەبیل دادەگرنەوەو سەبیلان دەكێشن. ئەو سەربازانەش كە دەگەڵمان هاتوون، دەوریان گرتووین و بە بێزاریو بێتاقەتی تەمەشامان دەكەن.

یەكێك لە زیندانییەكان بە دەنگی بەرز، بێ ئەوەی رووی دەمی لە هیچ كەسێك بێ، گوتی:

– نازانم بۆچی ئەم بەلەمە هەڵدەوەشێننەوە، ئەمە بیرۆكەی كێیە ؟ تۆ بڵێی پێویستیان بە دارەكەی بێ ؟

یەكێكی دی گوتی:

– ئەوانەی ئەم بیرۆكە جوانەیان بە مێشكدا هاتووە، لە ئیمەمانان ناترسن هاوڕێ !.

ئەوەی یەكەم دوای كەمێك بێدەنگی گوتی:

– ئەو جووتیارانە كێوە دەچن ؟

بێئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی پرسیارەكەی بكات، بە قامكان ئاماژەی بۆ كۆمەڵە جووتیارێك كرد كە لە دوورەوە بە ریزو دوا بە دوای یەك، بەسەر بەفری تازە كەوتوودا رێیان دەكرد. هەموو زیندانییەكان، بە بێتاقەتی ئاوڕی لای ئەو سەمتەیان دایەوەو، هەر بۆ كات بەسەر بردن كەوتنە گاڵتەكردن بەو رێبوارانە. یەكێك لەو جووتیارانە كە لە دوای دوای ریزەكەوە بوو، بە شێوەیەكی سەیرو پێكەنیناوی رێی دەكرد، باڵەكانی بڵاودەركردەوەو سەری بەلایەكدا زۆر خوار كردبووەوە،و كڵاوێكی قووچی فەرووی لەسەر بوو، سێبەری بەژن و باڵای بە تەواوەتی و روونی بەسەر بەفرە سپییەوە دیار بوو.

یەكێك لە هاوڕێكانم،بە لاسایی كردنەوەو بە زمانی جووتیارانە گوتی:

– تەماشا جل و بەرگەكەی پترۆفیچ چەند جوانە !

ئەوەی سەیرە زیندانییەكان بە چاوی سووك دەڕواننە جووتیاران،وگاڵتەیان پێدەكەن و لاساییان دەكەنەوە، هەرچەندە زۆربەیان، بە خۆیان جووتیاران.

– بە تایبەتی تەمەشای ئەوەی دوای دواوە بكەن... دەڵێی توور دەچێنێ !

زیندانیی سێیەم گوتی:

– تۆ تەمەشای کڵاوە قووچەکەی، چەند گەورەیە... دیارە دەبێ دەوڵەمەند بێ.

هەموو زیندانییەکان بە بێتاقەتی کەوتنە پێکەنین، وەکو ئەوەی بێگاریان پێبکرێ. لەو کاتەدا ژنێك بە یەك سەبەتە چۆرەکی سپیەوە هات: ژنێکی چەلەنگو چالاکو، زیتەڵ بوو. زیندانییەکان بایی ئەو پێنج کۆپیکەی کە کابرای شاری بەخێر دایبوونێ، چۆرەکیان لێکڕیو بە یەکسانی بەسەر خۆیاندا دابەشیان کرد.

ئەو کوڕە گەنجەی کە لە نێو زیندانەکەدا چۆرەکی دەفرۆشت بیست دانەی لە عەردێ لە ژنەی تاین کڕی، زۆری دەگەڵدا وت کە هەرزانتر پێی بفرۆشێت، بەڵام ژنەکە قاییل نەبوو، کوڕەکە وتی:

– دە باشە... بەلای کەمەوە یەکێکم "لەوە" بدەیە.

– ئەوە چیە ؟

– ئەوەی کە مشکیش پێی رازی نابێ.

ژنەکە لە قاقای پێکەنینی دا:

– رەزات مرێ، نەیخۆی تاڵە.

ئەنجام ئەو سەربازە دەرەجەدارەی کە چاودێری دەکردین بەخۆو دۆنکییەکەی دەستییەوە هات، گوتی:

– بۆچی دانیشتوون ؟ دەی خێرا دەست بەکار بن!

یەکێك لە بە ناو دەم سپییەکان، بە بێتاقەتی هەستاو گوتی:

– ئیڤان ماتیفچ ئیشمان بۆ بدۆزەوە تا بیکەین.

– ئیشەکەتان ئەوەیە بەلەمەکە دەربێنن، لەوە زیاتر چیتان دەوێ ؟

زیندانییەکان بە خاوە خاو هەستانو بۆ ناو روبارەکە شۆڕ بوونەوە. یەکسەر دوو سێ کەس خۆیان لێکردن بە دەم سپی، هەڵبەتە هەر بە دەم نەك کردەوە. نە دەبوو خوا بەختەکی بەلەمەکە بشکێنن، دەبوایە لەوحەکانی بە ساغی دەربێنن، بە تایبەتی ئەو تەختە پانانەی کە بنکی بەلەمەکەیان پێکدێنا. ئەمەش کارێکی بە درێژاو ناڕەحەت بوو.

یەکێك لە زیندانییەکان کە نە چاودێر بوو و نە دەم سپی، بەڵکو کرێکارێکی ئاسایی بوو هاواریکرد:

– پێموایە دەبێ هەوەڵجار ئەم تەختەیە دەربهێنرێ... دەی کوڕینە هیمەت کەن !....

ئەم پیاوە لاشەڕە گەوجۆکەیەی کە تا ئێستا هیچ قسەیەکی نەکرد بوو، ئەمێستا داهاتووەتەوە ولە تەختەیەکی قورس نەویوەو، چاوەڕوانە ئەوانی دی بچنە هیمدادی، بەڵام کەس بە دەنگییەوە نەچوو. یەکێکی دی لە بن لێوانەوە بۆڵاندی:

– خۆت ئەزیەت مەدە! ئەوە خواردنی تۆ نییە! ئەگەر باپیرە ورچەکەشت بێت بۆی دەرنایەت.

– باشە تەگبیر! چ بکەین براینە! من نازانم چۆن....

ئەوجا بە شپرزەیی دەستی لە تەختەکە بەرداو خۆی ڕاست کردەوە.

– قابیله بەتاقی تەنیا ئیشەکە ناکەیت، پەلەت چیە ؟ ئەو بەستەزمانە، سەرسامو شپرزەو بە پۆزشەوە گوتی:

– بەڵام هاوڕێیان زویر مەبن، قسەیەك بوو و بە زارمدا هات، خۆ قیامەت ڕانەبوو...

کابرای دەرەجەدار کە راسپێردرابوو چاودێری کارەکەمان بکات ، لە کاتێکا دەیڕوانیە ئەو بیست پیاوەی کە تیامابوونو نەیاندەزانی چۆن دەست بە کارەکەیان بکەنو لە کوێوە دەست پێبکەن، هاواری کرد:

– چییە، خۆ ناتانەوێ سەرو پاڵتۆتان پێدا بدەین تا گەرمتان بێتەوە ؟ یان چاوەڕێ بکەین تا زستان تەواو دەبێ ؟

– ئیڤان ماتوفیچ پەلەمان لێمەکە، ئیش بە پەلە ناکرێ، شەیتان پەلەی کرد چاوێکی خۆی کوێر کرد.

– بەڵام سافلیف تۆ هیچ ئیشێك ناکەیت، پیس دەست داوەتە تەمەڵی! چیە بۆ وا چاوت زەق کردووەتەوەو تەمەشا دەکەی؟ لەوە دەچێ بتەوێ چاوەکانت بخەیتە مەزادەوە ؟... دەی خێرا دەست بەکار بن...

– ئاخر من بە تاقی تەنیا چ بکەم، چیم پێدەکرێ.

– ئیڤان ماتوفیچ ئیشێکمان بۆ دیاری بکە.

– من یەکجار پێمگوتن کارێکی تایبەتیتان بۆ دیاری ناکەم. بەلەمەکە هەڵوەشێننەوەو هەرکە تەواوتان کرد بڕۆنەوە. دەی دەست پێبکەن.

دوای کەمێك ڕامانو سەبر، زیندانییەکان کەوتنە کارکردن، بەڵام زۆر بە تەمەڵیو بێتاقەتی. پیاو کە ئەو هەموو پیاوە بە هێزو توانایە بەو خاوەخاوو گێلە گێلە دەبینێ ئەوسا دەزانێ پاسەوانو بەرپرسەکانی زیندان بۆچی ئەوەندە لێیان پەستو قەڵسن. وەرە زەلام نەزانی چۆن دەست بەکاربکەی. هەرکە دەستیان دایە یەکەم تەختە، قرچەی لێهەستاو شکا. ئیدی زیندانییەکان بۆ خۆ پەڕاندنەوە بە چاودێرە دەرەجەدارەکەیان گوت کە: "هەر لە خۆیەوە شکا. خەتای ئەوانی تیا نەبوو، ئەم کارە لە بنەڕەتەوە دەبوایە بە شێوەیەکی تر بکرێت. ئیدی چ بکەین، هیچ چارێکی ترمان نەبوو ؟". دوای ئەمە مشتو مڕو گەنگەشەیەکی دوورو درێژ لە نێوان زیندانییەکاندا دەستی پێکردو بەرە بەرە هەڵیبوارد بۆ دەم بۆڵەو شەڕەجوێنو قسەی سووکو، خەریك بوو لە شەڕە جنێویش تێدەپەڕی...

کابرای چاودێر بەدەم دۆنکی بادانەوە دیسان هاواری بەسەرا کردن. بەڵام تەختەی دووەمیش بە مەرەدی تەختەی یەکەم چوو. هەنگێ هەموو هەستیان کرد کە پێویستیان بە پاچو ئامێرانی دی هەیە، دوو زیندانی گەنجیان هاوڕێ دەگەڵ پاسەوانێکدا بۆ زیندانەکە نارد تا پاچو ئامێرانی دی بێنن، زیندانییەکانی دی هەموو بەئارامی لەسەر بەلەمەکە لێی دانیشتنو سەبیلەکانیان دەرهێناو کەوتنە سەبیل کێشان.

چاودێرەکە لە داخا تفێکی رۆکردە زەویو بەدەم خوتەو بۆڵەو ناڕەزاییەوە گوتی:

– خۆ بە ئیش نامرن... تەمەڵینە... توخوا ئێوە بەشەرن !؟

ئەوسا دەستەکانی هەڵتەکاند، بەدەم دۆنکی بادانەوە بەرەو قەڵاکە (زیندان) وەرێکەوت.

دوای سەعاتە وەختێك بەڕێوەبەر هات، بەکاوەخۆ گوێی لە داواکانیان گرت، ئەوجا داوای لێکردن چوار تەختەی دیکە بە ساغی لە بەلەمەکە بکەنەوەو بەشێکی تەواو هەڵبوەشێننەوەو هەر کە لەو کارە بوونەوە ئیدی بۆ زیندان بگەڕێنەوە، هەرچەندە ئەمە کارێکی سووكو ئاسان نەبوو، بەڵام خۆزگە دەتبینی کە زیندانییەکان چۆن پەلاماریان داو تێی وڕوکان!

ئەمە لە کوێو ئەو تەمەڵی و خاوەخاوەی تۆزێ لەمە پێشیان لە کوێ ؟ هەر پاچ بوو بەرز دەبووەوەو دادەهاتەوە، دەتگوت دەرەقسن، هەر بزمارو سنگ بوو دەردەپەڕی، ئەوانەی تەورو پاچیان پێ نەبوو، دیرەکی ئەستووریان وەبن تەختەکان دەداو بە سپو ساغی دەریان دێنان. زۆرم پێ سەیر بوو کە دەمبینی ئەو تەختانە وا بە ساغی و دروستی دەردەهاتنو نەدەشکان! زیندانییەکان زۆر بە گورجو گۆڵی کاریان دەکرد، دەتگوت لە ناکاو وەخۆ هاتنەوەو وەهۆش هاتوونەتەوە، ئێستا نە قسەیان دەکرد، نە جنێویان دەدا، هەرکەسە قسەو کاری خۆی چاك دەزانی، دەیزانی دەبێ چ بڵێ، چ بکات، لە کوێ بوەستێ. زیندانییەکان بە نیو سەعاتێك بەر لە تەپڵی پایدۆس کارکەیان تەواوکرد، هیلاكو ماندوو بۆ زیندانەکە گەڕانەوە، بەڵام دڵیان بەوە خۆش بوو کە نیو سەعاتێك زووتر لە سەرکار دەگەڕانەوە، بەڵام سەبارەت بە خۆم هەستم بە شتێکی سەیر کرد، ئەوەبوو لە هەر لایەکەوە خۆم دەخزانە بەینیانەوە تا کۆمەکیان بکەم، جێیان نەدەکردمەوە، ناڕەحەت دەبوونو دەریان دەکردم،و بە جۆرێ دەیان پرتاندو دەیان بۆڵاندو پێما هەڵدەشاخین زیاتر لە جنێو وسووکایەتی دەچوو.

تەنانەت یەکێك لەو زیندانییە شڕۆڵەو پەڕپوتانەی کە نەیدەوێرا لە ئاستی زیندانییەکانی تردا، کە تۆزێ لەو پۆشتەو پەرداخترو زیتەڵتر بوون، زار هەڵێنێ، لە من بوو بە شێر، کە لێی نزیك بوومەوە بەو بیانووەوە پێما هەڵشاخی کە گوایە بەر دەستی دەگرم. ئەنجام یەکێکیان کە لەوانی تر وریاترو لێهاتووتر بوو، بە ڕاشکاویو بە زبری پێی گوتم:

– ئاخر تۆ بۆ هاتوویتە ئێرە ؟ یانی دەتوانی چ کارێك بکەی ؟ لاکەوە لێرە! هەڕوو، کە کەس بانگی نەکردوویت بۆ هاتوویتە ئێرە ؟

یەکێکی دی هەڵیدایە:

– لاچۆ، واز بێنە.

زیندانی سێیەم هاواری کرد:

– باشتر وایە بچی تەنەکەیەك پەیدا بکەیو ئاو بەریت بۆ ئەو خانووەی وا لەوێندەر دروست دەکرێ یان بڕۆی بۆ ئەو کارگەیەی کە تووتنی تیا ورد دەکەن: ئێمە پێویستمان بە تۆ نیە، ئێرە جێی تۆ نییە.

ناچار بووم کەنار بگرم. بەڵام پیاو کە لە دوور بوەستێ و ببینێ خەڵکانی دی کاردەکەن، هەست بە جۆرە شەرمو شەرمەزارییەك دەکات، کە چووم بۆ ئەو دیوی بەلەمەکە زیاتر لێم کەوتنە تەقە، بەدەم خوتەو بۆڵەو جنێودانەوە دەیانگوت: "ئێوە تەمەشاکەن چ جۆرە کرێکارێکمان بۆ

دەنێرن! بەخێر نەیەنەوە بۆ خۆتان‌و کرێکارێك کە بۆ ئێمەتان ناردووە! ئاخر ئێمە چ پێویستمان بەم شێرە کوڕانەیە ؟...."

هەڵبەتە بەئانقەست ئەو قسانەیان دەکرد. خوا خوایان بوو دەفەرتێکیان بەدەست بکەوێ، کەسێکی خانەدان‌و ئەشرافزادە بەگیر بێنن‌و داخی دڵی خۆیانی پێ بڕێژن‌و بە کەیفی دڵی خۆیان پێی رابوێرن، کاتی هەرە خۆشیان ئەو کاتانە بوو کە بە خانەدانێك رابوێرن.. بێگومان خوێنەر رەنگە ئێستا بتوانێ پەی بە نهێنی ئەو پرسیارە بەرێ کە لە رۆژانی هەوەڵی هاتنم بۆ ئەم زیندانە، مێشکی داگیر کردبووم‌و لە دڵی خۆدا دەمپرسی دەبێ رەفتارو هەڵوێستم دەگەڵ ئەو خەڵکەدا چۆن بێت ؟ هەڵبەتە هەستم بەوە دەکرد کە زۆرجار تووشی ئەم جۆرە رووداوانە دەبم، ئەم جۆرە هەڵوێست‌و بویەرانە زۆرجار دووبارە دەبنەوە، بۆیە لێبڕام هەرچییەك دەبێ با ببێ، بەڵام من نەخشەکەی خۆم ناگۆڕم. دڵنیا بووم لە دروستی ئەم هزرین‌و بیرکردنەوەیەی خۆم، بۆیە بڕیارم دا، بە شێوەیەکی زۆر سادەو ساکار دەگەڵیاندا بژیم بێئەوەی کەمترین هەوڵبدەم کە لێیان نزیك ببمەوە، بەڵام ئەگەر ئەوان بە خوایشتی خۆیان ویستیان لێم نزیك ببنەوە، لووتیان لێهەڵنەکەم‌و ڕوویان لێوەرنەگێڕم، هەروەها بڕیارم دا نە لە هەڕەشەو گوڕەشەیان بترسم‌و نە رق‌و بوغزیان بە هەند بگرم‌و چەندی بکارم وا خۆ بنوێنم کە هەست بە هەڕەشەکانیان ناکەم‌و گوێ بە کەرب‌و کینەیان نادەم، و لێبڕام هەندێجار خۆمیان لێ دووربگرم‌و بەشداری لە هەندێ داب‌و نەریتیاندا نەکەم، یانی بڕیارم دا هاوڕێیاتیان نەکەم. هەستم دەکرد ئەگەر ئەم رەفتارە نەگرمەبەر، دەمبوغزێنن.پاشان دڵنیا بووم کە ڕەچەڵەکی ئەشرافانەم وادەخوازێ خۆم بە سەریاندا بنوێنم‌و بە چاوی سووك تەمەشایان بکەم‌و وەکو خەڵکی ڕەشۆکی مامەڵەیان لە تەکدا بکەم‌و هەرگیز بە دەستی خۆم کار نەکەم و تەنیا ئەمر بکەم. راستە ئەم رەفتارە وای لێدەکردن لە دڵی خۆداو بە دزییەوە جنێوم پێبدەن‌و قسەم پێ بڵێن، بەڵام ناچاریان دەکات رێزو حورمەتم بگرن. بەڵام هەرچیم دەکرد نەمدەتوانی ئەو دەورە بگێڕم. یانی رۆژێ لە رۆژان نەمتوانی ئەو دەورە بگێڕم کە ئەوان بە شایستەی خەڵکی خانەدان‌و ئەشرافیان دەزانی، بەڵام دوا بڕیاری خۆم دابوو کە بە هیچ جۆرێ لە تەربێت‌و پەروەردەی خۆم لا نەدەم‌و، خیانەت لە قەناعەتەکانی خۆم نەکەم. خۆ ئەگەر هەوڵمدابا ڕوویان بدەمێ‌و شەرمیان لێم بشکێ‌و سیوایان لێم ببێتەوە هەنگێ بە ترسنۆکیان دەزانیم‌و وەکو ترسنۆکێك مامەڵەیان لە تەکدا دەکردم. جا... ف لەو نموونە باشانە نەبوو کە چاوی لێبکەم. ف کە لەلای مێجەر زمانی لێدەدان، ئەوان زیاتر لێی دەترسان. لەلایەکی تریشەوە نەمدەویست وەکو پۆڵاندییەکان، لووتیان لێ هەڵبکەم‌و بە چاوی سووك تەمەشایان بکەم‌و بیان بوغزێنم. هەستم دەکرد رقیان لێمە، بەڵام هەوڵم دەدا لە جیاتی ئەوەی گلەیی لە بەختی خۆم بکەم. کەسێکی بە کەڵك‌و کەڵکگرو سوودمەند بم. دەمزانی لە ئەنجامدا رەئی خۆیان دەربارەی من دەگۆڕن. هەڵبەتە کە هەوڵمدەدا وەکو ئەوان بم‌و مدارایان بکەم‌و نەمدەزانی چۆن ئەمە بکەم، هەستم بە جۆرە تەریقی‌و سووکیەك دەکرد‌و نە هەقم نەدەگرتن کە دەمبینی بە چاوی سووك تەمەشام دەکەن.

کاتیٚ کە ئێواریٚ لە کار بوومەوەو شەکەتو ماندوو بۆ زیندان گەڕامەوە، خەمێکی قوولٚ دایگرتم. لە دڵی خۆدا گوتم: "دەبیٚ هەزاران ڕۆژیٚ وەکو ئەم ڕۆژە بەسەر بەرم".

لە کاتێکا بە دەم پیاسەوە، خەمینو خەمناك بە حەوشەی زیندانەکەدا هاتوچۆم دەکرد،و دنیا سات بە سات تاریکتر دەبوو، لە پڕ (پولو)م بینی بەغار بەرەو ڕووم دێت. پولو، ناوی سەگی زیندانەکە بوو، زیندانیش وەکو کەتیبەی سوارانو فەسیڵی پیادەو تۆپخانە سەگی تایبەتی خۆی هەبوو. ماوەیەکی زۆرە لەم زیندانەدا دەژی. ئەم سەگە هی هیچ کەسێك نەبوو،و هەر زیندانییەکی بە خاوەنی خۆی دەزانی. بە ئێسقانو پاشماوەی مووبەقەکە دەژیا. سەگێکی گەورەی ڕەش بەڵەك بوو، زۆر پیر نەبوو، دووچاوی زیتی هەبوو، کلکی گەورەو تووکن بوو، هیچ کەسێك گوێی نەدەدایەو گەمەی دەگەڵ نەدەکرد، هەرکە گەییمە زیندانەکە کردم بە هاوڕێی خۆمو نەوازشم دەکردو خۆشم دەویست. چونکە ئەمڕۆ بە درێژایی ڕۆژەکە نەی بینیبووم، بیری کرد بووم، تومەز هەموو پەناو پاساری زیندانەکە بە دوومدا گەڕا بوو، هەرکە لە دوورەوە بینی بوومی، بە غارو بە دەم قروسکە قروسکەوە بەرەو لام هاتبوو. بە خۆیشم نازانم لەو ساتەدا هەستم بە چیکرد، بەڵام سەریم خستە سەر سینگمو ماچم کرد، ئەویش هەردوو دەستی خستە سەر شانەکانمو کەوتە لستنەوەی دەموچاوم. لە دڵی خۆدا گوتم ئەمە ئەو هاوڕێیەیە کە قەدەر بۆی ناردووم. ئیدی بە درێژایی هەوەڵین هەفتە سەختو دژوارەکانی زیندانم، کە ئێواران لە بێگار دەگەڕامەوە، دەچوومە ناو حەوشەی زیندانەکەو لە سووچێکی تاریکدا چاوەڕوانی (پولو)م دەکرد. پولو بە خۆشحاڵییەوە لە بەردەممدا دەکەوتە هەڵبەزو دابەزو کلکە لەقیٚ، سەریم دەخستە باوەشمو بەتاسەوە ماچم دەکردو دەکرد. هەستێکی خۆشو لە هەمان کاتدا خەمین دایدەگرتم. ئێستاش لە بیرمە کاتیٚ کە دەمبینی لەم دنیا گەورەیەدا تەنیا یەك گووراو دڵبەستەی منە، چەند خۆشحاڵو دڵخۆش دەبووم (لەزەتم لە عەزابی خۆم دەبینی) گووراێك کە چوومە زیندانەوە پارچە نانێکم دایە، گووراوێك کە ئەو نانو نمەکەی هەر لەبەر چاوبوو. کاتیٚ کە نەوازشم دەکرد لە جێی خۆی مت دەبوو. جوڵەی نەدەکرد، بە میهرو سۆزەوە نیگای دەکردمو بەکاوەخۆ، هێدی و دۆستانە کلکی دەلەقاند، ئەویش هاوڕێکەم، هاوڕیٚ تاقانەکەم، سەگە وەفادارەکەم (پولو) بوو.

***پەراوێز:***

*١- لە ساڵی ١٨٥٠دا، لە شاری توبولسك سیٚ ئافرەت لە دیسامبەرییەکان سەردانی دۆستۆیفسکی یان کرد کە بریتی بوون لە: مورافیوفا، ئاننکوفاو فونفیزینا، کە ساڵی ١٨٢٦دا بە زۆر دوای مێردە نەفی کراوەکانیان بۆ سیبیریا، کەوتبوون.*

*٢- "لەگەڵ هاوڕێیەکی دیکەی زیندانمدا" ئەو هاوڕێیە سیرگی ف دوروف بوو، ئەندامی شانەی بتراشفکی بوو. کە دۆستۆیفسکی حوکم درا، ئەویش حوکم درا، ئیدی لە زینداندا بەینی ئەو دوو پیاوە تێکچوو.*

*٣- (شوفێر) ئەمە دەرەجەدار بوو لە هێزی ئەندازەدا.*

((٧))

## هاوڕێیانی تازە

## پترۆف

ڕۆژگار تێدەپەڕیو منیش بەرە بەرە دەگەڵ ژیانی تازەمدا ڕادەهاتم. ئەو دیمەنانەی کە بە چاوی خۆم دەمبینین وەکو جاران خەمینیان نەدەکردم. یانی دەتوانم بڵێم کە زیندانو زیندانییانو دابو نەریتی حەپسخانە غاراندمیانو وایان لێکردم گوێ بە هیچ نەدەم. ڕاستە ئەم ژیانە یەجگار دژوار بوو، بەڵام هیچ چارێك نیە دەبێ تەحەمولی بکەی. هەوڵمدەدا هەرچی خەمو نیگەرانیو دوو دڵیەك هەیە لە ناخی خۆمدا بینێژم.. ئیدی بە تاقی تەنیا، خەمینو خەمبار، بێهودە بە چوار دەوری زیندانەکەدا نەدەسوڕامەوە. زیندانییەکانیش بە هەمان فزوڵیەتی جارانەوە تەمەشایان نەدەکردم. گوێیان نەدەدامێ. هەقیان بە سەرمەوە نەبوو. ئەمەم زۆر پێ خۆش بوو. ئیدی بە جۆرێ لە نێو زیندانەکەدا دەسوڕامەوە وەکو ئەوەی ماڵی خۆم بێت. شەوان ڕێك دەچوومە شوێنەکەی خۆم. بەرە بەرە بە شتی وا ڕاهاتم کە جاران لە خەوو خەیاڵیشدا پێم قەبووڵ نەدەکرا. هەموو هەفتەیەك دەچووم بۆ لای دەلاكو سەری خۆم دەخستە بەر دەستی. ڕۆژانی شەمموان یەك لە دوای یەك بۆ بارەگای پاسەوانەکان بانگ دەکراین، لە وێندەر دەلاکەکانی فەوج بە ئاوی ساردو سابوون سەریان تەڕدەکردینو بێ بەزەییانە بە کولترین گوێزان بەر دەبوونە تاشینی سەرمان. بۆیان دەکردین بە کولەکەی پاککراو. ئێستاش کە ئەو عەزابەم وە بیر دەکەوێتەوە لەرزم لێدێ. بەڵام زۆری پێ نەچوو کە دەرمانی ئەو دەردەم دۆزییەوە، ئاکیم ئاکیمیچ، زیندانییەکی بەشی سوپایی پێناساندم، کە بە گوێزانی تایبەتی خۆی سەری خەڵکی بە یەك کوبیك دەتاشی. ئەمە سەرچاوەی رزقو ڕۆزی ئەو بوو. بەشێکی زۆری زیندانییەکان، بێئەوەی خەڵکی بووەو نازدار بن، بۆ ئەوەی لە عەزابی دەلاکەکانی زیندان بخەلەسن، دەچوونە لای ئەو. نازانم بۆچی بەم دەلاکەیان دەگوت مێجەر! خۆ هیچ لێکچوونێکیش لە نێوان ئەمو مێجەرەکەی خۆماندا نەبوو. من ئێستا بە دەم نووسینی ئەم دێرانەوە سەرو سیمای باریكو لاوازی ئەو دەلاکە بە ڕوونی دەبینم. گەنجێکی درێژی، باریكو بنێسو کەمدوو و گەوجۆکە بوو، ڕوحی بەسەر کارەکەیەوە دەردەچوو. هەمیشە چەرمێکی بە دەستەوە بوو، شەوو ڕۆژ گوێزانەکەی پێدا دێناو تیژی دەکردەوە. لەوە دەچوو دەلاکیو سەرو ڕدێن تاشینی کرد بێت بە ئامانجی بەرو دوای ژیانی خۆی. کاتێ کە گوێزانەکەی بە باشی تیژ دەکردەوەو یەکێك دەهاتە لایو تکای لێدەکرد سەری بۆ بتاشێت، هەستی بە خۆشیو شادییەکی لە ڕادە بەدەر دەکرد. هەمیشە سابوونو ئاوی گەرمی هەبوو، دەستی ئەوەندە نەرمو ناسك بوو دەتگوت مەخمەلو لۆکەیە، ئەوەندە بە وەستایەتیو کارامەیی خۆیەوە دەنازیو دەفشی تەنانەت هەقدەستەکەی کە تاقە کوبیکیك بوو، بەساردیەوە وەردەگرت، یانی ئەوەندەی تامەزرۆو تاسەمەندی وەستایەتیەکەی بوو ئەوەندە تامەزۆری کرێیەکەی نەبوو. ئاشقی کارەکەی بوو.

رۆژێکیان (ئا...ف) بە دەم باسی ئەم دەلاکەوە، و بۆنەگبەتی لەبەردەم مێجەرەکەی لەمەڕ خۆماندا، لەدەمی دەردەچێت و بەمێجەر ناوی دەبات، ئیدی مێجەر زۆر توڕە دەبێت و سزایەکی زۆر توندی دەدات و توند شانی دەگرێت و ڕایدەتەکێنێ و بەدەم کەفچەڕینەوە هاواری بەسەردا دەکات:

- دەزانی مێجەر یانی چی هەی خوێڕی بەرەڵڵا ؟ دەزانی مێجەر چەند گەورەیە ؟ بە چ ڕوویەکەوە لە بەردەم مندا بە زیندانییەکی هیچ و پوچ دەڵێی مێجەر؟

(ئا...ف) تاقە کەس بوو کە دەیتوانی دەگەڵ مرۆڤێکی وەکو ئەم مرۆڤەدا بسازێت.

لە یەکەم ڕۆژی زیندانمەوە خەونم بە ئازادبوونەوە دەبینی. خەیاڵاتی شەوو ڕۆژم بوو بوو بەوەی ژمارەی ئەو ڕۆژانە بژمێرم کە دەبوایە لە زینداندا بەسەریان بەرم، هەزارو یەك کەڕەتم دەم ژماردن، بە هەزارو یەك شێوە دەم ژماردن. جگە لەوە نەمدەتوانی بیر لە هیچ شتێکی دیکە بکەمەوە. هەڵبەتە هەر کەسێکی دیکەش لە جیاتی من بوایە، هەمان کاری منی دەکرد. گومانم لەوە نیە. زیندانی هەرکێیەك بێ و ماوەی زیندانییەکەی هەرچەندێ بێ، هەر ئازادی لە بیرە. نازانم هاوزیندانییەکانم وەکو من ڕۆژانیان دەژمارد یان نا. بەڵام خەون و خەیاڵ و ئاوات و ئامانجەکانیانم بەلاوە سەیر بوو. هیواو ئاوات و خولیاو کەڵکەڵەی زیندانییەك زۆر جیاوازە لە ئاوات و خولیای بابایەکی ئازاد. پیاوی ئازاد هەمیشە ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە، بۆ نموونە دەیەوێ پرۆژەیەك لە پرۆژەکانی بێتە دی، بە ئاواتێکی بگات، بەڵام لە پێناویا دەژی و کاری بۆ دەکات، یانی بەدەم ژیان و کارەوە چاوەڕوانی دەکات. ئیدی خۆی دەداتە دەم ژیانی واقیعیەوە و لە خەیاڵاتدا نقوم نابێ. بەڵام زیندانی وانیە: ڕاستە دەژی، بەڵام هیچ زیندانییەك، هیچ بێگارە زیندانییەك، ساڵانی مەحکوومیەتەکەی بە بەشێك لە ژیانی ڕاستەقینەی خۆی نازانێت. ئەوە غەریزەیە، بە دەست خۆی نیە. هەست دەکات لە ماڵی خۆیدا نییە، میوانە. بەو چاوە سەیری بیست ساڵەی حوکمەکەی دەکات کە پێچی مێزەرێکەو هاکا تەواو بوو، زۆر دڵنیایە کە لە ٣٥ ساڵیدا حوکمدراوە، کاتێ کە لە ٥٥ ساڵیدا ئازاد دەبێ، هەمان ئەو گەنجەی جارانە، هەم تین و تاوو گوڕی گەنجە ٣٥ ساڵییەکەی دەمێنێ. لە دڵی خۆدا دەڵێ: "بەری ڕۆژگار درێژە، هێشتا زۆرمان بە بەرەوە ماوە."و هەر ڕەشبینییەکی لەمەڕ ژیانی ئایندە بە بیرا گوزەر بکات، خێرا لە خۆی دوور دەخاتەوە. تەنانەت حەپسی ئەبەدیش، بەو هیوایە دەژی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە پترسبۆرگەوە فەرمانێك بێت و بڵێ: " فلان بۆ کانەکانی نرچنسك بگوازنەوەو ڕۆژی بەردانی دیاری بکەن. چەند شتێکی خۆشە! چونکە یەکەم نرچنسك شەش مانگە ڕێیەو ژیان لەگەڵ ئەو جۆرە کاروانەدا سەد ئەوەندەی ژیانی ناو زیندان باشە، و دووەم چونکە ماوەی حەپسییەکەی لە نرچنسك تەواو دەکات و پاشان..". من لە نێو زینداندا زۆر پیرەمێردم دیتوون کە بەو خەیاڵانەوە دەژیان و دڵخۆشی خۆیان دەدایەوە.

لە بیرمە جارێکیان لە توبولسك کۆمەڵێك زیندانییم بینی کە بە زنجیران بە دیوارەوە بەسترا بوون. درێژی هەر زنجیرێك دوو مەتر بوو. تەختە خەویان لە نزیك خۆیانەوە بۆ دانرا بوو، تا لە سەری پاڵبکەون و بخەون. ئەمە سزای ئەو زیندانییانە بوو کە پاش هەواڵە کردنیان بۆ سیبیریا،

تاوانو سەرپێچی گەورەیان دەکرد. ئیدی بە پێنج ساڵو دە ساڵ بەو حاڵەوە، دەهێڵرانەوە. زۆربەی هەرە زۆری ئەمانە چەتەو ڕێگر بوون. تەنیا یەکێکم تیایاندا بینی کە پێدەچوو کەسێکی خانەدان بێ. ئەمە کاتی خۆی فەرمانبەری فەرمانگەیەکی دەوڵەتی بوو. پیاوێکی دەمو زار شیرین بوو، لە قسە کردنا نەرمو لەسەر خۆ بوو، جار جارە ناسکە بزەیەك دەکەوتە سەر لێوی. زنجیرەکەی خۆی پێ نیشانداین، بۆی ڕوونکردینەوە چۆن بەو زنجیرانەوە لەسەر تەختە خەوەکەی پاڵدەکەوێو دەخەوێ، لە کەسێکی باش دەچوو. هەر هەموو ئەو نەگبەتو داماوانە خۆش ڕەفتار بوون. بەڵام یەجگار پەرۆشی ئەوەبوو زوو ماوەی ئەم سزایەی تەواو بکات، خەریك بوو پەڕو باڵی دەردەکرد، بۆچی؟ ئازاد دەبوو؟، ئەگەر لە من بپرسن بۆچی؟ دەڵێم چونکە لەو زیندانە تەنگە نزمە شێدارەی کە تاقو پەنجەرەکانی لە جێ کەرپوچێك زیاتر نەبوو، دەرباز دەبوو، هەنگێ دەیتوانی بە حەوشەی زیندانەکەدا پیاسە بکاتو کەمێك هەوای پاك هەڵمژێ... تەنیا لەبەر ئەمە بوو، ئەگینا ئازاد نەدەبوو، ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو دیوی حەوشی زیندانەکەی بە چاوی خۆی نەدەبینی. دەیزانی هەموو ئەوانەی کە پێ بە کۆتو زنجیر کراون، ڕۆژێ لە ڕۆژان لە زیندان ناچنە دەرێ،و هەموو تەمەنی لە زیندانندا دەباتە سەر، مەگەر مەرگ لە زیندانی بەرێتە دەرێ. چاك ئەمە دەزانێ، بەڵام وێڕای ئەوەش هەر بە ئومێدە لە کۆتو زنجیرەکەی بخەلەسێت، باشە ئەگەر ئەم ئومێدە نەبوایە، چۆن پێنج شەش ساڵ بەو دەقەوە، بەو کۆتو زنجیرەوە، بەقەد ئەو دیوارەوە هەڵیدەکردو نەدەمرد یان شێت نەدەبوو؟ بەرگەی دەگرت ؟

ئیدی هەر زوو پەیم بەوە برد کە تەنیا کار فریام دەکەوێ، هەر کار تەندروستیو بەدەنم دەپارێزێت، دەنا نیگەرانی دەروونیو هەڵچوونی بەردەوام، هەوای ناخۆشی ناو قاوشو ژوورەکانی زیندان، وێرانم دەکەن. لە دڵی خۆدا دەمگوت: "هەوای پاكو کارو ماندوو بوونی ڕۆژانەو هەڵگرتنی باری قورس زۆر باشە، دەبێ خۆمیان لەسەر ڕابێنم تا ئەگەر لە زیندان ئازاد بووم، مەرەخەس بووم. ڕەنگو رووم خۆش بنوێنێو شنگو هێزو توانایەکم هەبێت." بیر کردنەوەکەم دروست دەرچوو، کارو جوڵە سوودێکی زۆریان پێگەیاندمو لە پیربوونی کوتو پڕیان رزگار کردمو نەیان هێشت وەکو یەکێك لە هاوڕێکانم کە ئەویش وەکو من خانەدانو ئەسڵزادە بوو، بەرە بەرە بپوکێمەوەو وەکو مۆم بتوێمەوە. ئەم پیاوە لە هەمان ڕۆژی مندا کەوتە زیندان، گەنجێکی جوانخاسی تۆکمەی پتەو بوو، کە لە زیندان وەدەرکەوت، بە تەواوەتی داکەوتبوو، سەری سپی بوو بوو، لاقەکانی سستو لاواز، بە ئاستەم خۆی بەسەر یانەوە دەگرت، هەناسە سواری تەنگی پێ هەڵچنی بوو. کە تەمەشام دەکرد بە خۆمم دەگوت: "نا، من باش ماوم، دەبێ بژیم،و دەژیم ". کار دۆستی من، لە هەوەڵەوە کردیە کارێك کە هاوزیندانییەکانم تانەو تەشەرم لێبدەن. گاڵتەم پێبکەن، بەڵام من سوور بووم لەسەر ئەوەی گوێیان نەدەمێ،و پیاوانە مل بە کارەو بنەم، بۆ هەر کارێکیان ناردبام بێ چەندو چوونو گورج دەڕۆیشتم، یەکەم کارم لە کوورەی سووتاندنو هاڕینی مەڕمەڕی سپیدا بوو، ئەمە کارێکی زۆر ئاسان بوو. ئەندازیار، سەرپەرشتەکان، بە پێی تواناو دەرفەتی خۆیان هەوڵیاندەدا مدارای زیندانییانی خانەدانو ئەسڵزادە بکەنو کاری قورسیان پێنەکەن. هەڵبەتە ئەم مدارایەیان لە پیاوەتی خۆیان

نەبوو، بەڵکو ئینساف‌و دادپەروەری وایدەخواست. چونکە هیچ ماقوول نییە چاوەڕوانی هەمان کار لە کابرایەکی دەست سپی، بێتاقەت کە لە عەمراتی کاری دەستی نەکردبێ بکەی، وەك لە کرێکارێکی بە شنگ‌و تواناو بەهێزو قاڵبووی کار، چاوەڕوان دەکرێت. ئاخر ئەو دووە چۆن دەبن بە یەك ؟ هەڵبەتە ئەم مدارایە هەموو کاتێ بەردەوام نەدەبوو، زۆرجار بە دزییەوە دەکرا، چونکە چاودێرییەکی توندمان لەسەر بوو. هەڵبەتە کاری قوریش کەم نەبوو، زۆرجار وا رێدەکەوت کارەکە زۆر لەسەرووی توانای ئەسڵزادەو خانەدانەکانەوە دەبوو. جاری وا هەبوو دوو هێندەی کرێکارێکی ئاسایی رەنجمان دەداو ماندوو دەبووین.

بۆ مەڕمەڕ کوتان سێ یان چوار زەلامیان هەڵدەبژارد، ئەم سێ چوار زەلامە بە زۆری پیرەمێرد یان خەڵکی لاوازو بێ توانا بوون — ئێمە لە خانەی ئەوانەدا بووین، ئەم سێ چوار زەلامە دەدرانە دەست زیندانییەکی شارەزای کارەکە. ئێمە بە درێژایی چەندین ساڵ لە ژێر سەرپەرشتی‌و چاودێری یەك کەسدا کە ناوی ئەلمازوف بوو ئەو کارەمان دەکرد. ئەلمازوف پیاوێکی سەختگیری، پیری، دەموچاو تاوەگازی، یەجگار لەڕو لاواز بوو، سەرباری ئەوەش کەمدوو و سەختگیر بوو. لە ناخی دڵەوە رقی لێمان بوو، بەڵام ئەوەندە کەمدوو بوو، ئەوەندە دەم مردوو بوو، تاقەتی نەبوو جنێومان بداتێ یان سووکایەتیمان پێبکات. ئەو جەمەلۆن‌و ساباتەی کارمان لە ژێریدا دەکردو مەڕمەڕمان لە ژێریدا دەسووتاند، کەوتبووە رۆخە هەڵدێرو چۆڵەکەی روبارەکەوە. دیمەنی روبارەکە لە زستاندا زۆر خەمناك بوو، یەکپارچە تەم‌و مژ بوو، کەنارەکەی ئەوبەر زۆر دوور دیاربوو. پیاو کە چاوی بەم دیمەنە چەپەك‌و چۆڵ‌و خەمناکە دەکەوت دڵی دەگوشرا، خۆ کە تیشکی خۆر لەو دەشتە سپیە بێ کۆتاییەی دەدا، هێندەی تر خەمناکی دەکرد. لەو کاتانەدا پیاو خۆزیای دەخواست بەسەر ئەو دەشتە بێ پایانەدا بفڕێ کە لەوبەری روبارەکەوە دەستی پێدەکردو بە درێژی پتر لە ١٥٠٠ فەرسەخ بەرەو باشوور دادەکشا. ئالمازوف عادەتی وا بوو کە بە کڕی‌و کپی، گرژی‌و مۆنی دەکەوتە کار،و ئێمە شەرممان لە خۆ دەکرد کە نەماندەتوانی یارمەتیەکی ئەوتۆی بدەین، بەڵام خۆی بە تەنیا کارەکەی تەواو دەکرد، داوای هیچ یارمەتیەکی لێنەدەکردین، وەك ئەوەی بیەوێ تێمان بگەیەنێ کە دەرهەق بەو کەمتەرخەمین‌و خەفەت لەوە بخۆین کە خەڵکێکی دەست سپی‌و بێ خێرو بێ کەڵکین. هەموو ئیشەکەی ئەلمازوف بریتی بوو لە داگیرساندنی ئەو کوورەیەی کە ئێمە مەڕمەڕەکەمان تێ هەڵدەڕشت.

بۆ رۆژی دوایی کە مەڕمەڕەکە بەتەواوەتی دەسووتا، دەبوایە لە کوورەکەی دەربێنین. هەر کەسەو دەستی دەدایە بێڵچەیەکی قورس‌و سەندوقێکی پڕ لە مەڕمەڕی سووتاو دەکردو بە کەماڵی ئیسراحەت دەکەوتە کوتانی. ئەمە کارێکی خۆش بوو، مەڕمەڕە تورت‌و فشەڵەکە بە ئاسانی لە ژێر زەبری مێکوت و مەجرەفەکانماندا وردو خاش دەبوو، دەبوو بە گەردێکی سپی بریقەدار. مەجرەفە قورسەکانمان بەرز دەکردەوەو بە توندی دامان دەهێنایەوەو دەمانکێشا بە مەڕمەڕەکەداو تا زیاتر ماندوو دەبووین. زیاتر باری لەشمان سووك دەبوو، خوێن لە دەمارەکانماندا خۆشتر دەبزووت‌و گۆناکانمان سوور هەڵدەگەڕا. هەنگێ ئەلمازوف-ش بە خێری خۆی ئاوڕێکی بە سۆزی لێدەداینەوە وەك ئەوەی تەمەشای کۆمەڵە منداڵێکی بچووك بکات. لەم

کاتانەدا دەکەوتە سەبیل کێشان و ڕووی دەگەشایەوەو ڕەزامەندی و ئارامی دەنیشتە سەرسیما،بەڵام وێڕای ئەمەش ئەگەر کەسێك دەمی کردباوە، بە خۆی نەدەوەستاو دەکەوتە پرتەو بۆڵە. ئیدی ئەمە تەبیعەتی بوو، دەتگوت پیرەژنی دۆڕژاوە، دەگەڵ هەموو کەسێکدا هەر وابوو. هەرچەندە لەوە نەدەچوو لە ناخاو بە تەبیعەت پیاوێکی خراپ بێ.

کارێکی دیکەشیان پێ سپاردم، ئەم کارە بریتی بوو لەوەی چەرخی دەزگای خەڕاتیو دارتاشیەکە بابدەم. ئەم چەرخە بەرزو قورس بوو، بادانی ئەم چەرخە کارێکی ئاسان نەبوو، هێزو قوەتێکی زۆری دەویست بە تایبەتی ئەگەر وەستایەکە (لە کرێکارانی کارگەی هێزی ئەندازە بوو) خەریکی دروستکردنی محەجەرەی قاڵدرمەیەك یان قاچی مێزێکی گەورە بوایە کە قەدی دارێکی گەورەی دەویست، چونکە ئەم کارە بە یەك کەس نەدەکرا، بۆیە هەرکاتێ کاری خەڕاتیو دارتاشی هاتبا پێشێ زیندانییەکی دیکەیان بە نێوی ب... لەگەڵمدا دەنارد. ب.... کۆنە خانەدان بوو، چەندین ساڵ بە دوو قۆڵی ئەم چەرخەمان بادا. ب.... گەنجێکی لاوازی کورتە باڵا بوو، حاڵی بە دەست سینگ یەشەوە پەریشان بوو. دەگەڵ دوو کەسی خانەدانی دیکەدا ساڵێك پێش من گیرابوو. یەکێکیان شەوو ڕۆژ هەر خەریکی نوێژ کردن بوو ( زیندانییەکان لەبەر ئەو دینداریەی زۆریان ڕێز دەگرت ). من هێشتا لە زینداندا بووم کە کۆچی دوایی کرد. ئەویتریان لە هەڕەتی لاوی خۆیدا بوو، کوڕێك بوو بە ڕەنگو ڕوو، تۆکمەو بتەو،و بوێرو ورە بەرز، (ب)(١)ی هاوڕێی لە نیوەی ڕێگادا پەکی دەکەوێت، ئەویش پیاوانە دەیدا بە کۆڵیاو مەسافەی حەوت سەد فەرسەخان هەڵیدەگرێت. ئەم دووە دۆستایەتیان زۆر خۆش و بەهێز بوو. (ب) گەنجێکی ئەسڵزادەو بە تەربێتو نەفس بەرزو خانەدان بوو، بەڵام نەخۆشی مگێزی تێکدا بوو و زوو تووڕە دەبوو. جا ئێمە بە دوو قۆڵی چەرخی خەڕاتیەکەمان بادەداو ئەم کارەمان لە گیان خۆش بوو، و ئۆخژنی دەخستە دڵو دەروونمان،و من بە وەرزشێکی زۆر باشم دەزانی.

کاری بەفر ماڵینشم زۆر بەلاوە خۆش بوو، حەزم لێدەکرد . جا کە زستان زریان هەڵیدەکرد، بە تایبەتی کە یەك ڕۆژی تەواو بەردەوام دەبوو، بەفر دنیای دەگرت،و ئەگەر ماڵەکان بە تەواوی ژێر بەفر نەکەوتبان ئەوا بەفر تا پەنجەرەکانیان دەهات. کە زریانەکە خۆشی دەکردەوەو خۆر هەڵدەهات دەیان ناردین بۆ ماڵینی بەفری سەربانی بینا حکوومەتیەکان، بە کۆمەڵ دەیان ناردین، هەندێجار گشت زیندانییەکانیان دەنارد. هەریەکەو بەفر ماڵێکمان هەڵدەگرت،و هەر کەسەو کاری خۆی بۆ دیاری دەکرا، کارەکە ئەوەندە زۆر دەینواند، کەس وێنای نەدەکرد بتوانێ هەمووی تەواوبکات. زیندانییەکان بە شەوقو زەوقەوە دەست بەکاردەبوون. بەفرەکە هێشتا نەمەیی بوو، تەنیا سەرانسەرەکەی بە ئاستەم بەستبووی ئیدی بە کۆمەڵ بەفرەکەمان ڕادەماڵی، بەسەر خۆماندا بڵاومان دەکردەوەو بە دەم هەواوە دەبوو بە بەفرە ژیلکەو بە دەم تیشکی خۆرەوە دەبریقایەوەو پرشنگی دەدا. بێڵچەو بەفرماڵەکان بە ئاسانی لە بەفرەکە ڕۆدەچوون، زیندانییەکان زۆربەی کات بە شەوقو زەوقەوە ئەم کارەیان دەکرد. هەوای ساردی زستان دەی بوژاندنەوەو، کارو چالاکی، گوڕو تینی پێدەبەخشین. هەموو کەسێك هەستی بەخۆشیو شادی دەکرد.

دەنگی پێکەنین‌و گاڵتەو گەپ لێرەو لەویٚ بەرز دەبووەوە. زیندانییەکان دەکەوتنە شەڕە تۆپەڵ، بەلاٚم دوای ماوەیەك زیندانییە بە تەمەن‌و ئەقڵمەندەکان، ئەوانەی حەزیان لە سوعبەت‌و پێکەنین نەدەکرد، تورِە دەبوون، بۆیە زیندانییەکان سارد دەبوونەوەو زۆرجاریش ئەم بەزم‌و خۆشیە بە دەم بۆڵەو شەڕە جنێوان تەواو دەبوو.

ئیدی لێرەوە بەرە بەرە ژمارەی ئاشناو دۆستانم زیادی کرد. ئەلهەقی من لە خەمی دۆست گرتندا نەبووم، چونکە هەمیشە نیگەران‌و پەشێوو دڕدۆنگ‌و بە گومان بووم، حەزم لە تێکەلاٚوی‌و دۆستایەتی نەدەکرد. بەلاٚم ئەم پەیوەندی‌و دۆستایەتیانە خۆبەخۆ دروست بوون، یەکەم کەس کە هاتە سەردانم زیندانییەك بوو بە ناوی پترۆف. بۆیە دەڵێم هاتە سەردانم، چونکە پترۆف لە بەشی تایبەتیدا حەپس بوو، کە کەوتبووە ئەوپەڕی زیندانەکەوە، دوورترین قاوش بوو لە قاوشەکەی منەوە. یانی بەو حیسابە بوایە نەدەبوو هیچ پەیوەندیەکمان لە نێواندا دروست ببیٚ، بە رواڵەت هیچ شتێك نەبوو کۆمان بکاتەوەو لێکمان نزیك بخاتەوە. کەچی پترۆف بە ئەرکی خۆی دەزانی، بەتایبەتی لە رۆژانی هەوەڵی زیندانییەکەمدا، کە هەموو رۆژیٚ بیٚ بۆ قاوشەکەی ئێمەو سەرم لێبدات، یان لەو کاتانەدا کە لە حەوشەی زیندانەکەدا، بە تەنیاو دوور لە چاوی زیندانییەکان پیاسەم دەکرد، بێت بۆ لام‌و دوو قسانم دەگەڵ بکات. لە سەرەتاوە بە مووی لووتم دەزانی، زۆری پیٚ قەڵس و نارِەحەت دەبووم، بەلاٚم ئەوەندە زیرەکانە درێژەی بە سەردانەکانی خۆی دا، کە بەرە بەرە خووم پێوە گرت‌و خەمی دڵی دەڕواندمەوە ئەگەرچی پیاوێکی بێدەنگ‌و کەمدووش بوو. پترۆف کورتە بالاٚ، تۆکمە، بە داروبارِوو گورج‌و گۆڵ‌و بەڕاپەڕ بوو. دەموچاوی لەو دەموچاوانە بوو کە دەچوونە دڵەوە: رەنگ کاڵ، گۆنا زەق، نیگا تیژو زیت، دایمە پارچە تەماکۆیەکی لە دەما بوو و دەیمژی ( گەلێك لە زیندانییەکان خوویان بەو تەماکۆ مژینەوە گرتبوو ). لە تەمەنی خۆی بچووکتر دیاربوو، هەرچەدە تەمەنی چل ساڵان بوو، بەلاٚم کە تەمەشات دەکرد قەت نەتدەگوت لە سی ساڵ زیاترە. سەربەستانە قسەی دەگەڵ دەکردم، زۆر بە نەزاکەتەوە رەفتاری دەگەڵ دەکردم، کە هەستی کردبا، حەزم لە تەنیاییە، دوای دوو سیٚ دەقیقەیەك، سوپاسی لوتفی دەکردم، خودا حافیزی لێدەکردم‌و دەرِۆیی، هەڵبەتە ئەم وێڵ‌و ماریفەتەی دەگەڵ هیچ زیندانییەکی تردا نەدەنواند. پێویستە ئەوەش بێژم کە ئەم پەیوەندییەمان بەو دەقەوە مایەوە، نە لە رۆژانی هەوەڵی زیندانییەکەمداو نە لە سالاٚنی دواتریشدا نەگۆڕا،و قووڵتر نەبووەوە، هەرچەندە ئەو پڕ بەدڵ خۆشی دەویستم‌و دڵسۆزم بوو. تێناگەم پترۆف چ خۆشیەکی بە دۆستایەتی مندا چوو بوو، بۆچی حەزی دەکرد هەموو رۆژێك سەرم بدات. راستە هەندیٚ وردە دزی لێکردبووم، بەلاٚم پێدەچوو بە ئەنقەست ئەمەی نەکردبیٚ، نەخشەی تایبەتی بۆ دانەنابێت. کەچی قەت داوای قەرزی لێنەدەکردم: ئەمە مانای وایە کە بۆ پارە یان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی لە من نزیك نەدەبووەوە.

نازانم بۆچی باوەڕم نەدەکرد کە ئەم پیاوە لە هەمان زیندانی مندا دەژی، بەڵکو لە ماڵێکی تردا، لە شارێکی دوور دوورا دەژی،و تەنیا جارجاریٚ دێت بۆ زیندان تا سەردانی من بکات‌و لە ژیان‌و گوزەرانم بپرسێت‌و ئاگادار بێت، هەمیشە بە پەلە بوو، لە تۆ وایە ژوانی دەگەڵ کەسێکدا هەیە،

کەسێك بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی دەكات، یان كارێكی بە نیوەچڵی بەجێ هێشتووەو دەبێ بە پەلە بگەڕێتەوە سەری و تەواوی بكات. متمانەیەكی سەیر لە چاوانیدا هەبوو، نیگاكردنی سەیر بوو، تەنكە سێبەرێكی بوێری و تەوسی بەسەرەوە دیاربوو. دەیڕوانیە دوور، لە تۆ وایە دەڕوانێتە ئەو دیوی ئەو شتانەی بەردەمی. ئەمە جۆرە حەواس پەرتیەكی پێدا بوو، هەندێجار لە خۆم دەپرسی: باشە ئەم پەلە پەلەی لە چیە، كە لای من دەڕوات، بۆ كوێ دەچێ ؟ ئایا لە شوێنێكی دی چاوەڕوانی دەكەن ؟ ئەوی راستی بێ یان خۆی بە قاوشێك لە قاوشەكاندا، دەكرد یان بە شێنەیی خۆی بە موو بەقەكەدا دەكرد، ئەگەر كوڕی گفتوگۆ گەرم بوایە، لەلای یەكێك لە گفتوگۆكارەكانەوە دادەنیشت و بە وردی گوێی لەگفتوگۆكانیان دەگرت و هەندێجاریش بە گەرمی بەشداری لە گفتوگۆكاندا دەكردو پاشان سارد دەبووەوەو بە بێدەنگی و ئارامی لێی دادەنیشت.
بەلأم چ لە كاتی قسەكردناو چ لە كاتی بێدەنگیدا، هەمیشە وادەهاتە بەرچاو كە بیری لە شوێنێكی ترە، لە شوێنێكی دوورەو لەوێندەر چاوەڕوانی دەكەن. سەیر ئەوە بوو ئەم پیاوە هەرگیز كاری بۆ خۆی نەدەكرد، جگە لە سوخرەو بێگاری زیندان كە بە خۆرتی بەسەریاندا دەسەپاند، هیچ كارێكی تری نەدەكرد، هەموو كاتی خۆی بە دەست بەتاڵی دەبردە سەر. هیچ كارێكی نەدەزانی، بۆیە هەمیشە بێ پارە بوو، تاقە عانەیەكی پێنەبوو، بەلأم ئەمەی لەبەر گران نەبوو. رەنگە بپرسیت باسی چی لەگەڵ دەكردم ؟ وەلأمم ئەمەیە كە قسەكانیشی وەكو خۆی غەریب بوو. بۆ نموونە كاتێ كە دەیبینیم لەپشت زیندانەكەوە بە تاقی تەنیاو بەوپەڕی خەمینی پیاسە دەكەم، خێرا پێچێكی دەكردەوەو بەلەز دوام دەكەوت و بە قسەوە مژولی دەكردم. هەمیشە خێرا دەڕۆیی و، زوو زوو ئاوڕی دەدایەوە. ئەوەتا وا بە پەلە خۆی گەیاندمێ.
– رۆژ باش!
– رۆژ باش!
– ناڕەحەتم نەكردوویت ؟
– نەخێر.
– ویستم شتێكت دەربارەی بوناپورت(٢) لێ بپرسم، ویستم بپرسم ئایا بەخزمایەتی دەگاتە ئەو یارۆیەی كە لە ساڵی ١٨١٢دا هێرشی كردە سەر رووسیا ؟ ( بۆ زانیاری زیاتر پترۆف لە قوتابخانەی سەرەتایی سوپایی خوێندبووی،و خوێندن و نووسینی دەزانی ).
– با، خۆیەتی .
– دەڵێن گوایە سەرۆكە، سەرۆكی كوێیە ؟ و سەرۆكی چیە ؟
پرسیارەكانی پترۆف، هەمیشە بەپەلەو پچڕپچڕ بوون. دەتگوت دەیەوێ بە زووترین كات زۆرترین زانیاری و وەلأمی دەست بكەوێ.
بە گوێرەی توانا پایەو سەرۆكایەتیەكەی ناپلیۆنم بۆ شرۆڤە كردو بە ناخێرم باسی ئەوەشم بۆ كرد كە لەگینە رۆژێ لە رۆژان ببێ بە ئیمپراتۆریش.
پرسی: –چۆن ؟

بەپێی توانا بۆم باسکرد، زۆر بە وردی گوێی لێدەگرتم، بە تەواوەتی لێم حاڵی بوو، و ئەوجا گوێی لیَ هێنامە پێشەوەو گوتی:

- ئا... ئا... ئەلکساندەر پترۆفیچ، دەمویست ئەوەشت لێبپرسم کە ئایا راستە هەندیَ مەیموونان هەن گوایە دەستیان ئەوەندە درێژن دەگەنە پێیانو بالآیان بەقەد بالآی بەشەرە ؟.

- بەڵیَ.

- باشە ئەو مەیموونانە چۆنن ؟

هەرچیەکم لەو بارەیەوە دەزانی بۆم باسکرد.

- ئەو مەیموونانە لە کویَ دەژین ؟

- لە ولآتە گەرمە سێرەکاندا دەژین. هەندێك لەو مەیموونانە لە دوڕگەی سۆمەترا هەن.

- سۆمەترا لە ئەمریکایە، وانییە ؟ دەڵێن خەڵکی لە وێندەر لە سەر سەر دەڕۆن.

- نەخێر. وا نییە... رەنگە مەبەستت ئەوە بیَ کە لە نیوەی دووەمی گۆی زەویدا دەژین. هەر چیەکم دەربارەی ئەمریکاو هەردوو رووی گۆی زەوی دەزانی، بۆم باس کرد، زۆر بە وردی گوێی لێدەگرتم، دەتگوت بە تایبەتی بۆ ئەوە هاتووە پرسیاری هەردوو رووی گۆی زەویم لێبکات.

- ئا... ئا... پار چیرۆکێکم لەمەڕ دۆتمیر دولافالییر خوێندەوە. ئاریفییف ئەو کتێبەی لەلای عەریفەکەمان هێنا بوو. باشە ئەم چیرۆکە راستە یان خەیاڵە ؟ لە نووسینی دومایە.

- نا، ئەمە چیرۆکە، ڕاست نیە، زادەی خەیاڵە .

- زۆر باشە، خودا حافیز، زۆر سوپاس.

هەنگیَ پترۆف رۆیی. ئەلهەقی قسەی هەموو رۆژێکمان هەر هەمان ئەو جۆرە قسانە بوو.

حەزم دەکرد زانیاری زیاتر لەمەڕ پترۆف پەیدا بکەم. (م) کە بەم پەیوەندییەی منی دەگەڵ ئەو پیاوەدا زانی، هەستی کرد لەسەرێتی ئاگادارم بکاتەوە، یەکێك لە قسەکانی ئەوەبوو کە هەوەڵجار هاتووەتە زیندان سڵی لە زۆریان کردووەتەوە، لە گەلێکیان بە گومان بووە، تەنانەت ترساویشە، بەڵام ئەوەندەی لە پترۆف ترساوە، لە کەسی تر تەنانەت لە (گازین)یش نەترساوە.

(م) پێی گوتم:

- پترۆف لە هەر هەموو زیندانییەکانی ئێرە دڕترو بیَ پەرواترو ترسناکترە. لە هیچ شتێك ناپرینگێتەوە. کە کەڵکەڵەیەکی کەوتە سەر ، هێز نیە لە مێشکی دەربکات، هەر جێبەجێی دەکات. ئەگەر لە پڕ هات بە سەریا بتکوژێت، دەتکوژێت. هەر ئەوەندەی زەحمەتە ئەو بیرۆکەیەی بکەوێتە سەر، ئیدی بیَ چەندوچوون، بیَ هیچ ترسو دوودڵییەك ئەنجامی دەدات، کە ئەنجامیشی دا هەست بە هیچ جۆرە پەشیمانیەك ناکات، لەوە دەچیَ شێت بیَ...

ئەم قسەیەی (م)م زۆر بەلاوە گرینگ بوو، زۆرم مەبەست بوو، بەڵام (م)... نەیتوانی بۆمی روون بکاتەوە بۆچی ئەو بۆچوونەی دەربارەی پترۆف هەیە. سەیر ئەوەیە بەدرێژایی چەندین ساڵ، هەموو رۆژیَ ئەم پیاوەم دەبینیو رۆژانە پێکەوە قسەمان دەکرد، زۆریش لەگەڵما بە لوتفو دڵسۆز بوو، هیچ کارێکی نا جۆرم لێنەبینی ( هەرچەندە هۆی ئەمەم نەدەزانی) کەچی وێڕای ئەمەش رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر قەناعەتم بە قسەکانی م... دەهات، هەرچەندە کابرا هەمیشە

هێمن‌و ئاقڵ‌و میانڕەو بوو و قەت ڕەفتارێکی ناسازی لێ سادر نەبوو، ئیدی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر قەناعەتم دەهێنا کە ڕەنگە ئەم پیاوە دڕترین زیندانی ناو زیندانییەکان بێ، بێ باکترینیان بێ، مل بۆ هیچ زەبت‌و ڕەبتێك نەدات. بەڵام بۆچی ؟ وەڵامی ئەو پرسیارەم بۆ هەڵنەدەهات.

پترۆف، هەمان ئەو زیندانییەیە کە کاتی خۆی بۆ ئیمزای سزایەکەی بانگ کرا، ویستی مێجەر بکوژێت، ئەوەم گێڕایەوە کە چۆن مێجەر " بەموجیزات ڕزگاری بوو " چونکە بەر لە ئیمزا کردنی سزایەکە بەدەقیقەیەك ڕۆیی بوو. پترۆف بەر لەوەی بگیرێ‌و حوکم بدرێت سەرباز دەبێت، کۆلۆنیلەکەی لە کاتی مەشق‌و ڕاهێناندا لێی دابوو، پێموایە پێش ئەو کەڕەتە زۆر جاری تریش لێدانی خوارد بوو، بەڵام ئەو ڕۆژە مجێزو حەواسی تەواو نابێت‌و، هیچ تەڵفیسی‌و سووکایەتی‌و لێدانێك قەبووڵ ناکات. ئیدی بە ڕۆژی نیوەڕۆو بە بەرچاوی هەموو ئەندامی کەتیبەکەوە، لە گەرمەی مەشقی سوپاییدا، کۆلۆنێل سەردەبڕێت. هەڵبەتە من هەموو شتێکی ئەم چیرۆکە نازانم، چونکە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم بەسەرهاتەی بۆم نەگێڕابووەوە. هەڵبەتە بە دەگمەن ئەم حاڵەتانەی لێدەهات، مەگەر بەسەریا هاتبا، هەنگێ بەخۆی نەدەوەستا. بەڵام لە حاڵەتە ئاساییەکاندا نەك هەر پیاوێکی ئاقڵ بوو بەڵکو هێمن‌و ئارامیش بوو. بەڵام ئەڵهاو کەڵکەڵە پەنهانەکانی لە ژێلەمۆی ژێر خۆڵەمێش دەچوون.

قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان نەمبینی وەکو زۆربەی زیندانییەکانی دی سینگ دەرپەڕێنێ‌و بە خۆ بنازێت. بەدەگمەن شەڕی دەکرد. جگە لە (سیروتکین) دۆستایەتی کەسی تری نەدەکرد، هەڵبەتە دۆستایەتی دەگەڵ ئەویشدا زۆر گەرم نەبوو، وەختێ دۆستایەتی دەکرد کە پێویستییەکی پێی بوایە. کەچی وێڕای ئەوەش ڕۆژێك دیتم کە زۆر توڕە بووبوو. داوای شتێکی کردبوو و نەیان دابوویە، هەستی بە سووکایەتی کردبوو، ئیدی لەسەر ئەوە دەگەڵ زیندانیەیکی دیدا لێیان بوو بوو بە شەڕ. نەیارەکەی زیندانییەکی باڵا بەرزی تۆکمەی ناو شان پان بوو، لە وەرزشەوانان دەچوو، نێوی ئانتونوف بوو، ئەم پیاوە بە دڕی‌و دڕندەیی‌و شەڕفرۆشی‌و دەم پیسی‌و گۆساخی بە نێوبانگ بوو. ئەمە لە زیندانییە مەدەنیەکان بوو، پیاوێکی ترسنۆك نەبوو. کەوتنە دەنگە دەنگ‌و پێموابوو ئەم شەڕەش وەکو شەڕەکانی دی دەگاتە شەڕە مست‌و بۆکسانێ. کەچی بە پێچەوانەی پێشبینییەکەی منەوە، پترۆف لە پڕ ڕەنگی هەڵبزڕکا، لێوی شین هەڵگەڕاو کەوتە تەتەڵە، هەناسەی تەنگ بوو، بە ئەسپایی لە جێی خۆی ڕابوو، هێندە بە هێواشی کەوتە ڕێ کە گوێت لە دەنگی پێی نەدەبوو ( پترۆف هاوینان حەزی دەکرد بەپێخاوسی بگەڕێ ) هێدی هێدی بەرەو ئانتونوف ڕۆیی، زیندانییەکان کە لە بەینی خۆیاندا مژۆلی پێکەنین‌و قسە کردن بوون، لە ناکاو بێدەنگ بوون، بێدەنگیەکی ئەوتۆ باڵی بەسەراکێشان ئەگەر دەرزییەك بکەوتبایە سەر عاردی گوێت لە دەنگی دەبوو. هەموو زیندانییەکان چاوەڕوانی ئەوە بوون لە پڕ بقڵیشێتەوە. ئانتونوف، ڕەنگی بوو بوو بە جاوی سپی، بەرەو نەیارەکەی گوڕی بەستەوە. تەحەمولی ئەم دیمەنەم نەکرد، لە قاوشەکە وەدەرکەوتم، دڵنیا بووم پێش ئەوەی بگەمە قاڵدرمەکان، گوێم بە دەنگی هاواری کەسێك دەزرینگێتەوە کە دێتە سەر بڕین. بەڵام ئەو شتە ڕووی نەدا، پێش ئەوەی پترۆف بگاتە ئانتونوف، ئەو شتەی بۆ هەڵدا کە شەڕیان بوو لەسەری ( شتەکەش پەڕۆ شڕەیەك

بوو، کۆنه ئەستەڕێکی رزیو بوو ). ئانتونوف، دوای دوو دەقیقەیەك، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە ترسنۆك نیەو گلەیی خەڵکی نەیەتە سەر پترۆڤ بەر دەمرێژی جنێوان دا. بەڵام پترۆف نە گوێی بە جنێوەکانی داو نە وەڵامی دایەوە، گرینگ ئەوەیە بە مەبەستی خۆی گەیی، جنێوی بەلاوە هیچ نیە، گرینگ ئەوەیە پەرۆ شڕەکەی خۆی، دەست کەوت... دوای یەك چارەکە سەعات، وەکو هەمیشە وێڵ‌و بێکار، بێ خەم‌وخەیاڵ بەقاوشەکەدا دەسوڕایەوەو، لە کەسانێك دەگەڕا قسەیەکی خۆش یا نوکتەیەکیان لێ بژنەوێ. زۆر سەر قاڵ‌و مژول دەینواند، کەچی وێڕای ئەوەش زۆربەی کات خەمساردو بێ موبالات بوو، وێڵ‌و سەرگەردان، بێ هیچ مەبەست‌و ئامانجێك بە تاڵ‌و حەتاڵ لێرەو لەوێ دەسوڕایەوە. وەکو کرێکارێکی زۆر بە تواناو کارامە دەهاتە بەرچاو، کرێکارێك کە ئیشوکار لەبەریا بلەرزێ‌و خۆی نەگرێت، لەو دەمەدا کە کار چاوەڕوانی بێت تا هێزو بازووی خۆی بخاتەکار، بچێت دەگەڵ منداڵانی بچووکدا گەمە بکات.

تێنەدەگەییشتم بۆچی هەڵنەدەهات ؟ دڵنیام ئەگەر بیویستایە کاری وابکات، دەیتوانی بیکات، بۆ ئەو وەکو ئاو خواردنەوە وابوو. چونکە خەڵکی وەکو پترۆف لە دەستەڵاتی ئاوەزو ئەقڵ بەدەرن، مەگەر خۆیان شتێکیان نەوێ، دەنا هەر کەڵکەڵەو خولیایەکیان بکەوێتە سەر، بێ بیرکردنەوە ئەنجامی دەدەن. من دڵنیام ئەگەر بیویستایە هەڵێت، دەیتوانی زۆر زیرەکانە هەمووومان فریوو بدات،و بۆ ماوەی هەفتەیەك یان چەند هەفتەیەك خۆی لە بێشەیەکدا یان لە قامیشەڵانی کەنار روبارەکەدا وەشێرێت‌و بەبێ خۆراك هەڵبکات. ئیدی یان ئەم بیرۆکەکەی بە مێشکدا نەهاتبوو یان خۆی حەزی نەدەکرد لە زیندان هەڵێت. تواناو بەهرەی بڕیاری دروستم تیایا نەدەبینی. خەڵکانی وەکو پترۆف لەگەڵ بیرۆکەو تەبیعەتێکدا لە دایك دەبن‌و ئەم بیرۆکەیە بە درێژایی ژیان بە راست‌و بە چەپا دەیان خولێنێتەوەو بەو جۆرە، خۆبەخۆ دەخولێنەوە تاتووشیان دەبێ بە تووشی شتێکەوەو ئارەزوویەکی توندیان لەلا بێداردەکاتەوە. کە تووشی ئەو شتە بوون‌و ئارەزوویان بزوا، ئیدی بۆی دەچن ئەگەر سەریشیان لە پێناوی ئەو شتەدا داناوە. هەندێجار سەرم لەوە سوڕدەما چۆن پیاوێك کە لەسەر لێدانێکی ئاسایی کۆلۆنێلەکەی خۆی کوشتبوو، بەو ئاسانیە، بێ دەربڕینی هیچ ناڕەزاییەك مل دەدات‌و پاڵ دەکەوێ بەر شەلاقان بدرێ‌و فەلاقە بکرێت. پترۆف وەکو هەموو ئەو زیندانییانەی کە هیچ ئیشێکی تایبەتیان نەبوو، مەشرووباتی بە قاچاغ دێنایە ناو زیندانەوە، کە کاتێ بە مەشرووبی قاچاغەوە دەگیرا، فەلاقە دەکراو دەگیرایە ژێر قامچی‌و شەلاقان. جا پترۆف زۆر بە ئاسانی، وەکو ئەوەی بەم سزایە قاییل بێ، وەك ئەوەی دان بە تاوان‌و خەتای خۆیدا بنێ، ملی بۆ فەلاقەو جەڵدە دەدا. یەکێك لە خووە سەیرەکانی پترۆف ئەوە بوو سەرباری ئەوەی خۆشی دەویستم‌و رێزی دەگرتم، زۆرجار دزی لێدەکردم. رۆژێك تەوراتەکەی لێدزیم، تەوراتەکەم دایێ کە بۆم بخاتە شوێنی خۆی، شوێنی تەوراتەکە تەنیا چەند شەقاوێك لێوەی دوور بوو، خێرا لە مەودای ئەو چەند هەنگاوەدا یەکێکی پەیدا کردو تەوراتەکەی پێفرۆشت.وخێرا پارەکەی دابوو بە مەشرووب، وا دیارە لەو کاتەدا زۆری حەز لە مەشرووب کردووەو خۆی پێ کۆنترۆڵ نەکراوە... ئیدی پترۆف پترۆفە بە شەرت، کە شتێك دای لە کەللەی هەر دەبێ بیگاتێ‌و بیکات. پترۆف ئامادەبوو لە پێناوی ٢٥ کۆپیکدا

زەلامێك بكوژێت، بۆ هیچ نا تەنیا بۆ ئەوەی ئەو پارەیە بدات بە نیو قاپ مەشرووب و بیخواتەوە. لە غەیری ئەم حاڵەتانەدا پارەی بە هیچ نەدەزانی، سەدان هەزار رۆبڵ لەو گۆڕە بکەوتایە بێزی نەدەهات دەستی بۆ ببات. هەر ئەو شەوە هاتە لام و بەبێ کەمترین پەشیمانی یان شەرمەزاری وەك ئەوەی کارێکی زۆر ئاسایی کردبێت دانی بە دزیەتیەکەیدا نا، ویستم بە توندی سەرزەنشتی بکەم، چونکە زۆرم داخ بۆ تەوراتەکەم خوارد، کەچی هەر خۆشی شێلو نەکرد، زۆر بە هێمنی و ئارامی گوێی لە سەرزەنشتەکانم گرت، و قەناعەتی تەواوی بەوە هەبوو کە تەوراتەکە بۆ من زۆر بە کەڵك و بە سوود بوو، زۆری سوو لەوە خوارد کە لە دەستی منی کردووەتەوە، بەڵام هیچ پەشیمان نەبوو لەوەی کە دزیویەتی، هێندە بە متمانەوە لێی دەڕوانیم، ناچار وازم لە سەرزەنشتی هێنا. پێموایە بۆیە ئەو هەموو سەرزەنشتەی لێ قەبوڵ کردم چونکە دەیزانی کارێکی نەشیاوی کردووەو شایستەی ئەو سەرزەنشتەیەو هەقی خۆمە سەرکۆنەی بکەم و جنێوی پێبدەم تا داخی دڵی خۆم هەڵڕێژم. بەڵام لە ناخی خۆیدا هەموو ئەم شتانەی بە تووڕەهات و بێبایەخ دەزانی،و پێی وابوو خەڵکی جدی شەرم دەکەن هەر باسیشی بکەن، بگرە لە دڵی خۆیدا گاڵتەی پێدەکردم و بە منداڵێکی گێلۆکەی بەستەزمانی بێئاگا لە سادەترین کاروباری ئەم دنیایەی دەزانیم. ئەگەر جگە لە باسی کتێب و زانستان، باسی شتی ترم لەگەڵ کردبا وەڵامی دەدامەوە. بەڵام وەڵامدانەوەکەی تەنیا لە رووی ئەدەبەوە بوو، بۆیە وەڵامەکانی زۆر کورت بوون، زۆر جار لە خۆم دەپرسی: بۆچی ئەوەندە حەزی لێیە باسی کتێبانم لێبپرسێت ؟ بەدەم قسانەوەو بە دزییەوە تەمەشام دەکرد تا بزانم ئاخۆ پێم ڕانابوێرێ، گاڵتەم پێناکات، بەڵام دەمبینی زۆر بە جددی و بە وردی گوێم بۆ ڕادەدێرێ، بەڵام زۆرجار ئەم جدیەتە زۆری نەدەخایاند،و خەیاڵی دەڕۆیی و حەواسی پەرت دەبوو، هەندێجار بەمە قەڵس و تووڕە دەبووم. ئەو پرسیارانەی لێی دەکردم هەمیشە روون و وردو ئاشکرا بوون. وەڵامەکانیشی بەلاوە گرینگ نەبوون... لەوە دەچوو قەناعەتی تەواوی بەوە هێنابێ کە من کەسێکم جیاواز لە خەڵکانی دی و نابێ بە هەمان زمان بێمە دواندن کە خەڵکانی تری پێ دەدوێنرێ،و حەزم لە هیچ قسەو باسێك نیە تەنیا ئەو قسەو باسانە نەبێ کە دەربارەی کتێبن، واتە جگە لە باسی کتێبان لە هیچی تر تێناگەم.

من دڵنیام کە پترۆف خۆشی دەویستم. ئەمەم زۆر بەلاوە سەیر بوو. ئایا بە منداڵی دەزانیم ؟ ئایا بە گەورەیەکی منداڵی دەزانیم! ئایا وەکو چۆن کەسێکی بەهێز بەزەیی بە کەسێکی لە خۆی بێدەسەڵات تردا دێتەوە بەو ئاوایە بەزەیی پێمدا دەهاتەوە ؟ ئایا بە هینی دەزانیم... نازانم! دڵنیام کە بەزەیی پێمدا دەهاتەوە، کەچی وێڕای ئەوەش دزی لێدەکردم. هەڵبەتە کە دزی لێدەکردم لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "داماوە! چ پیاوێکی سەیرو بێدەسەڵات و غەریبە! ناتوانێ شتەکانی خۆشی بپارێزێت". پێموایە لەبەر ئەوە خۆشی دەویستم. جارێکیان، وەك بڵێی لە دەمی دەرچوو، پێی گوتم:

– ئەلکساندەر پترۆفیچ تۆ باشیت کردووە بە گاڵتەی منداڵان، یانی ئەوەندە باشی ناخۆشت کردووە، ئەوەندە سادەو ساویلکەی بەڕاستی پیاو بەزەیی پێتدا دێتەوە! دوای دەقیقەیەك لەسەری ڕۆیی:

– ئەلکساندەر پترۆفیچ، قسەکەم بە خراپ وەرمەگرە، لێم زویر مەبە. ئەم قسەیەم لە دڵسۆزیە ها....

پیاو هەندێجار لە ژیاندا خەڵکانی وەکو پترۆف دەبینیٚ کە لە ساتەوەختێکی نیگەرانیدا یان لە ساتەوەختێکی هەڵچووندا دەردەکەون و خۆ دەنوێنن،و پاشان دەکەون بەسەر چالاکی دڵخوازی خۆیانداو ئەو کارە دەدۆزنەوە کە دەگەڵ تەبیعەتیاندا دەگونجێت. ئەو جۆرە پیاوانە پیاوی قسەو تیوریان نین، ناتوانن خەڵکی هانبدەن یان ڕێبەرایەتی و سەرکردایەتی شۆڕش بکەن، بەڵام خەڵکانێکی ئیشکەرو جێبەجێکارن، زۆر بەسادەیی، بیٚ هیچ خوتەو بۆڵەیەك، بەکرِی کاردەکەن، لە پێشی پێشەوە بەسەر لەمپەرو سەنگەراندا دەدەن، لە پێشەوە هێرش دەبەنە سەر مەتەرێزان، بە سینگی ڕووتەوە پێشڕەوی دەکەن، نە بیردەکەنەوەو نە لە هیچ شتیٚ دەترسن، خەڵکی هەموو، کوێرانە دوایان دەکەون، تا دەگەنە شورەو دیواران کە لەوێدا عادەتەن دەکوژرێن و تیا دەچن. باوەڕ ناکەم خێر هاتبێتە ڕێگەی پترۆف: چونکە ئەو سەرە سەری خۆی نەبوو، خۆ ئەگەر تا ئێستا نەمرد بیٚ، لە پیاوەتی و ئاقڵی خۆی نیە، هی ئەوەیە ڕێنەکەوتووە، تووشی مردن نەبووە. بە هەر حاڵ کیٚ دەزانیٚ ؟ لەوەیە پاش ئەوەی بێکارو سەرگەردان، بیٚ مەبەست و ئامانجان، ئێرەو ئەویٚ، دنیا تەی دەکات، تەمەنێکی زۆر بکات، پیری پیر ببیٚ و ئەوجا زۆر بە ئیسراحەت و ئارامی بمرێت. بەڵام من پێموایە کە (م)... ڕاستی دەکرد، پترۆف لە هەموو زیندانییەکان دڕتر، بیٚ پەرواتر، بێباکتر، سەختگیرتر، لە خۆبایی ترو سەرکێش تر بوو.

***پەراوێز:***

*١– "ب....": ناوی جوزیف بوگوسلافسکییە، شۆڕشگێڕێکی پۆڵاندی بوو.*

*٢– "پوناپۆرت": مەبەست لە لویس ناپلیۆن پوناپۆرتە کە لە ١٠/ك١/١٨٤٨دا بەسەر کۆماری فەرەنسا هەڵبژێردرا.*

## لۆقا

قسەکردن لەسەر خەڵکانی ئولولعەزم قورسە. ئەمانە چ لە زیندان‌و چ لە شوێنانی دی کەم‌و دەگمەنن، پیاو هەر بە هەیبەت و سامداریەکەیاندا دەیناسێتەوە، سام دەخەنە دڵەوە، خەڵکی بە پارێزەوە مامەڵەیان لە تەکدا دەکەن. لە هەوەڵەوە هەستێکم لەلا چێبوو کە خۆم لەو جۆرە پیاوانە دووربگرم، توخنیان نەکەوم. بەڵام پاشان رەئی خۆم نەك هەر دەرهەق بەوانە بەڵکو دەرهەق بە بکوژانی خوێنرێژی ترسناکیش گۆڕی. پیاوانێك هەن قەت رۆژێ لە رۆژان دەستیان نەچووەتە خوێن، کەسیان نەکوشتووە، بەڵام زۆر لەوانە دڕو دڕندەترن کە شەش کەسیان کوشتووە. هەندێ تاوانان هەن بە شێوەی ئەوەندە سەیرو غەریب ئەنجام دراون، کە پیاو ناتوانێ تەسەوری بکات، باوەڕی پێبکات، بۆیە ئەو قسەیە دەکەم چونکە ئەو تاوانانەی ئەندامانی کۆمەڵ دەیانکات، زۆر جار لەسەر شتی زۆر هیچە، لەسەر شتی ئەوتۆیە پیاو سەری سوڕدەمێنێ.

ئێستا باسی بکوژێکتان بۆ دەکەم کە نموونەی زۆرن: ئەمە پیاوێکە هێدی و هێمن، لاشەڕو بێوەی، بەڵام ئیدی قەدەرو چارەنووسی زۆر سەخت‌و دژوارە، هەست بە ئازارو غەزاب دەکات ( بۆ نموونە وەرزێرەو لە کێڵگەیەکدا کاردەکات، یان مسکێنەو بە نۆکەری گیراوە یان یەکێکە لە خەڵکی شار یان سەربازە لە سوپادا ) لە پڕ دێت بەسەریا، چیکڵدانەی تەنگ دەبێ و بەخۆی ناوەستێ، دەست دەداتە کێردو لە سینەی چەوسێنەرەکەیدا ختمی دەکات، لە سینەی ئەو کەسەدا کە دژایەتی دەکات، پاشان رەفتاری ئەم پیاوە دەگۆڕێت، دەبێ بە رەفتارێکی نە شازی سەیرو هەموو سنوورێك دەبەزێنێ. ئەمە نەیارەکەی یان چەوسێنەرەکەی کوشت، هەڵبەتە ئەوە تاوانە، بەڵام ئەنگێزەو پاکانەو شرۆڤەی خۆی هەیە، هۆیەك بۆ ئەو کارەی هانداوە. بەڵام دوای ئەوە، ئیدی ئەو پیاوە تەنیا نەیارەکانی ناکوژێت ، بەڵکو هەر مرۆڤێك دەکوژێت، هەرکەسێکی بێتە رێ دەیکوژێت، کوشتن دەکا بە پیشە، لەزەتی لێدەبینێ، کوشتن لە پێناوی کوشتندا ئەنجام دەدات. لەسەر قسەیەکی بچووك لەسەر مۆڕەیەك پیاو دەکوژێت. بۆ کەیف، بۆ ئەوەی ژمارەی کوژراوەکانی زیاتر بکات ، دەکوژێت. یان جاری وایە تەنیا بۆ ئەوە دەکوژێت کە بڵێ: "لاچۆ لە رێم". ئیدی وەکو سەهەندەیەکی سیا مەست رەفتار دەکات، کار دەگاتە ئەوەی هەموو سنوورێك دەبەزێنێ، هیچ پیرۆزو پیرۆزییەکی لەلا نامێنێ: لەوەیە بە خۆیشی سەری لەمە سوڕبمێنێ. ئیدی سنووری هەموو یاساو رێساو دەسەڵاتێك دەبەزێنێ، ئەوپەڕی ئازادی بەخۆی دەدات، لەزەت لە لێدانی دڵی خۆی دەبینێ، لەو ترسەی هەستی پێدەکات، لەو سامەی هەستی پێدەکات. چاك دەزانێت سزایەکی ترسناك چاوەڕوانیەتی، رەنگە هەستەکانی لە هەستی ئەو کەسە بچن کە حەزدەکات لە ترۆپکی بورجێکەوە بەسەر سەرا خۆی هەڵبداتە هەڵدێرێکی هەزار بە هەزارەوە تا بەزووترین کات رزگاری ببێت. ئەمە لە خەڵکانێك روو دەدات کە لا شەڕترین‌و بێوەی ترین خەڵکن. هەڵبەتە نموونەی ئەم هەڤدژیە زۆر بەرچاو دەکەوێ: زۆرجار خەڵکانێك دەبینین چەوساوەو سەرکوت کراو بوون، کەچی کاتێ دەزانی هەر ئەوانەی تا دوێنێ چەوساوە

بوون لە هەموو کەس سوورترن بۆ چەوساندنەوەو ترساندن‌و تۆقاندنی خەڵکی دی، وەك ئەوەی بیانەوێ تۆڵەی خۆیان بکەنەوە. هەندێجار ئینسانێکی نائومێدی شەڕانی سەرکێشی گیان لەسەر دەست دەبینین لەزەت لە ترساندن‌و تۆقاندنی خەڵکی دەبینێ، لە رووی نا ئومێدییەوە دەست دەداتە کاری شێتانەو زۆربەی کاتیش چاوەڕوانی سزایەو خواخوایەتی بگیرێت‌و کێشەکەی ببڕیتەوەو چارەنووسی یەکلایی ببێتەوە، چونکە هەست دەکات ئەم باری نائومێدیە لەوە قورسترە بە تەنیا پێی هەڵبگیرێت. سەیر ئەمەیە کە ئەم هەڵچوون‌و سەرکێشی‌و زێدەگاڤی‌و ستەمکارییەی تا ئەو رۆژەی بە سزای خۆی دەگا لەلا دەمێنێ. کە بە سزای خۆی گەیی، کە گیرا دەبێ بە ئاشی ئاو لێکەوتوو، وەکو ئەوەی سزایەکە سنوورێك بۆ عەزابەکەی دابنێت، لە پڕ ئارام دەبێتەوە، دەکوژێتەوە، دەبێ بە ماستی مەیبوو، دەبێ بە پارچە پەڕۆیەکی شیبووەی ریزاڵ ریزاڵ، بەجارێ نەترە بەردەدات‌و هەرەس دێنێ. داوای بوردن لە خەڵك‌و خوا دەکات، دەپاڕێتەوە، کە دەگاتە بێگارەزیندان دەگۆڕێت، دەبێ بە کەسێکی تر، کەس باوەڕ ناکات، ئەم کابرایەی کە لە مریشکی ئاوەڕووت کراو دەچێ، پێنج شەش پیاوی کوشتبێ.

لە نێو ئەو تاوانبارانەدا خەڵکانێك هەن زیندان بە ئاسانی ڕامیان ناکات، جۆرە فڕناخی‌و خۆپەسندییەکیان لەلا دەمێنێ،و زۆرجار بە خۆ دەنازن‌و لاف‌و گەزافی گەورە لێدەدەن، جاری وایە گوێت لە فیشاڵی زل دەبێت بۆ نموونە یەکێك دەڵێت: "گوێ بگرە ها، چما تۆ من بە چی دەزانی! حەوت روحم، حەوت روح، رۆحێکم لێرەیەو شەشم لەو دنیایە!" بەڵام ئەوانە هەمیشە لە ئەنجامدا مل دەدەن‌و ڕام دەبن. ناو بە ناو بەوە دڵخۆشی خۆ دەدەنەوە کە یادی سەرکێشی‌و ریسککاریە شێتانەکانی خۆیان دەکەنەوە، لەو کاتانەدا حەزدەکەن گوێگرێکی سادەو ساویلکە پەیدابکەن‌و خۆیانی لەبەر دەمدا هەڵکێشن،و بە کارەکانیانەوە بنازن، ئیدی دەکەوێتە گێڕانەوەی کارەکانی بۆ یارۆی ساویلکەو واش دەنوێنێ کە نایەوێ گوێگرەکەی سەرسام بکات‌و بەوە قسەکەی دەبڕێتەوە کە دەڵێت: "من ئەوە بووم!" مەگەر هەر خوا بزانێ ژێراو ژێرو بە پارێزەوە بە چ ئاو وتارێك گوزارشت لە غرووی خۆی دەکات. جا چەند وەستایانە خۆی لە ژێر پەردەی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەدا دەشارێتەوەو وا دەنوێنێ گوایە خۆی پێوە هەڵناکێشێ! لە حاڵێکا خۆ هەڵکێشان‌و لاف‌و گەزاف بە زمانیەوە، بە هەموو وشەیەکیەوە دیارە، بەڵام دەزانێ چۆن لە پەردەی تەوازعییەوە دەپێچی! تۆ بڵێی ئەو خەڵکە ئەم هەموو شتە لە کێوە فێر بووبن ؟

شەوێك لە شەوە درێژەکانی، رۆژانی هەوەڵی زیندانیەکەم گوێم لە حیکایەتێکی لەم جۆرە حیکایەتانە گرت، لەبەر کەم ئەزموونی خۆم، وام تەسەورو وێنا دەکرد، یارۆی حیکایەتخوان تاوانبارێکی یەجگار لە زەبرو وەرە پۆڵایینە،و بە جۆرێ خۆی هەڵدەکێشا خەریك بوو (پترۆف)م لەبەرچاو دەکەوت. یارۆی حیکایەتبێژ ناوی لۆقا کوزمیچ بوو، ئەمە هەر بۆ کەیفی دڵ ئەفسەرێکی بە پلەی مێجەر کوشتبوو. ئەم لۆقایە لە هەموو زیندانییەکانی قاوشەکەی ئێمە کورتە باڵاترو ریوەڵەو لاوازتر بوو، لە باشوور لە دایك بوو بوو، لەو مسکێنانە بوو کە لە کێڵگەدا کار ناکەن‌و لە ماڵی ئاغاکانیاندا خزمەتکاری دەکەن. فڕناخی‌و لووتبەرزییەکی سەیری تیابوو، وەك دەڵێن تەیرێکی چکۆلە بوو، بەڵام دەنووك‌و چنگاڵی هەبوو. زیندانییەکان بە هەست‌و

غەریزە خەڵکیان دەناسی، دەماری پیاویان دەناسی، هەرچەندە لۆقا توندو تیژ بوو، بەڵام زیندانییەکان حیسابێکی ئەوتۆیان بۆ نەدەکرد. کابرایەکی موزیڕ، لە خۆبایی، بەرزە فڕو فڕناخ بوو. ئەو شەوە لەسەر چەرپاکەی خۆی دانیشتبوو،وخەریك بوو کراسێکی دەدروو، لۆقا بەرگدروو بوو، زیندانییەکی دیکە بە نێوی "کوبیلین" لە نزیکیەوە دانیشتبوو، کوڕێکی گەنجی کەتەی بە داروباری خۆش تەبیعەت بوو، بەڵام گێلۆکەو گەوج و کەم ئاوەز بوو. لۆقا زۆرجار دەگەڵ ئەم هاوسێیەیدا بە شەڕ دەهات و سەرزەنشتی دەکردو خۆی بە سەریا دەنواندو گاڵتەی پێدە کردو وەکو کۆیلە مامەڵەی لە تەکدا دەکرد، بەڵام کوبیلین لەبەر دڵپاکی و ساویلکەیی خۆی هەستی بەمە نەدەکرد. لەو کاتانەدا گۆرەوییەکی بە دەستەوە بوو،و بەدەم گۆرەوی چنینەوەو لامسەرلایی گوێی لە لۆقا دەگرت، لۆقا بە دەنگی بەرز قسەی دەکردو حیکایەتەکەی دەگێڕایەوە. هەڵبەتە دەیویست سەرنجی هەموو خەڵکەکە راکێشی و ئەوانیش گوێیان لێی بێ، هەرچەندە وای دەنواند تەنیا قسە بۆ کوبیلین دەکات. بە دەم تەقەڵ و درومانەوە گوتی:

– بەو جۆرە لە زێدو زاگەی خۆم وەدەرنرام برای ئازیزم.

کوبیلین پرسی:

– دەمێکە ؟

– کە پۆڵکەو گاگۆزان پێ بگات دەکاتە ساڵێك. کە گەییشتنە (ك..ف) لە زیندانیان پەستاوتم. لەوێ خۆم لە نێو دەستەیەك پیاودا بینییەوە کە هەموویان خەڵکی رووسیای بچووك بوون، تا بڵێی کەتەو زەلامو تەندوستو بەهێز بوون، هێندە قەڵەو بوون دەتگوت مانگان... بەڵام زۆر هێدیو هێمنو حیزەڵە بوون... ئەو خواردنەی دەماندرایە زۆر خراپ بوو... مێجەر وەکو حەیوان مامەڵەی لەتەکدا دەکردن... رۆژێ دوان تێپەڕی... سەیرم کرد ئەوانە زۆر بودەڵەو ترسنۆکن... پێمگوتن: "باشە ئێوە بۆچی زیرەتان لەم حەیوانە کردووە؟...". گوتیان: " دەی فەرموو ئەگەر دەتوانی تۆ قسەی دەگەڵ بکە!" ئەو حەیوانانە دەستیان بە پێکەنین کرد، گاڵتەیان بە ئەقڵم دەهات. بێدەنگ بوومو هیچم نەگوت.

ئەوسا یارۆی حیکایەت بێژ، کوبیلینی فەرامۆش کردو ڕووی دەمی کردە هەمووان :

– پیاوێکی خەڵکی رووسیای بچووکیان تیا بوو تا حەزکەی بودەڵەو هیچو پوچو قەشمەر بوو، ئەمە رووی دەمی تێکردنو کەوتە گێڕانەوەی ئەوەی کە چی بە قازیو دادوەرەکان گوتووە، چۆن لەبەریان پاڕاوەتەوە، چۆن رووپامایی بۆ کردوونو گوتویەتی ژنو منداڵی هەن. پیاوێکی کەتەو زەلامی سەر سپی بوو. کابرا لەسەر حیکایەتەکەی بەردەوام بوو، بۆ هاوڕێکانی باسکرد کە چۆن سەگێك لەوێندەر بووەو پەیتا پەیتا هەر دەینووسیو دەینووسی... هەر هەموو ئیفادەکانی ئەوی دەنووسیو، چۆن ئەوی تۆمەتبار پێی گوتووە: "دەك خوا بتکوژێ..."و چۆن ئەو جوابی نەداوەتەوەو لەسەر نووسینی خۆی بەردەوام بووە...وکابرا بەوە کۆتایی بە قسەکانی هێنا گوتی: "بەو جۆرە کڵاوم تێنا، سەرم تیاچوو...!"

– ئادەی فاسیا(١) گیان دەزوویەکی ترم بدەیە، ئەم دەزووە قرچۆکە .

فاسیا دەزوویەکی تری دایەو گوتی:

– هانێ، ئەم دەزووە لە بازاڕ کردڕاوە.

– دەزووی کارگەکە باشە. تۆزێ لەمە پێش (نیفالید)مان نارد لە کارگەکە دەزوومان بۆ بکڕێت، نازانم لای چ ئافرەتێکی سووك ئەم دەزووانەی کڕیوە، دەزوویەکی خراپە، قرچۆکە.

لۆقا بەدەم ئەو قسەیەوەو لەبەر رووناکی چرایەکە دەزووەکەی بە کونی دەرزییەکەوە دەکرد.

– دەبێ لای دۆستەکەی خۆی کڕیبێتی.

– بێگومان لە دۆستەکەی خۆیی کڕیوە.

کوبیلین، کە تەواو فەرامۆش کرابوو و بیر چوو بووەوە هەڵیدایێ:

– نەمانزانی مێجەر چی بەسەرهات ؟

لۆقا، لە خودای دەویست ئەو پرسیارەی لێبکرێ. کەچی وێڕای ئەوەش نەیویست یەکسەر دەست بەگێڕانەوەی واریقاتەکە بکاتەوە، وای دەنواند کە گوێی لە کوبیلین نەبووە. بە ئەسپایی کەوتە تەقڵ لێدان و پاشان بە ئەسپایی خۆی چاك کردو بە چوارمشقی لێی دانیشت و بەردەوام بوو:

– ئیدی هاوڕێ بودەڵەکانی خۆم هاندا تا بنێرن بە دووی مێجەردا. جا ئەو بەیانییە کێردێکم لە دراوسێکەم بە ئامانەت وەرگرت و بۆ کاتی مەباداو تەنگانە شاردمەوە. مێجەر هات. دەتگوت سەگی هارە، لا لا مووی دەکرد. بە دزییەوە پێمگوتن: " کوڕینە، ئەی خەڵکانی رووسیای بچووك ئەمڕۆ رۆژی ترس نیە، مەترسن." لێ فایدەی نەبوو! لە ترسا روحیان پێنەبوو، وەکو شەقشەقە دەلەرزین. مێجەر بەوپەڕی مەستی خۆی بە ژووردا کرد. گوتی: " ها، بۆچی لە دووتان ناردووم؟ چۆن زاتتان کردووە... چی قەوماوە...؟ من تزاری ئێوەم، من خوای ئێوەم"، کاتێ کە گوتی تزاری ئێمەیە ، خوای ئێمەیە، لێی نزیك کەوتمەوە، کێردەکەشم لە قۆڵی کراسەکەمدا شاردبووەوە، زیاتر لێی نزیك بوومەوەو گوتم: " نەخێر جەنابی پایەبەرز... شتی وا نابێت سەروەری پایەبەرز... ببوورە، ناشێت لە هەمان کاتدا هەم تزارو هەم خوداش بیت." مێجەر هاواری کرد: " کەواتە... تۆ سەردەستەو هاندەری ئەمانەیت..." زیاتر لێی نزیك بوومەوەو گوتم: "نەخێر جەنابی پایەبەرز، من سەردەستەی یاخیان نیم. بەڵام هەم تۆو هەم ئێمەش ئەوە دەزانین کە هەموومان یەك خوامان هەیە، خوایەك کە شەریکی نیە... یەك تزارمان هەیە کە خودا بۆی هەڵبژاردووین، بەڵام تۆ جەنابی پایەبەرز تەنیا مێجەریکیت و بەس.... لەساو پەنای تزارو بە فەزڵی تزارو بەگوێرەی بەهرەو توانای خۆت لێرە سەرۆکی ئێمەی ."

مێجەر، لە توڕەیی و حەژمەتاندا کەوتە دەمەلاڵکێ، لە داخا نەیدەتوانی قسان بکات. گوتی: "چی؟ چی؟ چی؟". گوتم: "هەر ئەوەیە". هەنگێ پڕم دایەو کێردەکەم تابن کرد بە ورگی دا! دوای تۆزێ بەلادا هات، وەرسوڕایەوە بە پشتا تەختی زەوی بوو. ئەوسا چەقۆکەم توڕداو بە هاوڕێکانم گوت: "دەیسا هاوڕێیان ئێستا هەڵیگرن!".

جا ئێستا تۆزێ لە باسەکەم دوور دەکەومەوەو دەڵێم زۆر بە داخەوە لەو سەردەمانەدا دەستەواژەی وەك "من تزارتانم، من خواتانم"و زۆری تری لەو بابەتە دەستەواژانە بەکار دەهات. گەلێك لە ئەفسەرەکان بەکاریان دێنا. هەڵبەتە دەبێ دان بەوەدا بنەین کە ئێستا ژمارەی ئەو

کەسانەی ئەو جۆرە دەستەواژانە بەکاردێنن زۆر کەم بووەتەوەو بگرە کەس بە کاری نایەنێ. ئەوەی مایەی سەرنجە ئەو خەڵکانەی کە ئاوا بە خۆ دەنازین‌و ئەو جۆرە قسانەیان دەکرد، زیاتر ئەو دەرەجەدارانە بوون کە بۆ پلەی ئەفسەر بەرزکرابوونەوەو هەوای پلەو پایەی تازە لە کەللەی دا بوون‌و خۆیان لێگۆڕا بوو. ئەوانە چونکە زۆریان پێکرابوو، و زەحمەتی زۆریان کێشا بوو، کە لە پڕ دەبوون بە ئەفسەرو فەرماندەو لەقەبی خانەدانیان وەردەگرت،و شتی وایان بە خۆوە نەدیتبوو، ئیدی زۆر پیس لە خۆ دەگۆڕان‌و پلەو پایە مەستی دەکردن‌و، هێزو دەسەڵاتی خۆیان لە رادەبەدەر، بە گەورە دەزانی‌و بەردەست‌و خواردەست‌و بندەستەکانی خۆیان بە بەشەر نەدەزانی، بەڵام دەرهەق بەسەرانی خۆیان، مەرایی وروو‌پامایی‌و کلکە سووتێ‌و ملکەچی‌و زەلیلی وایان دەنواند پیاو قێزی لێدەکردنەوە. تەنانەت کەسە دەڵەچەو بنڕیشەکانیان لە بەردەم سەرانی خۆیاندا دانیان بەوەدا دەنا کە بندەست‌و بەردەست بوون‌و "ئەسڵی خۆیان لە بیر ناکەن، لە کونی خۆ هەڵناگەڕینەوە". بەڵام ئەوانە دەرهەق بە بندەستەکانیان لە رادەبەدەر ستەمکارو دیکتاتۆر بوون. دەبێ ئەوەش بڵێین کە هیچ شتێك زیندانییانی بە ئەندازەی ئەو رەفتارە بێ مانایانە توڕە و قەڵس نەدەکرد. مرۆڤ هەر چییەك بێ، چەند کۆیلەو کەساس‌و ملکەچ بێ، چەند گوێڕایەڵ و سازگار بێت، بەو هەموو فەخرفرۆشی‌و لە خۆبایی بوون‌و خۆپەسندی‌و لاف‌و گەزافە بێ مانایە توڕەو قەڵس دەبێت‌و سەبرو هەدای دەسوێ‌و پەت دەپچڕێ.

خۆشبەختانە، هەموو ئەم شتانە بەسەرچوون‌و کۆن بوون‌و خەریکن بەتەواوەتی لە بیری خەڵکی دەچنەوە. پێویستە ئەوەش بڵێین کە دەسەڵاتی باڵا لەو سەردەم‌و سەروبەندەدا زۆر بە توندی سزای ئەو هەڵەکارو تاوانبارانەی دەدا، من نموونەی زۆرم لەلایە.

ئەوەی کە بندەستان نارەحەت و توڕە دەکات، ئەوەیە بە ناشیرینی مامەڵەیان دەگەڵ بکرێت، بە قێزو بێزو سووکایەتییەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت.

ئەوانەی پێیان وایە هەر ئەوەندەیان لەسەرە نانی زیندانی بدەن‌و مدارای بکەن‌و لە هەموو شتێکدا بەپێی یاسا رەفتاری دەگەڵ بکەن، هەڵەن. چونکە مرۆڤ چەند بچووك بێ، چەند نەگبەت بێ‌و چەند کەم بایەخ بێت، بە تەبیعەت حەزدەکات کەرامەتی مرۆڤانی بپارێزرێت. هەر زیندانییەك زۆر چاك دەزانێ زیندانیە، دڵنیایە کە کەسێکی بێزراوی ناخۆشەویستە،و دەزانێ لەچاو بەرپرسەکانیا هیچ نیە. بەڵام نە تەلبەندو نە کۆت‌و زنجیر ئەوەی لە بیر نابەنەوە کە مرۆڤەو دەبێ مامەڵەیەکی مرۆڤانی لەگەڵ بکرێت. خودایا! مامەڵەی مرۆڤانی چەند پێویستە. لەوەیە مامەڵەیەکی مرۆڤانی، تەنانەت ئەو کەسەش لە هەڵدێر رزگار بکات کە دەمێکە وێنەی خودای لە دڵ‌و دەروونی ئاوابووە. بەڵام "قەرەبەختان" لە هەر کەسێکی دی زیاتر پێویستیان بە مامەڵەی مرۆڤانیە، دەبێ لەو رووەوە پێش خەڵکانی تر بخرێن، چونکە ئەوە دەرمانی دەردیانە، ئەوە سەرچاوەی رزگاریانە، ئەوە سەرچاوەی خۆشی‌و شادیانە. من بە رێکەوت دوو شت سەرنجی راکێشام‌و سەیرم کرد ئەو قەرەبەختانە زۆر خۆشحاڵ دەکەن. یەکێکیان زمانی شیرن‌و رووی خۆشی زیندانەوانەکان بوو کە گیانی زیندانییەکانی دەژیانەوەو وەکو منداڵ دڵیان پێی خۆش دەبوو و دەیکردە کارێك بەدڵ بەرپرسەکانی خۆیان خۆش بوێ. دووەمیان ئەوە بوو

زیندانییەکان حەزیان نە دەکرد سەرۆکەکانیان زۆر روویان بدەنیٚو شەرمیان لیٚکدی بشکیٚ، حەزیان نەدەکرد بەرپرسەکان زۆر خۆش مامەڵە بن لەگەڵیاندا، هەروەها حەزیانیش نەدەکرد ئەو بەرپرسانە زۆر سادەو ساویلکەبن، چونکە حەزدەکەن ریٚزی بەرپرسەکانیان بگرن. بۆ نموونە کەبیاندیتبا سەرۆکەکەیان سینگ‌و بەرۆکی پڕە لە میداڵ‌و نیشانان، پۆشتەو پەرداخەو بەسام‌و تامەو لای سەرانی باڵاتر بە سەنگ‌و ئیحتوبارە، کەسیٚکی بە زەبت‌و رەبت‌و بە ویقارو دادپەروەرو بە ئینسافە، زۆر ریٚزی خۆی دەگریٚت، شانازیان پیٚوە دەکرد، زیندانیان ئەو جۆرە بەرپرسە پەسند دەدەن بەسەر، هی دیدا، چونکە قەدری خۆی دەزانیٚ، سووکایەتی بە کەس ناکات. خراپە دەگەڵ کەسدا ناکات، بۆیە هیچ کیٚشەیەکی بۆ دروست نابیٚو کاروباری ئاسایی دەڕوات.

کوبیلین بە هیٚمنی پرسی:

– پیٚموایە لەسەر ئەوە سزایەکی قورس درایت ؟

– هەر قورس... هەر باسی مەکە... ئەلهەقی سزایەکی قورس درام هاوڕیٚیان!... ئەو مقەستە بیٚنە! ئەریٚ پیٚم بلیٚن: ئەمشەو یاری وەرەق نیە ؟

فاسیا گوتی:

– پارەی قومارەکە دراوە بە خواردنەوە... دراوە بە مەشرووب‌و خوراوەتەوە، ئەگینا ئیٚستا لیٚرە دەبوو....

لۆقا گوتی:

– "ئەگینا"! ئەم "ئەگینا"یە لە بازاڕی مۆسکۆدا سەد رۆبلٚ دەکات.

کوبیلین دیسان پرسی:

– باشە لۆقا سزایەکەت چەند بوو ؟

لۆقا گوتی:

– پیٚنج سەد شەلاق برادەری ئازیز.

دیسان دراوسیٚکەی فەرامۆش کردو رووی کردە ئەوانی دی:

– ئەلهەقی هاوڕیٚیان... خەریك بوو بمکوژن! من پیٚشتر بە عەمرانم شەلاقم نەخواردبوو! هەر کرام بە مەخسەرە. خەڵکی دنیام لیٚ خڕکرایەوە. هەموو خەڵکی شار هاتبوون بۆ تەمەشای سزای تاوانبار، سزای بکوژ. کە خەڵکیٚکی کەرو گەوج بوون! گەوجیٚتیان لە باس کردن نایەت! کابرای جەلاد جلەکانی لەبەرداکەندم، یەك تەختە لەسەر عاردی پاڵی خستم، ئەوجا تیٚی خوڕیم: "ئامادەبە... دەت برژیٚنم!" چاوەڕیٚم کرد. کە یەکەم قامچی پیٚدا کیٚشام ویستم پڕ بەزار هاوار بکەم، بەڵام نەمتوانی، دەنگم دەرنەچوو... چەند زارم دەکردەوە دەنگم لە ئەوکم دەر نەدەهات. دەنگم لە ئەوکم گیرا... کە جەڵدەی دووەمی پیٚدا کیٚشام، یەکسەر بورامەوە گویٚم لە کابرا نەبوو کە دەیگوت: "دوو"... کاتیٚ بە خۆ هاتمەوە گویٚم لیٚیان بوو کە ژمارە (هەڤدە)یان دەژمارد. تا ئەو کاتە چوار جاریان کردبوومەوە تا نیو سەعاتیٚك پشوو بدەم‌و هەناسەم وەبەربیٚتەوە، تا ئاوی

ساردم پێدا بکەن. تەمەشای هەموویانم دەکرد خەریك بوو چاوم دەربێت. لە دڵی خۆدا دەمگوت: "تەواو لێرە دەتۆپم".

کوبیلین گوتی:

- ئەوجاش نەمردی ؟

لۆقا تەمەشایەکی تەوسامێزی کردو، ئەوانی دیش لە قاقای پێکەنینیان دا.

- بەڕاستی شێتە.

لەوە دەچوو لۆقا ژێوان بێ لەوەی لەوساوە قسەی بۆ ئەم قەلپیاوە دەکرد، هەنگێ ئاماژەیەکی بۆ سەری خۆی کردو گوتی:

- لەوە دەچێ یارۆ ئێروکانەی تێك چووبێ.

فاسیا هەڵیدایە:

- ئەرێ ئەقڵی تەواو نیە.

هەرچەندە لۆقا شەش کەسی کوشتبوو و حەزیدەکرد وا لە زیندانییەکان بگەیەنێ کە پیاوێکی زۆر جەربەزەو ترسناکە، بەڵام هیچ کەسێك لە زیندانەکەدا لێی نەدەترسا.

*ژێدەر:*

*١- فاسیا: کورتکراوەی فاسیلییە.*

((٩))

## ئەشعیا فومیچ- گەرماو
## و بەسەرهاتی باکلۆشین

بەره جەژنان بوو، جەژنی سەری ساڵ، زیندانییەکان بە شەوق‌و زەوقێکی زۆرەوە چاوەڕوانی هاتنی جەژنیان دەکرد. کە بەو حاڵەوەم دیتن، منیش دڵم خۆش بوو، پێشبینی ئەوەم دەکرد کە شتێکی چاوەڕوان نەکراو روو بدات. دەبوایە چوار رۆژی بەر لە جەژن بۆ گەرماوی هەڵم ببرێین. زیندانییەکان هەر هەموویان خۆشحاڵ‌و بە کەیف خۆیان ئامادە دەکرد. دەبوایە دوای فراقین بۆ گەرماو بڕۆن. جا بەو بۆنەیەوە، مۆڵەتی نیو رۆژمان پێدەدراو بۆ بێگار نەدەچووین. ئەشعیا فومیچ مشتاین، لە هەموو زیندانییەکان خۆشحاڵتر بوو، لە کەیفان جێی بەخۆ نەدەگرت. ئەشعیا فومیچ زیندانییەکی جوولەکە بوو کە لە فەسڵی چوارەمی ئەم بیرەوەرییەمدا ناوم بردووەو کەمێکم باس کردووە. ئەم پیاوە زۆری حەز لە گەرماو بوو، زۆر دەمایەوەو، ئەوەندە دەمایەوە جاری وا هەبوو دەبورایەوە. هەرکاتێ ئەو گەرماوەم بیر دەکەوێتەوە (هەڵبەتە زۆر ئەستەمە بیر بچێتەوە) یەکسەر سەرو سیمای خۆشەویستی ئەشعیا فومیچی هاو زیندانیم دێتەوە بەرچاو.

خودایە کە ئینسانێکی سەیر بوو! پێشتر تۆزێکم باس کردووە. کابرایەکی پەنجا ساڵانی، باریك‌و بنیس‌و لاواز، سیما مەنگ‌و ئارام بوو، گۆناو تەوێڵی یەکپارچە جێگا برین بوو، لاواز، رێوەڵە، سپی سپی بوو، بە دەنی لە بەدەنی جووجەڵە دەچوو. سیمای مەندو مەنگ و ئارام بوو، متمانەی لێدەباری، خۆشی‌و شادی لە سیمای نەدەبڕا. پێموابوو هیچ باکی بەوە نییە کە کەوتووەتە زیندانەوە. ئەمە زێڕینگەر بوو، تاقە زێڕنگەری شار بوو، لە کاری کەم نەبوو. دەسکەوتی زۆر بوو. پێویستی بە هیچ نەبوو، دەوڵەمەندانە دەژیا، درێغی لە خۆی نەدەکرد، بۆ خۆی دەس‌و دڵ تێر بوو، بەڵام وێڕای ئەوەش هەموو دەسکەوت‌و قازانجەکانی خەرج نەدەکرد، بەڵکو پاشەکەوتیشی دەکرد، بارمتەی لە زیندانییەکان وەردەگرت‌و قەرزی بە سووتی دەدانێ. سەماوەرێك‌و دەستێ پێخەف نەرم‌و لێفەیەك‌و چەند فینجانێکی هەبوو. جوولەکەکانی شار مدارایان دەکردو چاویان تێوەبوو. هەموو شەممووانێك، بە مەخفوری دەبرا بۆ کڵێسا (یاسا رێی ئەم کارەی دەدا). یانی ژیانێکی خۆش‌و دەوڵەمەندانەی هەبوو، بەڵام زۆر پەرۆشی ئەوە بوو کە ماوەی زیندانییەکەی، کە ١٢ ساڵ بوو، زوو تەواو ببێت، تا ژن بێنێ. بە ڕاستی کابرایەکی سەیر بوو تێکەڵەیەکی کۆمیدی بوو لە ساویلکەیی‌و گەوجێتی، لە فێڵبازی‌و چاو قایمی، لە گۆساخی‌و شەرمنی، لە خۆپەسندی‌و دڕی. زۆرم بەلاوە سەیربوو کە زیندانییەکان هەرگیز گاڵتەیان پێنەدەکرد، پێیان رانەدەبوارد. خۆ ئەگەر جارجارێك سەریان بکردبایە سەری، تەنیا بۆ سووکە شۆخی‌و پێکەنین ئەوەیان دەکرد. ئەشعیا فومیچ مایەی دڵخۆشی‌و سێبوری هەموویان بوو. خۆشیان دەویست، ئەگەر یەکێك زیاد سەری کردبایە سەری دەیانگوت: "وازی لێ بێنن، جگە لە ئەشعیا کێمان هەیە. چما چەند ئەشعیامان هەیە". جا ئەشعیاش هەنگێ، هەرچەندە خۆی باش دەناسی، زۆر بە پایەو کەسایەتی خۆی دەفشی، وای نەدەنواند کە پێی رادەبوێرن، زویر

نەدەبوو، زیندانییەکان بەمە خۆشحاڵ دەبوون. هاتنی ئەشعیا بۆ زیندان بەلای زیندانییەکانەوە وەکو شانۆییەکی کۆمیدی وابوو. ( ئەشعیا لە پێش مندا چوو بووە زیندان، پاشان زیندانییەکان بۆیان باسکردم). ئێوارانێکی درەنگ لەپڕ مقۆ مقۆ دەکەوێتە نێو زیندان کە جوولەکەیەك بۆ زیندان هێنراوە، ئێستا لە ژووری پاسەوانییە ( قەرەوڵخانە)، سەری دەتاشن. زیندانەکە تاقە جوولەکەیەکی تیا نەبوو، زیندانییەکان بە تاسەوە چاوەڕوانی هاتنی دەکەن، هەرکە لە دەرگا گەورەکە وەژوور دەکەویٚ هەموو دەوری دەدەن و لێی خڕدەبنەوە. مامورێك دەیهێنیٚ بۆ زیندانی مەدەنی و جێگەو تەختە خەوەکەی نیشاندەدات. ئەشعیا تورەکەیەکی پیٚ بوو هەم کەلوپەلەکانی خۆی تیا بوو هەم ئەو کەلوپەلانەی کە لە ئیدارەی زیندان دابوویانیٚ. تورەکەکەی لە عاردی دانا، لەسەر تەختە خەوەکەی، چوار مشقی دانیشت، زاتی نەدەکرد چاو هەڵبڕێت. زیندانییەکان بەدەم تەوس و پێکەنینەوە کەوتنە گاڵتەکردن بە ئەسڵ و فەسڵ و ڕەچەڵەکی جوولەکانەی . لەپڕ زیندانییەکی گەنج هاتە پێشیٚ، دڕی بە خەڵکەکەداو لە ئەشعیا نزیك بووەوە، پانتۆڵێکی هاوینەی شڕو پینە پیناوی بە دەستەوە بوو، لەلای ئەشعیا فومیچەوە دانیشت و دەستێکی بە شانیا داو گوتی:

– دەی هاوڕێی ئازیز، بە خێرێی، شەش دانە ساڵە من چاوەڕوانی تۆم! تەمەشا، ئەگەر ئەم پانتۆڵەت بە بارمەتە لا دابنەم چەندم قەرز دەدەیە ؟

بە دەم ئەو قسەیەوە پانتۆڵە شڕەکەی خستە بەردەمی. ئەشعیا فومیچی داماو بە جۆریٚ حەپەسا بوو، نەیدەوێرا چاو هەڵبڕیٚ و تەمەشایەکی سیمای شێواو ترسناکی ئەو ئاپۆڕا چڵکن و پڵکنە بکات کە دەوریان دابوو. تا ئەو کاتە فزەی لە دەم دەرنەهاتبوو، بەڵام هەرکە چاوی بە شڕە پانتۆڵەکە کەوت، ئاهێکی تێگەڕا، پانتۆڵەکەی لە دەستی وەرگرت، بە وردی کەوتە تەمەشاکردنی. تەنانەت دایە بەر رووناکی چرایەکەش تا بە جوانی بیدینیٚ. زیندانییەکان هەموو بە تاسەوە وەستا بوون تا بزانن ئەشعیا چ دەڵێت.

زیندانییە گەنجەکە چاوێکی لە هاوڕێکانی داگرت و لەسەری ڕۆیی:

– ها، چ دەڵێی؟ ڕۆبڵێکی زیوم دەدەیتیٚ ئەگەر پانتۆڵەکەت بە بارمتە لا دابنەم ؟

ئەشعیا فومیچ، بۆ یەکەمجار لە زینداندا بەم وشانە زاری کردەوە:

– ڕۆبڵێکی زیو؟ نا، زۆرە... ئەگەر رازی بی حەوت کۆپیکانت دەدەمیٚ !

زیندانییەکان، کە گوێیان لەو قسانەی بوو، هەموو لە قاقای پێکەنینیان دا.

زیندانییە گەنجەکە گوتی:

– حەوت کۆپیك ؟ باشە بێنە.... باوەڕ بکە شانست هەیە! بەڵام ئاگات لە پانتۆڵەکەم بیٚ، خەراپی نەکەی ها، ئەگینا دەتکوژم.

یارۆی جوولەکە، دەستی بە بەرکیدا کرد تا حەوت کۆپیکەکە دەربێنیٚ،و ژێراو ژێر تەمەشای زیندانییەکانی دەکرد وەك ئەوەی بە شایەتیان بگرێت، ئەوجا بە دەنگی لەرزۆك گوتی:

– ئەمە حەوت، سێش قازانجی دێتە سەر، واتا دە کۆپیکی من قەرزار دەبیت.

یارۆی جولەکە هەستی بەترس‌و دڵەڕاوکێیەکی زۆر دەکرد، بەڵام ئارەزووی تەواوکردنی سەودایەکە بەسەر ترس‌و دڵەڕاوکێیەکەیدا زاڵ بوو.

زیندانییە گەنجەکە گوتی:

– مەبەست لە سێ کۆپیك، ساڵانەیە ؟ یانی ساڵی سێ کۆپیکی دێتە سەر؟

– نەخێر مانگانە.

– کە پیاوێکی تەماعکاری. تۆ ناوت چییە ؟

– ئەشعیا فومیچ.

– زۆر باشە ئەشعیا! تۆ لەم دنیایەدا زۆر پێشدەکەوی! خوا حافیز.

ئەشعیا دیسان کەوتە تەمەشا کردنی شڕە پانتۆڵەکە، گاڵتەنیە، حەوت کۆپیکی لە جیاتی خەواندووە. ئەوسا قەدی کردو بەوپەڕی وریایی لە کیسەکەی نا. زیندانییەکانیش هەر پێدەکەنین.

ئەلهەقی هەموو زیندانییەکان خۆشیان ویست، کەس ڕۆژێ لە ڕۆژان خراپەی دەگەڵ نەکرد، هەرچەندە هەموو زیندانییەکان کەوتبوونە ژێر قەرزو سووتی قورسی ئەوەوە، بە هەرحاڵ کابرایەك بوو زەڕەیەك کەرب‌و کینەی لە دڵدا نەبوو، بە قەد مریشکێك بوغزو رقی لە دڵدا نەبوو. کە دەیبینی ئەوانەی دەوری مدارای دەکەن، خۆی قورس دەگرت. بەڵام ئەمەی لێنەدەهات‌و پێکەنیناوی دەهاتە بەچاو، بۆیە زیندانییەکان دەیان بەخشی‌و لێیان نەدەگرت.

لۆقا، کە بەر لەوەی بکەوێتە زیندان، جوولەکەیەکی زۆری دەناسی، هەندێجار سەری دەکردە سەری، رقی هەڵدەستاند، بەڵام ئەمەی لە نیاز گلاوی‌و زگڕەشیدا نەدەکرد، تەنیا بۆ سوعبەت‌و گاڵتەو رابواردن ئەوەی دەکرد، وەکو چۆن کەسێك هەر بۆ خۆشی‌و پێکەنین سەر بخاتە سەر سەگێك یان تووتکێك یان هەر حەیوانێکی دەستەمۆ، ئەمەی دەکرد. ئەشعیا بەمەی دەزانی، بۆیە قەت توڕە نەدەبوو، بەڵکو یەك بە دوو وەڵامی دەدایەوە.

بۆ نموونە لۆقا دەیگوت:

– تەمەشا جوولەکە... ئاگات لە خۆ بێ، لەم ڕۆژانەدا لێدانێکی وات لێدەدەم بە عەمراتت لێدانی وات نەخواردبێ.

ئەشعیا وەڵامی دەدایەوە:

– ئەگەر تۆ جارێکم لێبدەی، من دە جارت لێدەدەم.

لۆقا پێی دەڵێت:

– هەی گولی پیس!

ئەشعیا وەڵام دەداتەوە:

– چ قەیدیە با هەر گول بم.

لۆقا دەڵێت:

– هەی جوولەکەی پیسکە !

ئەشعیا دەڵێت:

– گول، پیسکە، هەرچییەك دەڵێی بیڵێ، گرینگ ئەوەیە باخەڵم گەرمە، دەوڵەمەندم.

ئیدی شەڕە سوعبەتەکەیان بەردەوام دەبێت:

– هەی مەسیح فرۆش

– چی دەڵێی بیڵێ.

زیندانییەکان هاوار دەکەن:

– بژی ئەشعیا فومیچ! بەڕاستی قۆشمەی! هاوڕێیان وازی لێبێنن، هەر یەك ئەشعیامان هەیە.

– دەی جوولەکە، ئەگەر ئاگات لە خۆ نەبێ، بەر شەلاقان دەدرێی و رەهەندەی سیبیریا دەکرێی.

– من لە ئێستاوە لە سیبیریام.

– بۆ شوێنێکی دوورترت دەنێرن.

– باشە خودا لە وێش نیە ؟

– هەڵبەتە، با.

– دەیسا باکم نیە، لە هەر شوێنێ خودا هەبێ و باخەڵم پڕ بێ، پارەم هەبێ، خەمم نیە.

زیندانییەکان هاوار دەکەن:

– بژی ئەشعیا، بەڕاستی ئاقڵە! ئاشکرایە کە...

یارۆی جوولەکە زۆر چاك دەیزانی کە سەردەکەنە سەری و پێی رادەبوێرن، بەڵام بە خۆیدا نەدەشکایەوە، و ورەی بەر نەدەدا. لەزەتێکی زۆری لە ئافەرین و ستایشی زیندانییەکان دەبینی و بای دەچووە ژێر کەوڵی و بە دەنگێکی زیقاوڵە، کە لە هەموو قاوشەکەدا دەنگی دەدایەوە، گۆرانی دەچڕی! لالەلە، لا، لا، لالەلە، لا!.... هەر ئەو ئاوازە کۆمیدیەی دەزانی، بە درێژایی ساڵانی زیندانییەکەی کەس لەو ئاوازە زیاتری لێنەبیست، کە ئاشنایەتیم دەگەڵی پەیدا کرد سوێندی قورسی بۆ خواردم کە ئەم گۆرانیە هەمان ئەو ئاوازەیە کە لە کاتی پەڕینەوە لە دەریای سوور شەش سەد جوولەکە، بە وردو درشتیانەوە دەیانگوت و دەیانگوتەوە، دەبێ هەر ئیسرائیلییەك دوای هەر سەرکەوتنێك ئەم گۆرانیە بڵێ.

زیندانییەکان هەموو شەوێکی هەینی لەسەر شەممە، لە هەموو قاوشەکانی ترەوە بۆ قاوشەکەی ئێمە دەهاتن تا سەیری ئەشعیا بکەن کە چۆن جەژنی شەمموان دەگێڕێت. هەڵبەتە ئەشعیا کە پیاوێکی سادەو ساویلکەو خۆپەسند بوو، بە خڕ بوونەوەی خەڵکەکە زۆر کەیف خۆش دەبوو. مێزێکی چکۆلەی لە سووچێکی ژوورەکەدا هەبوو، دەچوو بۆ لای مێزەکە پەردەیەکی قوماشی سپی پێدا دەدا، بە رواڵەت خۆی مژولی عیبادەت و دینداری و خواناسی دەکرد، ئەوسا کتێبێکی لەسەر مێزەکە دادەنا، دوو مۆمی بە دیاریەوە دادەگیرساندو بە درێژایی ئەو ماوەیە لێوی دەجوڵاندو وردە وێردی نامەفهووم و نهێنێ ئامێزی لەبەر خۆوە دەگوت، ئەوجا دەچوو جبەکەی لەبەر دەکرد، جبەکەی قۆڵی نەبوو، زۆر بەخەمی جبەکەیەوە بوو، لە بنی بنەوەی سەندوقەکەیدا هەڵیدەگریت. ئەوجا جووتێ دەسبەندی مسی لە دەستەکانی دەکرد. پاشان کڵاوێکی بچووکی قوتوو(١) ئاسای قووچی لەسەر دەنا کە لە شاخ دەچوو، پاش ئەمانە ئیدی دەکەوتە نوێژو وێرد خوێندن. ئیدی بە دەم نوێژو وێردەوە فووی بە چواردەوری خۆیدا دەکرد، سەری دەجوڵاند،

بەشێوەیەکی کۆمیدی ملی بادەدا، دیارە سرووتی تایبەتی ئاینەکەی وایدەخواست، هەڵبەتە ئەگەر ئەشعیا ئەو سرووتانەی، بەو شێوە کومیدییەو بە بەرچاوی ئێمەوە ئەنجام نەدابا، بە هیچ جۆرێ نەدەبوونە مایەی پێکەنین! کەس پێی پێنەدەکەنی. ئەوجا لە پڕ هەردوو دەستی بەسەر چاویەوە دەگرت و بەدەم زۆڕوهۆڕی گریانەوە وێردی دەخوێند. بەرە بەرە گریانەکەی دەبوو بە شین و شەپۆڕ، لە تاواندا خۆی بەپێوە نەدەگرت، خەریك بوو بەسەر کتێبەکەدا دەکەوت، کەچی لە گەرمەی ئەو شین و شەپۆڕەدا، لە پڕ لە قاقای پێکەنینی دەدا، شادو خۆشحاڵ بە دەنگێکی منگن سروودی سەرکەوتنی دەگوت... هەندێجار زیندانییەکان لە دڵی خۆدا دەیانگوت: "کەس لەمە تێناگات". جارێکیان لە (ئەشعیا فومیچ)م پرسی باشە ئەم گۆڕانە کوت وپڕە لە خەمینییەوە بۆ شادی مانای چیە. ئەشعیا فومیچ ئەم پرسیارانەی منی پێ خۆش بوو، ئیدی بۆی باسکردم کە ئەو خەم و گریان و شینە بۆ لە دەست چوونی ئۆرشەلیمە،و بە پێی ئاینەکەیان دەبێ لەو یادەدا بگرین، سینگ بکوتن، شین بگێڕن، تا ئەو کەسە دەگاتە ئەوپەڕی خەمینی و خەمباری، هەنگێ دەبێ ئەوەی بیر بکەوێتەوە کە بەری تەنگانە کورتەو بە گوێرەی پێشبینییەك، جوولەکان بۆ ئۆرشەلیم دەگەڕێنەوە،و جا دەبێ بەو بۆنەیەوە یەکسەر دەست لە گریان هەڵگرێ و هەڵبکاتە گۆرانی و بە دڵ پێبکەنێ، بە دەنگ و ئاوازی شادمانیەوە نوێژو عیبادەت بکات،و سیمای بگۆڕێت و سەلارو سەنگین بنوێنێ.

ئەشعیا فومیچ زۆر دڵی بەم گۆڕانە کوتوپڕە لە خەمینییەوە بۆ شادمانی خۆش دەبوو، بە ئەنجامدانی ئەم ئەرکە زۆر ئاسوودە دەبوو. بەخۆشییەکی زۆر گەورەوە، بەبێ ئەوەی بیشارێتەوە ئەو پرەنسیپە ئاینییەی بۆ شەرح کردم. ئێوارەیەك لە کاتێکا ئەشعیا فومیچ لە گەرمەی عیبادەت و نوێژدا بوو، مێجەرو ئەفسەری ئێشکگرو چەند سەربازێك خۆیان بە ژوورا کرد، زیندانییەکان بە پەلە لە بەردەم جێگاکانیاندا ریزبوون، تەنیا ئەشعیا نەبێ کە نەك هەر نوێژەکەی نەبڕی بەڵکو بە دەنگی بەرزترو حەرەکاتی زیاتر لەسەر نوێژو عیبادەتەکەی بەردەوام بوو. دەیزانی ماڧ عیبادەتی هەیەو کەس ناتوانێ نوێژەکەی پێ ببڕێ،و ئەگەر لە بەردەم مێجەردا چەند هاوار بکات، چەند بگری، هیچ مەسئولیەت و ترسێکی ناکەوێتە سەر. زۆری پێخۆش بوو لە بەردەم مێجەردا ئەو حەرەکاتە بکات. مێجەر تەواو لێی نزیك بووەوە، هەر شەقاوێکیان بەین بوو. ئەشعیا فومیچ پشتی کردە مێزەکەو لە بەردەم مێجەردا ڕەق ڕاوەستا، کەوتە خوێندنی سردووی سەرکەوتن، ئازای بەدەنی دەجولان، دەستی، سەری، ملی، ئیدی جەزمە گرتبووی و حاڵی لێهاتبوو، تا گەییە ئەوەی سیمای بگۆڕێت و شادی و ویقار لە خۆی بێنێ، یەکسەر ئەوەی کرد، چاوی دادەگرت، قاقا پێدەکەنی، سەری بە ئاراستەی مێجەردا دادەنەواند. مێجەر لە هەوەڵەوە ئەمەی زۆر پێ سەیر بوو، حەپەسا، پاشان لە قاقای پێکەنینی دا، گوتی ئەم پیاوە دێوانەیە، و ئیدی ڕۆیی، ئەشعیا فومیچ لەسەر عیبادەتی خۆی بەردەوام بوو و زیاتر دەنگی لێهەڵبڕی. دوای سەعاتێك، لەو دەمەدا کە ئەشعیا نانی ئێوارەی دەخوارد، لێم پرسی باشە ئەگەر مێجەر لێی توڕەبایە، چی دەکرد، کەچی ئەشعیا پرسی:

– کام مێجەر ؟

گوتم:

– چۆن ؟ ئەدی مێجەرت نەبینی ؟

گوتی:

– نەخێر.

گوتم:

– ڕێك لەبەردەمتدا وەستا بوو و تەمەشای دەکردیت.

بەڵام ئەشعیا فومیچ، بە جددی دڵنیای کردم کە مێجەری نەدیتووە، چونکە لەم حاڵەتانەدا جەزمە دەیگریّو بە جۆریّ حاڵی لێدێت نە هیچ دەبینیّو نە هیچ دەبیسێتو نە ئاگای لە دەوروبەری خۆی دەمێنیّ. ئێستاش ئەشعیام دێتەوە بەرچاو کە چۆن ڕۆژانی شەمموان تا ئێواریّ بەناو زیندانەکەدا دەسوڕایەوەو هیچ کارێکی نەدەکرد، چونکە بە پێی ئاین هیچ جوولەکەیەك بۆی نیە لەو ڕۆژەدا کاربکات. زۆرجار دەنگوباسو حیکایەتی باوەڕ نەکردەنی بۆ دەگێڕامەوە، هەرجاریّ لە کڵێسای جوولەکان دەهاتەوە، دەنگوباسی پترسبۆرگی بۆ دێنام، بانگەشەو دەنگۆی قۆڕی بۆ دنیامو دڵنیای دەکردم کە ئەو شتانەی لە هاودینەکانی خۆی زانیوە،و ئەوانیش لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە وەریان گرتووە.

چیە خەریکە لە بابەتەکەمان دەردەچم، زۆر لەسەر ئەشعیا فومیچ ڕۆییشتم.

شار تەنیا دوو گەرماوی گشتی تیا بوو، یەکەمیان بەدەست کابرایەکی جوولەکەوە بوو. ئەمە گەرماوی نمرە بوو، یانی ژوورێن بچووك بچووك بوو. کرێی هەر ژوورێکی پەنجا کۆپیك بوو. تەنیا دەوڵەمەندو ئەرستۆکراتانی شار هاتوچۆی ئەم گەرماوەیان دەکرد. گەرماوی دووەم بۆ خەڵکە هەژارو ڕەشۆکی بوو، کۆنو پیس بوو، زیندانییەکان بۆ ئەم گەرماوە دەبران. دنیا سارد بوو، ڕۆژێکی هەتاوی ڕووناك بوو، بۆ ئەو گەرماوەیان دەبردین. زیندانییەکان زۆریان پیّ خۆش بوو کە لە زیندانەکە وەدەردەکەوتنو بەناو شارا بایەکی باڵی خۆیان دەدا، هەموو ڕێگاکەیان بە دەم پێکەنینو گاڵتەو نوکتەو قسەی خۆشەوە دەبڕی. بۆ یەك ساتیش دەمیان لێك نەدەنا. یەك پەل سەربازی چەکداریان بەگەڵ خستین. خەڵکی شار لەزەتیان لە تەمەشای ئەم دیمەنە دەبینی. کە گەیيشتینە گەرماوەکە کردیانین بە دوو بەشەوە، چونکە گەرماوەکە زۆر چکۆلە بوو و هەموو زیندانییەکانی بە کەڕەتیّ نەدەگرت، تاقمیّ دەچوونە ژوورەوەو خۆیان دەشتو تاقمێکیش لە ساردی گەرماوەکە چاوەڕوانی نۆرەیان دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا ساردی حەمامەکە، واتە ژووری چاوەڕوانیەکە ئەوەندە بچووك بوو پیاو نەیدەزانی چۆن نیوەی زیندانەکان دەگرێت. پترۆف بە نیونەخت بە جێی نەدەهێشتم. بیّ ئەوەی داوای کۆمەکی لێبکەم بە پەلە هات بەلامەوە، تا لە داکەندنی جلەکانمو خۆشتندا یارمەتیم بدات. زیندانییەکی دیکەش هەبوو بە نێوی باکلۆشین، ئەمە لە ئەحکامی تایبەتی بوو، پێیان دەگوت مێجەر. لە هەموو هاوڕێکانم کراوە ترو ڕووخۆشتر بوو. ئیدی بەینمان خۆش بوو. پترۆف یارمەتی دام کە جلەکانم دابکەنم، چونکە خۆم لەم کارەدا زۆر خاو بوومو هێشتا پێی ڕانەهاتبووم. سەرمای ژووری چاوەڕوانی هیچی لە سەرمای دەرەوە کەمتر نەبوو. جل داکەنین بۆ تازە زیندانییان زۆر ئەستەم بوو، چونکە دەبوایە بزانێت چۆن

قایشەکانی ژێر زنجیرەکانی بکاتەوەو دابکەنێ. ئەم قایشانە لە چەرم بوون، هەر یەکەیان ١٧ سانتیمەتر درێژ بوو، لەسەر جلی ژێرەوەو لە ژێر ئەو ئەڵقەیەدا دەبەسترا کە لە قاچیان دەکردین. جووتی ئەم قایشانە بە شەست کۆپیك بوو. دەبووایە هەر زیندانییەك جووتێك لەم قایشانە بکڕێت، چونکە بەبێ ئەو قایشانە نەیدەتوانی ڕێبکات، ئەڵقەکە بە باشی لە قولەپێت نەدەچەسپی، لەو حاڵەتەدا قامکێك دەچووە بەینی ئاسنەکەو گۆشتەکەی قولەپێتەوە، ئیدی ئەڵقەکە بەر قولەپێت دەکەوت و دەیخوراند، ئیدی زیندانی هەرکە یەك ڕۆژ بەبێ ئەو قایشانە ڕێی بکردایە، گۆزینگی بریندار دەبوون و لە خوێن دەهاتن. داکەندنی قایشەکان قورس نەبوو، بەڵکو داکەندنی جلەکانی ژێرەوە زۆر زەحمەت و ئەستەم بوو، داکەندنی جلەکانی ژێرەوە وەستایەتی و لێزانی و لێهاتووییەکی فرەی دەویست. زیندانی دوای ئەوەی لنگی چەپی پانتۆڵەکەی دادەکەند دەبوایە هەر هەمووی لە بەینی ئەڵقەکەو لاقیەوە ئاودیو بکات و لەوێوە بە پێچەوانەوە بە ژێر ئەڵقەکەدا بیهێنێتەوە، ئەوجا لاقی چەپی بە تەواوەتی ئازاد دەبوو، ئەوسا زیندانی دەبوایە لنگی چەپی پانتۆڵەکەی لە ژێر ئەڵقەکەی لاقی ڕاستیا ببات،و بۆ جاری دووەم لەگەڵ لنگی ڕاستی پانتۆڵەکەدا بۆ دواوەی بەرێت. جا ئەم کارە قورس و ئاڵۆزە دەبوایە لە کاتی گۆڕینی جلە چڵکنەکانی ژێرەوە بە جلی تازەش ئەنجام بدرایە. کورنیف یەکەم کەس بوو کە ئەوەی فێر کردین، کورنیف خەڵکی توبولسك بوو، ئەم پیاوە سەرکردەی دەستەیەك دزو ڕێگر بوو، ئەمە حوکمی پێنج ساڵ کۆت و زنجیر درا بوو. زیندانییەکان هەموو لەسەر ئەم وەرزشە ڕاهاتبوون، زۆر بەلەزو خێرا ئەنجامیان دەدا. چەند کۆپیکێکم دایە پترۆف کە سابوون و لیفکەیەکم بۆ بکڕێت. ڕاستە لە زیندان سابوونیان دەدایە زیندانییەکان، بەڵام زۆر بچووك بوو، هەر بە قەد سکەیەکی دوو کۆپیکی دەبوو، زۆریش تەنك بوو. هەر بە قەد ئەو قاژە پەنیرە تەنکە دەبوو کە لە ئێوارە خوانی دەوڵەمەندانda بەر لە شیو بۆ بەرکوڵ دادەنرا. لە ژووری چاوەڕوانیدا دوکانچەیەك هەبوو سابوون و شەربەتی سبیتینی ( کە لە هەنگوین و بەهارات و ئاوی گەرم دروست کرابوو) دەفرۆشت. هەروەها کێك و چۆرەك و ئاوی گەرمیشی دەفرۆشت، چونکە هەر زیندانییەك بە گوێرەی ڕێکەوتنی نێوان خاوەن گەرماوەکەو ئیدارەی زیندان، تەنیا یەك تەنەکە ئاوی گەرمی دەدرایە، خۆ ئەگەر زیندانییەك بیویستایە دەستێك زیاتر لە خۆی بدات و پتر خۆی خاوێن بکاتەوە دەیتوانی تەنەکەیەکی دی بە دوو کۆپیکان بکڕێت، کە خودانی گەرماوەکە لە دەلاقەیەکەوە کە بەتایبەتی بۆ ئەم مەبەستە لە دیوارەکە کرا بوو، دەیدایە دەستی.

هەرکە لە داکەندنی جلەکانم بوومەوە، پترۆف بازووی گرتم، بیانووی ئەوە بوو کە زەحمەتە بە زنجیرو پێوەندەکانمەوە ڕێ بکەم، لە کاتێکا خۆی دابووە بن باڵم و وەکو ئەوەی پیرەمێرێکی پەککەوتە بم، ئامۆژگاری کردم: "زنجیرەکان بەرز بکەوە بۆ سەر بەلەکت. لێرە ئاگادار بە! ئەمە ئاستانەی دەرگاکەیە، وریابە ساتمە نەدەی!" پیاو ڕاست بڵێ خەجاڵەتی ئەو هەموو خزمەت و مدارایەی پترۆف بووم، دڵنیام کرد کە دەتوانم بە تەنیا ڕێ بکەم، بەڵام نەیدەویست باوەڕم پێبکات.. وەکو چۆن سەرپەرشتی و مدارای منداڵێکی حۆلی گێل دەکرێت ودەبێ هەموو کەسێك یارمەتی بدات، بەو ئاوایە مدارای دەکردم و مشووری دەخواردم. پترۆف هەرگیز خولام و

خزمەتکار نەبوو. ئەگەر سووکایەتیم پێ بکردایە دەیزانی چۆن بەرپەرچم دەداتەوەو رەفتارم دەگەڵ دەکات. هەڵبەتە من بەڵێنی هیچ پاداشتو یارمەتیەکم نەدابوویە. ئەویش قەت باسی ئەو شتانەی نەکردبوو و نەدەکرد، ئەدی چ شتێك هانی دەدا ئەوەندە بە خەمی منەوە بێ ؟

که دەرگای گەرماوەکەمان کردەوە، وام بە خەیاڵدا هات کە دەچینە ناو دۆزەخ. تەسەوری ژوورێکی ١٢ پێ بە ١٢ پێ بکەن کە سەد کەسی بە جارێك تێ پەسترا بێ، یان بەلای کەمەوە هەشتا کە سی تێ خزێنرا بێ، چونکە ژمارەمان نزیکەی دوو سەد کەسێك دەبوو کە کرا بووین بە دوو بەشەوە. لەبەر هەڵمو بوخار، چاو چاوی نەدەبینی. تەنیو پیسیو چڵكو تەنگەبەری شوێنەکە کردبوویانە کارێك نەماندەزانی پێ لە کوێ دابنەین. زۆر ترسامو دەمویست بگەڕێمەوە. خۆ ئەگەر هاندانی پترۆف نەبوایە بێگومان دەگەڕامەوە. دوای ماندووبوونێکی زۆر، بە هەر جۆرێ بوو، دوای تکاو رجا لە زیندانییەکان کە تۆزێ رێگەمان بۆ بکەنەوە، تا بچین بۆ لای سەکۆیەکی ئەوسەری زیندانییەکان. بەڵام هەموو سەکۆیەکان گیرابوون. ئیدی پترۆف پێشنیازی بۆ کردم کە شوێنێك بکڕمەوە، خێرا بۆ ئەو مەبەستە کەوتە مامەڵەو سەودا دەگەڵ زیندانییەکدا کە لە سەکۆیەکی نزیکی پەنجەرەکە دانیشتبوو. ئەم زیندانییە قاییل بوو کە بە یەك کۆپیك شوێنەکەی خۆیم بۆ چۆڵ بکات. تومەز پترۆف پێشوەختە کۆپیکەکەی حازر کردبوو و لە ناو دەستیا بوو، کە پارەکەی دا بە یارۆی زیندانی، خێرا شوێنەکەی چۆڵ کردو بە ژێر دەستو پێی مندا خۆی بە شوێنێکی تاریکدا کرد کە یەکپارچە تەنیو چڵكو پیسی بوو. تەنانەت بەینی سەکۆکانیش پڕ بوو لە زیندانییان کە لە عاردی دانیشتبوونو بە دەم هەراو زەناوە، خۆیان لە کەف سابوون نابوو گوایە خۆیان دەشت. هێندە قەرەباڵغ بوو دەرزیت هەڵدابا بە عاردی نەدەکەوت، ئیدی هەرکەسەو تەنەکە ئاوی خۆی بەدەستەوە بوو و ئاوی بە خۆدا دەکرد. ئەوانەی بە پێوە خۆیان دەشتو تەنەکە ئاوەکانیان بە دەستەوە گرتبوو، چۆڕاوگەو پریشکی ئاوی لەشی ئەوان دەڕژا بەسەر سەری تاشراوی ئەوانەی کە دانیشتبوون. ژمارەیەکی کەم لە زیندانییەکان لەسەر سەکۆکان خۆیان قانگڵە کردبوو و خۆیان دەشت. یانی ژمارەیەکی کەم بەڕاستی خۆیان دەشت. زۆربەی هەرە زۆری زیندانییەکان حەزیان نەدەکرد خۆیان بە ئاوو سابوون بشۆن، حەزیان دەکرد لەسەری سەرەوە خۆیان لە بوخارە گەرمەکە هەڵکێشنو لەشیان بخوسێتەوەو ئەوسا ئاوی سارد بەخۆدا بکەن، ئیدی خەڵکە عەوامەکە بەو جۆرە خۆیان دەشت. پیاو کە تەمەشای دەکرد، دەیبینی پەنجا لیفکە بە جارێ بەرزو نزم دەبنەوەو زیندانییەکان لەزەتیان لەوە وەردەگرت. بوخارەکەش سات بە سات زیاتر دەبوو، رادەی گەرما بە جۆرێ بەرز دەبووەوە پیاو هەستی بە سووتان دەکرد. هەراو زەنا لە هەر چوار نکالی زیندانەکەوە بەرز دەبووەوەو تێکەڵ بە زڕو هۆڕی پێوەندو زنجیری زیندانییەکان دەبوو کە لە عاردی دەخشا... خۆ ئەگەر کەسانێك بیان ویستبایە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بڕۆن، ئەوا زنجیرو پێوەندەکانیان لە زنجیری کەسانی دی دەئالۆسکاو دەکەوت بەسەر ئەوانەدا کە دانیشتبوون، هەنگێ شڵپ دەکەوتن بە عاردیداو دەستیان بە تووكو نەفرەتو جنێودان دەکرد، جا نەك هەر خۆیان دەکەوتن بەڵکو لەگەڵ خۆیاندا ئەوانەشیان دەخست کە زنجیرەکانیان تێك ئالا بوو. زیندانییەکان هەموو جەزمە

گرتبوونی و وەکو کێوی دەهاتن‌و دەچوون‌و شێت ئاسا هات‌و هاواریان بوو. زیندانییەکان، هەموو لەبەر ئەو دەلاقەیەی کە ئاوی گەرمی لێوە وەردەگیرا، کەڵەکە بوو بوون‌و خەریك بوو یەکتریان دەپلیشاندەوە، کە تەنەکە ئاوەکانیان وەردەگرت، تا دەیان گەیاندە جێ، نیوەیان بەسەر سەری ئەوانەدا دەڕشت کە دانیشتبوون. هەستمان دەکرد ئازادین، بەڵام هەر سا نا ساتێ سەربازێکی سمێڵ بابڕ لە دەرگاکەوە یان لە دەلاقەکەوە، بە خۆو تفەنگەکەیەوە سەرێکی دەکێشا تا بزانێ ئارامی بەرقەرارە یان نا. سەری تاشراوی زیندانییەکان‌و جەستەیان کە لە بوخارو گەرمی گەرماوەکەدا وەکو خوێن سوور دەچووەوە، زۆر سەیر دەهاتە بەرچاو، ئەو جێ قامچی‌و شوێن تەڕکانەی لە پشتیان درا بوو، بە جۆرێ بەرجەستە بوو بوون‌و بە دیار کەوتبوون، دەتگوت تازە لە ژێر شەلاق‌و قامچی هەستاونەتەوە. کە جێ برینی ترسناك بوون! کە تەمەشای ئەو دیمەنەم دەکرد، لەرزم لێدەهات. بوخارو هەڵمەکە سات بە سات زیاد دەبوو، هۆڵی گەرماوەکە لە هەڵم‌و بوخاری گەرمدا نقووم دەبوو، هەراو زەناو ژاوە ژاو دنیای هەڵگرتبوو. لە نێو ئەو چڕە هەڵم‌و بوخارەو لێرەو لەوێ پشتی زامدارو سەری تاشراوو دەست‌و لاقی خوارو خێچ بەرچاو دەکەوت. ئەشعیا فومیچش سەرباری ئەم دیمەنە بوو، چوو بووە سەربەرزترین سەکۆو لە خۆشیاندا پڕ بەزار هاواری دەکرد. ئەشعیا فومیچ ماوەیەکی زۆر خۆی دەدایە هەڵم‌و بوخارەکە، لە گەرمی تێر نەدەبوو، کۆپیکێکی دابوو بە زیندانییەك کە بە لیفکە پشتی بشوات، بەڵام کابرا خۆی لەبەر گەرمایەکە نەگرت، دوای تۆزێك لیفکەکەی توڕداو بە پەلە رۆیی تا ئاوی سارد بە خۆیدا بکات‌و پشوویەك بدات. ئەشعیا فومیچ کۆڵی نەدا زیندانییەکی دیکەی بە کرێ گرت. ئەشعیا فومیچ بۆ ئەو شتانە دڵاوا بەخشندە بوو، ئامادە بوو لەو حاڵەتانەدا پێنج کەسی یەك لە دوای یەك بە کرێ بگرێت کە بیشۆن. زیندانییەکان لە خوارەوە هورا دەکێشن: "ئەشعیا فومیچ کوڕە کوڕ، کوڕە نە گاڵتە، کوشتەی گەرماوە! بژی شێرە کوڕ!" یارۆی جوولەکە با دەچێتە کەوڵییەوە، هەست بە سەرکەوتنی خۆی دەکات. بە دەنگە تیژەکەی هەڵدەکاتە سروودو گۆرانیە تایبەتیەکەی: لالەلە، لا، لا، لالەلە... بە دەنگە تیژەکەی هەموو زەنا زەناو ژاوەژاوی نێو گەرماوەکەی کردە ژێرەوە. لە دڵی خۆدا گوتم: "رەنگە دۆزەخیش هەر وەکو ئێرە بێ. ئەگەر بە کۆمەڵ بخرابانینا دۆزەخ، لەوێش حاڵمان هەروەکو ئێرە دەبوو." بە خۆم نەوەستام‌و ئەو بیرۆکەیەم بە (پترۆف)ش گوت، پترۆف تەمەشایەکی دەوروبەری کردو هیچی نەگوت.

ویستم شوێنێك بۆ پترۆڤی هاوڕێشم بە کرێ بگرم، بەڵام ئەو لەبەر پێمدا دانیشت‌و دڵنیای کردم کە شوێنەکەی باشەو خۆی ئاوای پێ خۆشە. باکلۆشین ئاوی گەرمی بۆ دەکڕین‌و بۆی دەهێناین. پترۆف گوتی دەیەوێ بە خۆی بمشوات، لە بنی پێمەوە تا تەپڵی سەرم بشوات تا بە تەواوەتی پاك ببمەوە. داوای لێکردم ماوەیەك خۆم بدەمە هەڵمەکە تا بخوسێمەوە. بە قسەم نەکرد. ئەوسا دەستی دایە لیفکەو سابوون‌و ئازای بەدەنی پاك پاك شتم. کە لەوە بووەوە گوتی: "ئێستا نۆرەی پێیە بچووکەکانتە، پێیە بچووکەکانت دەشۆم." زۆرم هەوڵ لەگەڵی دا کە قەیدی نیە خۆم دەیانشۆم، فایدەی نەبوو، ناچار ملم بۆی دا. هەڵبەتە کە دەیگوت "پێیە بچووکەکانت"

بە هیچ جۆرێ مەبەستی سووکایەتی نەبوو بۆیە وای دەگوت تا پێی من لە پێی ئەوانی دی، کە هەموو پێیان زل بوو، جیا بکاتەوە.

دوای ئەوەی پترۆف دوو دەستی لێدام، زۆر بە وریایی، وەکو ئەوەی بووکە شووشە بم، لەباڵم نەوی و بۆ ژووری چاوەڕوانی بردم. ئیدی یارمەتی دامو خۆم لەبەر کردەوە، کە لەو هەموو کۆمەكو خزمەتەی من بووەوە، ئەوسا خۆی بە ژووری گەرماوەکەدا کرد تا خۆیشی بشوات.

کە گەییشتینەوە زیندان، پیاڵەیەك چام دایە، بە سوپاسەوە لێی وەرگرتمو نۆشی کرد. لە دوای چایەکە بیرم لەوە کردەوە کە لە جیاتی ئەو هەموو چاکەیە پێکێ شەرابی بۆ بکڕم. ئیدی شەرابم لە زیندانەکەماندا دەستکەوت. بۆم کڕی، زۆری دڵ پێ خۆش بوو، شەرابەکەی خواردەوە، کۆکەیەکی بۆ کرد، شادو شەنگوڵ زۆری سوپاس کردم، پێی گوتم کە بوژاندوومەتەوە، ئەحیام کردووەتەوە، ئەوسا بە پەلە خۆی بە مووبەقەکەدا کرد. هەرکە ئەو رۆیی میوانێکی ترم هات. باکلۆشین بوو کە پێشترش باسم کردبوو، ئەویشم دەعوەتی چای کردبوو.

بە عەمراتم پیاوی وەکو باکلۆشین نەرمو نیانو سازگارم نەدیتبوو. راستە هەقی خۆی بەسەر کەسەوە نەدەهێشتو تەنانەت هەندێجار لەگەڵ ئەمو ئەودا دەیکرد بە شەڕ، بەتایبەتی ئەگەر کەسێك خۆی لە کاروباری هەڵقورتاندبا. بە کورتیو کرمانجی دەیزانی چۆن بەرگرىو داکۆکی لە خۆی دەکات، بەڵام رقی لە کەس هەڵنەدەگرتو زوو دادەمرکایەوە، پێموایە لای هەمووان ئازیزو خۆشەویست بوو. رووی بکردایەتە هەر کوێیەك بە خۆشحاڵیەوە پێشوازی دەکرا. تەنانەت لە شاریشدا بەمرۆڤی باشو سازگار دەژمێردرا. گەنجێکی باڵا بەرز بوو، تەمەنی هەر سی ساڵێك دەبوو، سیمای زیتەڵو زیرەك دەینواند، ردێنێکی کچکۆکەی لەسەر چەناگەی دانا بوو، کە زۆری لێدەهات. دەیتوانی دەموچاوی خۆی بگۆڕێت، لەو رووەوە بەهرەیەکی سەیری هەبوو، هەر کەسێکی تاقە جارێك دیتبا دەیتوانی کوتو مت وەکو خۆی لاسایی بکاتەوە. لاسایی هەر کەسێکی بکردایەوە ئەوانەی دەوروبەری لە قاقای پێکەنینیان دەدا، سەر بە قوڕی دێنایە پێکەنین. بە سروشت ئەکتەرێکی کۆمیدی بوو. حەزی لە چارەی ئەوانە نەدەکرد کە خۆیان گران دەگرتو حەزیان لە شۆخی و پێکەنین نەدەکرد. بۆیە کەس بەوە تاوانباری نەدەکرد کە "بەرەڵلایەکی بێ خێری بێ دەماغە". باکلۆشین یەکپارچە چالاکیو چەلەنگی بوو، ژیانی لێ هەڵدەقولا. لە سەرەتای زیندانیەکەمەوە ئاشنایەتیم لەگەڵدا پەیدا کرد، ژیانی سەربازیی خۆی بۆ باسکردم کە چۆن لە کەتیبەی پێشەنگاندا سەرباز بووەو چۆن ئەفسەرانی خاوەن پلەو پایەی هەرە بەرز بایەخیان پێداوە.و بە خۆشڕەفتاری خۆی سەرنجی راکێشاونو خۆشیان ویستووە. هەر زوو چەند پرسیارێکی دەربارەی پترسبۆرگ لێکردم. تەنانەت کتێبانیشی دەخوێندەوە. کە ئەمجارە بۆ چا خواردنەوە هاتبوو، بە جۆرێ شەڕی نێوان لیوتنان شو مێجەری گێڕایەوە کە هەر هەموو زیندانییانی ناو قاوشەکەی هێنایە پێکەنین. لە کاتێکا کە لەلامەوە دانیشتبوو بە خۆشییەوە هەواڵی دامێ کە لەوەیە لە زینداندا ئاهەنگێکی شانۆیی بێتە گێڕان. زیندانییەکان بەتەمان لە جەژنەکانی سەری ساڵدا شانۆییەك نماییش بکەن، ئەکتەرانی پێویستیان دۆزیوەتەوەو، حاڵی حازر خەریکن بەرە بەرە دیکۆرەکەی بۆ ئامادە دەکەن. هەندێ کەسیش لە

شارا بەڵێنیان داونەتێ کە جلو بەرگی ژنیان بۆ نمایشەکە بە ئەمانەت بدەنێ، تەنانەت ئومێدی ئەوەش هەیە کە لە ڕێگەی یەکێك لە خولامانی ئەفسەرەکانەوە، جلو بەرگ و میداڵ و نیشانانی زێڕ پەیدابکەن، ئیدی هەموو شتێك حازرو ئامادەیە، مەگەر مێجەر بێت بە سەریاو وەکو پار نەیەڵێ ئاهەنگ بگێڕن! مێجەر بۆیە پار نەی هێشتبوو، ئاهەنگ بگێڕن چونکە هەم لە قومارا دۆڕا بوو و هەم سووکە ئاژاوەیەك لە زیندانەکەدا دروست بوو بوو، ئیدی تورە بوو بوو، دۆو دۆشاوی تێکەڵ کردبوو و نەی هێشتبوو ئاهەنگ بگێڕن. بەڵام ئەمساڵ هیچ بیانوویەکی بە دەستەوە نیە کە ڕێگەی ئەو ئاهەنگە شانۆییە بگرێت. باکلۆشین زۆر بە کوڵ و بە جۆش بوو، دیار بوو لە ریزی پێشەوەی هاندەرانی سازکردنی ئەو ئاهەنگە شانۆییە بوو. لە دڵی خۆدا بڕیارم دا کە بچمە ئاهەنگەکە. باکلۆشین هێندە بە خۆشییەوە باسی ئەم پرۆژەیەی دەکرد کە منیشی خستە سەر هەوەس و کەڵکەڵە. کە بەرە بەرە پتر یەکترمان ناسی، لە ناو قسەو باسەکانیا، ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە لە ساڵانی خزمەتی سوپاییدا، بە درێژایی ماوەی خزمەتەکەی هەر لە پترسبۆرگ نەبووە، بەڵکو ماوەیەکیش بەپلەی دەرەجەدار دەگەڵ پەلێ سەربازدا بۆ شاری "ر...."ش نێردراوە، ئەوجا لەسەری ڕۆیی و گوتی:

– ئیدی لەوێوە بۆ ئێرە نێردرام.

لێم پرسی:

– بۆچی ؟

بەرسڤی دایەوە:

– بۆچی؟ دەزانی بۆچی؟ هەرگیز تەسەور ناکەیت! لەسەر ئەشق، چونکە ئاشق بوو بووم ئەلکساندەر پترۆڤیچ!

بە دەم پێکەنینەوە بەرسڤم دایەوە:

– واز بێنە، کەس لەسەر ئەشق نەفی ناکرێت.

باکلۆشین گوتی:

– ئەلکساندەر پترۆڤیچ، راستت دەوێ، من لەوێ پیاوێکی ئەڵمانیم کوشت، هەڵمکێشایە دەمانچەو کردم بە قوربانی یەك گوللە. باشە ئەڵمانییەك ئەوە دێنێ منی لەسەر نەفی بکرێت و حوکمی بێگارە زیندان بدرێم ؟ تۆ خۆت حەکەم بە...

– باشە ڕووداوەکە چۆن بوو؟ بۆمی بگێڕەوە، دەبێ چیرۆکێکی سەیر بێت.

– بەڕاستی چیرۆکێکی کۆمیدیە ئەلکساندەر پترۆڤیچ!

– دەیسا بۆمی بگێڕەوە.

– حەزەکەی ؟ دەیسا گوێ بگرە....

گوێم لە واریقاتی کوشتنەکە گرت، نەك هەر چیرۆکێکی کۆمیدی نەبوو، بەڵکو چیرۆکێکی بەڕاستی سەیر بوو...

باکلۆشین دەستی بە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی کرد:

– ... کاتیێ گەییمە شاری (ر .... ریگا)، زۆرم بە دڵ بوو، شارێکی گەورەو ئاوەدانو جوان بوو، عەیبی گەورەی ئەم شارە ئەوە بوو ئەڵمانیەکی زۆری تیا بوو. هێشتا گەنج بووم، ئەفسەرە بەرپرسو سەر دەستەکانم زۆریان خۆش دەویستم. ئیدی زۆر بە خۆ دەنازیمو کڵاوەکەم بە تیلاگی سەرمەوە دەناو بە کەشو فشو خۆشییەوە بە ناو شاردا دەگەڕام. ئاشقێنیو چاوبازیم دەگەڵ کیژە ئەڵمانیاندا دەکرد، یەکێك لەو کیژانەم زۆر چووە دڵەوە، حەزم لێکرد، نێوی لویزا بوو. ئەمە دەگەڵ پوریدا کاری دەکرد، جلیان دەشتو ئوتو دەکرد. پورەکەی بیچمو شێوەی زیاتر لە کاریکاتۆر دەچوو، زۆر داراو بووە بوو. لە سەرەتاوە تەنیا بە بەر پەنجەرەی ماڵەکەیاندا دەڕۆییشتم، بەڵام زۆری نەبرد، کە تەواو هۆگرو دڵبەندی یەکتر بووین. لویزا رووسییەکی باشی دەزانی، بەڵام لە قسە کردندا تۆزیێ پێوەی دیار بوو کە رووس نیە. یەجگار جوانو روح سووك بوو، لە ژیانما جوانی وام نەدیتبوو. لە سەرەتاوە وام دەزانی دەتوانم بە ئاسانی دەستەمۆی بکەمو بیخەمە ژێر رکێفی خۆم. بەڵام لویزا لەو کیژانە نەبوو، بە ئاسانی خۆی بە دەستەوە بدات، رێگەی نەدەدام دەستی بۆ بەرم، پێی گوتم: "نا. ساشا گیان داوای شتی وام لێمەکە، دەمەویێ بە پاکیو بێگەردی خۆمەوە بمێنم، تا سەربەرزانە شووت پێبکەم!". ئەوسا نەوازشتی دەکردمو سەری دەخستە سەرمو قاقا پێدەکەنی... بەڕاستی کیژێکی ئابڕومەندو داوێنپاك بوو!... ئەنجام پێشنیازی کرد کە بیخوازم... ئاخر چۆنی نەخوازم ؟ پێم ناڵێی چۆن بتوانم رەفزی بکەم ؟ لێبڕام بچم بۆ لای کۆلۆنێلەکەمانو داوای مۆڵەتی زەماوەندی لێبکەم. کەچی لویزا لە پڕ دیار نەما، نەهاتە جیێ ژووان، جاریێ، دووان، سیان... نامەیەکم بۆ نارد... وەڵام نەبوو... لە دڵی خۆدا گوتم: "دەبیێ چی قەوما بیێ ؟ خۆ ئەگەر مەبەستی خەڵەتاندنم بوایە، مەبەستی چاو وڕاو بوایە دەهاتە جێژوان، یان وەڵامی نامەکەی دەدامەوە". بەڵام لویزا درۆی نەدەزانی. دیارە وازی لێهێناومو تەواو. لە دڵی خۆدا گوتم: "ئەمە ئۆینی پوورەکەیەتی". زاتم نەکرد بچم بۆ لای پورەکەی. هەرچەند بە پەیوەندییەکەمانی دەزانی، بەڵام من وام وێنا دەکرد کە بە بەینمان نازانێت... لە داخو پەشێویدا وەکو شێتم لێهات. ئیدی ناچار نامەیەکی دیکەم بۆ نارد کە "ئەگەر نەیەتە ژووانم، بە خۆم دەچم بۆ لای پوری." ترساو، هات. دەستی بە گریان کرد، بەدەم گریانی بە کوڵەوە بۆی باسکردم کە بۆرە خزمێکی ئەڵمانیان بە نێوی شوڵتس، کە سەعاتچییەکی دەوڵەمەندی پیرە. دەیەویێ بیخوازێت، تا گوایە هەم لویزا بەختەوەر بکاتو هەم بۆ خۆیشی لە پیریدا ژنێکی هەبیێو خزمەتی بکات.و گوایە ئەم ئەڵمانیە لە زووەوە خۆشی ویستووەو هەر بە تەمای ئەو بووەو، بەڵام ئیدی لەبەر هەر هۆیەك بووە، ئەو نیازەی خۆی ئاشکرا نەکردووە... پاشان بەوە کۆتایی بە قسەکەی هێنا کە: "جا ساشا گیان، بەختەوەری من بەندە بەم شووەوە، چونکە کابرا زەنگینو دەوڵەمەندە. خۆ خوا نەخواستە ناتەویێ لەو بەختەوەرییەم بکەی؟!" تەمەشام کرد، بەدەم کوڵی گریانەوە دەستی لە ملم وەریناو کەوتە راموسانم... لە دڵی خۆدا گوتم: "هەق بەوە! ئاخر ئەم داماوە چ خێرو خۆشییەك لە سوپاییەکی دەرەجەدار دەبینیێ، با ئەو دەرەجەدارە عەریفیش بیێ؟" پاشان پێمگوت: "زۆر باشە لویزا! خودا حافیز، خودا ئاگادارو پشتو پشتیوانت بیێ! من هەقی ئەوەم نیە ریێ لە بەختەوەری تۆ بگرم...

بەڵام پرسیارێکم هەیە، پێم بڵێ ئایا کابرا جوانە؟، وەڵامی دامەوە: "نەخێر... پیرە، کەپووی زۆر درێژە." بەخۆی نەوەستاو لە قاقای پێکەنینی دا. ئیدی بەجێم هێشتو، لە دڵی خۆدا گوتم: "دەی گوێ مەدەیە، بەختم نەی هانی". بۆ سبەینێ بەلای دوکانەکەی شوڵتس دا تێپەڕیم ( لویزا ناوی شەقامەکەی پێ گوتبووم )، لە جامخانەکەوە تەمەشام کرد، کابرای ئەڵمانیم بینی کە سەعاتێکی چاك دەکرد. تەمەنی نزیکی چلو پێنج ساڵێك دەبوو، لووتێکی دەندووکە داڵاشی هەبوو، چاوەکانی گەورەو درشت بوون، پاڵتۆیەکی کەشخەی یاخە بەرزی لەبەر بوو، زۆر شیكو کەشخە دەهاتە بەرچاو. کە چاوم پێکەوت لە داخاندا تفێکم کرد. لەو ساتەدا ئامادە بووم شووشەی جامخانەکەی وردو خاش بکەم. بەڵام لە دڵی خۆدا گوتم: "بەچی دەچێ ؟ تازە کارم کراوەو هەموو شتێك براوەتەوە !". شەوێ بۆ سەربازخانە گەڕامەوە. یەك تەختە خۆم دا بەسەر تەختە خەوەکەمدا و ما بگری ئەمما گریان، باوەڕ دەکەی ئەلکساندەر پترۆفیچ!

چەندین رۆژ بوری‌و هیچ هەواڵێك لە لویزاوە نەبوو. ئەنجام پیرەژنێکی جل شۆرو ئوتوچی کە لویزای دەناسی بۆی گێڕامەوە کە کابرای ئەڵمانی بە ئەشقەکەی زانیوین، بۆیە پەلەی لە خوازگاری لویزا کردووە، دەنا تا دوو ساڵی دی چاوەڕوانی دەکردو، گوایە لویزای سوێند داوە کە هەرگیز من نەبینێ. ئەوەشم زانی کە یارۆی ئەڵمانی دەگەڵ لویزاو پوری لویزادا زۆر خراپەو لەوەیە ژێوان ببێتەوەو لویزا نەخوازێت. پیرەژنەکە ئەوەشی پێگوتم کە قەرارە دوو سبەی، کە دەکاتە یەك شەممە، لەلای ئەو، لە ماڵی ئەو دەعوەتی چای بن‌و، خزمێکی دیکەشی دەعوەتکردووە، کە پیرەمێرێکی کۆنە بازرگانە، نابووت بووەو ئێستا لە کۆگاو عەمارێکی مەیفرۆشیدا چاودێرە. کە زانیم رۆژی یەك شەممە مەسەلەکە یەك لایی دەکەنەوە، بەجۆرێ تورە بووم نەمدەزانی چی بکەم. تەنیا بیرم لە دوو سبەی دەکردەوە. بە ڕادەیەك رقم هەستا بوو، لەوە بوو ئەگەر ئەو کابرا ئەڵمانیە ببینم بە زیندوویەتی پارچە پارچەی بکەم، هەر بە خواردن بیخۆم.

بەیانی رۆژی یەك شەممە کە هێشتا هیچ بڕیارێکم نەدابوو، هەرکە لە نوێژ بوومەوەو لە کڵێسا وەدەرکەوتم، بەلەز پاڵتۆیەکەم لەبەر کردو، خێرا بەرەو ماڵی کابرای ئاڵمانی دامکێشا. وام دانا بوو هەموویان لەوێندەر دەبینم. بەڵام راستت دەوێ بە خویشم نەمدەزانی بۆچی بۆ ماڵی یارۆ دەچووم‌و، دەمویست چی پێ بڵێم. بە هەرحاڵ دەمانچەیەکم خستە بەرکم. دەمانچەیەکی گچکۆکەی کۆنی خراپ بوو، بە منداڵی نیشانانم پێ دەنایەوە، ئێستا بەکەڵکی هیچ نەدەهات، کەچی وێڕای ئەوەش فیشەکێکم خستەبەری، چونکە وام دانا بوو لەوەیە دەرم بکەن‌و کابرای ئەڵمانی قسەی ناشیرینم پێ بڵێ‌و هەنگێ منیش هەر بۆ ترساندیان تەقەیەك بە ئاسماندا دەکەم. گەییمە ئەوێندەر. قاڵدرمەکە چۆڵ بوو، هەموویان لە ژوورەکەی پشت دوکانەکەوە بوون. هیچ خولاّم‌و دەرگاوانێکیش لەو ناوە نەبوو. تاقە کارەکەرێکیان هەبوو ئەویش لەوێ نەبوو. بە دوکانەکەدا تێپەڕیم، سەیرم کرد دەرگا داخراوە، دەرگایەکی کۆن‌و شەق‌و شڕ بوو و، لە پشتەوە بە ئەڵقەیەك داخرا بوو.دڵم کەوتە پەلەپەل. وەستام‌و گوێم هەڵخست: بە ئەڵمانی قسانیان دەکرد. لەقەیەکم لە دەرگاکەدا، بە ئاسانی کرایەوە، تەمەشام کرد، بینیم سفرە راخراوە. جەزوەیەکی گەورە لەسەر تەباخێکی غاز دەکولاّ. هەندێ پسکیت‌و کێك لەسەر خوانەکە دانرا بوو، قاپێ

مەی‌و هەندێ ماسی وشکەوە کراوو بوتڵێك شەرابیش لەسەر سینییەکی دی دانرا بوو. لویزاو پوری جلی جوانی یەك شەممەیان لەبەر کردبوو و بە دوو قۆڵی لەسەر موبیلەیەك دانیشتبوون. دەزگیرانەکەی لەسەر کورسییەکی بەرانبەریان دانیشتبوو، زاوایەتی پێوە دیار بوو، قژی شانە کردبوو و پاڵتۆیەکی کەشخەی یاخە بەرزی لەبەرکردبوو، کابرایەکی ئەڵمانی دیکەش لە بەرانبەریا دانیشتبوو، کابرایەکی قەڵەوی قژ ماش‌و برنجی کڕوکپ‌و بێدەنگ بوو. کە خۆم بە ژوورا کرد لویزا ڕەنگی زەرد هەڵگەرا، پوری پەشۆکا، بەلەز لە جێی خۆی هەستاو هەر زوو لە جێیەکەی خۆی دانیشتەوە. کابرای ئەڵمانی زۆر توڕە بوو، هەر هەستاو بەرەو رووم هات‌و گوتی: – چیت دەوێ ؟

ئەگەر توڕەیی فریام نەکەوتبا لەوە بوو بپەشۆکێم. گوتم:

– چیم دەوێ ؟ ئەوەندەت ئوسوڵ تیا نیە بڵێی فەرموو دانیشە پێکێ بخۆرەوە، ئەمە بوو بە شەرتی میوانداری ؟ ئاخر من بە میوانی هاتووم...

کابرای ئەڵمانی کەمێك لە فکران ڕاچوو و ئەوسا گوتی:

– دانیشە.

دانیشتم.

– ئەوە مەی بخۆرەوە.

– مەیەکی باشترم بدەیە!

بەرە بەرە توڕەتر دەبووم

گوتی: – ئەمە مەیەکی باشە.

سەیرم کرد بە جۆرێك لە سەراپام دەڕوانێ، ئەمە زۆری پەست‌و توڕە کردم، بەتایبەتی کە لویزا لەوێ بوو و ئەو دیمەنەی دەبینی، مەیەکەم هەڵداو گوتم:

– دەی کاکی ئاڵمانی! بۆچی لێم پەستی؟ من بۆ شەڕ نەهاتووم، بۆ دۆستایەتی هاتووم.

کابرای ئەڵمانی گوتی:

– من ناتوانم دۆستایەتی تۆ بکەم، تۆ بابایەکی عەسکەر، من‌و عەسکەریان نەوتووە.

کە گوێم لەو قسەیە بوو، چاوم پەڕییە تۆقی سەرم‌و هاوارم کرد:

– هەی داهۆڵی خوێڕی! چما نازانی تۆ لە ژێر دەستی مندای ؟ دەتەوێ بەم دەمانچەیە مێشکت بپژێنم؟.

بە دەم ئەو قسەیەوە دەمانچەکەم لە بەرکم دەرهێناو لە جێی خۆم هەستام‌و لوولەی دەمانچەکەم نا بە لاجانگیەوە. لویزاو پوری نیوە گیان بووبوون، نەدەوێران هەناسە بدەن. کابرای پیرەمێریش وەکو بی ناو ئاو دەلەرزی، ڕەنگ بە ڕوویەوە نەما.

کابرای ئەڵمانی هەوەڵجار حەپەسا، بەڵام هەر زوو بە خۆی هاتەوەو گوتی:

– من لێت ناترسم. تکات لێدەکەم پیاوێکی پیاوانە بەو واز لەم گاڵتەو گەمەیە بێنە. بە هیچ جۆرێ لێت ناترسم.

– درۆ دەکەی. دەترسیت. تەمەشای بکەن! ناوێرێ سەری بە ئاستەمیش بجولێنێ.

گوتی:

– نەخێر،... تۆ ناوێری شتی وا بکەی!

– بۆچی ناوێرم ؟

– چونکە، کاری وا قەدەغەیە، ئەگەر بمکوژیت، توندترین سزا دەدرێی!

که پیاوێکی کەر بوو! چ ئەڵمانیەکی دەبەنگ بوو! ئەگەر بەو قسانە توڕەی نەکردبام، لەوە بوو تا ئێستاش بژی.

پێمگوت:

– یانی تۆ پێت وایە ناوێرم بتکوژم ؟

– نەخێر ناوێری.

– ناوێرم ؟

– نەخێر ناوێری کە....

– کەواتە بگرە هەی باسترمەی هەڵئاوساو!

بە دەم ئەو قسەیەوە دەستم بە پەلە پیتکەی دەمانچەکەمدا ناو، کابرا بەسەر کورسیەکەیدا داڕوخاو کەوت،و ژنەکان دەستیان بە شینو شەپۆڕ کرد.

دەمانچەکەم لە بەرکم نایەوە. کە بۆ سەربازخانەکە گەڕامەوە، دەمانچەکەم توڕدایە ناو گژوگیای بەر دەروازەکە.

گەییمەوە سەربازخانەکە، خۆم بەسەر تەختە خەوەکەمدا داو لە دڵی خۆدا دەمگوت: "هاکا هاتنو دەستگیریان کردم". کەچی سەعاتو دووانو سیان تێپەڕیو کەس بە سۆراغمەوە نەهات. دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ هەستم بە دڵتەنگییەکی زۆرو خەمێکی قورس کرد. دەرچووم. دەمویست هەر چۆنێ بووە لویزا ببینم. بە بەرماڵی یارۆی سەعاتچیدا تێپەڕیم، خەڵکێکی زۆر لەگەڵ چەند پۆلیسێکدا لەوێندەر خڕ بوو بوونەوە... بەپەلە چووم بۆ ماڵی پیرەژنە جلشۆرەکەو پێمگوت: "لویزام بۆ بانگ بکە". لویزا یەکسەرو بەغار هات، دەستی لە ملم کردو بە دەم گریانەوە دەیگوت: "خەتای من بوو کە بە گوێی پورم کرد". ئەوسا لویزا بوی گێڕامەوە کە پوری یەکسەر دوای ڕووداوەکە بۆ ماڵ گەڕاوەتەوەو لە ترسا نەخۆش کەوتووەو، توند زمانی خۆی گرتووەو نە شکاتی لە کەس کردووەو نە ناوی کەسی بردووە، تەنانەت بە برازاکەشی (لویزا) گوتووە کە دەمی خۆی بگرێتو هیچ شتێك نەڵێت، چونکە ترساوە. لویزا گوتی: "چییان لە دەست دێ با بیکەن، خۆ کەس لە کاتی ڕووداوەکەدا، ئێمەی لەوێندەر نەبینیوە ".

سەعاتچییەکە ئەو ڕۆژە کارەکەرەکەی ئیزن دابوو، چونکە زۆری لێدەترسا، ئەگەر بیزانیبا بە تەمایە لویزا بخوازێت، هەردوو چاوی دەردێنا. دوکانەکەش هیچ کرێکارێکی لێ نەبوو بوو، یارۆی سەعاتچی هەموویانی دەرکرد بوو، بە خۆی قاوەو خواردنی بۆ خۆی ئامادە دەکرد. خۆ خزمەکەشی پیاوێکی نەدوو بوو، بە کێردیش زاری هەڵنەدەهێنا. بۆیە شەپقەکەی هەڵگرتبوو و، لە پێش هەمووانەوە ڕۆییشتبوو. لویزا دەیگوت: "دڵنیام ئەم پیرەمێرە قسە ناکات، خۆی بە ساحێبی ئەو مەسەلەیە ناکات". هەرواش دەرچوو. دوو هەفتە بوریو نەك هەر دەستگیر نەکرام،

بەڵکو گومانیشم لێنەکرا. ئەم دوو هەفتەیە خۆشترین ڕۆژانی ژیانم بوو، جا ئەلکساندەر پترۆفیچ باوەڕ بکە لەم دوو هەفتەیەدا هەموو ڕۆژێ لویزام دەبینی، داماوە زۆر هۆگری من بوو بوو! بە دەم گریانەوە پێی دەگوتم: "بۆ هەر شوێنێکت نەفی بکەن، لەگەڵتا دێم، هەموو کەسوکارم بەجێدێڵم‌و ڕەدووی تۆ دەکەوم!". کە وای دەگوت زۆرم بەزەیی پێیدا دەهاتەوە، دڵم بە حاڵی دەسووتا. بەڵام پورەکەی‌و ئەو پیرەمێردە، ئاقیبەت بە دوو قۆڵی خەبەریان لێدام‌و شکاتیان لێکردم‌و دووای دوو هەفتە دەستگیر کرام.

قسەکەم پێ بڕی‌و هەڵمدایە:

– بەڵام باکلۆشین تۆ گوێ بگرە! حوکمی ئەم جۆرە تاوانە هەر دە ساڵ ئەوپەڕی دوانزە ساڵە،و تاوانبار هەواڵەی زیندانی مەدەنی دەکرێت، باشە بۆچی تۆ هەواڵەی (بەشی تایبەتی) کراویت ؟

باکلۆشین گوتی:

– هۆی ئەمە شتێکی ترە، کاتێ بۆ دادگای ئەنجوومەنی سوپایی برام، وەکیلی گشتی کە ئەفسەرێك بوو بە پلەی کاپیتان لە بەردەم دادگادا کەوتە سووکایەتی پێکردنم، کەوتە جنێودانم، منیش بە خۆم نەوەستام، خۆم پێنەگیراو هاوارم بەسەرا کرد: "بۆچی جنێوم دەدەیتێ خوێری؟ چما ئاگات لێ نییە کە لەبەردەم "ئاوێنەی دادپەروەریدا*(٢)"یت؟ ئیدی سکاڵای لەسەر تۆمار کردم‌و سەر لە نوێ‌و لەسەر هەردوو تاوانەکە دادگایی کرامەوەو ئیدی حوکمی چوار هەزار شەلاقم بۆ دەرچوو و بۆ (زیندانی تایبەتی)یان ناردم. بەڵام حەزدەکەم ئەوەش بزانی کە کاتێ منیان بۆ شەلاق خواردن بردە دەرێ، ئەو ئەفسەرەشیان بە سزا دراوی هێنایە دەرێ، لەسەر تاوانێك، پلەو پایە ئەفسەرییەکەیان لێ سەندبووەوەو وەکو سەربازی رووت بۆ قەفقازیان دەنارد. خوا حافیز ئەلکساندەر پترۆفیچ، لە بیرت نەچێ بێی بۆ تەمەشای شانۆنامەکەمان.

***پەراوێز:***

*١– کڵاوێکی بچووکی قوتووئاسا: ئەم کڵاوە شەش پاڵوە، لەلای جوولەکان ڕەمزی هەیکەلی سلێمانەو، دە ئامۆژگارییەکەی تیادا تۆمار کراوە.*

*٢– ئاوێنەی دادپەروەری: ئەمە لەسەر مێزی هەموو دادگایەکی رووسیادا هەبوو، بریتی بوو لە مەنشورێکی سێ گۆشە بەسەر پشتی هەڵۆیەکی زێڕینی دوو سەرەوە بوو، هەر روویەکی مەنشورەکە ئەو فرمانەی بتروسی گەورەی پێوە بوو کە دەربارەی چۆنیەتی دادگایی کردن‌و مافی هاووڵاتیان دەری کردبوو. جا ئەم ئاوێنەیە نیشانەو ڕەمزی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەت بوو لە هەموو جێیەکدا،و ئەمری بەوە بوو کە ئەوپەڕی ئەدەب‌و نەزاکەت بەکار ببرێت.*

((١٠))

## جەژنی سەری ساڵ

ئەنجام جەژنی نوئێل هات. زیندانییان مەگەر بە دەگمەن دەنا رۆژی عارفە، یانی رۆژی بەر لە جەژن نە دەچوونە سەرکار. ئەوانەی کاری بەرگ دروونو خەیاتیان دەکرد دەچوون بۆ کارگەکانیان، ئەوانی دی هەرکە لە شوێنی کارکردندا خڕ دەبوونەوە، ئیدی یەك یەكو دەستە دەستە بۆ زیندان دەگەڕانەوە. کە لە فراڤین دەبوونەوە ئیدی دەستیان بە هیچ کارێکەوە نەدەدا. بەشێکی زۆری زیندانییەکان، لە بەیانییەوە، خەریکی کاری تایبەتی خۆیان دەبوون، کەسیان گوێیان بە بێگارو سوخرەی ئیدارەی زیندان نەدەدا، هەندێ خەریکی ئەوە دەبوون بە هەر فێڵێ بووە مەشرووباتی قاچاغ بێننە ناو زیندان، هەندێ عەودالی مەشرووبی زیاتر دەبوون، هەندێ داوای مۆڵەتی دەکرد دۆستانی خۆی لە پیاوو لە ژن ببینێ، هەندێ کاری بۆ خەڵکی کردبووو کرێیەکەی وەرنەگرتبوو،و دەگەڕاو وردە قەرزەکانی کۆ دەکردەوە. باکلۆشینو ئەو زیندانییانەی کە بەشدارییان لە سازدانی ئاهەنگە شانۆییەکەدا دەکرد، هەوڵیان دەدا، قەناعەت بە هاورێکانیان، بەوانەی کە خزمەتکاری ئەفسەران بوون بێنن، کە جلو بەرگی پێویستیان بە ئەمانەت بۆ پەیدا بکەن.

لە نێو زیندانییەکاندا خەڵکانێك هەبوون سەرگەردانو بێهودە دەهاتنو دەچوون، ئەمەیان تەنیا لەبەر ئەوە دەکرد کە دەیانبینی خەڵکانی دی زۆر سەرقاڵو شپرزە دێنو دەچن. کەس قەرزارییان نەبوو تا بەتەما بن قەرزەکانیان وەربگرنەوە، کەچی وێڕای ئەوەش وایان دەنواند گوایە چاوەڕانن شتێك وەربگرن، بە کورتیو کرمانجی وا دەهاتە بەرچاو کە سبەینێ رووداوێکی نا ئاسایی، گۆڕانێك روو دەدات. ئێوارێ سەربازە دێرینەکان (نوقستانانی جەنگ) کە زیندانییەکان رایان سپارد بوون لە بازاڕ خواردەمەنی وەکو گۆشتی گاو، بێچوە بەرازو قازیان بۆ بکڕن، بە خۆو راسپاردەکانیانەوە لە شار گەڕانەوە. زۆربەی زیندانییەکان، تەنانەت ئەوانەیش کە بە تەبیعەت رژدو رەزیل بوونو قەت تاقە کۆبکیکیان بە بێهودەو بە خۆڕایی خەرج نە دەکردو بە درێژایی ساڵ پارەکانیان پاشەکەوت دەکرد، باوەڕیان وابوو کە دەبێ لەم رۆژەدا دەست کراوەو دڵاوا بنو جەژنێکی شایستە بە شەوی نوئیل بگێڕنو لە هیچ شتێکدا بێ دڵی خۆیان نەکەن. چونکە سبەینێ بەلای زیندانییەکانەوە جەژنی راستەقینەی خۆیان بوو، مافیان هەبوو، جەژنێ بوو فەرمیو یاسایی، بە درێژایی ساڵ تەنیا سێ رۆژی وەکو ئەم رۆژە هەبوو.

کێ دەیزانی لە رۆژێکی وەکو ئەم رۆژەدا چ یادگارو بیرەوەرییەك، لە دڵو دەروونی ئەو قەرەبەختانەدا، ئەو بێزراوو دوورخرانەدا سەری هەڵدەدایەوەو هەڵدەچووو سەرڕێژ دەبوو؟ خەڵکەکە هەر لە منداڵی ڕا ئەوەیان لە لاچەسپی بوو کە رۆژانی جەژنە گەورەکان رۆژانی پیرۆزن،و رێزو سامو تامی خۆیان هەیە، بۆیە دەبوایە زیندانییەکان بەو پەڕی خەمینیو نیگەرانیو پەشێوی یادی ئەو رۆژانەیان بکردایەتەوە، کە خەڵکی نەدەچوونە کارو ئیشو لە باوەشی ماڵباتو خێزانی خۆدا ئارامیان دەگرت، پشوویان دەدا. بۆیە زیندانییەکان خۆ بەخۆ

ڕێزی جەژنیان دەگرتو وایان هەست دەکرد بەم ڕێزگرتنو جەژن کردنە، درێژە بە پەیوەندی خۆیان دەگەڵ جیهانی دەرەوەدا دەدەن. تەنانەت ژمارەی سیامەستانیش لەو ڕۆژەدا کەمتر دەبوون، ئیدی زۆربەی هەرە زۆری زیندانییەکان بەبێ ئەوەی ئیشێکی ئەو تۆیان هەبێ، خۆیان خەریك دەکردو جۆرە جدیەتێکیان دەنواند. تەنانەت خەڵکە سێبەندیەکەش خۆیان قورس دەگرت... و هەموو شتێك جددی دەهاتە بەرچاو... لە تۆ وایە پێکەنینو فشقیات قەدەغەیە. ئیدی کپیو مەندییەکی سەیر باڵی بەسەر زیندانەکەدا کێشابوو، کوڕم دەیویست ئەو ئارامیو مەندییە بشێوێنێ، بە هەموو زیندانییەکان بە گژیا دەچوونەوە، قۆڵیان دەگرتو بە بۆڵە بۆڵو جنێوان بۆ شوێنەکەی خۆیان دەبردەوە، زۆری لێ توڕە دەبوون، وەکو ئەوەی بێ ڕێزی دەرهەق بە جەژن کرد بێت. ئەوە حاڵەتێکی دەروونی ئاشکراو زەقو لە هەمان کاتدا خەمناکەو لە هەر زیندانییەکدا بەدی دەکرێت. بۆیە کە بە تەبیعەتو خۆ بەخۆ ڕێزی ئەم ڕۆژە مەزنەیان دەگرت، هەستیان دەکرد بەم کارەیان درێژە بە پەیوەندی خۆیان دەگەڵ جیهانی دەرەوەدا دەدەن، و نابێزرێنو بە بچووكو سووك تەمەشا ناکرێن، فەرامۆش ناکرێن، مادامێکی لە زینداندا وەکو خەڵکانی ئازادی دەرەوە، بەو بۆنەیەوە جەژن دەگێڕن. هەموو زیندانییەکان هەست بەمە دەکەنو ئەم هەستەیان لەلایە، من بەخۆم ئەمەم دەبینیو هەستم پێدەکرد، تێی دەگەییشتم.

(ئاکیم ئاکیمیچ)ش کەرەستەو پێداویستیەکانی جەژنی ئامادەکرد بوو، ئاکیم ئاکیمیچ هیچ بیرەوەرییەکی خۆشی لەگەڵ جەژنی نوئیلدا نەبوو، چونکە بە هەتیویو لە ماڵاندا لە دایك بوو بوو، بە پازدە ساڵی بووبوو بە عەسکەر. لە ژیانیا هەستی بە خۆشی گەورە نەکرد بوو، چونکە ژیانێکی ڕۆتینی بەسەر بردبوو، هەموو هۆشو گۆشی لای ئەوە بوو بوو لە دابو نەریتان لا نەداتو پابەندو گوێڕایەڵو ملکەچ بێت، بیرو باوەڕێکی ئاینی بە هێزیشی نەبوو. ئەم پابەندیو ڕۆتینکاریە هەموو هەستو ئارەزووو ئامانجو بەهرە مرۆڤانیەکانی بە چاكو خراپەوە لەلا سڕی بووەوە بۆیە بە دوور لە هەر جۆشو خرۆشو سۆزو گودازێك خۆی بۆ جەژنی نوئێل ( سەری ساڵ ) ئامادە دەکردو ئەم کارە هیچ بیرەوەرییەکی لەلا نە دەوروژاند. تەنیا وەکو عادەتو بۆ ئەوەی هیچ گلەییو گازاندەیەکی کۆمەڵایەتی نەیەتە سەر ئەم ڕێوڕەسمەی جەژنی جێبەجێدەکرد. ئیدی ئاکیم ئاکیمیچ حەزی نەدەکرد زۆر بە تانی شتاندا بچێتو لە بنجو بناوانیان بکات. کە دەهاتە سەر جێبەجێکردنی یاساو ڕێسایانو ڕێوڕەسمان، ناوەڕۆکی شتەکەی بەلاوە گرینگ نەبوو، تەنیا وەکو شتێکی ڕواڵەتی وەری دەگرتو جێبەجێی دەکرد، ئەوەی ئەمڕۆ جێبەجێی دەکرد، ئەگەر سبەینێ داوای لێکرابا پێچەوانەکەی جێبەجێ بکات، بە هەمان گوێڕایەڵیو بە هەمان وردیو بێ چەندوچوون جێ بەجێی دەکرد. لە هەموو ژیانیا تەنیا یەك جار بە دڵی خۆی کرد بوو، ئەو جارەش بووە مایەی ئەوەی قوڕی بەسەردا بکرێو حوکمی ئەبەدی بدرێو لە بێگارەزیندان توند بکرێ. ئیدی ئەوە بۆی بوو بە دەرسو عیبرەت. هەرچەندە ئەوەندە زیرەكو ئاقڵ نەبوو کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە تاوانەکەی خۆی بگاتو بچێتە بنجو بناوانیو پەی بە هۆو ئەنجامەکەی بەرێتو بزانێ هەڵەکەی لە چیدا بووە، بەڵام ئەو قەناعەتەی لا دروست

بوو بوو کە سەلامەتی ئەو لە بیر نەکردنەوەدایە، چونکە کابرایەکە ئەقڵی بە هیچ شتێکدا ناشکێت‌و هیچ بڕیارێکی راستی پێنادرێت.

ئیدی بە چاولێکەری خەڵکەکە خەریکی ئەنجامدانی رێوڕەسمی جەژن بوو، تەنانەت بە رێزەوە دەیڕوانیە ئەو بێچوە بەرازەی کە ناو سکەکەی پڕکردبوو لە ساوارو بە دەستی خۆی سووری کردبووەوە ( شارەزایی لە ئاشپەزیدا هەبوو ). جا ئەم کودەڵەیەی (بێچوە بەرازی شیرە خۆرە) کە بۆ خواردنی جەژن ئامادەی دەکرد، لەو بەرازە ئاساییانە نەبوو، هەرکاتێ بتەوێ، بتوانی بە ئاسانی لە بازاڕا پەیدای بکەیت‌و سووری بکەیتەوە، ئەم کودەڵانە بە تایبەتی بۆ جەژنی نوئیل دادەنران‌و دەفرۆشران. یانی خواردنی کودەڵە لە جەژنی سەری ساڵدا باوبوو. ئیدی پێدەچوو ئاکیم ئاکیمیچ هەر لە منداڵییەوە بەوە ڕاهاتبێ لە جەژنانی سەری ساڵدا کودەڵە لە سەر سفرەوخوان ببینێ‌و ئیدی ئەو قەناعەتەی لا دروست بوو بوو کە جەژن بە بێ کودەڵە نابێت، کودەڵەو جەژن، جەژن‌و کودەڵە بەبێ یەکتر نابن. من دڵنیام ئەگەر لە جەژنی سەری ساڵدا ئەم جۆرە گۆشتەی نەخواردبا، بە درێژایی تەمەن هەستی بە عەزابی ویژدان دەکرد، چونکە بە خەیاڵی خۆی سەرپێچی کردووەو لە داب‌و نەریتی باو لایداوە. ئاکیم ئاکیمیچ بە درێژایی ئەو ماوەیە هەر چاکەت‌و پانتۆڵە کۆن‌و شڕۆڵەو پینە پیناویەکانی لەبەر دەکرد. پاشان بیستم کە چوار مانگێك لەوە پێش جلی تازەی وەرگرتبوو، بەڵام هەر بەو دەقەوە لە باوڵەکەی نابووو دەستی تێوە نەدابووو بۆ ڕۆژی جەژنی هەڵگرتبوو. هەرواشی کرد، شەوی جەژنە، باوڵەکەی دەکاتەوە، جلە تازەکانی دەردێنێ، لەسەر تەختە خەوەکەی هەڵیاندەخات، بە وردی ئەم دیوو ئەو دیویان دەکات، دەیان تەکێنێ. ئەوجا بۆ تاقیکردنەوە لە بەری کرد، رێك پڕ بە بەری بوو، هیچ عەیبی نەبوو. دوگمەکانی ئێلەکەکەی هەموو جوان دادەخران، یاخەکەی رەق وەکو مقەوا دەوەستا. دروونی چاکەتەکەی عەسکەرییانەیە. بزەیەکی شادی کەوتە سەر سیمای ئاکیم ئاکیمیچ، بە کەش‌و فشەوە بە دەوری خۆیدا سوڕایەوە، لە ئاوێنە بچکۆڵەکەی خۆیدا، کە دەمێ بوو چوار چێوەیەکی زەردی تێ گرتبوو، تەمەشایەکی خۆی کرد. دوگمەیەکی ئیلەکەکەی لە جێی خۆی نەبوو، ئاکیم ئاکیمیچ هەستی پێکرد، لێبڕا چاکی بکات، کە لێ بووەوە، جارێکی دی ئیلەکەکەی تاقیکردەوە، ئەمجارەیان هیچ عەیبێکی نەبوو. هەنگێ دەستە جلەکەی قەد کردەوەو ئاسوودە بیرو دڵڕەحەت لە باوڵەکەی نایەوە، تا سبەینێ لەبەری بکات. هەرچەندە سەری تاشرابوو، بەڵام کە جوان دیقەتی دا، بینی زۆر ساف نیە، بۆیە بەلەز چوو بۆ لای مێجەر تا دەستور بدات سەری بۆ بتاشن. ئەگەرچی دەیزانی سبەینێ نە کەس ئەوی لە بیرەو نە کەس تەمەشای سەرو سیماو جل‌و بەرگەکەی دەکات، کەچی هەر بۆ دڵی خۆی‌و ئاسوودەیی ویژدان هەموو ئەو کارانەی ئەنجام دابوو. نەریتی جەژن وایدەخواست. ئەم هەموو بایەخدانە بە بچووکترین دوگمەو بێ بایەخترین قەیتان‌و سەرشان، خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوە بوو لە ناخی دڵەوە ئەم کارەی بە ئەرکێکی بێ چەندوچوون دەزانی‌و هەموو پیاوێکی بەرێز لە سەرێتی بۆ جەژن دەست بە خۆیدا بێنێ‌و جا ئاکیم ئاکیمیچ بەو حەساوەی کە کۆنترین زیندانی قاوشەکە بوو کرا بوو بە دەم سپی قاوشەکە، بۆیە داوای لە یەکێك لە زیندانییەکان کرد هەندێ کا بە

زەمینەی قاوشەکەدا وەربکەن. ئەم کارە لە هەموو قاوشەکاندا دەکرا. نازانم بۆچی هەمیشە لە جەژنی سەری ساڵدا کایان بە ژوورو قاوشەکاندا دەکرد. ئاکیم ئاکیمیچ کە بەو جۆرە لە کاری رۆژانەی بووەوە، نوێژەکانی کردو هەنگێ لە سەر تەختە خەوەکەی پاڵکەوتو وەکو منداڵ، هێمن‌و ئارام خەوت تا سبەینێ، بەیانی زوو لە خەو ڕابێت. هەموو زیندانییەکانی دیکەش چاویان لەو کرد. هەموو زیندانییەکانی ئەو ئێوارەیە دەستیان لە کاری ئاسایی خۆیان هەڵگرت‌و لە جاران زووتر چوونە جێگاوەو نووستن. خۆ یاری قومارو وەرەقە، کوڕم دەویست بوێرێ ناوی بێنێ. هەر هەموو زیندانییەکان چاوەڕوانی سبەی بەیانیان دەکرد. ئەنجام بەیانی هات!... بەر لە هەڵاتنی هەتاو تەپڵی ڕابوون لێیدا. دەرگاکانی زیندان کرانەوە، ماموری چاودێری‌و سەرژمێریی زیندانییەکان وەژوورکەوت، سڵاوو جەژنە پیرۆزەی لە زیندانییەکان کرد. زیندانییەکانیش وەڵامیان دایەوەو، بە ئەدەب‌و رووخۆشی‌و، لە ناخی دڵەوە پیرۆزباییان لێکرد. ئاکیم ئاکیمیچ‌و چەند زیندانییەکی دیکە کە قازو کودەڵەیان هەبوو، پاش ئەوەی بە پەلە پەل نوێژەکانیان کرد، خێرا بەرەو ئاشخانەکە چوون تا بزانن قوربانیەکانیان کوڵاوە نە کوڵاوە، گەییوەتە چی. لە پەنجەرە چکۆلەکانەوە، کە تانیوەیان بەفرو زوقم بوو، لە قاوشەکانەوە، لە نێو تاریکییکەوە، بڵێسەی ئەو ئاگرانە دەبینران کە لە هەر شەش ئاگردانەکەی هەردوو ئاشخانەکەوە بەرز دەبوونەوە. زیندانییەکان پاڵتۆکانیان بەشانیاندا دابوو،و خۆیان گۆڕی بوو، بە ناو حەوشی زیندانەکە کەوتبوون‌و بەلەز بەرەو ئاشخانەکە دەچوون. ژمارەیەکی کەمیان توانیبوویان لەو بەینەدا خۆ بگەیەننە مەیفرۆشەکان. ئەوانە بێ سەبرتریان زیندانییانی زیندانەکە بوون. زیندانییەکان، ئەمڕۆکە. لە رۆژان سەلارو سەنگین تر بوون، نە شەڕو قەرقەشەت دەبینی‌و نە گوێت لە سخێف‌و جنێوان دەبوو. هەموو کەسێك دەیزانی کە ئەمڕۆ رۆژێکی مەزن‌و شکۆدارە، جەژنێکی گەورەیە. تەنانەت هەندێ لە زیندانییەکان بۆ جەژنە پیرۆزە لە هاوڕێکانیان دەچوون بۆ بەش‌و قاوشەکانی دیکەی زیندانەکە. پێدەچوو لەو رۆژەدا جۆرە دۆستایەتیەکیان لە نێواندا دروست بووبێت. پێشتر بە شێوەیەکی لامسەرلایی، ئەو سەرنجەم لا چێ بوو بوو کە زیندانییان نە پەیوەندی گشتی‌و نە پەیوەندی تایبەتیان لە نێواندا دروست نابێ. زۆر بەدەگمەن پەیوەندی لە نێوان زیندانییەك‌و زیندانییەکی دیدا دروست دەبوو، وەکو ئەمە لە دەرێی زینداندا روو دەدات. بە شێوەیەکی گشتی لە نێو یەکتر‌داو لەگەڵ یەکتردا خراپ بووین، جگە لە هەندێ حاڵەتی زۆر دەگمەن، بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندیمان خۆش نەبوو. ئەوە رێسایەکی گشتییەو زیندانییان لێی لانادەن. منیش لە قاوشەکە وەدەرکەوتم، تازە دنیا رووناك دەبووەوە ستێران زەرد هەڵدەگەڕان‌و بەرەو ئاوابوون دەچوون. تەنکە تەمێکی ساردو تەزی لە ئەرزەوە بەرز دەبووەوە، دووکەڵ، پێچاو پێچ، هەور ئاسا لە دووکەڵکێشی ئاگردانەکانەوە بۆ ئاسمان بەرز دەبووەوە. چەند زیندانییەکم تووش بوون، زۆر بە میهرەبانی ودۆستانە پیرۆزبایی جەژنیان لێکردم، منیش سوپاسم کردن‌و جەژنە پیرۆزەم لێکردن، خەڵکانێکیان تیا بوو، کە پێشتر هەرگیز زاریان لە زارم نەگەڕابوو. کە گەییمە بەردەرگای مووبەقەکە، یەکێك لە زیندانییانی قاوشی سوپایی کە پاڵتۆ فەروەکەی بەشل‌و شێواوی دابوو بە شانیاو، لە ناوەندی حەوشەکەوە بەدی

کرد بووم، بە غار بەرەو رووم هاتو بانگی لێکردم: "ئەلکساندر پترۆفیچ! ئەلکساندر پترۆفیچ!"و بە هەشتاو بەرەو مووبەقەکە (ئاشخانە) هات. وەستامو چاوەڕوانم کرد. کوڕێکی گەنجی دەمو چاو خڕی، نیگا میهرەبانو چاو جوان بوو، زۆر کەمدووو گۆشەگیر بوو، تا ئەو کاتە تاقە قسەیەکی دەگەڵ من نەکرد بوو، هیچ بایەخێکی پێنەدا بوومو تەنانەت ناویشیم نە دەزانی. بە هانکە هانك بەرەو لای من هات، لە بەردەممدا ڕەق ڕاوەستا، بزەیەکی گەوجانە کەوتە سەر لێوی،و جۆرە شادیو خۆشییەك نیشتە سەر سیمای. بە نیمچە سەرسامییەك لێم پرسی:

– چیت دەوێ ؟

بە هەمان زەردەخەنەوە لە بەردەممدا وەستا بوو، پڕ بە هەردوو چاو نیگای دەکردم،و حۆلو حەپەساو هیچی نەدەگوت. ئەوسا مینگە مینگێکی کردو گوتی:

– چۆن ؟ ئەمڕۆ جەژنە...

کە زانی هیچی پێ نیە بیڵێ، بە جێی هێشتمو بە هەشتاو خۆی بۆ ناو مووبەقەکە کوتا. پێویستە ئەوەش بڵێم کە تا تەواو بوونی ماوەی زیندانییەکەم چ قسەیەکی ترمان نەکەوتە نێوان. ئاپۆڕەی زیندانییان، سەرقاڵو پەشێواو دەوری ئاگردانی مووبەقەکەیان دابوو. هەرکەسەو چاودێری بەشە خۆراکی خۆی دەکرد. ئاشپەزەکان، خواردنی ئاسایی زیندانییەکانیان ئامادە دەکرد، چونکە ئەمڕۆکە فراڤین لە ڕۆژانی دی زووتر دەخورا. هێشتا کەس هیچی نەخوارد بوو، هەموو بە ناشتا بوون، هەموو ئاو زابووە دەمیان، بەڵام لە ترسی گلەییو زەرورەتی پابەندی بەدابو نەریتەوە ناچار بوون سەبربکەن ، چاوەڕوان بکەن. چاوەڕوانی کەشیشیان دەکرد، چونکە بەر لە هاتنی ئەو نەدەکرا ڕۆژوو بشکێنرێ. هەرکە ڕۆژ هەڵات، عەریفو سەرجۆخەکان لەو دیوی دەروازەی زیندانەکەوە کەوتنە بانگکردنی ئاشپەزەکان کە بچن بۆ لای ئەوان. ئەم بانگکردنە نزیکەی دوو دانە سەعاتی بەردەوامی خایاند. مەبەست لەو بانگکردنە ئەوە بوو کە ئاشپەزەکان بچن ئەو خێرو سەدەقە زۆرەی کە لە هەر چوار نکالی شارەوە بۆ زیندانییەکان دەهات، وەربگرن. ئەو خێرو دیاریانە بریتی بوون لە: نانی سپی، کێك، کولیچەو ئیشی هەویرو شیرینیو خواردنو خۆراکی هەمە جۆر. پێموایە هیچ کەیبانۆیەك، هیچ دوکاندارو فرۆشیارێك نەدەما، لە سەرانسەری شاردا بە بۆنەی جەژنەوە شتێك بۆ زیندانییانی "قەرەبەخت" نەنێرێت. ئەم خێرو سەدەقانە شتی زۆر بە نرخو گرانبەهایان تێدا بوو: نانێکی زۆر لە باشترین ئارد، شتی هەرزانیشیان تیابوو وەك: کولێرەی سپی دوو کۆبیك بایی، یان کولێرە چەورەی بۆر. ئەوە دیاریی هەژار بوو بۆ هەژار. دیارە ئەم خێرو دیاریانە بە هەرزانو گرانیانەوە، بەوپەڕی منەتباریو سوپاسگوزارییەوە وەردەگیرانو قەبووڵ دەکران. ئەو ئاشپەزانەی کە دیاریو خێراتەکانیان وەردەگرت، بەرێزەوە کڵاوەکانیان بۆ خێرخواوخێرەومەندەکان دادەکەندو سوپاسیان دەکردنو جەژنە پیرۆزەیان لێدەکردنو هیوای شادیو بەختەوەریان بۆ دەخواستنو ئەوجا خێراتەکەیان بۆ مووبەقەکان دەگواستەوە. کە نانو خۆراکێکی زۆر کەڵەکە دەبوو، ئەوجا دەم سپی گشت ژوورو قاوشەکان بانگ دەکرانو هەرکەسەو بەشی ژوورو قاوشی خۆیان وەردەگرت. ئەم دابەشکردنە هیچ قەرقەشەو دەمەقاڵەیەکی لێنەدەکەوتەوە، چونکە بە یەکسانیو

دادپەروەرانە ئەنجام دەدرا. ئاکیم ئاکیمیچ، بە هاوکاری زیندانییەکی دی، دەستی بە دابەشکردنی بەشە خێراتی قاوشەکەی خۆمان کرد، بە دەستی خۆی بە سەر یەك بە یەکی زیندانییەکاندا، دابەشی دەکرد. ئیدی هەموو زیندانییەکان رازی بوون، نە خوتەیەك‌و نە بۆڵەیەك دەبیسترا، نە گلەیی‌و نە گازاندەیەك دەبینرا، نە بەغیلی‌و نە حەسوودییەك دەنوێنرا، نە کەسێك پەنای وەبەر قاچ‌و قووچ‌و حیزەدزی دەبرد. کە ئاکیم ئاکیمیچ لە کاروباری مووبەق‌و دابەشکردنی نان‌و خۆراك بووەوە، هەستیکرد وەختی ئەوە هاتووە دەستێ بە خۆیدا بێنێ‌و خۆی بگۆڕێت، ئەدی مەعنای چی! جەژنە جەژن. بەو پەڕی بایەخەوە جلە تازەکانی لەبەر کرد، هەموو دوگمەی ئێلەکەکەی داخست،و، کە خۆی گۆڕی دەستی بە نوێژ کرد، ئەمە مودەتێکی زۆری خایاند. گەلێك لە زیندانییەکان فەرزە ئاینییەکانیان ئەنجام دەدا، بەڵام زۆربەیان خەڵکە بە تەمەن‌و پیرەکان بوون، گەنجەکان زۆر گوێیان بە عیبادەت‌و نوێژ نەدەدا، ئەوپەڕەکەی کە لە خەو ڕادەبوون، نیشانەیەکی خاچیان دەکێشا. تەنانەت ئەمەشیان هەر لە ڕۆژانی جەژندا دەکرد.

کە ئاکیم ئاکیمیچ، لە نوێژو سرووتە ئاینیەکان بووەوە، بەوپەڕی هێمنی هات بۆ لای من تا جەژنە پیرۆزەم لێبکات. یەکسەر خوڵك‌و دەعوەتی چام کرد، ئەویش دەعوەتی گۆشتی بەرازی کردم. دوای تۆزێك پترۆف بە هەشتاو هات تا پیرۆزبایی جەژنم لێبکات. پێدەچوو کەمێکی خواردبێتەوە، کەمێك لە بەردەممدا وەستا، نیگایەکی سەراپای کردم، هیچی نەگوت‌و بەلەزو بە غاردان بەرەو مووبەقەکە رۆیی. زیندانییانی قاوشی سوپایی لەو کاتەدا خۆیان بۆ پێشوازی کەشیش ئامادە دەکرد. ئەم قاوشە وەکو قاوشەکانی دی دروست نەکرا بوو. تەختە خەوەکان لە بن دیوارەکاندا ریزکرابوون نەك لە ناوەندی هۆڵ‌و قاوشەکەدا، بۆیە تاقە قاوش بوو کە ناوەندەکەی قەرەباڵغ نەدەبوو، بە بۆچوونی من بۆیە وایان کردبوو تا بتوانن جارجارو لە کاتی پێویستدا زیندانییەکان لەوێ کۆبکەنەوە. زیندانییەکان مێزێکیان لە ناوەندی قاوشەکەدا دانابوو، ئیکۆنەیەکیان لە سەری دانابووو، چرایەکی بە دیارەوە دەسووتا. کەشیش ئەنجام بە خاچ‌و ئاوی موفەڕکەوە هات. لەبەردەم ئیکۆنەکەدا وەستاو سرووتی عەشای ڕەبانی ئەنجام دا، ئەوجا ئاوڕی لە زیندانییەکان دایەوەو یەك لە دووی یەك دەهاتن‌و خاچەکەیان ماچ دەکرد. کەشیشەکە، دوای ئەوە بە گشت ژوورو قاوشەکانی دیکەدا کەوتە گەڕان‌و ئاو پرژێنیان بە ئاوی موفەڕك (پیرۆز). ئەوجا سەرێکی مووبەقی داو ستایشێکی زۆری زیندانەکەی کرد کە لە سەرانسەری شاردا بەناو بانگ بوو، زیندانییەکان، بۆ نیشاندانی سوپاسگوزاری خۆیان لێبڕان دوو نانی تازەی گەرمی بە دیاری بۆ بنێرن،و یەکێك لە سەربازە نوقستانەکانی جەنگیان راسپارد کە یەکسەر بۆی بگەیەنێتە ماڵەوە. زیندانییەکان وەکو چۆن بە ڕێزو نەوازشەوە پێشوازی خاچەکەیان کردبوو بەو ئاوایەش بەڕێیان کرد. دوای تۆزێك مێجەرو فەرمانڕەوای زیندانەکە هاتن بۆ لامان . زیندانییەکان فەرمانڕەوایان (ئامر) زۆر خۆش دەویست‌و ڕێزیان دەگرت. بەو دوو قۆڵی سەری هەموو ژوورو قاوشەکانیان داو پیرۆزبایی جەژنیان لە زیندانییەکان کرد. فەرمانڕەوا خۆی بە مووبەقەکەدا کردو کەمێکی لە شلەی کەلەرمەکەش چەشت. بە ڕێکەوت ئەو رۆژە شلەکە زۆر بەلەزەت بوو بوو: هەر زیندانییەك نیو ڕەتڵ گۆشتی

پێدەبڕا، ئەمە جگە لەوەی کە جریشێکی چەوریش ئامادە کرابوو. مێجەر، فەرمانڕەوای تا بەر دەرگا بەرێکردو، فەرمانی دا کە زیندانییەکان فراڤین بخۆن. زیندانییەکان خۆیان لە مێجەر دەشاردەوە، حەزیان لە چارەی نەدەکرد، حەزیان نەدەکرد بکەونە بەرچاوە ڕقنەکانی کە لە پشت عەینەکەکەیەوە، بە چاوی چاودێریو جاسووسی تەمەشای دەکردن،و بەراستو بە چەپدا چاوی دەگێڕا وەك ئەوەی بۆ ئاژاوەیەك بگەڕێ تا دایمکرێنێتەوە یان بۆ تاوانبارێك بگەڕێ تا سزای بداتو تەمێی بکات.

زیندانییەکان کەوتنە نانخواردن. بێچوە بەرازەکەی ئاکیم ئاکیمیچ زۆر جوان سوور بوو بووەوە. تا مێجەر لێرە بوو، سەرانسەری زیندانەکە کڕوکپ بوو، نە ورتەیەك نە سرپەیەك لە کەسەوە نەدەهات. بەڵام هەرکە مێجەر ڕۆیی، دوای پێنج دەققەیەك هەر سەرخۆش بووو بە سەرخۆشی دەگوت بەولاوە، نازانم ئەم هەموو سەرخۆشە لە کوێوە پەیدا بوون. سەیری هەر کەسێکت دەکرد لە سەرخۆشیدا دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو! نەخێر زۆری پێنەچوو دەنگی (بالالایکا)ش بەرز بووەوە. کابرای پۆڵاندی کورتە باڵا بە خۆیو کەمانچەکەیەوە دوای زیندانییەکی دەوڵەمەند کەوتبوو، کە بۆ هەموو ڕۆژەکە بە کرێی گرتبووو،و ئاوازی شادی بۆ لێدەدا. ژاوە ژاوو هەراو زەنا بەرز بووەوە. بەڵام باش بوو فراڤینەکە بە سەلامەتیو بەبێ وەی تەواو بوو. هەموو مڕ بوون. زیندانیە بە تەمەنو ماقوولەکان، دەچنە سەر جێگاکانیان تا پاڵ بکەونو چاوێك گەرم بکەنو سەر خەوێ بشکێنن... (ئاکیم ئاکیمیچ)ش کە لەوە دەچوو پێی وابێ پیاو دەبێ پاش نیوەڕۆی ڕۆژانی جەژن سەر خەوێك بشکێنێ چاوی لەوان کرد.کابرا دیندارەکەی (ستارودوب)ش دوای ئەوەی کەمێك پاڵ کەوتو چاوێکی گەرم کرد، هەستاو چوو بۆ لای سۆپاکە، کتێبەکەی خۆی کردەوەو بە درێژایی ڕۆژەکەو بڕێك لە شەوەکەش، لە یەکبینە، لە پەستاو بێ بڕانەوە هەر خەریکی خوێندنەوە بوو. دەیگوت ئەم دیمەنە (حەیابەرە)یەی زۆر پێناخۆشو لەبەر گرانە، هەموو چەرکەسییەکان پێکەوەو لەبەر دەرگاکە دانیشتبوونو بە کونجکاویو بە جۆرە بێزارییەك دەیان ڕوانیە ئەو پیاوە مەستانە. تووشی نورا بووم، بە نارەزییەوە سەری بادەداو دەیگوت: "ئامان... ئامان... ئامان... خوا غەزەبمان لێدەگرێ !"... ئەشعیا فومیچ لە سووچێکەوە مۆمێکی پێکردو بە کەشو فشێکی دەستکردەوە کەوتە کارکردن تا ئەوە نیشان بدات کە ئەمڕۆ جەژنی ئەو نیە. پێڕی قومار لێرەو لەوێ دامەزرا. زیندانییەکان لە سەربازە نوقستانەکانی جەنگ نە دەترسان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەفەریان لەبەر دەرگاکان دانا، تا نەبادا عەریف خەفەر لە پڕێکا بدات بەسەریاندا، هەرچەندە ئەگەر بشهاتبایە بە سەراو بە قومارەوە دیتبانی خۆی لە گێلی دەداو چاوپۆشی لێدەکردن. عەریف خەفەر، بە درێژایی ڕۆژەکە تەنیا دوو سێ جار سەری دا، هەرکە لە دوورەوە دەردەکەوت خێرا سەرخۆشەکان لە پەناو پەسێراندا خۆیان دەشاردەوەو کۆڕی قومارو وەرەقەکانیش لە چاو تروکانێکدا دەپێچرایەوە. بە مەزەندەی من عەریف خەفەرو زابت خەفەرەکان بە ئانقەست چاوپۆشیان دەکردو لە ئاستی سووکە سەرپێچیاندا خۆیان لە گێلی دەدا. بۆ نموونە مەستی لە ڕۆژێکی وادا تاوانو سەرپێچییەکی گەورە نییە. بەرە بەرە شادی باڵی بەسەر هەموو زیندانییەکاندا کێشا. قەرقەشەو دەمەقاڵێ دەستی پێکرد. بەڵام

زۆربەیان هێشتا بە ئاگاو ئارام بوون. ئەلهەقی بینینی سەرخۆشان خۆی لە خۆیدا مایەی پێکەنینە. سەرخۆشەکان زۆریان دەخواردەوە، ئیدی بە جارێ خۆیان بەردا بوو. رۆژ رۆژی گازین بوو، بە خۆشیو شادییەوە بە بەر تەختە خەوەکەیدا دەهاتو دەچوو، مەشرووباتەکەی لە ژێر تەختە خەوەکەیدا شاردبووەوە. پێشتر مەشرووباتەکەی لە دەرێی قاوشەکەداو لە جێیەکی نهێنی، لە ژێر بەفرا شاردبووەوە. ئیدی کە دەیبینی مشتەری وەکو داڵ تێی دەوروکێن، لە کەیفان لە پێستی خۆی نەدەهێوری. خۆی هیچی نەخوارد بووەوە، چونکە بەنیاز بوو لە دوا رۆژی جەژنداو دوای ئەوەی هەموو زیندانییەکانی جۆرِ دەداو گیرفانی بەتاڵ دەکردن، هەنگێ بە ئارەزووی دڵی خۆی بخواتەوە . بەرە بەرە لێرەو لەوێ لە نێو قاوشەکەدا دەنگی سازو گۆرانی بەرز بووەوە، چونکە قامبێژەکان زۆریان خواردبووە، گۆرانیەکانیان زیاتر لە شیوەنو گریان دەچوون. زیندانییەکان پۆل پۆل دەگەڕانو بەدەم بالالایکا ژەنینەوە گۆرانی دڵخوازی خۆیان دەچڕی، بەبێ موبالاتیو خەمساردی پاڵتۆکانیان بە شانا دابوو و خەمو پەژارە بە سیمایانەوە دیاربوو. لە (بەشی تایبەتی)دا کۆرسێکی هەشت نۆ نەفەریان دروستکرد بوو، ئەمانە بە دەم گیتارو بالالایکاوەو بە دەنگی بەرزو خۆش گۆرانی میللی بەڕاستی ناوازەیان دەچڕی، کە من ئێستا تەنیا یەکێك لەو گۆرانیانەم لە بیرە کە بەڕاستی خۆشیان دەگوت:

*منی کیژۆڵە*

*دوێنێ لە مەزرا بووم...*

لە زینداندا،شێوەیەکی تازەی ئەو گۆرانیەم گوێ لێ بوو کە پێشتر نەم بیستبوو،وچەند دێرێکی لە کۆتاییدا بۆ زیاد کرابوو:

*لە ماڵەکەمدا هەموو شتێکم رێك خست*

*کەوچكو مراکانم شت*

*شۆربام تێکرد*

*دەرگام پاك کردەوە*

*خواردنم کوڵاند.*

زیندانییەکان زیاتر ئەو گۆرانیانەیان دەگوت کە (گۆرانی زیندانیان)یان پێدەگوترا. کە سەربەندی یەکێکیان بەمجۆرە بوو: "رۆژێ لە رۆژان..." ئەمە گۆرانیەکی کۆمیدیە، چیرۆکی مرۆڤێك دەگێڕێتەوە کە جاران وەکو پاشا ژیاوە، خەریکی عەیشو نۆش بووەو، بێ دڵی خۆی نەکردووە، پاشان دەستگیرکراوەو رەهەنەی بێگارەزیندان کراوە. جاران باشترین خواردنی خواردووە، نایابترین شەرابو ئارەقی خواردووەتەوەو کەچی ئێستا هاوار دەکات:

*ئەمرۆ شۆربایەك دەخۆم....*

*ورگ پڕ دەکاتو...*

ئەمەش گۆرانیەکی زۆر بە ناوبانگی دیکەیە کە زیندانییەکان دەیانگوت:

*جاران گەنجێك بووم خۆشگوزەران*

*دەوڵەمەند، ئەهلی کەیفو خۆشی*

*هەر بە منداڵی، بە فیڕۆمدا سەروەت*

*و سامانم*

*ئێستاش دیلو ئەسیر وام لە زیندان.*

هەڵبەتە ئەم گۆرانیانە، هی خەمناکیانیش تێدابوو، بۆ نموونە ئەم گۆرانیە کە پێموایە زیندانیەکی قەرەبەخت دایناوە:

*رۆژهەڵات، تەپڵ کەوتە لێدان*

*دەبێ هەستین، چار ناچار.*

*لە دەرگا دەدرێ*

*پاسەوان دێتە ژووری*

*بانگمان دەکات... هەستاین*

*کەس نامان بینێ لە پشت دیواران*

*کەس نابینێ ژیانمان*

*خودایە هاوار، ئەوەی زیندانییە*

*زیندووە لە ناو قەبران.*

*فریارەس هەر خوایە*

*دەنا لێرە دەفەوتاین*

گۆرانیەکی دیکەش هەیە کە دڵدەگوشێت، گۆرانیەکە وەکو ئاواز زۆر خۆشە، بەڵام وەکو ناوەڕۆكو وشە بێ سەرو بەرە، پڕە لە هەڵەی زمان.. من چەند بەیتێکیم لە یادە:

*جارێکی دی چاوم بە وڵاتی خۆم ناکەوێ*

*هەرگیز نابینم زێدو زاگەم*

*بێ سووچو تاوان*

*کەوتمە سووچی زیندان*

*ئیدی بەختو ناوچەوان*

*وای هانی، لە دەردو*

*رەنجا بەرمە سەر هەموو ژیان.*

*بایەقوش دەخوێنێ لەسەربانم*

*دەنگی پڕ دەکات جەنگەڵو*

*دارستان،*

*ئای لە دڵەی خەمناکم*

*جارێکی دی نابینم*

*ماڵو خاکم.*

زیندانییەکان زۆرجار ئەم گۆرانیەیان دەگوتەوە، بەڵام بە کۆمەڵ نەیان دەگوتەوە، بەڵکو بە تەنیا دەیانگوت. بۆ نموونە هەندێجار دەمەو ئێوارە، زیندانییەکی داماو کە لە کار دەبووەوە، لە

قاوشەکە دەهاتە دەرێ، لەسەر قاڵدرمەکانی بەر دەرگا دادەنیشت، چەناگەی دەخستە سەر دەستیو لە فکران ڕادەچوو،و لە ناکاو هەڵی دەکردە گۆرانیو هێندە بە سۆزەوە دەیگوت کە هاوڕێکانی وایان هەست دەکرد، شتێك لە ناخیاندا هەرەس دێنێ. هەندێ خەڵکی دەنگ خۆش لە نێو زیندانییەکاندا هەبوون.

دنیا تاریك بوو. پەستیو بێزاریو خەمو کولو کۆڤان، لە میانەی مەستیەوە سەری هەڵدایەوە. ئەو زیندانییەی کە سەعاتێ لەمە پێش لە گەرمەی پێکەنیندا بوو، لەبەر پێکەنین خۆی بە پێوە نەدەگرت، ئێستا سووچێکی گرتووەو مەستی مەستەو بە کوڵو بەدڵ دەگریو کوڵی گریانی نانیشێتەوە. چەند زیندانییەکی دیکە وا دەست دەدەنە یەخەی یەکتری، هەندێکی دی ڕەنگ زەردو بێتاقەت، بەلارە لار بە نێو قاوشەکان دەکەونو لە قەرقەشەو شەڕە جنێوان دەگەڕێن. بەڵام ئەوانەی بە خەمەوە گرتوویانە، دەچن بۆ لای هاوڕێکانیان تا بە گریان باری خەمی خۆیان سووك بکەن. هەموو بە تەمابوون ئەو ڕۆژە پیرۆزە، ڕۆژی جەژن کە ساڵێك بوو بە تاسەوە چاوەڕوانیان دەکرد بە خۆشیو شادمانی تەواوبێ، کەچی بە پێچەوانەوە بۆ هەموو زیندانییەکان ڕۆژێکی یەجگار خەمناكو ناخۆش بوو... لەوە دەچوو هەموویان لە دڵی خۆدا بە تەمای شتێکی خۆش بووبن بەڵام ئەو خەیاڵ پڵاوەشیان کەڕووی هەڵهێنا.ئەو چاوە ڕەشەشیان کاڵ بووەوە. پترۆف ئەو ڕۆژە دووجار سەری دام، سەرخۆش نەبوو، چونکە زۆر کەمی خواردبووەوە، لەوە دەچوو ئەویش بە تەمای ڕووداوێکی خۆش بوو بێ، تا دوا سات هەر بە ئومێد بوو شتێکی نا ئاسایی، بویەرێکی نا ئاسایی ڕووبدات. ئەمەی بە دەمی نەدرکاند، بەڵام پیاو لە چاوەکانیا بەدی دەکرد. وێڵو سەرگەردان لەم قاوشەوە بۆ ئەو قاوش دەڕۆیی... بەڵام هیچ شتێك ڕووی نەدا... جگە لە مەستی کە هەمووانی گرتەوە، جگە لە شەڕە جوێنی سەرخۆشەکان، هیچ شتێکی تر ڕووی نەدا. (سیروتکین)ش کراسێکی سووری تازە تازەیی لەبەرکرد بوو وبە قاوشەکاندا دەگەڕا، لە جاران قۆزترو جوانتر دەهاتە بەرچاو، لە ڕادەبەدەر پاكو خاوێن بوو. ئەویش چاوەڕوانی ڕوودانی شتێکی دەکرد، بەوپەڕی ئارامیو سادەییو ساکاری چاوەڕوانی دەکرد. بەڵام بەرە بەرە جەوەکە شێوا، لە تام دەرچوو، پیاو قێزی دەهاتەوە. هەرچەندە هەندێ دیمەنی پێکەنیناویش لە ئارادا بوو، بەڵام نەبوونە مایەی دڵخۆشی من، چونکە بێ هیچ هۆیەکی دیار، زۆر پەستو غەمگین بووم. هەستم بە بەزەییەکی قووڵ دەرهەق بە هەموو ئەو پیاوانە دەکرد، وام هەست دەکرد لە ناویاندا دەخنکێم. ئەوەتا دوو زیندانی لەسەر ئارەق شەڕیانە، ئەمیان دەڵێ دەبێ ئەو ئارەقی بداتێو ئەویان دەڵێ دەبێ ئەم ئارەقی بداتێ. ماوەیەکی زۆرە شەڕیانە. چیوای نەماوە بکەونە شەڕە مست. یەکێکیان دان زەقێکی دان ناشیرینی زمان فس بوو، قسەی باش بۆ نەدەهات، دەیویست قەناعەت بە هاوڕێکەی بکات کە پار وەختێ پاڵتۆکەی پێ فرۆشتووە، غەدری لێکردووەو بەشێك لە پارەکەی نەداوەتێو بۆ خۆی خواردوویەتی... ئەمە جگە لە هەندێ ڕەفتاری ناشیرینی دیکە کە بۆم دەرنەکەوت چی بوون... کابرای گلەیی کەر، گەنجێکی باڵا بەرزی بە شانو باهۆ بوو، گەوجو کەودەن نەبوو، بەڵام کە مەست دەبوو، زوو دەبوو بە دۆستی خەڵکیو گرێی دڵی خۆی بۆ دەکردنەوەو خەمو پەژارەی خۆی بۆ هەڵدەڕشتن. ئێستا کە ئەم

**شەڕەی دامەزراند بووو گلەیی لە خەنیمەکەی دەکردو لە عەلەیی دەدواو عەیبو عاری دەخستە رووو شەڕی پێدەفرۆشت، بەو نیازە ئەمەی دەکرد، یەکسەر دوای گلەییەکە ئاشتی بکاتەوە. زیندانی دووەم کابرایەکی کورتە بالای تۆکمەی دەمو چاو خڕ بوو، زۆر وریاو زرینگ دەهاتە بەرچاو، لەوە دەچوو لە هاوڕێکەی زیاتری خواردبێتەوە، بەڵام مەشرووبەکە زۆر کاری تێنە کردبوو. ئەم پیاوە، پیاوێکی بە ورە بوو، لەناو زیندانییەکاندا بە دەوڵەمەند ناسرابوو. وادیار بوو قازانجی لەوەدا بوو کە هاوڕێکەی نەهاڕوژێنێ، قۆڵی گرتو بۆ لای مەیفرۆشەکەی برد. هاورێکەی بە دەم رێوەو بە دەنگی بەرز دەیگوتو دەیگوتەوە کە قەرزی لەلایەتی، پارەی لەسەرێتی، ئەگەر زەڕەیەك ئابڕوی هەبێت، ئەگەر زەڕەیەك غیرەتی هەبێ، دەبێ دەعوەتی ئارەقی بکات، ئارەقی بۆ بکڕێت.**

**مەیفرۆشەکە پەرداخێ ئارەقی بۆ پڕدەکات، رێزی کڕیارەکە دەگرێت، بەڵام بە چاوێکی سووك تەماشای هاورێکەی دەکات، چونکە لەسەر حیسابی خەڵکی تر دەخواتەوە، بەئیف دەخواتەوە. هاورێ چەنەبازەکە گوتی:**

**– ستپکا پێت ناخۆش نەبێ، تۆ دەبێ پارەکە بدەی، چونکە قەرزارمی، پارەم لەلاتە.**

**ستپکا وەڵامی هاوڕێکەی دایەوە:**

**– باشە باش! پێویست ناکا دەمی خۆم لەگەڵ تۆدا هیلاك بکەم!**

**پیاوی یەکەم، پەرداخە ئارەقەکەی لە مەیفرۆشەکە وەرگرتو گوتی:**

**– نەخێر ستپکا! تۆ درۆ دەکەی، تۆ قەرزارمی. دیارە تۆ ویژدانت نیە، زەڕەیەك ئینسافت نیە. تەنانەت چاوەکانیشت هی خۆت نین، بە قەرز لە یەکێکت وەرگرتوون. تۆ پیاوێکی خوێریت ستپکا! بودەڵەیت... بەرەڵڵایت!...**

**مەیفرۆشەکە هاواری بەسەردا دەکات:**

**– گلەیی چیتە ؟ تەمەشا.. ئارەقەکەت ڕشت.. دەی بیخۆرەوە، خەڵکی بە پیاوەتی خۆیان بۆیان کڕیوی دەتۆش وەکو پیاو بیخۆرەوەو قسەمەکە! خۆ تا بەیانی لێرە چاوەڕوانت ناکەم.**

**– باشە، دەیخۆمەوە، خەمت نەبێ... بەڵام بۆچی بەم جەژنە هاوارم بەسەردا دەکەی ؟ جەژنی سەری ساڵت پیرۆز بێ ستیبان دوروفیچ.**

**ئەوجا زۆر بەرێزو نەزاکەتەوە رووی کردە ستپکا، لە کاتێکا پەرداخەکەی بە دەستەوە بوو، ئیکلامێکی بۆ کرد، هەرچەندە هەمووی دەققەیەك لەوە پێش پێی گوتبوو خوێڕی، گوتی:**

**– تکام لە خودایە کە هەمیشە ساغو سەلامەتت بکات، تەمەن درێژ بیت، سەد ساڵی دیکە بژی!**

**ئەوجا ئارەقەکەی خواردەوە، هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵکێشا،و بە دەست دەمی سڕی. دوای تۆزێك، بە نەزاکەتەوە رووی کردە خەڵکەکە،و بەدەمو زمانێکی شیرین، بێ ئەوەی رووی دەمی لە کەسێکی تایبەتی بێ گوتی:**

**– هێی دنیا، سەر زەمانێ زۆر لە ئێستا زیاترم دەخواردەوە، رۆژ رۆژی من بوو، بەڵام پیریو هەزار عەیب، زەمانی من بەسەر چوو! ستیبان دوروفیچ زۆر سوپاس بۆ تۆ!**

**– ببورە، شایانی نیە.**

ئەوجا رووی کردەوە ستپکاو گوتی:

– ستپکا سوپاس بۆ تۆش، بەڵام چاك بزانە کە بەلای منەوە خوێڕیت، بەرەڵڵایت، ئەمە جگە لە...

ستپکا، بە خۆی نەوەستا، تورە بووو گوتی:

– دەیسا بەد مەستی خوێڕی گوێ بگرە، بزانە چیت پێ دەڵێم دنیا زۆر گەورەیە، وەرە رێك دەیکەین بە دووبەشەوە، من بەشێکی دەبەمو تۆش بەشەکەی تریو ئیدی بڕۆو بەرۆکم بەردەو نەدەتناسمو نەبمناسە.

– یانی بەتەما نیت قەرزەکەم بدەیتەوە ؟

– قەرزی چی، هەی بەد مەستی ماڵوێران ؟

– کە لەو دنیا بە مەمنوونی دێی بۆ لامو دەڵێی هانێ قەرزەکەت وەربگرەوە، لێتی وەرناگرمەوە ها. ئەو پارەیەم بە ئارەقی ناوچەوان و رەنجی شان پەیدا کردووە. لەو دنیا پەشیمان دەبیتەوە، ئەو پێنج کوبیکەی من دەبێ بە ئاگرو بەردەبێتە گیانت، بزانە چۆن لەسەر ئەو پێنج کۆبیکە لە ئاگری دۆزەخدا دەتبرژێنن.

– کورە دەبڕۆ... عەمرت نەمێنیٚ!...

– بۆ تێوەم دەژەنی؟ خۆ ئەسپ نیم !

– دەی بڕۆ!

خوێڕی هیچو پووچ!

– زیندانیی چەپەڵ!

دەمڕێژی جنێو بە گوڕتر لەوسای کە کابرا ئارەقەکەی بۆ هاوڕێکەی نەکڕی بوو، دایکرد.

ئەوەش دوو هاوڕێی ترن، کە لەسەر دوو تەختە خەوی تەنیشت یەکەوە دانیشتوون، یەکێکیان کابرایەکی بالا بەرزی تۆکمەی تیکسمڕاوی سوورەی قەساو ئاسا بوو، زۆر خەمبار بوو. لە زگ بوو بگری. دوەمیان کابرایەکی رێوەڵەی خۆپەسندی، لووت زل بوو دەگوت پەسیوی بەردەوامیەتی. چاوەکانی بچووك لە چاوی بەراز دەچوون، هەمیشە نیگای بڕی بووە عاردی. پیاوێکی هەستیارو بە نەزاکەت بوو، کاتی خۆی کاتب قەڵەمی دادگا بوو بوو، بە جۆرە لووت بەرزییەکەوە مامەڵەی دەگەڵ هاورێکەیدا دەکرد، هاورێیەکەی ئەمەی لەبەر گران بوو. ئەم جووتە بە درێژایی ئەو رۆژە بە دوو قۆڵی و پێکەوە ئارەقیان خوارد بووەوە.

کابرا قەڵەوەکە، دەستی چەپی دەخاتە سەر سەری هاورێکەی، بەتوندی ڕایدەوەشێنێ و هاوار دەکات:

– بێ ئەدەبی لە رووم کرد!

مەبەستی لە (بێ ئەدەبی لەرووم کرد!) یانی لێی داوە. ئەم زیندانییە جاران عەسکەر بوو، لە ناخی خۆیدا بە غیلی بە دراوسێکەی دەبرد. هەر دووکیان لە قسەکردنا مدارای یەکیان دەکرد.

کاتب قەڵەمەکە.چاوی بڕی بووە ئەرزەکەو بێئەوەی تەمەشای دراوسێکەی بکات، بە نەزاکەتەوەو بە شێوەیەکی بنجبڕ گوتی:

– تۆ نەهەقی، تۆ هەڵەیت...

کابرای دووەم، زیاتر سەری دۆستە ئازیزەکەی تەکان دەدات و دەڵێت:

– لێی دام! گوێت لێ نیە؟ ئاخر من لەم دنیایەدا تەنیا تۆ شك دەبەم، تێدەگەی؟ بۆیە ئەم قسەیەت لادەکەم و، پێت دەڵێم لێی دام.

یارۆی کاتب قەڵەم بە دەنگێکی نزم و بەزاکەتەوە گوتی:

– برادەری ئازیز ئەم بیانووە پووچانەی تۆ دادت نادات، مەگەر شەرمەزاری زیاتری لێ بدوریتەوە. ئەوسا لە سەری رۆیی:

– برادەری ئازیز دەبێ دان بەوەدا بنەی کە ئەم رووداوە زادەی مەی نۆشی و بەد مەستییە، ئەم هەموو مەینۆشی و مەیگوسارییەش زادەی لاوازی و خۆ نەگری خۆتە.

هاورێ قەڵەوەکە لەترێکی دا، کەمێك چووە دواوە، چاوە خومارەکانی بڕییە کاتب قەڵەمەکە، و گوڕی بەستەوەو لە پڕ تا هێز لە بازوویدا بوو مستە کۆڵەیەکی خێواندە رووەمەتە لاوازەکەی. بەو شێوەیە دۆستایەتی ئەو رۆژەیان کۆتایی هات. دۆستە ئازیزەکەی بە تەپاوتل کەوتە ژێر تەختە خەوەکە.

یەکێك لە ناسیاوەکانی من خۆی بە قاوشەکەدا کرد، ئەمە زیندانییەکی بەشی تایبەت بوو، پیاوێکی دڵپاك و رووخۆش بوو. گەوج نەبوو، زۆر خاکی و سادە بوو، سوعبەتچی و حەنەکچی بوو، هەر بۆ سوعبەت و رابواردن، نەك بە بەدنیازی، بە زیندانییەکانی ڕادەبوارد. ئەمە هەمان ئەو پیاوەیە کە لە یەکەم رۆژی زیندانیەکەمدا هاتبوو لە جوتیارێکی دەوڵەمەندی دەپرسی، و دەیگوت گوایە مرۆڤێکی نەفس بەرزە، ئەوەبوو من خولقی چام کردو هات چای لەگەڵم خواردەوە. ئەمە پیاوێکی چل سالانی لێو ئەستوور بوو، لووتە زلەکەی هەرزیپکە بوو. ئامێرێکی بالالایکای بە دەستەوە بوو و جارجارێ بە خەمساردییەکەوە قامکی بە ژێیەکانیا دێنا، زیندانییەکی کورتە بالای سەر زل وەکو سێبەر بە دوایەوە بوو، من ئەم پیاوە کورتە بالایەم. نەدەناسی، هیچ کەسێکیش لەوێدا گوێی نەدەدایە. ئەم پیاوە کورتە بالایە کەسێکی سەیر بوو، زۆر سرك و سڵ و بە گومان بوو، کابرایەکی نەدوو بوو، قوڕو قەپ زاری داخستبوو، زۆر جددی بووو سوعبەت و گاڵتەی نەدەکرد. ئەمە لە کارگەی جلدورین کاری دەکرد، خۆی لە خەڵکی دوور دەگرت و تێکەڵاوی کەس نەدەبوو. ئەمرۆکە خواردبوویەوەو سەرخۆش بوو بوو و خۆی بە (فارلاموف)ی هاورێمانەوە هەڵواسی بووو وەکو سێبەر شوێنی کەوتبوو، بۆ هەر کوێیەك دەڕۆیی شوێنی دەکەوت. مەستی مەست بوو، هارووژا بوو، هەردوو دەستی بادەدان، شێت ئاسا بۆکسی بەم لاو بەو لادا دەوەشاندا، دیواری قاوشەکەو تەختە خەوی زیندانییەکانی بەر مستان دەدا، گریان لە ئەوکی گیرابوو. فارلاموف بە هیچ جۆرێ خۆی لێ بە خاوەن نەدەکرد، دەتگوت هەر لەگەڵ ئەویشدا نیە. سەیر ئەوە بوو ئەم پیاوانە لە هیچ شتێکدا وەکو یەك نەبوون، خاڵی هاوبەشیان لە بەیندا نەبوو، نە کارو پیشەیان لێکدیەوە نزیك بوو، نە تەبیعەتیان دەچووەوە سەر یەك. سەر بە دوو بەشی جیاواز، لە دوو قاوشی جیا بوون. ئەم زیندانییە کورتە بالایە ناوی: بولکین بوو. فالاموف کە منی بینی لەسەر جێگاکەی خۆم و لە نزیکی سۆپاکەوە

دانیشتووم بزەیەکی بە رووما دا. هەڵوەستەیەکی کرد، کەمێك لە فکران ڕاچوو، ئەوجا بەدەم لارە لارو لەتردانەوە بەرەو رووم هات، دەیویست سەلارو سەنگین بنوێنێ، کە بینی ناتوانێت، لە جێی خۆی وەستا، بە قامکان کەوتە لێدانی ژێی ئامێرەکەی‌و بەدەم هەڵپەرکێیەکی سووکەوە کەوتە چڕینی ئەم قامە:

*دەموچاوی یارەکەم سپییە*

*دەموچاوی یارەکەم خڕە*

*دەخوێنی وەکو بولبولان*

*چەند جوانە بە کراسی ئاوریشمی*

*ئاڵاو واڵاوە.*

ئەم گۆرانیە کارێکی زۆری لە بولکین کرد، هەردوو دەستی هەڵبڕین،و بە هەموو هێزی خۆیەوە روو لە هەمووومان هاواریکرد:

– براینۆ درۆ دەکا، باوەڕی پێ مەکەن، ڕاستی لە مەزبدا نیە، هەر چیەك دەڵێت درۆیە !

فارلاموف کە مەستی مەست بوو، تەواو لە من نزیك بوو بووەوە، دەترسام دەست لە ملم بکات‌و ماچم بکات گوتی:

– "پیر" ئالکساندەر پترۆفیچ رێزو حورمەتم قەبووڵ بفەرموون..

زاراوەی "پیر" زاراوەیەك بوو هەموو خەڵکی سیبیریا بە کاریان دێنا، تەنانەت بۆ دواندنی خەڵکی بیست ساڵیش بەکاردەبرا، زاراوەی "پیر" بۆ رێزو حورمەت تەنانەت رووبینی‌و مجامەلەش بەکار دەبرا، بە کەسێك دەوترا کە بە حورمەت‌و رێزو ویقار بوایە.

– فارلاموف چۆنی ؟

فارلاموف، نیگایەکی کردم‌و بەدەم پێکەنێنکی فێڵبازانەوە گوتی:

– مام ناوەندیم، ببورە کە مەستم! ئیدی ئەمڕۆ جەژنە!

بولکین پەست‌و غەمگین، نا ئومێدانە مستێکی بە تەختە خەوەکەدا کێشا‌و هاواریکرد:

– درۆ دەکات! دیسان کەوتە درۆیان !

پێدەچوو فارلاموف، لە دڵی خۆیدا لێبڕابێ کە خۆی لێ نەکات بە خاوەن. ئەمە خۆی لە خۆیدا کومیدی ترین، خاڵی دیمەنەکە بوو، بولکین لە بەیانی زووەوە دوای فارلاموف کەوتبوو، وەکو قیری کەوای سپی پێوەی لکابووو بە ساتیش لێی دوور نەکەوتبووەوە. پێدەچوو تەنیا لەبەر ئەوە دوای کەوتبێ تا بە درۆی بخاتەوەو ئەو درۆیانە بخاتە روو کە بە خەیاڵی ئەو فارلاموف دەیکردن. وەکو سێبەر بە دووی کەوتبوو و لێی نەدەبووەوە، بەرپەرچی هەموو قسەیەکی دەدایەوە، لە داخا کۆڵەمستی دەگوشی‌و بە مست بەردەبووە دەرگاو تەختە خەوەکان، هەموو دەستی دەبوو بە برین‌و خوێن، بە ئاشکرا دیاربوو خەفەتی دەخوارد، خەفەتی لەوە دەخوارد کە گوایە فارلاموف "درۆی دەکرد". ئەگەر داوە قژێکی بە سەرەوە بوایە، بێگومان لە حەژمەتاندا هەڵیدەکێشا. بە رەفتاریدا وادیاربوو کە خۆی بە مەسئوولی هەموو کەمتەرخەمی‌و خەمساردی‌و بێ موبالاتیەکانی فارلاموف دەزانی، کە کەموکوڕییەکانی فارلاموڤ دەبینی هەستی بە عەزابی

ویژدان دەکرد. لە هەموو ئەمانە کۆمێدیتر ئەوە بوو کە فارلاموف، کەمو زۆر گوێی بەم نمایشکارییەی بولکین نەدەداو هەر ئاوڕیشی لیٚ نەدەدایەوە.

بولکین هاواریکرد:

– درۆ دەکات! راست ناکات، درۆ دەکات! هەرچیەك دەڵیٚ هەمووی درۆیە !

زیندانییەکان بە پێکەنینەوە پێیان گوت:

– باشە تۆ هەقت چیە ؟ بە تۆچی ؟

فارلاموف، لە ناکاو گوتی:

– ئەلکساندەر پترۆفیچ باوەڕبکە بە گەنجی ئەوەندە قۆز بووم، ئەوەندە جوانخاس بووم کە کچان شێتو شەیدام دەبوون، دووم دەکەوتن.

بولکین، قسەکەی پیٚ بڕی، هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

– درۆ دەکات، دیسان دەستی بە درۆیان کردەوە !

زیندانییەکان لە قاقای پێکەنینیان دا.

– منیش خۆم بۆ دەڕازاندنەوە ئەمما رازانەوە. کراسێکی سوورو پانتۆڵێکی فشی مەخمەلم لەبەر دەکرد، ئیدی کوڕ بووم بە بانانەوە، هەر کاتیٚ ویستبام وەکو کۆنت دولابوتیل دەخەوتم، وەکو بابایەکی سویدی دەمخواردەوە... بە کورتی و کرمانجی هەرچیەکم بە ئەقلا هاتبا دەمکرد.

بولکین، زۆر بە جددی گوتی:

– درۆ دەکات !

– ئەوسا بابم تازە مردبوو، خانوویەکی بەردی دوو نهۆمی بۆ بە جیٚ هێشتبووم، لە ماوەی دوو ساڵدا گسکم لێدا، تەنیا دەرگاکانیم بۆ مایەوە. ماڵی دنیا چیە ؟ وەکو کۆترە ئێستا دەنیشێتەوەو تاوێکی دی دەفڕیٚو دەڕوات!....ماڵی دنیا چڵکی دەستە دیٚ و دەڕوات!..

بولکین، بە دەنگێکی جدیتر لە پێشوو گوتی:

– درۆ دەکات !

– ئیدی دوای ئەوەی گەییمە ئێرە بە چەند رۆژێك نامەیەکم بۆ کەسوکارەکەم نارد کە هەندیٚ پارەم بۆ بنێرن. وا دیارە لە رەفتارم پەستو نارازی بوو بوونو، وەکو پێویست رێزو حورمەتم نەگرتبوون، بۆیە هیچ دەنگێکیان نەبوو، ئەوە حەوت دانە ساڵە ئەو نامەیەم ناردووە!....

بە دەم زەردەخەنەیەکەوە پرسیم:

– تا ئێستا وەڵامیان نەداویتەوە ؟

– نەخێر، تا ئێستا وەڵامیان نەداوەتەوە.

بە دەم پێکەنینەوە ئەو جوابەی دامەوە،و هەنگیٚ بە رادەیەك لێم نزیك بووەوە خەریك بوو کە پووی بەر دەمو چاوم دەکەوتو، گوتی:

– دەزانی ئەلکساندەر پترۆفیچ لێرە ماشووقەیەکم هەیە !

– تۆ ؟ لێرە ماشوقەت هەیە ؟

– بەڵێ، چەند ڕۆژێ لەمەپێش (ئوفوفريف) دەيگوت هەرچەندە ماشوقەکەی دەموچاو ئاوڵاویەکی کونجی ناشیرینە، بەڵام پۆشتەو پەرداخە، جلکی جوانو باشی هەیە، ماشووقەکەی تۆ هەرچەندە جوانە، بەڵام سواڵکەرێکی تورەکە بە کۆڵە.

– جا وایە ؟

بە دەم خنکەخنکی پێکەنینەوە گوتی:

– وایە! دەنکەکەم، سواڵکەرە، دەست پاندەکاتەوە !

هەموو زیندانییەکانیش لە قاقای پێکەنینیان دا. هەموو زیندانییەکان دەیانزانی کە پەیوەندی دەگەڵ ژنە سواڵکەرێك دا هەیەو لە ماوەی شەش هەیڤدا تەنیا دە کۆبیکی داوەتێ.

ئەنجام بۆ ئەوەی لە شەڕی رزگار بم گوتم:

– باشە، هیچت ناوێ ؟

بۆ ساتێك بێدەنگ بوو، ئەوجا نیگایەکی پاڕانەوە ئامێزی کردمو، گوتی:

– ئەلکساندەر پترۆفیچ بێزەحمەت پارەی پێکێك ئارەقم نادەیتێ تا بە سەلامەتی تۆ بیخۆمەوە، ئەمڕۆکە لە بەیانیەوە تا ئێستا جگە لە چاپی هیچی ترم نەخواردووەتەوە. ( بە دەم وەرگرتنی ئەو پارەیەوە کە بۆم ڕاگرتبوو، بە دەنگێکی ناسك لەسەری ڕۆیی ) ئەوەندەم چا خواردووەتەوە خەریکە تووشی هەناسە تەنگی دەبم. ئەوەندەم چا خواردووەتەوە سکم بووە بە مەشکە، قوڵپە قوڵپی چا لە سکما سەعاتە ڕێیەك دەڕوات، دەڵێی ئاوەوە لە شووشەدا قوڵپ دەدا.

کە ئەو پارەکەی لێوەرگرتم، بولکین هێندەی دی هاڕوژا، وەکو شێتان کەوتە هەڵبەزو دابەز، رووی دەمی کردە هەموو ئەوانەی لە قاوشەکەدا بوونو، گوتی:

– بەڕێزینە خۆ گوێتان لێ بوو چ درۆیەکی کرد ؟ هەرچییەك دەڵێت درۆیە، ڕاستی لە مەزەبدا نیە!....

زیندانیەکان کە سەریان لەم پێداگرییەی بولکین سوڕما بوو، هاواریان کرد:

– باشە تۆ هەقت چیە ؟ ئەم شتە چ پەیوەندییەکی بە تۆوە هەیە! بە راستی کابرایەکی سەیری ها!

بولکین کە لە تووڕەییدا چاوانی ئەبڵەق بوو بوون، کۆڵە مستی گۆشیو بە هەموو هێزو توانای خۆی بە کۆڵە مستان بەر بووە لەوحی تەختە خەوەکان،و هاواری دەکرد:

– نا، نابێ درۆ بکات! نایەڵم درۆ بکات !

هەموو پێی پێکەنین. فارلاموف، پارەکەی لێوەرگرتم، سوپاسی کردمو بەو وەزعە نالەبارەیەوە بەلەز بەرەو لای مەیفرۆشەکە دایکێشا. وەك بڵێی لە ناکاو بولکینی بیر کەوتەوە، لەبەر دەرگای قاوشەکە وەستا، وەك ئەوەی پرۆژەیەکی لە بیرا بێو بەبێ بولکین جێبەجێ نەکرێت، بانگی کرد:

– ئادەی وەرە با بڕۆین !

ئەوجا بە فیزێکەوە دەڵەکی داو دایە پێش خۆی:

– دەی خڕە !

و ئەوجا بەقامکان کەوتە ختوکەدانی ژێی بالالایکاکەی.

**باشه بۆچی لەسەر باسی ئەم شێتخانەیە بەردەوام بم ؟ ئەنجام ئەو ڕۆژە جەنجاڵە تەواو بوو... زیندانییەکان لە جێگاکانی خۆدا نووستن، ئەو شەوە زیاتر لە شەوانی دی وڕێنەیان دەکرد، بەدەم خەوەوە دەیان بزڕکاندو قسەیان دەکرد، کۆڕی قوماریش لەم سووچ و لەو کەنار هەر بەردەوام بوو. ئەو جەژنەی کە دەمێ بوو چاوەڕوانی بووین، تەواو بوو، ئیدی لە سبەینێوە بێگارو سوخرە دەست پێدەکاتەوە.**

## شانۆنامەو نمایش

یەکەم ئاهەنگی نمایش لە ئێوارەی ڕۆژی سێیەمی جەژندا سازکرا. دیارە هەوڵێکی زۆر لە پێناوی سازدانی ئەم ئاهەنگەدا درابوو، بەڵام چونکە ئەکتەرەکان هەموو شتێکیان لە ئەستۆی خۆ گرتبوو،وبە خۆیان کاروبارەکانیان ڕادەپەڕاند، زیندانییەکانی دی نەیاندەزانی کاری نمایش‌و ئاهەنگەکە گەییوەتە کوێ‌و ئەکتەرەکان بەتەمای چین‌و چی پێشکەش دەکەن، تەنانەت نەماندەزانی چ شتێك نمایش دەکەن‌و بابەتی شانۆنامەکە چ دەبێ. هەموو هەوڵێکی ئەکتەرەکان، لە زەرف ئەم سێ ڕۆژەدا، لە پێناوی ئەوەدا بوو، بە هەرجۆرێ بووە جل‌و بەرگ‌و ئیکسسواری پێویست پەیدا بکەن. هەر ەند (باکلۆشین)م دەبینی لە خۆشیاندا دەکەوتە چەقەنە لێدان، بەڵام هیچی بۆ نەدەگێڕامەوە. تەنانەت مێجەرەکەی لەمەڕ خۆمانیش لە هەر کاتێکی دی هێمن‌و هێدی تر بوو. بەڵام ئێمە بە هیچ جۆرێ نەماندەزانی کە ئاخۆی مێجەر لە هەوڵی سازدانی ئەم ئاهەنگە ئاگادارە یان نا، ئایا ڕێی پێداون یان نا ؟ یان جۆرە ڕێکەوتنێکی ناڕاستەوخۆ لە نێوان ئەوو زیندانییەکاندا بەرقەرار بووەو بە نیاز نیە دەست لە نەخشەو کاروباریان وەربدات بە مەرجێ ئاژاوەو هەراو هەنگامە نەنەنەوە. من بەش بە حاڵی خۆم وای بۆ دەچووم کە ئاگای لە هەوڵی سازدانی ئاهەنگە شانۆییەکە هەبوو، بەڵام بە ئانقەست خۆی لە گێلی دەداو چاوپۆشی لە شتەکە دەکرد، چونکە دەیزانی ئەگەر ڕێگەی سازدانی ئاهەنگەکە نەدات، کاروباری زیندان دەشێوێ،و لەوەیە زیندانییەکان بە ئانقەست دەست بدەنە ئاژاوەو سەربکەنە خواردنەوەو مەیگوساری‌و بەدمەستی، کەواتە باشتر وایە خۆیان بە شتێکەوە مژول بکەن، بۆیە پێموا بوو ئەوە بیرکردنەوەی مێجەر بوو، چونکە ئەوە تاقە هەڵوێستی بەجێ‌و ئاسایی بوو، بگرە هەق بوو ئیدارەی زیندان، ئەگەر زیندانییەکان ئەم کارەیان نەکردبایە، بە خۆی ئاهەنگێکی بۆ سازکردبان. بەڵام چونکە مێجەر، پیاوێکی نەژنەو بوو، ڕاوبۆچوونی ڕێك دژو پێچەوانەی ڕاوبۆچوونی هەموو تیرەی بەشەر بوو، بۆیە زۆر دەترسام ئەو بۆچوونەم کە گوایە مێجەر لە پرۆژەکەمان ئاگادارەو خۆی ڕێی داوە، ڕاست دەرنەچێت، مێجەر مێجەر بوو، دەبوایە هەمیشە مرۆڤێك عەزاب بدات، دەست بخاتە بینی گووراوێك، شتێك هەڵکێشێ‌و دەربێنێ، غەدر لە کەسێك بکات‌و لە ماف خۆی بێبەشی بکات، یانی لە هەموو بوارێکدا زەبت‌و ڕەبت بسەپێنێ. لە سەرانسەری شاردا بە سەختگیری بەناوبانگ بوو، هەرگیز خەمی ئەوەی نەبوو زیندانییەکان لە کارو هەڵوێستەکانی بڕەنجێن، توڕە ببن، ئاژاوەو یاخیبوون لە زیندانەکەدا سەرهەڵبدات، چونکە ئەو جۆرە تاوانانە، سزای یاسایی خۆیان هەبوو، هەر زیندانییەك ئەو جۆرە تاوانانەی کردبا، سزای خۆی وەردەگرت ( خەڵکانێك هەن وەکو ئەم مێجەرە بیردەکەنەوە )، نابێ ڕووی خۆش بەو زیندانییە بودەڵەو خوێڕیانە بدرێت، دەبێ بەوپەڕی توندی مامەڵەیان دەگەڵ بکرێت. بەرپرسان تەنیا ئەوەندەیان لەسەرە، بێ هیچ سازشێك، بێ هیچ چاوپۆشیەك یاسا وەکو خۆی جێبەجێ بکەن‌و تەواو!.... جا ئەو پیرە

بەرپرسانە، غافڵ بوون لەوەی کە جێبەجێکردنی دەقێن یاسا بەبێ تێگەییشتن لە روحی یاسا، هەراو هەنگامەو پاشاگەردانی لێدەکەوێتەوە. ئەوان دەڵێن: "ئەوە دەقی یاسایە، لەوەی پتر چیان دەوێ ؟" تەنانەت پێیان سەیرە جگە لە جێبەجێکردنی یاسا داوای شتێکی تریان لێبکرێ، بۆ نموونە داوای هەستی راستگۆیانەو هزرینی ئاشتیانەو ئەم شتانە بەلای ئەوانەوە زیادە بوو، زیادە مەسرەف بوو، رقی هەڵدەستاندن و تورەی دەکردن.

به هەرحاڵ، ماموری چاودێر، رێی سازدانی ئاهەنگەکەی داو هەموو زیندانییەکانیش ئەوەیان دەویست. جا دەبێ ئەوە راستیەش بڵێم کە زیندانەکە لە ماوەی رۆژانی جەژندا زۆر ئارام بوو، هیچ ئاژاوەو پەشێوییەك دروست نەبوو، هیچ شەڕو قەرقەشەیەك بەرپا نەبوو،و هیچ دزییەك نەکرا، هەمووی بە هۆی ئەوەوە بوو کە مۆڵەت بە زیندانییەکان درابوو ئاهەنگی خۆیان بگێڕن. بە چاوی خۆم دەمبینی کە چۆن زیندانییەکان ئارامی زیندانەکەیان دەپاراست و نەیاندەهێشت هاوڕێ مەینۆشەکانیان، بەدمەستی بکەن و هەراو هەنگامەو ئاژاوە بنەنەوە، چۆن نەیاندەهێشت ئاژاوەو فەرتەنەو قەرقەشەو دەمەقاڵە هەڵبگیرسێت، لە ترسی ئەوەی نەبادا مێجەر پێ بزانێت و نەیەڵێت ئاهەنگەکەیان بگێڕن. چونکە مێجەر وەعدو بەڵێنی لێوەرگرتبوون کە هیچ ئاژاوەیەك نەنەنەوەو ئارامی زیندانەکە بپارێزن، بۆیە زیندانییەکان پابەندی وەعدو بەڵێنەکەی خۆیان بوون: زۆریان پێخۆش بوو کە بەڵێنەکەیان ببەنە سەر. ئەمە جگە لەوەی کە ئاهەنگەکەو مەسرەفی ئاهەنگەکە کەم و زۆر لەسەر حیسابی ئیدارەی زیندان نەبوو. پێویست نەبوو شوێنێکی تایبەتی بۆ دامەزراندنی شانۆکە چۆڵ بکرێت، شانۆکە بە جۆرێ تەرتیب کرابوو، دەشیا لە چارەکە سەعاتێکدا دابنرێ یان هەڵبگیرێت. شانۆنامەو نمایشەکە لە سەعات و نیوێك زیاتری نەدەخایاند، خۆ ئەگەر بەرهەڵست و کێشەیەکی کوتوپڕ بهاتبایەتە ئاراوە، دەشیا شانۆو دیکۆرەکە لە چاوتروکانێکدا بپێچرێتەوەو کۆبکرێتەوە. ئیکسسوارو جل و بەرگەکان لە باوڵی ئەکتەرەکاندا کە هەموویان زیندانی بوون، شاردرا بووەوە. جا ئێستا و لە پێش هەموو شتێکدا بە کورتی باسێکی چۆنیەتی دامەزراندنی شانۆکەو، باسی چۆنیەتی جل و بەرگەکان دەکەم و ئەوسا دێمە سەر باسی بەرنامەو ئەو نمایشنامانەی دەویسترا پێشکەش بکرێن.

ئەلهەقی هیچ بەرنامەیەکی نووسراو لە ئارادا نەبوو، بەڵام باکلۆشین، بەرنامەیەکی لامسەرلایی بۆ شەوی دووەم یان سێیەمی ئاهەنگەکە نووسی بوو، ئەویش لەبەر خاتری ئەفسەرەکان و گەورە میوانەکانی دی، ئەو کارەی کردبوو، چونکە لەو دوو شەوەدا ئامادەی ئاهەنگەکە بوو بوون و ئاهەنگەکەیان مشەڕەف کردبوو،و بریتی بوون لە: ئەفسەری پاسەوان کە تاقە یەکجار هات،و ئامیر سریەی پاسەوانی و، پاشان ئەفسەرێکی هێزی ئەندازە. ئیدی وەکو رێزێك لەو میوانانە بەرنامەکە نووسرا بوو.

زیندانییەکان، هەموو دڵنیا بوون کە ئاهەنگە شانۆییەکەمان نەك لە هەموو گۆشەو کەنارێکی زیندانەکەو دەڤەرەکە، بەڵکو لە سەرانسەری شارەکەشدا دەنگدەداتەوە، بە تایبەتی کە شاری (ن....) تاقە شانۆیەکی تیا نەبوو، شانۆکاری تیا نەبوو. ئەوپەڕی رۆژێ لە رۆژان چەند کەسێکی ئاماتۆر هەر بۆ کەیف ئاهەنگێکی شانۆییان لەوێ گێڕاوە یان نا. زیندانییەکان وەکو منداڵ، بە

بچووکترین سەرکەوتن دڵیان خۆش دەبوو و بە خۆ دەنازین‌و ستایشی کارەکانی خۆیان دەکرد. لە دڵی خۆیان یان لە نێو یەکتردا دەیانگوت: " گەورە بەرپرسانی زیندانەکە بەم کارەمان دەزانن‌و دێن تەمەشادەکەن‌و بە چاوی خۆیان دەیبینن‌و هەنگێ قەدری زیندانییەکان دەزانن‌و بۆیان دەردەکەوێ کە چ بەهرەو توانایەکیان لە باردایە، چونکە ئەم ئاهەنگە شانۆییەی ئێمە پێشکەشی دەکەین لەو شانۆنامە بازاڕیانە نیە کە سەربازان پێشکەشی دەکەن‌و بە نیشاندانی چەند بووکەڵەو چەند بەلەمێك‌و چەند ورچ‌و چەند سابرێنێك لە کۆڵی دەکەنەوە، بەڵکو شانۆنامەیەکە ئەکتەران نمایشی دەکەن، ئەکتەرانی راستەقینە، زنجیرە کۆمیدیایەك پێشکەش دەکەن کە بۆ خەڵکانی نەجمیزادەو فاما نووسراوە. لە سەرانسەری شاریشدا شانۆو ئاهەنگی وەکو ئەمەی ئێمە نابێتەوە! دەڵێن تا ئێستا جارێك جەنەراڵ ئابروسیموف لە ماڵەکەی خۆیدا ئاهەنگێکی سازکردووەو، گوایە ئاهەنگێکی دیکەش لەوێ پێشکەش دەکرێت! با پێشکەش بکرێت... لەوەیە ئیکسسوارو جل‌و بەرگیان زۆر لە هی ئێمە باشتر بێ،... ئەمە ئاساییە... بەڵام "دیالۆگیان" لە هی ئێمە باشتر نابێت...و ئیدی قولی ڕەش‌و سپی لە بواردا دەردەکەوێ... لەوەیە خودی فەرمانڕەوا بە ئاهەنگەکەمان بزانێ‌و کێ دەڵێ نایەت بۆ تەمەشا کردنی. لە شارا شانۆیان نییە".

بە کورتی خەیاڵی زیندانییەکان، بە تایبەتی دوای سەرکەوتنی یەکەم، زۆر بەرز فڕی، تەنانەت بە ئومێدی ئەوە بوون کە خەڵات بکرێن، دیارییان بەسەردا دابەش بکرێت، سەعاتی کاری سوخرەو بێگاریان لەسەر کەم بکرێتەوە، بەڵام هەرکە وەخۆ دەهاتنەوەو پەیان بە نا واقیعیەتی ئەم خەیاڵپلاوەی خۆ برد، خۆیان یەکەم کەس بوون کە بە خۆیان پێدەکەنین. ئەلهەقی ئەوانە هەر چەندە خەڵکی تەمەن چل ساڵیان تیا بوو بەڵام لە رووی ئەقڵەوە هێشتا منداڵ بوون. من دەمزانی بە تەمان چ شانۆنامەیەك پێشکەش بکەن، هەرچەندە هیچ بەرنامەیەکی دیاریکراو لە ئارادا نەبوو. سەرناوی شانۆنامەی یەکەم: " هەڤرکان فیلادکا*(١)و میروشکا" بوو. باکلۆشین بە هەفتەیەك پێش دەست پێکردنی ئاهەنگەکە پێی گوتم: کە ئەو رۆڵی فیلادکا دەبینێ‌و زۆر بە متمانەوە دەیگوت بە تەمایە بە جۆرێ ئەم رۆڵە بدێنێ کە لەسەر شانۆکانی "سان پترسبۆرگ"شدا دەوری وا نەبینرا بێ! باکلۆشین بەدەم باسی رۆڵەکەی خۆی‌و بەدەم خۆ هەڵکێشانەوە، بەکەش‌و فشەوە بە ژوورو قاوشەکاندا دەگەڕاو بەوپەڕی رووخۆشی لێرەو لەوێ بە شێوەیەکی نمایشی، هەندێ لەو دیالۆگانەی دەگوتەوە کە لە رۆڵەکەیدا هەبوون،و ئیدی قسەکانی کۆمیدی بوایەن یان نا، خەڵکەکە لە قاقای پێکەنینیان دەدا، خەڵکەکە بۆیە بەو قسانە پێدەکەنین چونکە باکلۆشین دەیگوتن. بە هەرحاڵ گەلێك لە زیندانییەکان، حەزیان لە کاری شانۆیی نەدەکردو گوێیان نەدەدایە، ئەوانەی کە بەتاسەوە گوێیان لە باکلۆشین دەگرت‌و لە دەوری خڕ دەبوونەوەو بە رەفتارە دراماتیکییەکانی (تەمسیلی) پێدەکەنین زیاتر ئەو گەنجانە بوون کە نەیاندەزانی چۆن هەستەکانی خۆیان وەشێرن یان ئەو زیندانییە گەورەو پشت ئەستوورانە بوون کە لە خۆیان‌و پێگەی خۆیان نەدەترسان‌و بێ خەم گوزارشتیان لە هەستی خۆ دەکرد. بەڵام ئەوانی دی بە کڕی‌و کپی گوێیان لە ژاوەژاوو گەنگەشەکان دەگرت‌و نە گلەییان دەکردو نە ناڕەزاییان دەردەبڕی، بەڵکو هەوڵیان دەدا وابنوێنن کە حەز لە شانۆ ناکەن‌و شانۆ

هیچ نیە، بە هەرحاڵ هەموو زیندانییەکان بە هەمان تاسەو جۆش و خرۆشەوە چاوەڕوانی ئاهەنگە شانۆییەکەیان نە دەکرد. زۆریان دوو دڵ بوون لەوەی کە سەر دەگریٚ یان نا. ئەم دوودڵییە تا یەکەم رۆژی دەسپێکی ئاهەنگەکە نەڕەوییەوە. لە دڵی خۆیاندا دەیانپرسی: ئاخۆ مێجەر چ دەڵێ ؟ تۆ بڵێی ئەم ئاهەنگەش وەکو ئاهەنگەکەی پێرار سەرکەوتوو بێت ؟ تاد... تاد.... باکلۆشین دڵنیای کردم کە ئەکتەرەکان بژاردەن "زۆر بە باشی هەڵبژێردراون"و شانۆکە پەردەشی دەبێت، سیروتکین رۆڵی فیلادکای دەزگیرانی دەبینێ. باکلۆشین لەسەری رۆیی، چاوێکی داگرت و بە ئاوو تاو گوتی: "جا بە چاوی خۆت دەیبینی چەند جوان جلی ژنانەی لێدێت !" باکلۆشین گوتی ژنە دەوڵەمەندە خێرخوازەکە تەنورەیەکی پەڕ پەڕە لەبەر دەکات و چەترێکی چکۆلە هەڵدەدا، و کابرا دەوڵەمەندو خێر خوازەکەش بە جلێکی ئەفسەریانەی ئەستێرە لەسەر شان و بە دار عاسایەکەوە دەردەکەوێ. بەڵام شانۆنامەی دووەم لە ژێر سەرناڤی (کودریلی چڵێس(٢)) دا بوو.  ئەم ناونیشانە زۆری سەنج راکێشام. چەندم کردو کۆشا شتێك لە بارەی ئەم شانۆنامەیەوە بزانم، بەر لە پێشکەشکردنەکەی هیچم لە بارەیەوە نەزانی. ئەم شانۆنامەیە چاپ نەکرابوو، بەڵکو نوسخەیەکی دەستنووس بوو لە سەربازێکی خانەنشینی ئەو دەوروبەریان خواستبوو، کە ڕەنگە بە خۆی رۆژێ لە رۆژان لە شوێنێکدا، لەسەر شانۆیەکی سوپاییدا، دەوری تیا بینی بوو بێ. هەڵبەتە لە شارو دەڤەرە دوورە دەستەکانی ئێمەدا، دنیایەك شانۆنامەو درامای لەو جۆرە هەن کە  نە کەس پێی زانیون و نە رۆژێ لە رۆژانیش چاپکراون، بەڵکو خۆڕسك لە کاتی پێویستدا هەڵقوڵیون و لە هەندێ شوێنی رووسیادا بوون بە بەشێك لە شانۆی میللی. کە دەڵێم "شانۆی میللی" هەقە باسکاران و توێژەرانی ئەدەبیاتی میللی ئەمە بە هەند بگرن و لێکۆڵینەوەی وردو تێرو تەسەل دەربارەی ئەم نمایشنامەو نیمچە درامایانە بکەن کە مەرج نیە لەو ئاستە نزمەدا بن کە هەندێ کەس وێناو تەسەوری دەکەن. من باوەڕ ناکەم هەموو ئەوەی کە لە زیندانەکەماندا دیتوومە، داهێنانی زیندانییەکان بێ و، هیچ ڕەگ و ریشەیەکیان نەبێ، ئەوەی من دیتم، بێگومان دەبێ پێشینەی خۆی هەبووبێ و یاساو رێسای خۆی هەبوو بێ و دەماودەم لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی هاتبێ. ئیدی دەبێ لە ناو سەربازان، کرێکارانی کارخانەی شارە گەورەکان و تەنانەت لە ناو رۆڵەی چینی ئەرستۆکراتی هەندێ باژێرۆکانی دوورەدەست و گومناودا، بۆ رەگ و ریشەیان بگەڕێیت و بیدۆزیتەوە. ئیدی ئەمە وەکو بەشێك لە کەلەپووری میللی لە هەندێ گوندو لە مەڵبەندو پایتەختی هەرێمەکاندا، لە نێو نۆکەرو مسکێنی گەورە ئاغاو موڵکداراندا پارێزراوەو نوسخەی لەبەر گیراوەتەوەو لە فەوتان رزگارکراون. چونکە گەورە موڵکدارو ئاغایانی کۆن و دەوڵەمەندانی مۆسکۆ شانۆی تایبەتی خۆیان هەبووەو دەست و پێوەندو مسکێن و خولامەکانیان دەقی شانۆییان لەسەر نمایش کردووە. جا سەرچاوەی شانۆی میللی ئێمە لەوێوە هەڵقوڵیوە. بەڵام سەبارەت بە نمایشنامەی "کودریلی چڵێس" تەنیا ئەوەندەم بۆ دەرکەوت کە ئەهریمەنان دێنە سەر شانۆو کودریلی قارەمانی نمایشنامەکە بۆ دۆزەخ دەبەن. بەڵام وشەی "کوردیل" مانای چیە ؟ بۆچی ناونراوە (کودریل)، و ناو نەنراوە "کیریل"؟ ئاخۆ

رووداوی نمایشنامەکە رووسیە یان بیانییە ؟ وەڵامی ئەو پرسیارەم دەست نەکەوت. بەڵام ئەوەیان گوت کە نمایشنامەکە بە دیمەنێکی "پانتومایم" لەگەڵ مۆسیقادا، کۆتایی دێت.

ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوە بوو کە ئاهەنگەکە خۆش دەبێت. ژمارەی ئەکتەرەکان پازدە کەس بوون، هەر هەموویان خەڵکانی چوستو چالاكو گورجو گۆڵو روح سووكو ئیشکەر بوون. زۆر دەجولان، زۆریان بەردەوام خەریکی پرۆڤەو مەشق بوون، هەندێجار پرۆڤە و مەشقەکان لە دەرێی زیندانو قاوشەکاندا دەکراو ئەکتەرەکان بە بەرچاوی خەڵکەکەوە پرۆڤەیان نەدەکرد. بە کورتی دەیانویست لێمانی بکەن بە شتێکی کوتوپڕو چاوەڕوان نەکراو. دەرگای قاوشو زیندانەکان، لە رۆژانی ئاسایی و سوخرەو بێگاردا، شەوانە زوو دادەخرا، بەڵام لە رۆژانی جەژنی سەری ساڵدا وا نەبوو دەوروبەری سەعات نۆی شەو دەرگاکان قفڵ دەدران. بە تایبەتی لەبەر ئاهەنگە شانۆییەکە ئەمەیان کردبوو. هەموو رۆژێکی جەژن دەمەو ئێوارێ سەرپەرشتیارانی ئاهەنگەکە نوێنەری خۆیان بۆ لای زابت خەفەر دەناردو لێی دەپاڕانەوە کە "رێگەی ئاهەنگە شانۆییەکەیان بداتو زوو دەرگای زیندانەکە دانەخات "،و ئەوەشی بە گوێدا بدەن کە دوێنێ شەو ئاهەنگیان گێڕاوەو هیچ ئاژاوەو ئاشووبێك رووی نەداوەو کەمترین سەرپێچی نەکراوە. ئیدی زابت خەفەرەکە لە دڵی خۆیدا دەیگوت: دوێنێ هیچ ئاژاوەیەك رووی نەداوە، هیچ سەرپێچییەك نەکراوە، چا مادامێکی بەڵێنیان داوە کە کۆڕو ئاهەنگی ئەمشەویشیان وەکو دوێنێ شەو بە سەلامەتی تێ بپەڕێت، مانای وایە خۆیان دەبن بە پۆلیسو ئەمنو ئاسایشی زیندانەکە دەپارێزن، هەڵبەتە لە پۆلیس-ش باشتر ئەمە دەکەن. ئەمە جگە لەوەی کە زابت خەفەر سوور دەیزانی کە ئەگەر رێگەیان نەدات ئاهەنگەکەیان بکەن لەوانەیە ئەمانە (زیندانییان ئامانیان نیە) فەرتەنەو ئاژاوەیەکی وەها بنەنەوە، کە کێشە بۆ هەموو ئەفسەرانی پاسەوان دروست بکەن. جگە لەمە هۆیەکی دیکەش هەبوو کە زابت خەفەری هاندەدا، مۆڵەتی ئاهەنگە شانۆییەکە بدات، ئەویش ئێشك گرتن بوو کە زۆر ناخۆش بوو، ئەگەر مۆڵەتی ئاهەنگە شانۆییە کۆمیدییەکەی بدایە، دەیتوانی بچێ بۆ تەمەشای ئاهەنگێك کە نەك سەربازان بەڵکو زیندانییان نمایشیان دەکردو، دەیتوانی بەوە بایەکی باڵی خۆی بدات. خۆ ئەگەر فەرماندەی پاسەوانانیش هاتباو پرسیاری کردبا، هەنێ دەکرا وەڵامی بدرێتەوە کە گوایە زابت خەفەر چووە زیندانییەکان سەر ژمێر بکاتو دەرگای قاوشەکان دابخات، دیارە ئەوە وەڵامێکی حازر بە دەستو هەنجەتێکی ئاسان و باوەڕکەردەنی بوو. بۆیە چاودێرەکانمان لە هەموو شەوەکانی جەژندا رێگەی سازدانی ئاهەنگە شانۆییەکەیان داین. دەرگای قاوشەکان درەنگە شەوانێك، بە ماوەیەکی کەم پێش خەوتنان دادەخران،و زیندانییەکان پێشوەختە دەیانزانی کە پاسەوانەکان، رێگەیان لێناگرن.

پترۆف، لە دەوروبەری سەعات شەشدا هات بە شوێنماو پێکەوە بۆ هۆڵی نمایشەکە چووین. هەموو زیندانیەکانی قاوشەکەی خۆمان هاتبوون جگە لە چرنیچکوڤ دیندارو پۆڵاندییەکان کە تا دوا ئێوارە، واتە تا ئێوارەی ٤/ك٢، بڕیاریان نەدابوو بچنە ئاهەنگەکە، ئەویش پاش ئەوەی دڵنیا بوو بوون کە نمایشێکی زۆر خۆشەو هیچ تانەو تەشەرێکی تێدا نیە، ئەوجا بڕیاریان دابوو بێن. دیارە زیندانییەکان ئەو دڕدۆنگیو لوتبەرزیو دوورەپەرێزییەی پۆڵاندییەکانیان لە دڵ

نەگرتبوو، بۆیە کە ئێوارەی ٤/ك٢ هاتن، زیندانییەکان زۆر بە گەرمی پێشوازییان کردنو لە باشترین شوێن دایان نیشاندن. چەرکەسییەکانو ئەشعیا  فومیچ، نمایشەکەیان زۆر پیٚ خۆش بوو، لە شادیا خەنی بوون. ئەشعیا فومیچ هەموو رۆژیٚ کە دەچووە ئاهەنگەکە سیٚ کۆبیکی دەدا، کەچی لە دوا رۆژدا لە جیاتی سیٚ کۆبیك دە دانە کۆبیکی خستبووە ناو قاپەکەوەو زۆریشی پیٚ خۆش بوو بوو.

زیندانییەکان بڕیاریان دابوو هەر تەمەشاڤانێك بە گوێرەی توناناو بە ئارەزووی خۆی بڕە پارەیەك بدات. قەراربوو قازانجی ئاهەنگەکە خەرجی سازدانی ئاهەنگەکەی لیٚ دەربهێنریٚو، زیادەکەی بەسەر ئەکتەرەکاندا دابەش بکرێت.

پترۆف پێی گوتم خەمی جێگام نەبێت، ئەگەر شانۆکە چەندیش قەرەباڵغ بیٚ، من جێی خۆم هەیە، چونکە جێی تایبەتیان بۆ داناوم، یەکەم لەبەر ئەوەی گوایە من لەوانی دی دەوڵەمەندترم، لەوانەیە پیتاکی زیاتریان بدەمیٚو، دووەم چونکە من لە هەموو ئەوانی دی پتر سەر لە نمایشنامەو شانۆیان دەردەکەمو تێدەگەم.

قسەکەی پترۆف دەرچوو. بەڵام با جاریٚ وەسفێکی هۆڵەکەو دامەزراندنی شانۆکەو شوێنی دانیشتن یان وەستانی تەمەشاڤانەکانتان بۆ بکەم.

قاوشی بەشی سوپایی کرابوو بە هۆڵی شانۆ، درێژی ئەم قاوشە هەر پازدە شەقاوێك دەبوو، پیاو لە حەوشی زیندانەوە بە قاڵدرمەیەکدا دەچووە ڕارەوێکی بچووکەوە کە دەچووە سەر ژوورێکی تر. ئەم قاوشە درێژکۆڵەیە وەکو پێشتر باسم کردووە، بە شێوەیەکی تایبەتی دروست کرابوو. تەختە خەوەکان لە بن دیوارەکان دادەنرانو ناوەندی قاوشەکە چۆڵ بوو. نیوەی یەکەمی قاوشەکە بۆ تەمەشاڤانان تەرخان کرا بوو، بەڵام نیوەی دووەمی کە دەچووە سەر بینایەکی دی کرا بوو بە شانۆ. پەردەی شانۆکە لە هەر شتێکی دیکە پتر سەرنجی راکێشام. قاوشەکەی دەکرد بە دوو بەشەوە، درێژییەکەی دە پیٚ بوو، ئەم پەردەیە پەڕجوویەك بوو لەو گۆڕە، بە راستی مایەی سەرنجو رامان بوو. بە بۆیەی زەیتی نەخشو نیگاری هەمە جۆری لەسەر کێشرا بوو: دارو درەخت، کەپرو کوختەو گۆڵاو ستێران. ئیدی ئەم پەردەیە لە قوماشی تازەو جلە کۆنی زیندانییەکان دروست کرابوو، لە کراسو شاشکان، کە جووتیارەکانمان لە جیاتی گۆرەوی بەکاریان دێنا، هەموو ئەمانە بە یەکەوە دوورا بوونو کرابوون بە پەردەیەکی گەورە،و چونکە پەردەکە بە ئەندازەی ژوورەکە نەبوو و بچووك بوو، ئیدی زیندانییەکان پارچە کاغەزی هەمە جۆریان لە فەرمانگەو دایەرەکان وەرگرتبوو و دابوویاننە دەم یەکترەوە. ئیدی نیگارکێشەکانی لەمەڕ خۆمان (کە یەکێك لەوانە برولوف یانی ئا.... ف) بوو بە نەخشو نیگاری یەجگار جوانو سەرنجڕاکێش نەخشاندبوویان، زیندانییەکان کە چاویان پێکەوت زۆر دڵیان پێکرایەوە، تەنانەت خەڵکە وشكو درژپەسندەکانیش دڵیان پیٚ کرایەوە. هەرکە نمایشەکە دەستی پێکرد هەموو وەکو منداڵ کەوتنە پاڵەپەستۆو دەڵەکدانی یەکتر. هەر هەموویان خۆشحاڵ بوون، هەستیان بە جۆرە شانازییەك دەکرد. رووناکی شانۆکە بریتی بوو لە چەند مۆمێك، مۆمەکانیان کردبوو بە پارچەی بچووکەوە تا زوو تەواو نەبێتو زیاتر بەرگە بگرێت. دوو تەختی درێژیان لە مووبەقەکە

هێنا بوو و رووبەڕووی پەردەکە دایان نابوون، سێ چوار کورسیانیش لە ژووری دەرەجەدارەکان بە ئەمانەت وەرگرتبوو و لە نێوان پەردەکەو دوو تەختە درێژەکە دایان نابوون، تا ئەگەر گەورە ئەفسەرەکان هاتبان بۆ ئاهەنگەکە لەسەر ئەو کورسیانە دابنیشن. بەڵام دوو تەختە درێژەکە بۆ دەرەجەدارو سەربازانی ئەندازەو چاودێردانی کاروبارەکان‌و ئەو سەرپەرشتیارانەی کە پلەی ئەفسەرییان نەبوو، و لەوە بوو سەرێك بدەن‌و تەمەشایەکی ئاهەنگە شانۆییەکە بکەن، تەرخان کرا بوو. ئەلهەقی شانۆکە لە میوان‌و تەمەشاڤانی کەم نەبوو. ژمارەی ئامادەبووان بە گوێرەی رۆژەکان دەگۆڕا، کەم‌و زۆر دەبوو، بەڵام لە دوا شەوی نمایشەکەدا، هیچ شوێنێکی بەتاڵ لەسەر تەخت‌و کورسیەکان نەمابوو. زیندانییەکان لە نێوان تەخت‌و کورسیەکان‌و دیوارەکاندا بەقەرەباڵغی بەپێوە وەستا بوون، وەکو رێز بۆ میوانەکان کڵاوەکانیان لەسەریان داکەند بوو. هەر چەندە هۆڵەکە گەرم بوو، بەڵام هەموو چاکەت یان پۆستینی کورتیان لەبەر بوو. چونکە شوێنەکە تەنگ بوو و جێی هەموو زیندانییەکانی تیا نەدەبووەوە، هەموویان بەسەر یەکا کەڵەکە بوو بوون، بە تایبەتی ریزەکانی دواوە، تەنانەت هەندێکیان چووبوونە سەر تەختە خەوەکان‌و ئەوانەی هیچ جێیەکیان دەست نەکەوتبوو لە پشت پەردەکەوە تەمەشایان دەکرد. هەندێکی دی چوو بوونە پشت شانۆکەو لە قاوشەکەی ترەوە تەمەشایان دەکرد. قەرەباڵغیەکەی لەوەدا نەبوو!.

بە هەرحاڵ من‌و پترۆف-یان بۆ شوێنێکی زۆر نزیکی تەختەکان برد، ئەوانەی لەو ریزەدا بوون، زۆر باشتر لەوانەی لە ریزی دواوەی هۆڵەکە بوون، شانۆو نمایشەکەیان دەبینی. بە بۆچوونی ئەوان من داوەرێکی زۆر باش بووم، بەلای ئەوانەوە کەسێکی ئەزموندار بووم‌و زۆر شانۆو نمایشی دیکەم دیتبوون. زیندانییەکان دیتبوویان کە باکلۆشین زۆرجار پرس‌و رای پێدەکردم،و بە رێزێکی زۆرەوە گوێی لە شیرەتەکانم دەگرت‌و بەگوێی دەکردم، ئیدی بە پێویستیان زانی بوو رێزم بگرن‌و باشترین شوێنم بۆ دابنەن. ڕاستە ئەوانە خەڵکانێکی سەرکێش‌و لەخۆ رازی بوون، بەڵام ئیدی ئەو رووبینی‌و رواڵەتبازیەشیان هەبوو. لە ئیش و کارا گاڵتەیان پێدەکردم، چونکە کرێکارێکی زۆر خراپ‌و بێ کەڵك بووم. ئالمازوف هەقی بوو گاڵتە بە ئێمەی خانەدان‌و ئەسڵزادە بکات،و شانازی بەوەوە بکات کە کوورەچیەکی باشەو لە مەڕمەڕ سووتاندندا وەستاو لێزانە. هەر هەموو ئەم تەوس‌و توانج‌و تەڵفیزیکاریە دەگەڕایەوە بۆ وەی کە ئێمە سەر بە چینی خانەدان بووین‌و ئەوانیش چەوساوەو پاشکەوتووی دەستی خانەدانان بوون‌و هیچ یادگارییەکی باشیان دەربارەی خانەدانان نەبوو. کەچی هەر هەمان ئەو پیاوانە، لێرەدا، لە شانۆکەدا، جێی تایبەتیم بۆ دادەنەن، چونکە لە دڵی خۆیاندا دان بەوەدا دەنەن کە لەم مەیدانەدا من لەوان شارەزاترم... تەنانەت ئەوانەش کە چاویان پێمدا هەڵنەدەهات‌و لە دڵی خۆیاندا رقیان لێم بوو ( ئەمەم لەسەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە دەزانی ) حەزیان دەکرد رای من لەمەڕ شانۆکەیان بزانن‌و ستایشی بکەم، بۆیە بێ هیچ روو دەربایسییەك شوێنەکانی خۆیان بۆ چۆڵ دەکردم. من ئێستا لەبەر رۆشنایی هەستی ئەو رۆژگارەم حوکم دەدەم. هەنگێ پەیم بەوە برد کە ئەو هەڵسوکەوت‌و مامەڵەیەیان هیچ جۆرە سازش‌و ملکەچییەکی تێدا نیە. بە پێچەوانەوە... بەڵکو جۆرە رێزگرتن‌و کەرامەت پارێزییەکی خۆیانی تیایە. یەکێك لە خەسڵەتەکانی گەلی ئێمە دادو دادخوازییە.

گەلێکە تینووی دادپەروەریی. لە خۆوە گەوجانە کەسێك ناخاتە ریزی پێشەوە کە شایستەی پێشەوە نەبێت. گەل لەم نەخۆشیە دوورە. وەرن رواڵەتبازیەکانی لێ لابەن، پەردەی رواڵەتبازیان لەسەر لابەن،و بە دوور لە هەر حوکمو داوەرییەکی پێشوەختە بیخەنە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوەو لە نزیکی نزیکەوە تەمەشای بکەن، بزانن چ خەسڵەت و تایبەتمەندیانێکی باشی ئەوتۆتان بۆ دەردەکەوێ کە رۆژێك لە رۆژان بیرتان لێنەکردووەتەوە، بە رێبواریش بە خەیاڵتاندا تێ نەپەڕیوە. تەنیا هەندێ شتی زۆر کەم هەن کە زانایان بتوانن فێری گەلی بکەن، بە پێچەوانەوە دەبێ ئەوان لە قوتابخانەی گەلدا فێری شت بن.

کە پترۆف بۆ شانۆکەی بردم، رێكو رەوانو بە شێوەیەکی زۆر سادەو ساویلکانە پێی گوتم کە لە ریزی پێشەوەم دادەنەن چونکە پارەی زیاتر لە خەڵکی دی دەدەم. هەڵبەتە شوێنەکان نرخی دیاریکراویان نەبوو، بەڵکو هەر تەمەشاڤانێك بەگوێرەی توانای خۆیو چی لە دەست دەرچووبا، ئەوەی دەدا. کە پیتاك کۆکرایەوە هەرکەسەو پارچە دراوێکی خستە ناو قاپی پیتاکەکەوە. لە خۆم دەپرسی: باشە ئەگەر لەبەر ئەوەش منیان خستبێتە ریزی پێشەوە کە پارەی زیاتر لە خەڵکی بدەم ئایا ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی جۆرە رێزو حورمەت گرتنێکی قووڵی شەخسی نییە ؟ وەکو ئەوە بوو پێم بڵێن: " تۆ لە ئێمە دەوڵەمەندتری، کەواتە بچۆ ریزی پێشەوە! راستە ئێمە لێرە یەکسانین، بەڵام تۆ لە خەڵکی دیکە زیاتر دەدەیت، کەواتە تەمەشاڤانێکی وەکو تۆ کە زیاتر دڵی ئەکتەرەکان خۆشدەکات، هەقی خۆیەتی لە ریزی پێشەوە دانیشێت. نەك لەبەر ئەوەی پارەمان خۆشدەوێ‌و رێزو حورمەتی پارەکە دەگرین، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە پێویستە خۆمان پۆلێن بکەین‌و، هەرکەسەو شوێنی شایستەی خۆی بەر بکەوێ !". بەڕاستی ئەمە رەفتارێکی بەجێ‌و دڵخۆشکەرەیە! چونکە لێرەدا مەسەلە پارەکە نیە، بەڵکو رێزو حورمەتەکەیە، وەك دەڵێن بۆ نەفسێ نییە بۆ قەدرێیە ! زیندانییەکان زۆریش پارە خۆشەویست نەبوون. قەت بیرم نایەت رۆژێ لە رۆژان یەکێکمان بۆ پارە خۆی سووك کردبێت. بۆ پارە تەنازولی کردبێت. خۆ ئەگەر جاروبار کەسێك داوای پارەی لە من کردبێت‌و پارەی لێوەرگرتبم، زیاتر بە مەبەستی فێڵ‌و حیلەبازی‌و ڕابواردن بووە تا بە مەبەستی خودی پارەکە… ئەوەش نیشانەیەکی شۆخیبازی‌و خۆش مەشرەبی‌و خۆش مگێزی بووە. بە هەرحاڵ نازانم ئاخۆ توانیومە مەبەستەکەی خۆم بەڕوونی‌و رەوانی دەربڕم یان نا… وا بزانم لە باسەکەم دوورکەوتمەوە، با بێینەوە سەر باسی شانۆکە..

هۆڵەکە بەر لە لادانی پەردەکە دیمەنێکی سەیری هەبوو، یەکپارچە جم‌و جۆڵ بوو. دەرزیت هەڵدابایە بە عاردی نەدەکەوت، خەڵکەکە لە هەموو لایەکەوە تێك ترنجابوون، بەڵام هەموو شادوو رووخۆش چاوەڕوانی دەست پێکردنی نمایشەکە بوون. ریزەکانی دواوە قەرەباڵغتر بوو، زیندانییەکان بەسەر یەکدا کەڵەکە بوو بوون: زۆربەیان سەرو کۆتەرە داریان لە مووبەقەکە هێنا بوو، نابوویان بە دیوارەکەوەو چوو بوونە سەری. دوو دانە سەعاتی خشت بەو دەقەوە، هیلاك‌و ماندوو، دەستیان بەشانی ئەوانەی پێش خۆیانەوە گرتبوو و هێشتاش مەمنوون بوون کە ئەو جێیەیان دەسکەوتبوو. هەندێکی دی خۆیان بە قەراخی باریکی سۆپاکەوە گرتبوو، بەدرێژایی

ماوەی نمایشەکە بەو حاڵەوە وەستابوون. هەندێکی دی لەسەر تەختە خەوەکان کەڵەکە بوو بوونو زۆر لە شوێنەکەی خۆیان رازی بوون. پێنج زیندانی دیکەش خۆیان گەیاندووەتە سەر سۆپاکەو لەویێ پاڵ کەوتوون، لەو سەرەوە دەڕواننە شانۆکەو زۆر خۆیان بە بەختەوەر دەزانن کە ئەو جێیەیان دەسکەوتووە. بەڵام ئەوانەی کە زۆر درەنگ گەیی بوونە جیٚو جێیان دەست نەکەوتبوو، هەموویان بە ئارامی لەبەر دەرگاو پەناو پەسێرەکان، دانیشتبوونو وەستا بوونو هیچ جۆرە هەراو هەنگامەو ئاژاوەو ئاشوبێك یان شەڕو قەرقەشەیەك دروست نەبوو، هەموو زیندانییەکان پابەندی یاساو رێسای زیندان بوون،و هەموویان هەوڵیان دەدا، لەبەر چاوی میوانە بەڕێزەکاندا ئەوپەڕی هێمنیو ویقار بنوێنن. بەدەم چاوەڕوانییەوە، لە گەرمای هۆڵەکەدا ئارەقەیان کردبوو و دەموچاویان سوور هەڵگەڕابوو. شادییەکی منداڵانەی بێگەرد نیشتبووە سەر سیمایانو هەموو بەسەری رووتەوە چاوەڕوانیان دەکرد. من کە لە دەستە راستەوە دانیشتبووم، وام دەهاتە بەرچاو کە هەموو سەریان سفر کردووە. ئەنجام دەنگە دەنگێك لەسەر شانۆکەوە بەرز بووەوە، جمو جۆڵێك پەیدابوو.... پەردەکە بوو کە دەجووڵا... ئەوجا دەنگی ئۆرکستەرەکە (تیپی مۆزیك) بەرز بووەوە... ئەم ئورکستەرە ئەوە دێنیٚ هەڵوەستەیەکی لەسەر بکەمو باسێکی بکەم. ئۆرکستەراکە بریتی بوو لە ٨ مۆزیکژەن لەسەر تەختەکان دانیشتبوون: دوانیان کەمانجەژەن بوون ( یەکێك لە کەمانجەکان هی پیاوێکی زیندانی بوو و ئەویتریان لە دەرێی زیندانکە بەئەمانەت هێنا بوو، مۆزێکژەنەکان هەموویان لە زیندانییەکانی خۆمان بوون) سییانیش بالالایکا ژەن بوون، بالالایکاکان دەستکردی زیندانییەکان خۆیان بوو، دووانیش گیتارژەن بوونو، یەکێکیش دەفژەن بوو. کەمانجەکان زۆر دەنگیان ناسازو ناخۆش بوو، گیتارەکان لە نرخی نەبوودابوون،و بەڵام بالالایکاکان گاڵتەیان پێنەدەکرا. قامکی هونەرمەندەکان بەسەر ژێی بالالایکاکانەوە هێندە بە سووکیو نەرمی دەبزوان کە من بەعەمرانم شتی وام نەبینی بوو. ئیدی پارچە ئۆپرایەکی میللی بوو لەو گۆڕە. مۆزیکژەنەکان جەزمە گرتبوونی، حاڵیان لێهاتبوو، لە گەرمەی مۆزیکژەنیدا لە پڕ دەیانکێشا بەقۆناغی ئامێرەکانیاندا، ژەنینەکەیان زۆر رەسەن، خۆشئاهەنگو، پڕ زەوقو ناسكو بە ریتمو ئاواز ڕەوان بوو. یەکێك لە گیتارژەنەکان زۆر باشی دەژەند، ئەمە ئەو گەنجە بوو کە بابی خۆی کوشتبوو، بەڵام دەفژەنەکە هەر باسی مەکە، پەڕجوویەك بوو لەو گۆڕە. دەفەکەی لەسەر یەك قامکی هەڵدەسوڕاند، یان قامکی گەورەی بە چەرمەکەیدا دێناو شەپۆلە ریتمو ئاهەنگێکی روونو رەوان بەرز دەبووەوەو بەرز دەبووەو لە ناکاودا دادەهاتەوەو دەنگێکی کرۆکپی وەکو دەنگی وردە شەپۆلی لیٚ هەڵدەقولا. لە کۆتاییدا دوو هارمۆنیکاژەنیش پەیوەندیان بەم ئۆرکستەرایەوە کرد. پیاو راست بڕوات قەت باوەڕم نەدەکرد بەم ئامێرە میللیانە بتوانریٚ ئەم هونەرنماییە بەرزە پیشان و ئەنجام بدرێت. کە گوێم لەم مۆزیقایە بوو هەر سەرم سوڕما! ئەلهەقی ئەو مۆزیکژەنانە توانیان بە جوانترین شێوە ئاوازەکان ئەدا بکەن، کە دیتم ریتمو ئاهەنگو ئاوازو ژەنین لە یەکەیەکی هونەری جواندا یەکیان گرتووە، هەنگیٚ بۆ یەکەمجار بۆم دەرکەوت، کە ئاوازو ئاهەنگی سەما میللییەکانمان و گۆرانیو ئاوازە باوەکانمان چ سیحرو ئەفسوونێکی مەزنیان لەخۆ گرتووە.

ئەنجام پەردەکە لابرا. جمو جۆڵو لە هۆڵەکەدا پەیدا بوو. ئەوانەی لە ریزی دوای دواوە بوون هەستانە سەر قامکی پێیان. یەکێکیان لەسەر کۆتەرە دارەکەی ژێر پێی خزی، هەموو ئەوانی دی بەتاسەوە دەمیان داچەقاندبوو، چاویان بڕی بووە شانۆکە، بێدەنگییەکی تەواو باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشابوو... ئەنجام نمایشەکە دەستی پێکرد.

من لە نزیکی "عەلی"یەوە دانیشتبووم، عەلی و براکانیو هەموو چەرکەسییەکانی دی لە یەك شوێندا وەستا بوون. ئەمانە زۆریان حەز لە شانۆو نمایش بوو، ئیدی هەموو شەویٚ دەهاتن بۆ شانۆکەو شەوبێریان نەدەکرد. هەستم کرد هەموو موسوڵمانان، چ تەتەرو چ غەیرەز تەتەر زۆر حەز لە شانۆ دەکەن. (ئەشعیا فومیچ)ش لەولای ئەوانەوە بوو، هەرکە پەردەکە لادرا، ئیدی سەراپای بوو بە گویٚو بەچاو، زۆر بەتاسەوە چاوەڕوانی رووداوی پەرجووئاسای دەکرد، خۆ ئەگەر گرتەیەکی بەدڵ نەبوایە، یەکسەر بەوەدا بۆت دەردەکەوت کە هەناسەیەکی قووڵی پڕ حەسرەتی هەڵدەکێشا. دەموچاوە جوانەکەی عەلی لە خۆشیا پرشنگی دەداو، بێگەردیو پاکییەکی منداڵانەی ئەوتۆ نیشتبووە سەر سیمای کە لەزەتم لە تەمەشاکردنی دەبینی. هەر کاتیٚ کە خەڵکەکە بە نوکتە یان ڕەفتارێکی کۆمیدیانەی ئەکتەرەکان پێدەکەنین، من ئاوڕم دەدایەوەو تەمەشایەکی (عەلی)م دەکرد تا بزانم کاردانەوەی ئەو سەبارەت بەو نوکتەیە یان رەفتارە کۆمیدیە چییە. بەڵام عەلی هەستی پێنەدەکردمو تەمەشای نەدەکردم. دیارە لەو کاتانەدا بیری بە شتی ترەوە مژوڵ بوو و ئاگای لە من هەر نەبوو. بە دەستە چەپداو لە نزیکی شوێنەکەی منەوە زیندانییەکی پیر راوەستا بوو، کابرایەك بوو گرژو پەستو توڕەو دڕدۆنگو ئیرادگرو ناڕازی. ئەویش هەستی بە عەلی کردبوو، ناو بەناو دزە نیگایەکی دەکردو بزەیەکی کاڵ سیمای بە ئاستەم دەگەشاندەوە! ئەم زیندانییە هەمیشە بە عەلی دەگوت (عەلی سیمیونیچ)، نازانم بۆ وای پێدەگوت! نمایشەکە بە نمایشنامەی (فیلادکاو میروشکا) دەستی پێکرد. باکلۆشین کە دەوری فیلادکای دەبینی، دەورێکی یەجگار جوان بوو. باکلۆشین زۆر بە باشی دەورەکەی دەبینی. دیاربوو حیسابی وردی بۆ هەر رستەیەك دەکرد کە دەیگوت، هەزارو یەك حیسابی بۆ هەر جوڵەیەك دەکرد کە ئەنجامی دەدا. بە تەواوەتی چوو بووە پێستو خووی کاراکتەرەکەوە. کۆپییەکی کوتو متی کاراکتەرەکە بوو. ئاسایی، چوستو چالاك، بە دوور لە هەر شێوەیەکی دەستکرد، دەورەکەی دەبینیو زۆری لێدەهات. خۆزگە (باکلۆشین)تان دەبینی چۆن دەورێکی دەگێڕا، هەنگیٚ دانتان بەوەدا دەنا کە بە راستی ئەکتەرێکی گەورەیەو لە خەڵقەتەوە بۆ نواندن دروست بووەو بەڕاستی بەهرەیەکی گەورەی هەیە. من نمایشنامەی (فیلادکا)م لەسەر شانۆکانی مۆسکۆو پترسبۆرگدا زیاتر لە جارێك دیتبوو، دەتوانم بە دڵنیاییەوە ئەوە بڵێم کە لە هیچ یەکێك لەو دوو پایتەختەدا، تاقە هونەرمەندێکم نەبینی لە بینینی ئەو دەورەدا هاوتای باکلۆشین بکاتەوە. ئەکتەرەکانی ئەوێندەر دەوری جووتیارانێکیان دەبینی دەشیا جووتیاری هەر وڵاتێکی دنیا بن، یانی جووتیاری راستەقینەی رووس (موجیك) نەبوون. یانی ئەوان پێیانەوە دیار بوو کە تەمسیل دەکەن، دەوری جووتیار دەبینن، بە پێچەوانەی (باکلۆشین)ەوە کە بوو بوو بە خودی جووتیارەکە. یەکێك لە هاندەرەکانی باکلۆشین هەڤڕکیی بوو. تەمەشاڤانەکان دەیانزانی لە

نمایشنامەی دووەمدا بوتسیاکین رۆڵی کودریل دەبینیٚ‌و باوەڕیان وابوو – نازانم بۆ– کە بوتسیاکین زۆر لە باکلۆشین بەهرەمەندترە. باکلۆشین وەکو منداڵ پێی ناخۆش بوو کە پەسندی هاوڕێکەی بەسەر ئەودا بدەن. لە دوا رۆژەکاندا چەندین جار هاتە لام‌و دەردە دڵی خۆی بۆ کردم! باکلۆشین پێش دەست پێکردنی نمایشەکە بە دوو سەعات تای لێهات، بەڵام کاتیٚ کە جەماوەرەکە لە قاقای پێکەنینیان دەداو هاواریان دەکرد: "سلاّو لە باکلۆشین بە ڕاستی ئەکتەری نەك گاڵتە !" لە خۆشیا دەموچاوی دەگەشایەوە، سەرۆیەکی راستەقینە لە چاوانیەوە پرشنگی دەدا. کاتیٚ ئەو دیمەنە پیشاندرا کە (میروشکاو فیلادکا) دەست لە ملی یەکدی دەکەن‌و یەکتری رادەمووسن، فیلادکا هاوار لە هاوڕێکەی دەکات: "زارت بسڕە، زارت وشك بکەوە" خەڵکەکە پڕ بە زار لە قاقای پێکەنین دەدەن. بەڕاستی کە ئەو هەموو جۆش‌و خرۆش‌و کەیف‌و شادییەی تەمەشاڤانەکانم بینی، زۆر خۆشحاڵ بووم. زیاتر شادمانیەکەی ئەوان خۆشحاڵی کردم، ئەم داماوانە کە ساڵەهای ساڵ بوو جگە لە بەدبەختی چاوەڕوانی هیچ شتێکی دی نەبوون، ئەمشەو دەرفەتیان بۆ رەخسا بوو، ئەگەر بۆ چەند ساتێکیش بووە، بەدبەختی‌و کلۆڵی خۆیان لە بیر بکەن. بۆ نموونە زیندانییەك بە ئانیشکان دەژەنیٚ بە قەبرغەی ئەوەی تەنیشتییەوە تا بە پەلەو بیٚ ئەوەی بزانیٚ کیٚ لە تەنیشتییەوەیە ، هەستی خۆی بۆ بگوازێتەوەو دەربڕێت. یەکێکی دی لە گەرمەی دەستپێکردنی دیمەنێکی کۆمیدیدا، بە توندی ئاوڕی پاشەوەی داو بە توندی کەوتە دەست تەکاندان، وەك ئەوەی بیەویٚ هاوڕێکانی هان بدات کە پێبکەنن، ئەوجا بەپەلە رووی بەرەو شانۆیەکە وەرگێڕایەوە. زیندانییەکی دیکە، هەر جوڵە جوڵیەتی‌و ناتوانیٚ ئارام بگرێت. بەڵام شوێنەکە تەنگەو ناتوانیٚ شوێنەکەی خۆی بگۆڕێت‌و لەجێی خۆی هێدی هێدی پێیان بە عاردیدا دەدا. لە کۆتایی شانۆییەکە شادمانی‌و خۆشی گەییە ئەوپەڕی. هەموو خەڵکەکە قاقا پێدەکەنین. ئەوەی دەیگێڕمەوە هیچ زێدەڕۆییەکی تێدا نیە! زیندانەکە بێننە بەرچاوی خۆتان، زیندانییانی پیٚ بە زنجیر، ئەو تەختە خەوانەی زیندانیەکانیان لە قاڵب دابوو، سالاّنی دوورو درێژی سوخرەو بێگاری‌و تاراوگە، ژیانی رۆتینی‌و یەکهاوی کە وەکو دڵۆپە تك تك دەهاتە خواریٚ، رۆژانی تاریك‌و نوتەك‌و درێژی پایز، هەموو ئەو دیمەنانە بێننە بەرچاوی خەیاڵ، ئەو زیندانییە داماوو بەدبەخت‌و سەرکوتکراوانە بێننە بەرچاو کە لەو وەزع‌و حاڵە نالەبارەدا، لەوپەڕی بیٚ ئومێدیدا دەژیان، لە پڕ رێگە درابوون بۆ ماوەی سەعاتیٚ دوان ئاهەنگ بگێڕن، شادی بکەن، خەمی دڵیان بە با بدەن‌و پڕ بە سییەکانیان هەناسە هەڵبکێشن، بەدبەختی خۆیان، مۆتەکەکانی سەر دڵیان فەرامۆش بکەن، ئاهەنگێك بگێڕن ئەمما ئاهەنگ، ئاهەنگێك کە هەموو خەڵکی شار خۆزیای پیٚ بخوازن، گەورەو بچووك بیگێڕنەوە، باسی بکەن‌و بڵێن: "تەمەشای ئەو زیندانییانە بکەن!" هەموو شتەکان، گشت دیمەنەکان بۆ زیندانییەکان تازەو خۆش بوو، مایەی سەرنجیان بوو. بۆ نموونە جل‌و بەرگەکان: زۆریان پێخۆش بوو کە (فاتکا یان نتسفیاتالف یان باکلۆشین) یان بە جل‌و بەرگی تازەوە دەبینی، نەك بەو جل‌و بەرگەی زیندانەوە کە ساڵەهای ساڵ بوو دەقیان پێوە گرتبوو. بەشادییەوە دەیانگوت "ئەویش زیندانییە... زیندانییەکی راستەقینەیە، کە رێدەکات زرەی زنجیرەکانی لە ژێر جلەکانیەوە سەعاتە رێیەك دەڕوات... بەڵام

ئێستا تەمەشای بکەن، لەسەر شانۆکە بیدینن چەند گۆڕاوە، بەو پاڵتۆو شەپقەو جلانەوە لەخانەدان و ئەشرافزادەیەکی تەواو عەیار دەچێ. تەمەشای سمێڵە دەستکردو کڵاو قژەکەی، چەند لێی دێت، بڕوانە کە دەستەسڕە سوورەکەی دەردێنێ خۆی پێ باوەشێن بکات، کوت ومت لە خانەدان و ئەشرافان دەچێت". بۆیە خۆشی و شادی تەمەشاڤانەکان گەییە لوتکە. کاتێ "ئاغای خێرەوەمەند" بەجلی سوپاییەوە، کە ئەلهەقی جلێکی شڕو شەپڕێو بوو، بەڵام نەجمەی ئاڵتوونی بەسەر شانەوە بوو، و کڵاوی سوپایی لەسەر بوو، دەردەکەوێ، هەمووان لە چەپڵەی شادمانی دەدەن. باوەڕدەکەن، دووان لە زیندانییەکان، لەسەر بینینی ئەم رۆڵە وەکو منداڵ دەچن بەگژ یەکدا، چونکە هەردووکیان زۆریان حەزدەکرد بە جلی سوپاییەوە لەسەر شانۆ دەربکەون ؟ ئیدی ئەکتەرەکان دەکەونە ناوبژییان و نایەڵن شەڕبکەن، بە زۆرینەی دەنگ رۆڵەکە بە نتسفیاتایف دەسپێردرێت، هەڵبەتە لەبەر ئەوەنا کەلە هاوڕێکەی بەتواناترو بەهرەدارتر بوو، لەو زیاتر لە خەڵکی خانەدان و ئەشراف دەچوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی هەموویانی دڵنیا کردبوو کە دار حەیزەرانێکی هەیەو لە کاتی نمایشەکەدا بەکاری دێنێ، بەم لاو بەولادا بایەدات و وەکو هەر خانەدان و ئەشرافزادەیەك لە عاردی دەخشێنێ و هەندێ خەت خەتۆکانی پێدەکات، یانی دەوری ئەشرافزادەی راستەقینەی پێوە دەبینێ، ئەمە شتێك بوو کە فانکا یان تسیباتین لە عۆیەی نەدەهاتن، کە بە عەمراتیان ئەشرافزادەیەکی ڕاستەقینەیان نەبینی بوو. ئەوە بوو کاتێ نتسفیاتایف دەست لە نێو دەستی ژنەکەی لەسەر شانۆ دەرکەوت، خێرا بە داردەستەکەی، کە کەس نەیدەزانی لە کوێی پەیدا کردبوو، چەند خەت خەتۆکێیەکی لەسەر عاردەکە نەخشاند، کە ئەمە بە نیشانەیەکی بێ چەندوچوونی تەربێت و رەفتارو ئەتەکێتی خانەدانان و ئەشرافان دەژمێردا.

ڕەنگە کاتی خۆی کە منداڵە هەژارێکی پێخاوس و شرۆڵ بووە، ئاغایەکی شیکپۆشی خانەدانی دیتبێ بەو ئەتەکێتە دار عاساکەی بادابێت،و ئیدی ئەمە لە نەستیا بۆ هەتا هەتایە چەسپی بێ و مت بوو بێ و وا ئێستا لە تەمەنی سی ساڵیدا، لە یادگەیدا سەری هەڵداوەتەوەو بە جۆرێ نمایشی دەکاتەوە کە هاوزیندانییەکانی پێ سەرسام بن. نتسفیاتایف بەجۆرێ لە دەورەکەی خۆیدا نقوم بوو وچاوی لە نووکی داردەستەکەی نەدەگواستەوە کە کاتێ قسەی دەکردو وەڵامەکانیشی دەدایەوە چاوانی هەڵنەدەبڕی، نووکی دارەکەی و ئەو خەت خەتۆکێیانەی کە لەسەر عاردەکەی دەکێشان بە جۆرێ سەرقاڵی کردبوو ئاگای لە هەموو شتێکی دیکە بڕا بوو.. هەروەها ڕۆڵی خانمە خێرەوەمەندەکەش زۆر جوان بوو. بە جلێکی کۆنی شڕۆڵەی مۆزلینەوە هاتە سەر شانۆ، هەردوو باسك و گەردنی رووت بوون، ئارایشت و مکیاجێکی زۆر تۆخی کردبوو، شەپقەیەکی چکۆلەی کەتانی لەسەر نابوو و بە داوێك لە ژێر چەناگەیدا بەسترا بوو، بەدەستێکی چەترێکی چکۆلەی ژنانەی هەڵگرتبوو،و باوەشێنێکی کارتۆنی رەنگاو رەنگیش بە دەستەکەی ترییەوە بوو ولێکدالێکدا دەموچاوی پێ باوەشێن دەکرد. کە تەماشاڤانەکان ئەم خانمە بەویقارەیان بینی لە قاقای پێکەنینیان دا، بە جۆرێ پێدەکەنین کە ئەویش خۆی پێنەگیراو لەسەر شانۆیەکەو بەدەم نواندنەوە، زیاتر لە جارێك پێکەنین گرتی.

ئیڤانۆڤ، کە ئەویش زیندانی بوو، ئەم رۆڵەی دەبینی. (سیروتکین)ش کە رۆڵی کیژی دەبینی، جلی کیژی لەبەرکردبوو، تا حەزکەی لێیدەهات. ئیدی هەموو ئەکتەرەکان زۆر بەجوانی دیالۆگەکانیان ئەنجام دا، بە باشی شیعرەکانیان خوێندەوە.بەکورتی نمایشنامەکە سەرکەوتووانە کۆتایی هات، جەماوەرەکە زۆریان بە دڵ بوو، کەس کەمترین ئیرادو رەخنەی نەبوو، چما ئیرادی هەڵدەگرت تا رەخنەیان هەبێ! بەشی یەك تەواو بوو.

ئۆرکتسراکە ئۆپرای بەشی دووەمی "ژووره چکۆلەکەم، ژووره چکۆلەکەم(٣)"ی لێدا. دیسان پەردە لابرا. نۆرەی نمایشنامەی " کودریلی چڵێس" بوو. ئەم نمایشنامەیە لە نمایشنامەی دۆنجوان دەچوو. لەو رووەوە لە دۆنجوان دەچوو چونکە لە کۆتایی شانۆنامەکەدا ئاغاو نۆکەرەکەی لەلایەن ئەهریمەنەوە دەرفێنرێن‌و بۆ دۆزەخ دەبرێن. دەستنووسەکە بە تەواوی خویندرایەوە، بەڵام دیار بوو کە ئەم دەقە تەنیا بەشێك بوو لە شانۆنامەکە، هەمووی نەبوو. بە مەزندەی من سەرەتاو کۆتایی شانۆنامەکە ون بووبوون. چونکە ئەوەی دیتمان سەرەتاو کۆتایی نەبوو. رووداوی دیمەنەکە لە میوانخانەیەکی گۆشەیەکی رووسیادا روودەدا. لە سەرەتای دیمەنەکەدا خاوەنی میوانخانەکە وەژووردەکەوێ، ئاغایەکی خانەدان بۆ یەکێك لە ژوورەکان دەبات، ئاغا پاڵتۆیەکی لەبەرەو کلاوێکی گەورەی خڕی چرچ‌و لۆچی لەسەر ناوە، کودریلی نۆکەر، دوای ئاغای دەکەوێ، بە دەستێك جانتاکەی بۆ هەڵگرتوەو بە دەستەکەی تری مریشکێکی برژاوی هەڵگرتووە کە لە زەرفێکی شینەوە پێچراوە. کودریل، پۆستینێکی کورتی لەبەر، کلاوێکی بریقەداری لەسەرە. ئەم نۆکەرە پیاوە چڵێس‌و زۆر خۆرەکەیە. بوتسیایکین–ی زیندانیی کە هەڤڕکی باکلۆشینە، ئەم رۆڵە دەبینێ. دەوری ئاغاکە ئیڤانۆڤ دەیبینێ، ئەو ئیڤانۆڤەی کە لە شانۆنامەی یەکەمدا رۆڵی خانمە بە ویقارەکەی دەبینی.

خاوەنی میوانخانەکە (نتسفیایایف) میوانەکە ئاگادار دەکاتەوە کە ژوورەکە جنۆکەدارەو ئەوانگەلی هەیە، ئەوجا دەڕوات. ئاغا بەدەم خەم‌و پەژارەی خۆیەوە بە دەنگی بەرز دەڵێت دەمێکە ئەمە دەزانێت، و فەرمان بە کودریل دەدات کە بەرو بوخچەو جانتاکە بکاتەوەو شیو ئامادە بکات. کودریلی چڵێسی زۆر خۆر، ترسنۆك‌و قەلەزراو، هەرکە گوێی لە ناوی جنۆکەو ئەوانگەل دەبێ، رەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ‌و وەکو بی ناو ئاو دەکەوێتە لەرزین،و تەنانەت بیر لەوە دەکاتەوە هەڵێت، بەڵام هەم لە ئاغای دەترسێت‌و هەم زۆری برسییە. کابرایەکە نەوسن، کەودەن‌و گەوجە، بەڵام بە دینی خۆی سەگ‌و فێڵبازە، لەگام‌و دەڵەچەیە، هەموو کاتێ ئاغای دەخەڵەتێنێ، بەڵام زۆریشی لێدەترسێت. ئیدی نموونەیەکی سەیرو دەگمەنی نۆکەرو خۆڵامانە، هەموو سوخەت‌و خەسڵەتە سەرەکیەکانی (لیبوریلو)ی تیایە، بەڵام ئاوێتەو نادیارە، زەق نیە. بوتسیابکین بەڕاستی لێهاتووانە ئەم رۆڵەی بینی، زۆر جوان ئەم تەبیعەتەی بەرجەستە کرد، بەڕاستی توانار بەهرەیەکی گەورەی هەیە، نکۆڵی لێناکرێت، بەڕای من لە (باکلۆشین)ش بە تواناترو بەهرەمەند تر بوو. هەڵبەتە رۆژی دواتر کە (باکلۆشین)م بینی ئەو بۆچوونەی خۆمم پێنەگوت. چونکە ئەگەر پێمگوتبا زۆری لەبەر گران دەبوو، پێی زویر دەبوو.

بەڵام ئەو زیندانییەی کە ڕۆڵی ئاغاکەی دەبینی، نمایشەکەی زۆر خراپ نەبوو. هەرچیەکی گوت هەمووی بێ سەروبەر بوو بەڵام ئیلقاکەی روونو رەوان بوو، ئاماژەو حەرەکەکانی گونجاوو سەرکەوتوو بوو.

لە کاتێکا کودریل خەریکی کردنەوەی جانتاکە بوو، ئاغای بە ژوورەکەدا دەهاتو دەچوو، لەبەر خۆیەوە دەیگوت ئیدی تەواو لەمڕۆ بە دواوە واز لە گەڕیدەیی دێنیو ماڵاوایی لەسەر گەردانی دەکات. کودریل گوێ لە مونۆلوگەکەی ئاغای دەگرێو دەمەلاسکێی دەکاتەوە، بە ئەداو ئەتواری کۆمیدی تەمەشاڤانەکان دێنێتە پێکەنین، هەڵبەتە بە دزی ئاغایەوە، بێ ئەوەی ئاغای گوێی لێ بێ ئەمە دەکات. هەڵبەتە کودریل نە بەزەیی بەئاغایدا دەهاتەوەو نە دڵی پێی دەسووتا، بەڵام چونکە ترسنۆك بوو و ناوی جنۆکەو شەیتانانی بیستبوو حەزیدەکرد شتێکیان لە بارەوە بژنەوێو بزانێ، بۆیە دەکەوێتە پرسیار لە ئاغای، ئیدی ئاغای بۆ دەگێڕێتەوە کە جارێك تووشی گرفت دەبێو مەرگ هەڕەشەی لێدەکات،و هانا بۆ شەیتان دەباتو شەیتان بەهەندێ مەرج فریای دەکەوێتو رزگاری دەکات، وئیدی ئەمڕۆ دوا مۆڵەتی مەرجەکەیانەو، ئەگەر شەیتان ئەمڕۆ پەیدا بێ، مانای وایە بۆ روحکێشانی ئەو هاتووە. کودریل لە ترسا دەکەوێتە لەرزین، بەڵام ئاغاکەی نەترە بەرنادات‌و خۆی شێلو ناکات‌و، دەستوور بە کودریل دەدات شیو ئامادە بکات. کودریل کە گوێی لە وشەی شیو و خواردن دەبێت، دەبوژێتەوە، مریشکە برژاوەکە لە زەرفەکە دەردێنێو قاپێ شەراب لە جانتاکە دەردێنێ، بە دزییەوە دەست بە خواردن و خواردنەوە دەکات. تەمەشاڤانەکان لە قاقای پێکەنین دەدەنو لە پڕ تەقو هۆڕ لە دەرگاکە بەرز دەبێتەوە، با دەیخاتە سەر گازی پشت، کودریل لە ترسا دەلەرزێ، بە پەلەو بەلا شعوری پارووپەکی گەورە لە مریشکە برژاوەکە دەپەستێتە دەمیەوەو هەرچی دەکات بۆی قووت ناچێت. تەماشاڤانەکان دیسان لە  قاقای پێکەنین دەدەن. ئاغای کە بە ژوورەکەدا دێتو دەچێت، هەڵوەستەیەك دەکاتو دەڵێت: "شیوەکەت ئامادە کرد؟" کودریل بەرسڤی دەداتەوەو دەڵێت: "هەر ئێستا ئەزبەنی... من.... خەریکم بۆتی ئامادە دەکەم". کودریل بەدەم ئەو قسەیەوە لەسەر خوانەکە دادەنیشێتو بەتاسووقەوە دەکەوێتە خواردن. جەماوەرەکە زۆریان پێ خۆش بوو کە ئەم خزمەتکارە بەو لێهاتووییە بە ئاغاکەی رادەبوارد. زۆر لێهاتووانە وەڵامی دەدایەوە: هەر ئێستا ئەزبەنی.... من.... خەریکم بۆتی ئامادە دەکەم."

کودریل لەسەر پارووگلانی خۆی بەردەوام دەبێت، بەڵام لەگەڵ هەر پاروویەکدا لەوە دەترسێت ئاغای پێی بزانێت. هەرجارێ کە ئاغای ئاوڕی دەدایەوە، خێرا بە مریشکەکەوە خۆی وەبن مێزەکەدا دەکرد. پاش ئەوەی کەمێك برسێتی دەشکێ، لێدەبڕێ خەمێکی ئاغای بخوات. کە هاوار دەکات‌و دەڵێت: "ئەرێ چیت کرد کودریل، شیوەکە ئامادە نەبوو". کودریل بەرسڤی دەداتەوەو دەڵێت: "ئەزبەنی ئامادەیە". کە دەبینێ تەنیا یەك ڕان لە مریشکەکە ماوە زۆر دەترسێت، بەڵام خۆشبەختانە ئاغا بە ڕادەیەك غەرقی خەمو پەژارەی خۆی دەبێت، لەسەر خوانەکە دادەنیشێتو بە هیچ جۆرێ هەست بەمە ناکات، ئیدی کودریل-یش خاولی بەدەست لە پشت کورسییەکەی ئاغاوە دەوەستێ. ئیدی کودریل بە قسەو بە حەرەکەو بە چاوداگرتن، روو لە

جەماوەر، گاڵتە بە ئاغای دەکاتو سەر بە قوڕ دێنێتە پێکەنین. هەرکە ئاغای گەنج دەست بە نانخواردن دەکات، جنۆکەو شەیتانەکان وەژووردەکەون. ئیدی لێرەوە شتەکان ئاڵۆزو نا مەفهووم دەبن. ئەو شەتیانانە لە هیچ شتێکدا لە بەشەر ناچن. دەرگایەکی لاوەکی دەکرێتەوە، تاپۆیەکی سەراپا سپی پۆش وەدیاردەکەوێت، سەری بریتییە لەچرایەكو مۆمێکی بە سەرەوەیە، تاپۆیەکی دی بە دواوەیە، چرایەکی بەسەر سەرەوەیەو داسێکی بە دەستەوەیە. بۆچی ئەم تاپۆیانە سپییان پۆشیوە، بۆ چرایان بەسەرەوەیەو بۆچی داسیان هەڵگرتووە ؟ کەس ئەمەی بۆ لێك نەدەدرایەوەو ئەوەی راستی بێ جەماوەرەکە زۆر بە خەمی ئەوەوە نەبوو و ئەم دیمەنە نا ئاساییەیان بەلاوە سەیر نەبوو. بەڵام ئاغا ئازایانە رووبەڕووی جنۆکەو شەیتانەکان وەستاو بێباکانە پێی گوتن حازرو ئامادەیەو دەتوانن دەگەڵ خۆدا ببیەن. بەڵام کودریلی ترسنۆك، وەکو مشکی تۆقیو خۆی وەبن مێزەکە دەدات، سەرباری هەموو ترسو لەرزێکیش قاپە شەرابەکە لە بیر ناکاتو دەگەڵ خۆیدا دەیباتە ژێر مێزەکە. جنۆکەو شەیتانەکان بۆ چەند ساتێك دەڕۆنو دیار نامێنن، کودریل لە ژێر مێزەکە دێتە دەرێ، ئاغا دەست بەخواردنی مریشکە برژاوەکە دەکاتەوە، سێ دانە ئەهریمەن وەژووردەکەونو لە باڵی دەنەونو بۆ دۆزەخی دەبەن، هاوار دەکات: "کودریل فریام بکەوە!" بەڵام کودریل خەمی ئەوی نیە، خەمی شتێکی دیکەیەتی، ئەمجارەیان قاپە شەرابەکەو مریشکەکەو تەنانەت نانەکەش هەڵدەگرێتو خۆی وەبن مێزەکە دەدات. ئیدی ئەوەتا دنیای بۆ تەخت بووە، هەر خۆیو خۆیەتی، شەیتانو جنۆکەکان رۆییشتن، ئاغاشی رۆیی. کودریل، لە ژێر مێزەکە دێتە دەرێ، چاو بە هەر چوارنکالاندا دەگێڕێ، بزەیەك سیمای رووناك دەکاتەوە، وەکو پیاوێکی بە فڕوفێڵ وحیلەباز چاوێکی دادەگرێتو لە شوێنەکەی ئاغای دادەنیشێت، بە چپەو لە بن لێوانەوە روو لە جەماوەرەکە دەڵێت:- دەی ئیستا هەر خۆمم، خۆم ئاغام.. نها بە تاقی تەنیام، بێ ئاغام!..

تەمەشاڤانەکان، لە قاقای پێکەنین دەدەن. ئەوجا بە دەنگێکی نزم، چاوێك دادەگرێتو بە زمانێکی پڕ کینایەتو بەوپەڕی خۆشییەوە دەڵێت:- شەیتان بردی!..

کودریل، ئەو وشانەی هێندە بە تەوسو توانجەوە، هێندە بە کینایەوە، هێندە سەرکەوتووانە ئەدا کرد کە کوڕم دەیوست خۆی بگرێتو چەپڵەی بۆ لێنەدات. بەڵام ئەم شادییەی کودریل زۆر بەردەوام نابێت. هەرکە قاپە کۆنیاکەکە هەڵدەگرێتو پێکێك تێدەکاتو دەیەوێ بۆ دەمی بەرێت، ئەهریمەنەکان پەیدا دەبنەوەو بە ئەسپاییو لە پشتەوە خۆیان بە ژوورەکەدا دەکەنو دەستگیری دەکەن. کودریل شێت ئاسا دەقیژێنێ. لە ترسا ناوێرێ ئاوڕی پاشەوەش بداتەوە. دەیەوێ داکۆکی لە خۆی بکات، بەڵام ناتوانێ. چونکە هەردوو دەستی گیراون، قاپەکە بەدەستێکیەوەیەو پێکەکەش بە دەستەکەی تریەوەیەو هێندەش نەوسنو چڵێسە ناتوانێ قیرووسیان لێبکات. بەو دەقەوە، لەجێی خۆیەوە بە زاری بەشەوە، بە سیمای ترساوەوە زەق زەق دەڕوانێتە جەماوەرەکە، دیمەنێکی پێکەنیناویو کۆمیدی ئەوتۆ پەیدا دەکات هەر شایستەی ئەوەیە نیگارکێشێکی بەتوانا وێنەی بکێشێت، ئەنجام ئەهریمەنەکان بکێشی دەکەن، دەیبەن، ئەویش بە قاپە کۆنیاکەکەوە بە لەقەفرتێو دەست بادانەوە، بەدەم هاتو هاوارەوە دەڕواتو لەو دیو

پەردەکانیشەوە هەر دەنگی هاواری نابڕێتەوە. ئەوجا پەردەکە دادەڕێتەوە. جەماوەرەکە، بەوپەڕی شادمانی لە قاقای پێکەنین دەدەن‌و لە گەرمەی پێکەنین‌و شادمانی ئەواندا ئورکستەراکە ئۆپراو سەمای میللی کارامنسکایا عەزف دەکات.

عەزف‌و ئاهەنگەکە لە هەوەڵەوە زۆر بە نەرمی‌و ناسکی دەست پێدەکات، بەڵام بەرە بەرە هەم ئاوازەکەو هەم ریتمەکە توندو توندتر دەبێت،و دەنگی بالالایکاکانیش لە سەرانسەری هۆڵەکەدا دەنگ دەداتەوە. ئیدی ئاهەنگ‌و ئاوازی ئۆپراو سەمای کارامنسکایا(٤) دەگاتە لوتکەی بەرزی خۆی. خۆزگەم دەخواست کە گلینکا لە زیندانەکەی ئێمەدا گوێی لەم ئاوازو مۆسیقایە بوایە... ئەوجا پانتۆمایمەکە دەستی پێکرد، سەرانسەری نمایشەکە ئاوازو ئاهەنگی سەمای کارامنسکایای لەگەڵدا بوو. دیمەنەکە دیوی ناوەوەی کوختەیەکی نیشان دەدا. کوختەکە ژن‌و مێردێکی تیا بوو، پیاوەکە جلێکی بە دەستەوە بوو و پینەی دەکرد، ژنەکەش خەریکی تەشی ڕێسی بوو. لەم پارچە نمایشەکەدا سیروتکین ڕۆڵی ژنەکەی دەبینی‌و، نتسفیاتایف دەوری پیاوەکەی دەبینی کە ئاشەوان بوو.

دیکۆری شانۆکە یەجگار هەژارانە بوو، بۆیە دەبوایە چ لەم پانتۆمایمەداو چ لە هەردوو شانۆنامەکەی پێشوودا بینەر بە زەبری خەیاڵی خۆی کەم‌و کوڕی دیکورەکەی پڕ بکردایەتەوە. بینەر لەو سەری شانۆکەدا لە جیاتی دیوار پەردەیەکی دەبینی، یانی لە جیاتی دیوار پەردەیەکیان هەڵواسی بوو. لە دەستە ڕاستدا چەند لەمپەرێك دانرا بوو، لە دەستە چەپدا شانۆکە بە هیچ شتێك نەگیرابوو، یانی بینەر، تەختە خەوی زیندانییەکانی دەبینی. بەڵام تەمەشاڤانەکان خەڵکی درژ پەسندو ئیرادگیر نەبوون، بە هەموو شتێك رازی بوون، وەك دەڵێن بە دۆش دەیانژەند، بە زەبری خەیاڵی خۆیان کەموکوڕییەکانیان پڕ دەکردەوە. ئەمەش بۆ ئەوان کارێکی ئاسان بوو، چونکە زیندانییان فێرن پەت بۆ خەیاڵیان بەربدەن، فێرن خەونی زۆر بدینن... ئامادەن تەسەوری ئەو شتە بکەن کە پێیان دەگوترێ تەسەوری بکەن. بۆ نموونە ئەگەر پێیان بگوترێ: ئەمە باخە، بە خەیاڵ دەیکەن بە باخ، یان ئەمە ژوورە یان کوختەیە، بە ژوور یان کوختەی وێنا دەکەن... ئەمە بۆ ئەوان قورس نییە، چونکە گوێ بە ڕواڵەت نادەن، درژپەسندو ئیرادگیر نین.... سیروتکین، بە جلە ژنانەکانیەوە زۆر جوان‌و شیرین بوو. یارۆی ئاشەوان کە لە پینەو پەرۆکەی دەبێتەوە، کڵاوەکەی لەسەر دەنێت، قامچیەکەی هەڵدەگرێت، لە ژنەکەی نزیك دەبێتەوەو بە ئاماژە تێی دەگەیەنێ کە بۆ ماوەیەکی کەم دەچێتە دەرێ‌و خوای لەو خوایە تاکو دێتەوە دەرگا لە کەس بکاتەوە...و بە هەڕەشەوە قامچیەکەی پێ نیشان دەدات. ژنەش سەری بۆ دەلەقێنێ‌و تێی دەگەیەنێت کە خەمی نەبێت. وا دیارە زەبری ئەو قامچیەی چەشتووە چونکە بە ڕواڵەتدا لە ژنێکی ئەشقفرۆش‌و داوێنتەڕ دەچێت. مێردەکەی وەدەردەکەوێ، هەرکە پشتی تێدەکات لە دواوە چەمۆڵەیەکی لێدەنێت! و پەنجە رادەوەشێنێ وەك ئەوەی بڵێ ڕاوەستە بۆم! لەپڕ لە تەقەی دەدرێ، ژنە دەرگا دەکاتەوە، یەکێك لە دراوسێکان وەژووردەکەوێ... ئەویش ئاشەوانە، ردێنێکی درێژی داناوەو ئیلەکێکی لەبەرە... دەستەسرێکی سووری بە دیاری بۆ ژنە هێناوە... ژنە بە بزەیەکی شیرینەوە پێشوازی دەکات، لەو کاتەدا کە کابرا دەیەوێ ماچی

بكات، یەکێکی دی لە دەرگا دەدات. تەگبیر، چی بکەن ؟ ژنە ماوەیەك بیردەکاتەوەو ئەوجا دەیخاتە ژێر مێزەکەوەو سەر لە نوێ خۆی بە تەشی ڕێسییەوە خەریك دەکات. میوانە تازەکە کابرایەکی بەیتاڵەو کۆنە جلێکی سوپایی لەبەرکردووە. تا ئەو کاتە پانتۆمایمەکە، نمایشە بێدەنگەکە زۆر بە جوانیو سەرکەوتووانە هاتبوو، هەموو حەرەکەکان گونجاوو بێ عەیب بوون، بگرە پیاو بە سەرسامی لە خۆی دەپرسی، چۆن ئەو ئەکتەرانە، کە هیچ ئەزموونێکی نمایشیان نەبوو، و هیچ پرۆڤەیەکیان نەکرد بوو، دەیانتوانی بەو جۆرە خۆڕسكو جوانە، بەو دروستییە ئەو دەورە ببینن،و هەرخۆی بەرسڤی خۆی دەدایەوە: "مەگەر هەر خوا بزانێ چ بەهرەگەلێکی وەکو ئەم بەهرانە لە سەرانسەری وڵاتەکەماندا، لەسەرانسەری رووسیادا هەبنو بەبێ ئەوەی بدۆزرێنەوەو بەگەڕ بخرێن، لە رەشچاڵاندا و لە تاراوگەکاندا بە ختوخۆڕایی زندە بەچاڵ بکرێن !"

بە مەزەندەی من ئەم زیندانییەی کە رۆڵی بەیتاڵەکەی دەبینی، یان لە شانۆیانی هەرێمەکاندا یان لە شانۆ میللیو تایبەتیەکاندا دەوری بینی بوو. وا دەهاتە بەرچاو کە پێی وابێ هیچ یەکێك لەم ئەکتەرە زیندانییانە هیچ لە کاروباری شانۆ نەزانن، تەنیا ئەو نەبێت. بۆیە وەکو قارەمانانی شانۆنامانی کۆنی کلاسیك رێی دەکرد، یانی هەنگاوێکی هەڕاوی دەنا، ئەوسا بێ ئەوەی لاقەکەی تری بجوڵێنێ، دەوەستا، سەرو جەستەی بۆ دواوە دەبرد، بەکەشو فشەوە دەیڕوانیە دەوروبەری خۆیو بە جەلالو شکۆوە هەنگاوێکی تری دەنا... هەرچەندە ئەم رێکردنە زۆر نا واقیعی بوو، بەڵام جەماوەری تەمەشاڤانان پێی رازی بوونو بەلایانەوە زۆر ئاسایی بوو، و هیچ گلەییو گازاندەیەکیان لێی نەبوو. هێشتا نەگەیی بووە ناوەندەی شانۆکە، کە کەسێکی دیکە لە دەرگای دا، ژنە پەشۆکا، نەیدەزانی چی لە دۆستەکەی بکات ؟ خۆشبەختانە سەندووقێکی کراوە لە سووچێکدا بوو، کابرای بەیتاڵ بەلەز خۆی بە سەندووقەکەدا کردو ژنەش سەرەکەی نایەوە. میوانی سێیەمیش یەکێك بوو لە ئاشقو دۆستەکانی ژنە، بەڵام ئاشقێکی تایبەتی، براهمەنێك(٥)بوو بە جلو جبەی براهمەنانەوە. تەمەشاڤانان کە چاویان پێکەوت لە قاقای پێکەنینیان دا. زیندانییەك بە نێوی کوشکین رۆڵی ئەم براهمەنەی دەبینی، بەڕاستی جوان چوو بووە کلێشەی براهمەنەوەو دەورەکەی زۆر جوان لێدەهات، چونکە سەروچاوی کوتومت لە براهمەن دەچوو، وەکو براهمەنان، بە هەمان ئاماژەو رەفتاری براهمەنان، ئاشقێنی دەگەڵ ژنی ئاشەوانەکەدا دەکرد، هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرزدەکردنەوەو ئەوجا هەردوو دەستی دەخستنە سەر سینگی... جارێکی دیکە لە تەقەی دەرگا دەدرێ،... لە دەرگادانی ئەمجارە یەجگار توند بوو... وا دیارە خاوەن ماڵەو گەڕاوەتەوە. ژنەکەی دەپەشۆکێ، خەریکە لە ترسا شێت دەبێ، کابرای براهمەن لە ترسا جێ بە خۆی ناگرێ، لە ژنەکە دەپاڕێتەوە کە بیشارێتەوە، ئەنجام دەیخاتە پشت دۆڵابێکەوەو دەکەوێتەوە تەشی رێرسی، لە پەشۆکاویدا بیری دەچێت بچێت دەرگاکە بکاتەوە. لە راستیدا تەشی نەدەڕێسا، بەڵکو تەمسیلی دەکرد، داوێکی خەیاڵی تەشیەکی خەیاڵی دەردێناو تەشیەکی خەیاڵی بادەدا، چونکە تەشیەکە لە دەستی بەر بووبووەوەو لەسەر عاردەکە کەوتبوو. سیروتکین بە ڕاستی ئەم رۆڵی ترسو پەشۆکانەی جوان دەگێڕا. سەبری مێردەکەی دەسوێ، دەرگاکە لە پاژنەوە دەردێنێ، قامچی بە دەست، بە

هەڕەشەوە بۆ ژنەکەی دەچێت، تومەز هەموو شتێکی بە چاوی خۆی دیتووە،و دوورو نزیك تاقیبی میوانەکانی کردووە. بە ئاماژە ژنەکەی تێدەگەیەنێ کە دەزانێ سێ میوانی لای خۆی شاردووەتەوە. ئەوجا دەکەوێتە گەڕان بە دوویاندا. یەکەمجار دراوسێکەیان دەدۆزێتەوە، بە مستو شاپان وەدەری دەنێت. کابرای بەیتاڵ دەترسێت، دەیەوێ هەڵێت، سەری سەندووقەکە هەڵدەداتەوەو خۆی ئاشکرا دەکات، ئیدی کابرای ئاشەوان بە قامچی تێی بەردەبێت بگرە کوێت دێشێت، کابرای تاین، ڕەفتارە کلاسیکییەکەی هەوەڵجاری لە بیردەچێتەوەو بەوپەڕی شپرزەیی و بە پەلەپڕووزێ لە سەندووقەکە دێتە دەرێو سەگ ئاسا کلکی لە گەڵۆزی دەنێو هەڵدێ. ئەوجا نۆرەی کابرای براهمەن دێت. ئاشەوانەکە زۆری بۆ دەگەڕێو نایدۆزێتەوە، بەڵام کۆڵ ناداتو ئەنجام لە پشت دۆڵابەکەوە دیدۆزێتەوە، بەڕێزو حورمەتێکی زۆرەوە سڵاوی لێدەکات، ردێنی دەگرێتو بەڕدێن تا ناوەندی شانۆکەی دێنێ، یارۆی براهمەن دەیەوێ داکۆکی لەخۆی بکاتو بە دەنگی بەرز دەڵێت: "نەفرەتی خوات لێ بێ، دەك بەر نەفرەتی خوا بکەوێ !" (بە درێژایی نمایشە بێدەنگەکە تەنیا ئەو چەند وشەیە بەکار بران ) بەڵام یارۆی ئاشەوان گوێی ناداتێو لەسەر تێهەڵدانی بەردەوام دەبێتو شاپ ترێنی دەکات، تۆڵەی نامووسی خۆی لێدەکاتەوە. ژنەکە دەزانێ ئەوجا نۆرەی ئەوە بەلەز تەشیو دەسپێچەکەکەی توڕدەداتو بە غار لە ژوورەکە وەدەردەکەوێ، بەدەم هەڵاتنەوە بەر ئینجانەیەك دەکەوێو ئینجانەکە قڵپ دەبێتەوەو دەشکێت، زیندانییەکان هەموو لە قاقای پێکەنین دەدەن. عەلی بە بێئەوەی تەمەشام بکات، بە هەڵچوونەوە دەستی گرتم گوتی: "بینیت ؟ بینیت ؟ ئای لەم براهمەنە!". خۆی لەبەر پێکەنین پێنەدەگیرا. پەردەکە دادەرێتەوەو جارێکی دی لا دەبرێو دیمەنێکی دی دەست پێدەکات...

دوو سێ دیمەنی دیکە نمایش کران. هەر هەموو دیمەنەکان زۆر کۆمیدیو شادبوون. زیندانییەکان بە خۆیان دایان نەهێنا بوون، بەڵکو وەریان گرتبوونو شتی زیادەیان خستبوونە سەر، دەسکاریان کردبوون. شاخو باڵی تازەیان لێنابوون. هەر ئەکتەرەو لەلای خۆیەوە شتێکی تازەی بۆ زیاد دەکرد، یانی هەر ئێوارەیەك گۆڕانێك بەسەر دیمەنەکەدا دەهات، واتا هەمان دەوری ئەم ئێوارەیە سبەی ئێوارە بە شێوەیەکی دی ئەدا دەکرا. دوا نمایش واتە پانتومایمەکە، کە شێوەیەکی خەیاڵی تەواوی وەرگرتبوو، بە سەمای باڵێ کۆتایی هات. بابەتی ئەم دیمەنە بریتی بوو لە بەڕێکردنی جەنازەیەك. کابرای براهمەن نوێژی مردوو لەسەر جەنازەکە دەخوێنێو، لە پڕ لە پشت شانۆکەوە دەنگی سروودو ئاوازی "خۆری ئاوا بوو...." بەرز دەبێتەوەو دەبیسترێو مردووەکە زیندوو دەبێتەوە، ئامادەبووان لە خۆشیدا دەست بە رەقسین دەکەن. یارۆی (براهمەن)ش دەگەڵ مردووەکەدا دەکەوێتە رەقسین، بەڵام بە شێوازی تایبەتی خۆی دەڕەقسێ، بە شێوازی بەراهمەنی. بەم دیمەنە نمایشە بێدەنگەکە (پانتومایم) کۆتایی دێت.

زیندانییەکان، بەخۆشحاڵی و بەدەم ستایشی ئەکتەرەکانەوە، سوپاسی زابت خەفەر دەکەنو بڵاوەی لێدەکەن.هیچ قەرقەشەو دەمبۆڵەیەك رووی نەدا. هەموو رازی بوون، بگرە دەتوانم بڵێم هەموویان خۆشحاڵ بوون. هەموو بە ئارامی، چوونە سەر جێگاکانیان، ئاسوودە بیرو دەڵڕەحەت

خپ خەتن، خەوێکی جیاواز لە خەوی شەوانی پێشوویان... ئەوەی کە ئێستا دەیگێڕمەوە نە خەوەو نە خەیاڵ، بەڵکو حەقیقەتە، حەقیقەتێکی خالیسە. چونکە ئەو بەدبەختو داماوانە رێگەدرا بوون بۆ چەند ساتێك بە دڵی خۆیان بژین، بۆ چەند ساتێك لەزەت لە ئینسانیەتی خۆیان ببینن، بۆ سەعاتێك لە هەلومەرجو زروفی زیندانی رزگاربن. لەو حاڵەتەدا روحی مرۆڤ، باری دەروونی ئەگەر بۆ چەند دەقیقەیەکیش بووە دەگۆڕێ....

درەنگە شەوێکی تاریك بوو. تەزوویەکم پێدا هات. بە رێکەوت لە خەو ڕابووم: کابرای دیندار هێشتا لەسەر سۆپاکە نوێژی دەکردو تاکو بەرەبەیان هەر نوێژی کرد. عەلی لەنزیکی منەوە بە هێمنی نووستبوو، لە بیرمە تاکو نووستنیش هەر پێدەکەنی و دەگەڵ براکانیدا باسی شانۆکەی دەکرد. بەبێ ویستی خۆم روانیمە سەرو سیمای ئارامی. بەرە بەرە هەموو شتێکم بیرکەوتەوە، دوێنێم بیرکەوتەوە، جەژنەکانی نوئێل و سەری ساڵم بیرکەوتنەوە، هەموو ئەو مانگەم بیر کەوتەوە... بە ترسەوە سەرم هەڵبڕی، تەمەشای هاوڕێ نووستووەکانم کرد کە لەبەر رووناکی لەرزۆکی مۆمێکدا کە ئیدارەی زیندان لە قاوشەکەدا دایانابوو، نووستبوون. روانیمە سەرو سیمای نەگبەتیان، جێگەو بانە پەڕپووتەکانیان، روانیمە ئەو هەموو کڵۆڵی و بێنازییەی ئابلوقەی دابوون، بەڵێ روانیمە هەر هەموو ئەو دیمەنانە... دەمویست بە خورتی قەناعەت بە خۆ بێنم کە ئەو دیمەنەی دەی بینم نە خەوە، نە خەیاڵە، نە مۆتەکەیەکی ترسناکە، بەڵکو واقیعە، حەقیقەتە، حەقیقەتی راستەقینەیە. گوێم لە ناڵەیەك بوو. زیندانییەك بە زەحمەت باسکی جوڵاند، زڕەی زنجیرەکانی بەرز بووەوە. زیندانییەکی دی بە دەم خەوەوە شپرزەو پەشێو ورێنەی دەکرد. یارۆی پیرەمێردیش بە دەم نوێژ کردنەوە دوعای بۆ هەموو " مەسیحیانی ئەرتەدۆکس" دەکرد. گوێم لێ بوو لە پەستاو بێ بڕانەوە، بە دەنگی نزم، بە دەنگێکی خۆش، لە بن لێوانەوە دەیگوتو دەیگوتەوە: "حەزرەتی مەسیح! رەحم بە هەمووماندا بکە!"....

سەرم نایەوە سەر سەرینەکەمو لە دڵی خۆدا گوتم: "بۆ هەتا هەتایە لێرە ناژیم، ئەوپەڕەکەی چەند ساڵێك لێرە دەمێنمەوە."

***پەراوێز:***

***١- هەڤرکان فیلادکاو میروشکا: شانۆنامەیەکی کۆمیدییە، لە نووسینی ب. ج گریگۆرییفە، لە ساڵی ١٨٣١دا لە پترسبۆرگ نمایش کراو پاشان لە هەرێمەکاندا زۆر برەوی پەیدا کرد.***

***٢- کودریل: لەوەیە ناوی کودریل، لە (بدریللو)وە وەرگیرا بێ و گۆڕانی بەسەردا هاتبێ.***

***٣- ژووری بچکۆلەکەم : گۆرانیەکی یەجگار بەناو بانگی رووسییە.***

***٤- کارامنسکایا: سەمایەکی میللی رووسی زۆر توندە، گۆرانی زۆر مەکشوف بێ پەردەی دەگەڵ دەگوترێ.***

***٥- براهمەن: پلەیەکی ئاینی رۆحانیانی هندۆسییە.***

((١٢))

## نەخۆشخانە

٣-١

کەمێك دوای پشووەکانی جەژنی سەری ساڵ نەخۆش کەوتمو ناچار بووم بۆ نەخۆشخانەی سوپایی بڕۆم. نەخۆشخانەکە نیو فەرسەخێك لە زیندانەکەمانەوە دوور بوو. بینایەکی یەك نهۆمی زۆردرێژ بوو. بە بۆیەی زەرد بۆیە کرابوو. ئیدارەی نەخۆشخانەکە هەموو هاوینێك بەگڵی زەرد تەڕاوی دەکردەوە. ئەم نەخۆشخانەیە حەوشەیەکی گەورەی هەبوو، چەند بینایەکی دیکەی لە حەوشەکەیدا هەبوون، کە هەندێکیان تایبەتی بوون بە پزیشكو دکتۆرەکان. بەڵام بینا سەرەکیەکە بریتی بوو لە کۆمەڵێك قاوشی تایبەت بە نەخۆشخان. تەنیا دوو قاوش بۆ زیندانییەکان تەرخان کرابوون. بۆیە هەمیشە پڕبوون لە نەخۆش، بە تایبەتی لە هاویناندا، زۆرجار ئیدارەی نەخۆشخانەکە ناچار دەبوو لە نێو تەختە خەوەکاندا، بە شێوەی کاتی تەختی زیادە دابنەنو ریزبکەن. ئەم دوو قاوشە هەمیشە پڕبوون لە " قەرەبەختان "، هەموو جۆرە زیندانییەکی نەخۆشیان تیابوو، هەندێکیان هی زیندانەکەی ئێمە بوون، هەندێکی دی گیراوی سوپایی بوونو چاوەڕوانی دادگایی بوون، هەندێکی دی گیراوانی کاتی بوون، هەروەها هەندێکی دی لەو سەربازانە بوون کە هەواڵەی سەربازگەی تەمبێکاری کرابوون، سەربازگەی تەمبێکاری، بریتی بوو لە دەزگایەکی تایبەتی، ئەو سەربازانەیان بۆ دەنارد کە گوێڕایەڵو ملکەچ نەبوون، بەد ڕەفتارو سەرکێش بوونو وردە خەتایان دەکرد، تا گوایە لەوێندەر ڕامیان بکەنو هێورو هێمنیان بکەنەوەو چاکیان بکەنەوە، ئەمانە ساڵێك، دوو ساڵ لەو سەربازگانەدا دەهێڵرانەوە، کە دەردەچوون نەك بەرەو باشی نەدەگۆڕان، بەڵکو دەبوون بە خوێڕیترین تاوانکارانی سەر رووی زەوی.

هەر زیندانییەك هەستی بکردایە کە نەخۆشە، لە بەیانی زووەوە زابت خەفەری ئاگاداری دەکردەوە، ئەویش ناوی دەنووسی، پسوولەیەکی بۆ دەبڕیو بە سەربازێکدا بۆ نەخۆشخانەی دەنارد، کە دەگەیینە ئەوێندەر، پزیشك معایەنەی دەکردو ئەگەر دڵنیا بوایە نەخۆشە، لە خەستەخانە دەیخەواند. زابت خەفەر ناوی نووسیمو پسوولەی بۆ بڕیم. دەوروبەری سەعات یەك، کە هەموو هاوڕێکانم بۆ سەر کار ڕۆییشتن، من بۆ خەستەخانە چووم. هەر زیندانییەك کە بۆ نەخۆشخانە، ڕۆییشتبا، تۆێشەبەرەیەکی پڕ لە نانو خۆراك دەکردو لەگەڵ خۆیدا دەیبرد (چونکە لە نەخۆشخانەدا، ڕۆژی یەکەم نە فراڤینو نە شیویان بە نەخۆش نەدەدا )، هەروەها نەخۆش سەبیلو کیسە تووتنو چەخماخو بڕنوتیشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. بەڵام دەبوایە ئەم شتانە بە دزییەوە لە پێڵاوەکانیا وەشێرێت. کە داخڵی حەوشی نەخۆشخانەکە بووم، هەستم بە غوربەتێکی سەیر کرد، چونکە هیچ زانیارییەکم لەمەڕ ئەم لایەنەی ژیانی زیندانییان نەبوو.

رۆژەکەی، رۆژێکی گەرم بوو پەڵە هەوری خەمناك بەری ئاسمانی گرتبوو، دیمەنی نەخۆشخانەکە لە سایەی ئەو هەورو هەلاّیەدا دڵی نەخۆشی هێندەی دی تەنگ دەکرد. پیاو لە خۆی بێزار دەبوو. منو سەربازەکەی هاوڕێم خۆمان بە ژووری چاوەڕوانیدا کرد. ژوورەکە دوو بانێوی چینکۆی تیا بوو. دوو زیندانی دی دەگەڵ پاسەوانەکانیاندا لە ژوورەوە چاوەڕوانی معایەنەی پزیشك بوون. پەرستارێك خۆی بە ژووراکرد، بە خەمساردیو بێ موبالاتیەوە تەمەشایەکی کردین، نیگای ئەوەی دەنواند کە بەسەر ئێمەوە بالاّ دەستە، ئەوجا بەبێ موبالاتیو خوێنساردییەکی زیاترەوە چوو کە پزیشکی خەفەر لە هاتنی ئێمە ئاگادار بکات. دوای تۆزێك پزیشکەکە هات، بەوپەڕی لوتفو میهرەبانی معایەنەی کردین، ئەوجا سەرو کارتی داینێ کە ناوی خۆمانی لەسەر تۆمارکرابوو، مەسەلەی دیاریکردنی نەخۆشیو دانانی دەرمانو پارێزو ئەو شتانەی بە یاریدەدەرەکەی خۆی سپاردبوو کە بەرپرسیاریەتی هەردوو قاوشی زیندانییەکانی لە عۆدەدا بوو. پێشتر لە زیندانییەکانم بیستبوو کە ستایشی پزیشکەکانیان دەکردو تەنانەت کە لێبڕام بچم بۆ نەخۆشخانە پێیان گوتم: "پزیشکەکان بۆ ئێمە وەکو باوك وان!" جلەکانیان پێداکەندین تا جلی تر لەبەر بکەین، جلی خەستەخانەیان داینێ، ئەم جلانە جگە لە جلی پێویستی ژێرەوە، گۆرەویو سۆڵو کلاّوی دەزووچنو رۆبی ماڵەوە کە لە قوماشێکی ئەستووری قاوەیی دروستکرا بوو، بەرەکەی لە مشەمایەکی لەزگە ئاسا دەچوو، لەو لەزگانە دەچوو کە لە برینو زامیان دەنا تیابوو. ئەلهەقی رۆبەکە یەجگار چڵکنو پیس بوو، بەلام هەر زوو هەستم بە باشیەکەی کرد.

پاشان بۆ قاوشی زیندانیەکانیان بردین، ئەم قاوشانە دەکەوتنە کۆتایی رارەوێکی درێژی زۆر بەرزو زۆر پاکو خاوێنەوە. هەموو شتەکان، بەلای کەمەوە وەکو رواڵەتو، لە دیوی دەرەوە پاكو خاوێن بوو. هەموو شتەکان دەبریقانەوە، یان بەلای کەمەوە لە چاو پیسو پۆخڵی زیندانەکەدا وام دەهاتنە بەرچاو، دوو زیندانییەکەی دی چوونە ئەو قاوشەی کە کەوتبووە نکالی چەپی ڕاڕەوەکە، من چوومە قاوشەکەی لای دەستە ڕاستەوە. ئەم دەرگایە قفڵێکی گەورەی لێدرا بوو. پاسەوانێك بە بەر دەرگاکەدا دەهاتو دەچوو، ئێشکگرێکی دی لەولاوە وەستا بوو تا بیگۆڕێتو بێتە جێگاکەی. عەریف خەفەر ( کە لە پاسەوانانی خەستەخانەکە بوو ) دەستووری دا کە رێم بدەن بچمە ژوورەوە. کوتو پڕ خۆم لە قاوشێکی تەنگی درێژکۆڵەدا دیتەوە، لەم بەرو لەوبەری قاوشەکەو لە بن دیوارەکەوە بیستو دوو تەخت ریز کرا بوون، هێشتا سێ چوار دانەیان چۆڵ بوون. تەختە خەوەکان لە دارو تەختە دروستکرابوون، بە بۆیەی کەسك بۆیە کرابوون، هەموو خەڵکی رووسیا دەیانزانی ئەو تەختانەی کە بەو بۆیانە بۆیە دەکران مۆرانەیان هەبوو. لە یەکێك لە سووچەکانو لەبەر پەنجەرەیەکدا شوێنم گرت.

وەکو پێشتر باسم کرد، لە قاوشەکەماندا هەندێ نەخۆش هەبوون کە لە زیندانەکەی ئێمەوە هاتبوون، هەندێکیان دەیانناسیم، یان بەلای کەمەوە دیتبوویانم. بەڵام ژمارەی ئەو نەخۆشانەی کە لە ژێر دادگاییدا بوون یان سەر بە سەربازگە تەمبێکارییەکان بوون، ژمارەیان یەجگار زۆر بوو.

ئەوانەی کە بە راستی نەخۆش بوون‌و پێویست بوو لە خەستەخانە بخەوێنرێن ژمارەیان زۆر کەم بوو. ئەوانی دی یا لە قۆناغی بوژانەوەو چاك بوونەوەدا بوون، یان نەخۆشیەکانیان زۆر سووك بوو، ئیدی یان لەسەر جێگەکانی خۆ ڕاکشابوون یان بە ڕاڕەوی قاوشەکەدا هاتوچۆیان دەکرد. بەینی دوو ریزە تەختەکە فراوان بوو، دەیانتوانی بە ئاسانی هاتوچۆ بکەن. بۆنی قاوشەکە زۆر ناخۆش بوو، پیاو تەنگەنەفەس دەبوو، پەکپارچە بۆنی دەواو دەرمان بوو: جگە لە بۆنی ناخۆشی خودی نەخۆشەکان، بۆنی دەواو دەرمانیش پیاوی هێڕ دەکرد، هەرچەندە بە درێژایی رۆژ سوپاکەش دەسووتا، بەڵام بۆنی ناخۆشی دەواو دەرمانەکەی ڕانەدەدا.

چەرچەفێکی ڕێڕێ بەسەر جێگەکەمەوە بوو. چەرچەفەکەم لابرد ، پەتۆیەکی دوو بەری زبرو هەندێ ڕایەخی چڵکنی لەسەر ڕاخرا بوو. تەپەڵەکێکی چکۆلە بە تەنیشت تەختە خەوەکەوە بوو، شەربەیەکی ئاو و پەرداخێکی کانزایی ئاو خواردنەوەی لەسەر بوو، خاولیەکی چکۆلەش بەسەر پەرداخەکەوە بوو. تەپڵەکەکە رەفەیەکی هەبوو، ئەو زیندانییانەی توانای ئەوەیان هەبوو لە کیسەی خۆیان چا بخۆنەوە قۆری‌و تاقمی چایەکەیان لەسەری دادەنا. بەڵام ژمارەی ئەو دەوڵەمەندانە زۆر کەم بوو. سەبیل‌و کیسەی تووتن لە ژێر جێگاکاندا دەشێردرانەوە. ( زۆربەی هەرە زۆری زیندانییەکان‌و، تەنانەت ئەوانەی کە سیلیشیان هەبوو سەبیلیان دەکێشا.). بە دەگمەن دکتۆرو کارمەندانی نەخۆشخانەکە لە تووتن‌و سەبیل دەگەڕان، خۆ ئەگەر بە ڕێکەوت زیندانییەکیان بدیبایەو سەبیلی بە دەمەوە بوایە، بە ئانقەست خۆیان لە گێلی دەداو وایان دەنواند کە نەیان دیتووە. بەڵام زیندانیەکان بەخۆیان حەزیان دەکرد بە دزییەوە سەبیل بکێشن‌و ... مەگەر شەوانی درەنگ لەسەر جێگاکانیان سەبیلیان کێشابا، دەنا زۆربەی کات لە پشت سۆپاکەوە دەیانکێشا. شەوان کەس بۆ تەفتیش دەرناچوو جگە لە زابت خەفەر، ئەویش زۆر بە کەمی سەری قاوشەکانی دەدا.

ئەمە یەکەمجار بوو لە هەموو ژیانمدا لە خەستەخانە بکەوم. بۆیە هەموو شتێکم بەلاوە تازەو مایەی سەرنج بوو. هەر زوو پەیم بەوە برد کە ئەوانیش منیان بە لاوە تازەیەو مایەی سەرنجم بۆ ئەوان. هەڵبەتە هەندێ شتیان لە بارەی منەوە بیستبوو، وەکو چۆن منداڵە مەکتەبلی تەمەشای قوتابییەکی تازە دەکەن‌و خۆیان لەو بە گەورەتر دەزانن، ئەوانیش بەو ئاوایە تەمەشای منیان دەکرد، یان وەکو چۆن کارمەندانی فەرمانگەیەکی حکومەتی خۆیان لە موراجیعێك بە گەورەتر دەزانن، بەو ئاوایە مامەڵەیان دەگەڵ مندا دەکرد. دراوسێکەی دەستە ڕاستم زیندانییەك بوو کە جاران کاتب بوو، ئەمە کوڕی نا شەرعی ئەفسەرێکی خانەنشین بوو، لەسەر ئەوە گیرابوو کە پارەی قەڵبی دروست کردبوو: یەك دانە ساڵ بوو لە خەستەخانە بوو. لە گوێزیش ساغتر بوو،و قەناعەتی بە دکتۆرەکان کردبوو، کە شادەمارەکانی دڵی ئاوساون‌و بەمە هەم خۆی لە سوخرەو بێگار دزی بووەوەو هەم خۆی لە شەڕی سزای جەستەیی خەلەساندبوو. دوای ساڵێك بۆ خەستەخانەیەکی دی لە شاری (ت....ك)، نێردرا. گەنجێکی تۆکمەی چوارشانە بوو، تەمەنی هەر ٢٨ ساڵێك دەبوو، کابرایەکی زۆر زیرەك‌و گۆساخ بوو، ئەوەندە شارەزای یاسا بوو دەتگوت ئەوقاتە. پیاوێکی خۆش مەشرەب بوو، بەڵام زۆر خۆپەسندو خۆپەرست بوو، بەڕادەیەك

خۆپەرست بوو کە لێی بوو بوو بە نەخۆشی. قەناعەتی تەواوی بەوە هەبوو کە کەس لە دنیادا بە ئەندازەی ئەو ئابڕوومەندو دروستکارو راستگۆو پاکو بێگەردو بە ئینسافو بێتاوان نییە، هەرگیز دانی بە تاوانەکەی خۆیدا نەدەنا. بە درێژایی تەمەنی خۆی ئەم متمانەیەی بەخۆی هەبوو. ئەم کوڕە یەکەم کەس بوو کە هات بەلامەوەو مەرحەبای کردمو دواندمی، بەر لە هەموو شتێك باسی ئەوەی بۆ کردم کە کوڕی بابایەکی ئەفسەرە بە پلەی نەقیب. زۆری حەز دەکرد وەکو کوڕە ئەشرافان، یان کوڕە خانەدان مامەڵەی لە تەکدا بکەم. ئیدی باسی دابو نەریتو ئاکاری باوی خەستەخانەکەی بۆ کردم. دوای ئەو بە ماوەیەکی کەم نەخۆشێکی سەر بە سەربازگەی تەمێکاری هات بۆ لام. ئەمە بۆی گێڕامەوە کە گەلێك لەو خانەدانە زیندانییانە دەناسێت کە بەر لە من هاتبوونە زیندان. جا بۆ ئەوەی قەناعەتی تەواو بە من بکات کە ڕاست دەکات، بە ناو ناوی هەندێکیانی برد. بەڵام هەرکە چاوت بە سەروسەکوتی بۆزی ئەم سەربازە بکەوتبایە، یەکسەر دەتزانی کابرایەکی درۆزنەو راستی لە مەزەبدا نییە، ئەمە نێوی چیکونوف بوو. بۆیە مەرایی دەکردم، چونکە پێی وابوو دەوڵەمەندمو پارەم پێیە. کە بینی پریاسکەیەکم پێیەو چایو شەکری تێدایە، خێرا پێی گوتم کە کتریم بۆ دێنێو ئاوم بۆ دەکوڵێنێ. (م....کی) قەولی دابوومێ کە سبەینێ بە یەکێك لەو زیندانییانەدا کە لە خەستەخانەکە کاریان دەکرد، کترییەکەم بۆ بنێرێت. بەڵام چیکونوف خێرا قۆریو پیاڵەی ئامادە کرد، ئاوی کوڵاندو چای دەم کرد. ئیدی هێندە بە دڵو گیان کەوتە خزمەتم، کە یەکسەر یەکێك لە نەخۆشەکان توڕە بوو و کەوتە گاڵتە پێکردنی، ئەم نەخۆشە سیلی بوو، جێگاکەی بەرانبەر جێگاکەی من بوو نێوی ئوستیانتسف بوو، ئەمە ئەو سەربازە بوو کە لە بەشی یەکەمی ئەم بیرەوەریانەدا باسم کرد. ئەمە حوکمی شەلاقکاری درا بوو، ئەوەندە ترسا بوو هەستا بوو چنگێ تووتنی کوڵاند بوو، ئاوەکەی لەگەڵ قاپێ کۆنیاکدا تێکەڵ کردبوو و خواردبوویەوە تا بە خەیاڵی خۆی هەست بە ئازار نەکات، ئیدی رێك بۆ خۆی تووشی سیلو دەردەباریکە بوو بوو ونهو لەسەر جێگەی مەرگ کەوتبوو. ئەم پیاوە تا ئەم دەمە کڕوکپ پاڵکەوتبوو، ورتەی لێوە نەدەهات، بەئاستەم هەناسەی بۆ دەدرا، زۆر بە بایەخەوە نیگای بڕی بووە من، بەنیگای توڕە هەموو هەڵسوکەتێکی چیکونوڤ دابووە چاو. هێندە مەنگو بە ویقار بوو، ئەو توڕەییەی لێنەدەهات. ئەنجام پەتی سەبری پساو هەڵیدایە:

– تەمەشای ئەم نۆکەرە بکەن کە ئاغای خۆی دۆزیوەتەوە!

بە دەنگێکی کزو لاواز، بە شێوەیەکی پچڕپچڕ ئەو قسانەی کرد، یانی بەدەم گیانەللاوە ئەو قسانەی کرد.

چیکونوف. بە توڕەیی ئاوڕی دایەوە. نیگایەکی پڕ تەوسو توانجی کردو پرسی:

– کێ نۆکەرە؟

ئوستیانتسف بەرسڤی دایەوە:

– تۆ نۆکەری! خەڵکینە گوێ بگرن! یارۆ نایەوێ باوەڕم پێ بکات! خەڵکینە تەمەشاکەن، بزانن ئەم کوڕە ئازایە چۆن خۆی لە گێلی دەدات!

– تۆ هەقت چییە ؟ ئەم بەڕێزە کەسێکی دەستو پێ سپیە، نازانێ دەستی خۆی بە کاربێنێ، ئەمانە ناتوانن بەبێ خزمەتکار هەڵبکەنو بژین، ئیدی بۆ یارمەتی نەدەم، هەی دەمو قەپۆز کوڵکن؟

– کێ دەمو قەپۆز کوڵکنە ؟

– تۆ!

– من دەمو قەپۆز کوڵکنم ؟

– بەڵێ تۆ دەمو قەپۆز کوڵکنی...

– وەڵلا خوا هەڵناگرێ تۆ زۆر جوانی... باشە... ئەگەر من دەمو قەپۆز کوڵکن بم، دەمو قەپۆزی تۆ لە هێلکە قاژو دەچێ!....

– هەی دەمو قەپۆز کوڵکن! هەر خوا باشی ناسیووی، خوا تا کێو نەبینێ بەفری تێناکات، بۆ خۆت کڕ بە تا دەتۆپی! ئاخر چیت لە من گەرەکە ؟ بۆچی خۆت لە کاری خەڵکی هەڵدەقورتێنی؟

– دەزانی بۆچی؟ من حەزدەکەم سەری مێش بم بەڵام کلکی شێر نەبم. بابم هەمیشە وایدەگوت.بابم رۆژێ لە رۆژان حەپس نەبووە، قەتیش ئەمری پێنەکردووم کڕنۆش بەرم!... من... من....

کابرای سیلاوی ویستی قسەکەی تەواوبکات، بەڵام کۆکەیەك گرتی هەر خەریك بوو دەخنکا، کەوتە خوێن هەڵێنان، ئارەقەیەکی سارد نیشتە سەر تەوێڵی، زەق زەق تەمەشای دەکردین، دەیویست لەسەر سخێفو جنێوەکانی بەردەوام بێ، بەڵام لەبەر کۆکە کۆك نەیدەتوانی. ئیدی بە ئاماژەی دەستان کەوتە دەربڕینی ڕقو توڕەیی خۆی، ئیدی چیکونوف فەرامۆشی کردو وازی لێهێنا.

یەکسەر هەستم کرد کە ڕقی ئەم سیلاویە زیاتر لە منە تا لە چیکونوف بێت. چونکە هیچکەسێك هەقی ئەوەی نەبوو گلەیی لە چیکونوف بکات کە بەو کارەی بیەوێ یەك دوو عانە بۆ خۆی پەیدا بکات.هەموو نەخۆشەکان چاك دەیانزانی چیکونوف ئەو کارە تەنیا لەبەر ئەوە دەکات پارەیەکی دەست بکەوێ. کەسیش لەسەر ئەوە ڕقی لێهەڵنەدەگرت. ئوستیانتسف، رقی لە من، لە چایەکەی من هەستا، ئەوەی توڕەی کرد ئەوە بوو کە من لە چینی ئەشرافو خانەدانانم، سەرباری ئەوەی دەستوپێ بە کۆتو زنجیرم، دەستبەرداری خزمەتکار نابمو دەمەوێ یەکێك خزمەتم بکاتو ئەمەی بە پۆزلێدانی خانەدانانە دەزانی. لە حاڵێکا من حەزم نەدەکرد خزمەتکارم هەبێو، هەوڵی ئەوەم نەدابوو کەسێك هەبێ خزمەتم بکات، بە پێچەوانەوە سوور بووم لەسەر ئەوەی هەموو شتێك بە دەستی خۆم بکەم، تا کەس وا تێنەگات کە کەسێکی دەستو پێ سپیو ناز پەروەردەمو دەمەوێ پۆز لێبدەمو ڕۆڵی کابرایەکی ئەشرافو خانەدان بدینم، بەڵام ئەلهەقی نازانم بۆچی هەرکاتێ کەسێکی ریاکار لێم دەهاتە پێشێ، بەدەورما دەهاتو خۆبەخۆ دەیویست خزمەتم بکات نەمدەتوانی رەفزی بکەم. جا لە ئەنجامدا ئەم خزمەتکارانە وا بەسەرما زاڵ دەبوونو سواری سەرم دەبوون، هاوکێشەکە پێچەوانە دەبووەو من دەبووم بە خزمەتکارو ئەوان بە خزمەتکراو، بەخۆیشم لەمە تێنەدەگەیشتم. بە هەرحاڵ

هەرچییەکم کرد، بمویستایەو نەمویستایە، خەڵکەکە هەر بە ئەشراف‌و خانەدانیان دەزانیم‌و وایان تەسەور دەکرد بەبێ خزمەتکار هەڵناکەم‌و دەبێ داب‌و نەریت‌و ڕواڵەتبازی خانەدانان ڕەچاو بکەم. ئەلهەقی ئەمەم زۆر لەبەر گران‌و لە گیان ناخۆش بوو. ئوستیانتسف پیاوێکی نەخۆش بوو، سیلی بوو، دەردەکەی گران بوو، لەبەر ئەوە زۆر توندە مجێزو شەڕەنگێز بوو. بەڵام نەخۆشەکانی دی، خۆیان لەم دەمەقاڵەو فەرتەنەیەی ئێمە نەکرد بە خاوەن‌و بەڵکو پێیان نەنگ بوو بێنە ئەو ئاستە. ئێستا بیرم دەکەوێتەوە کە هەموویان چاوەڕوانی ڕووداوێکی تازە بوون، لە قسەکانیاندا ئەوەم خوێندەوە کە ئەو ئێوارەیە زیندانییەك بۆ نەخۆشخانەکە دێنن، کە حاڵی حازر لە ژێر شەلاقکاریدایەو هەرکە لێ ببنەوە، یەکسەر بۆ ئێرەی دێنن، ئیدی زیندانییەکان بە تاسەوە چاوەڕوانی ئەوە بوون لە ئان‌و ساتدا بگاتە نەخۆشخانەکە. هەندێکیان باسی ئەوەیان دەکرد گوایە بەختی هەیەو سزاکەی سووکە: تەنیا پێنج سەد جەڵدەیە... چاوێکم بە دەوروبەری خۆمدا گێڕا، زۆربەی زیندانییەکان، ئەوانەی بەڕاستی نەخۆش بوون تووشی نەخۆشی ئێسکەربوت‌و چاویەشەو تەراخوما بوو بوون، ئەم نەخۆشیانە، نەخۆشی باوو بەردەوامی ئەو دەڤەرو وڵاتە بوون. هەندێ نەخۆشی دی هەبوون، بە ڕاستی نەخۆش بوون، تایان هەبوو، بە ئازاری سیل‌و دەردەباریکەوە، دەتلانەوە. قاوشی تایبەتی بۆ نەخۆشیە جیاوازەکان تەرخان نەکرا بوو، هەموو نەخۆشەکان، بە جیاوازی نەخۆشییەکانیانەوە لە یەك قاوشدا بوون، تەنانەت تووشبووانی سفلیس-ش لە هەمان قاوش بوون، بۆیە گوتم: (بەڕاستی نەخۆش) چونکە هەندێکی دی هەراو، بۆ ئیسراحەت هاتبوون بۆ نەخۆشخانەکە. دکتۆرەکان، لە ڕووی بەزەییەوە ڕێگەیان بەوانە دەدا داخڵی خەستەخانە بکرێن، بەتایبەتی ئەگەر جێگای چۆڵ‌و بەتاڵ هەبووایە. ژیان لە زیندانەکاندا ئەوەندە سەخت‌و دژوار بوو، کە زیندانییەکان، خەستەخانەیان بە هەموو کەم‌و کوڕییەکیەوە بە هەموو هەوایەکی بۆگەن‌و ناخۆشییەوە،و سەرباری ئەوەی ڕێگەی کەس نەدەدرا بۆ ساتێکیش بچێتە دەرێ، لە چاو زینداندا بە بە هەشت دەزانی. وای لێهاتبوو هەندێ لە زیندانییەکان ئامادە بوون، ئەگەر دکتۆر ڕێی دابان، هەموو ژیانیان لە خەستەخانە بەسەر بەرن، زۆربەی ئەوانە سەر بە سەربازگە تەمێکارییەکان بوون. بە وردی ڕوانیمە هاوڕێ تازەکانم. یەکێکیان زۆر سەنجی ڕاکێشام. ئەمە تووشی سیل بوو بوو، لە حاڵی مردندا بوو. تەختەکەی تۆزێك لەولای تەختەکەی ئوستیانتسف-ەوە بوو،و بەرانبەر بە تەختەکەی من بوو، نێوی میخائیلۆف بوو. دوو هەفتەیەك لەوە پێش لە زینداندا دیتبووم. نەخۆشییەکەی خەتەر بوو، دەبوایە زووتر فریای خۆی کەوتبا‌و خۆی نیشانی دکتۆر بدایەو عیلاج‌و دەرمانی وەربگرتایە، بەڵام نەخۆشییەکەی بە هەند نەگرتبوو،و بە ماوەیەکی زۆر کەم پێش جەژنی نوئێل ئەوجا بۆ نەخۆشخانە چوو بوو، ئیدی هەر سێ هەفتەیەك لە خەستەخانە دەکەوێ‌و بە نەخۆشی سیل دەمرێت. ئەم مرۆڤە وەکو مۆم لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بە توانەوە توایەوە. ئەوەی کە زۆرم پێ سەیر بوو ئەوە بوو کە نەخۆشییەکە بەتەواوەتی سیمای گۆڕی بوو. چونکە من پێشتریش، کاتێ کە چوومە زیندان دیتبووم. بۆیە ئێستا زۆر سەرنجی ڕاکێشام. سەربازێکی سەر بە سەربازگەی تەمێکاری لە خەستەخانەکەدا دراوسێی بوو، پیرەمێرێکی گرژو مۆن‌و دیمەن قێزەون بوو. بەڵام

من لێرەندا نامەوێ باسی یەك بە یەكی نەخۆشەكان بكەم... بۆیەش باسی ئەم پیرە پیاوم كرد چونكە كارێكی زۆر تایبەتی لە دڵو دەروونم كردو بە كەرەتێك كۆمەڵێك لە تایبەتمەندییەكانی قاوشی زیندانییەكانی تێگەیاندم. ئەم پیرەمێرە تووشی پەسیوێكی زۆر دژوار بوو بوو، بەردەوام، شەوو رۆژ دەپژمی ( یەك هەفتەی تەواو ئەم پیاوە بەردەوام پژمیوە )، تەنانەت بەدەم خەویشەوە، پێنج شەش كەرەتی یەك لەسەر یەك دەپژمی، پژمینەكەی لە دەستڕێژی تفەنگ دەچوو، لەگەڵ هەر پژمەیەكدا دەیگوت‌و دەیگوتەوە: "خودایا! ئەم تۆڵەیە چییە، ئەمە چ قەساسێكە! " لەسەر تەختەكەی دادەنیشت‌و لێكدا لێكدا بڕنووتی لە كونە كەپووی دەپەست، تا زیاترو توندتر بپژمێت. هەمیشە دەستەسڕێكی نەرمی خانەخانەی وردی بەكەپوویەوە دەگرت، دەستەسڕی خۆی بوو، ئەوەندە شۆردرا بوو، بە تەواوەتی كاڵ بوو بووەوەو رەنگەكەی چوو بووەوە. كە دەپژمی كەپووە گچكۆكەی گرژدەبووەوە، هەزارو یەك چرچ‌و وردە چرچی تێدەكەوت، هەنگێ دەمی دادەچەقاند، ددانە كرمۆڵ‌و ڕەشەكانی دەردەكەوتن، پووكی سوورو لیكاوی، كە لە پژمین دەبووەوە دەستەسڕەكەی دەكردەوەو تەمەشای دەكرد بزانێ چەندی چڵم لە كەپوو هاتووە، ئەوجا خێرا دەستەسڕەكەی بە رۆبەكەی بەری، كە هەڵبەتە هی خەستەخانەكە بوو، دەسڕی. هەرچی چڵم‌و گەمار هەبوو بە رۆبەكەوە دەلكا، و دەستەسڕەكە هیچی پێوە نەدەما. هەڵبەتە ئەم كردەوانە، واتە پاراستنی كەلوپەلی شەخسی لەسەر حیسابی كەلوپەلی خەستەخانەكە، هیچ جۆرە ناڕەزاییەكی لەلای نەخۆشەكان دروست نەدەكرد، هەرچەندە دڵنیا بوون كە هەندێكیان ناچار دەبن، دواتر هەمان ئەو جل‌و بەرگە بەكار بێنن.

پیاو باوەڕ بەخۆی ناكات ئەو خەڵكە بەو رادەیە ڕام بن‌و قێز لەو شتانە نەكەنەوەو دڵیان تێكهەڵنەیەت. ئەم دیمەنە زۆری ناڕەحەت كردم، خۆ بەخۆو بەقێزو بێزەوە كەوتمە تەمەشا كردنی ئەو رۆبەی كە لە بەرم كردبوو. بۆنێكی تیژی ناخۆشی لێدەهات. دوای ئەوەی گەرمی بەدەنمی هەڵمژی بوو، بۆنی دەواو دەرمانی لێهەڵدەستا. هیچیش جێی سەرسامی نەبوو، چونكە لەوەتای هەبوو لەبەری نەخۆشان بوو بوو. دوور نییە رۆژێ لە رۆژان ئەستەڕو بەرەكەی بە رێكەوت شۆردرابێ، بەڵام لەمەش دڵنیانیم: بە هەرحاڵ وەختێ كە ئەم ڕۆبەم لەبەر كرد، تەڕی تەڕ بوو، یەكپارچە دیتۆڵ‌و تەنترۆك‌و هەتووان‌و دەرمان‌و خوێن‌و خوڕ بوو. زیندانییانی مەحكوم بە جەڵدەو شەلاقان، دوای شەلاقكاری بۆ خەستەخانە دەهێنران، پشتیان یەك پارچە خوێن بوو، ئیدی زامەكانیان دەرمان دەكراو هەتوانیان لێدەدان‌و ئەو ڕۆبەی لەسەر كراسە تەڕەكانیانەوە لە بەریان دەكرد، هەموو خوێن‌و خوڕو هەتووان‌و دەرمانەكانی تریان هەڵدەمژی. من بە درێژایی ئەو سالانەی كە لە زینداندا مامەوە، هەرچەند دەچووم بۆ نەخۆشخانە ( كە زۆریش دەچووم )و ئەو رۆبەیان پێ لەبەر دەكرد، ئیدی خەمم لێدەهات‌و دڵم تێكەڵدەهات‌و گومان لە سەراپام دەنیشت، جا گومان‌و ترسەكەم هەر لە رۆبەكەو پیسی رۆبەكە نەبوو، بەڵكو لە ئەسپێش بوو، ئەو رۆبانە ئەسپێ تێی دابوون ئەمما تێدان... ئیدی ئەسپێ دۆزین‌و كوشتن بوو بوو بە سەرگەرمیەكی بەلەزەت بۆ زیندانییەكان، ئەسپێكانیان دەدۆزییەوە دەیان خستنە نێوان نینۆكی هەردوو پەنجە كەڵەیانەوەو قرچ دەیانكوشتن، ئەگەر لەو كاتەدا تەمەشای سیمات كردبان،

دەتبینی چۆن بزەی خۆشحاڵی دەکەوتە سەر سیمایان. زیندانییەکان ڕقیان لە پێشکەش بوو، زۆرجار شەوانی دوورو درێژی زستانیان بە پێشکە کوشتن بەسەردەبرد. قاوشەکەی ئێمە، سەرباری بۆنە ناخۆشەکەی، بە ڕواڵەتو لە دیوی دەرەوە زۆر پاكو خاوێن بوو. بەڵام لە ناوەوە زۆر پیس بوو... بەڵام نەخۆشەکان لەگەڵیا ڕاهاتبوونو بەشتێکی ئاساییان دەزانی. بارودۆخی نەخۆشخانەکەش ئەوە نەبوو خەڵکی بۆ پاك و خاوێنی هانبدات، بە هەرحاڵ... پاشان دێمەوە سەر باسی ئەم لایەنە.

هەرکە چیکونوف چایەکەی بۆ ئامادە کردم ( دەبێ ئەوەش بڵێم کە ئاوی قاوشەکە شەوو ڕۆژی جارێك دەگۆڕدراو تازە دەکرایەوە، بۆیە لە ماوەی ئەو بیستو چوار سەعاتەدا بە هۆی نا تەندروستی هەوای قاوشەکە تامی تێك دەچوو و ناخۆش دەبوو ) یەکسەر دەرگا کرایەوە، ئەو سەربازەی حوکمی جەڵدە درا بوو، هاوڕێ لەگەڵ دوو پاسەواندا وەژوورکەوت. ئەمە یەکەمجار بوو کەسێك بدینم تازە لە ژێر جەڵدە هاتبێتە دەرێ... بەڵام پاشان زۆرم لەو دیمەنانە بینی، جاری وا هەبوو هی وایان دەهێنا ئەوەندەیان جەڵدە لێدا بوو، خۆی بەپێوە نەدەگرت، بە کۆڵ دەیان هێنایە ژوورەوە. ئەم دیمەنانە بەلای نەخۆشەکانەوە ئاسایی بوو. ئیدی ئەو نەگبەتو بەدبەختانە بە ساردو سڕی لەلایەن نەخۆشەکانەوە پێشوازی دەکران، ئەگەر تازە هاتووەکە تاوانبارێکی گەورە بوایەو سزایەکی قورس درابوایەو جەڵدەیەکی زۆری لێدرابوایە هەنگی بە ڕێزو حورمەتێکی تایبەتیەوە پێشوازی دەکرا. خۆ ئەگەر تاوانەکەی سووك بوایەو سزاکەی کەم بوایە، بۆ نموونە هەڵاتن بوایە لە سەربازی، زۆر گوێیان نەدەدایە. جا ئەم پیاوەی ئەمڕۆ هێنایان سەربازی هەڵاتوو بوو. بە هەرحاڵ زیندانییەکان لە هەموو حاڵەکاندا، لە جیاتی قسەی رووتو هاوسۆزی بێ مایە دەگەڵ شەلاق خواردووەکەدا، بە بێدەنگیو خێرا دەکەوتنە پەرستاریو دەرمانکردنیو، هەموو یارمەتیەکیان دەدا، بەتایبەتی هی ئەو کەسەی کە حاڵی بێ حاڵ بوایەو نەیتوانیبا بە خۆی ڕابگاتو خۆی بە پێوە بگرێ. پەرستارەکان، زۆر خۆیان بۆ ئەمجۆرە نەخۆشە سەخڵەت نەدەکرد، چونکە بە تەجرووبە دەیانزانی کە خودی زیندانییەکان پێی ڕادەگەن. پەرستاریو دەرمانکردنەکەش بە زۆری ئەوە بوو کە کراسێك یان پارچەیەکیان لە ئاوی سارد هەڵدەکێشاو دەیانگوشیو لە پشتی کابرای شەلاقخواردوویان دەنا، هەروەها دەبوایە زۆر بە وریاییو بە دیقەت ئەو تەراشە دارانەی کە لە ئەنجامی شکانی تەڕکەکە لە کاتی شەلاقو وەشاندن دا، دەچووە زامو برینی پشتی کابراوە، دەربهێنن، ئەمە کارێکی زۆر زەحمەتو بە ئازار بوو. کەچی زۆرم پێ سەیر بوو ئێستاش کەسێکم نەبینی لە کاتی دەرهێنانی ئەو تەراشە دارانە لە زامەکانی، روو گرژبکات یان ئۆف یان ناڵەیەك بکات. بە زۆری دوای پاك کردنەوەی زامەکانیان لە تەراشە داران، سیمایان تێك دەچوو، ڕەنگیان زەرد هەڵدەگەڕا، چاویان ئەبڵەق دەبوو، لێویان بە جۆرێ دەکەوتە لەرزین، لە تاوا بە دان دەیان گەست تا خوێنی لێدەهات. ئەو سەربازەی کە هێنایان، کوڕێکی نزیکەی ٢٣ ساڵان بوو، کەسێکی تۆکمەو تێکسمڕاو، جوانخاسو باڵا بەرزو، گەنمڕەنگ بوو. تا ناو قەدی رووتو قووت بوو، زۆر پیسیان لێدا بوو، پشتی یەکپارچە برینو زامو جی تەرکەو قامچی بوو. پارچە قوماشێکی تەڕیان دابوو بەسەر

شان‌و مل‌و پشتی دا، ئازای گیانی لە ژێر قوماشە تەڕەکەوە دەلەرزی. نزیکەی یەك دانە سەعاتی تەواو لە پەستاو بیٚ بڕانەوە بە قاوشەکەدا دەهات‌و دەچوو. روانیمە سیمای، لەوە دەچوو بیر لە هیچ شتێك نەکاتەوە. چاوەکانی لە چاڵی چاویدا بە شێوەیەکی سەیرو ترسناك دەجولاّن، نیگای لەسەر خاڵێکی تایبەتی نەدەگیرسایەوە، لەوە دەچوو نەتوانیٚ نیگای لەسەر خاڵێکی تایبەتی رابگرێت. وام بە خەیاڵدا هات کە بە تاسەوە دەڕوانێتە ئەو چایەی کە تازە چیکونوف بۆی ئامادە کردبووم‌و هێشتا هەڵمی لێهەڵدەستا: ئەو بەستەزمانە لە سەرما دانەچۆقەی پێکەوتبوو، بۆیە خولّقی چایم کرد، یەکسەر ئاوڕی دایەوەو بەبیٚ ئەوەی هیچ قسەیەك بکات کووپە چایەکەی هەڵگرت‌و هەر بە پێوەو بیٚ ئەوەی شەکری تێبکات، دەستی بە خواردنەوەی کرد. هەوڵیدەدا تەمەشام نەکات. کە لە خواردنەوەی چایەکە بووەوە، بە بێدەنگی کووپەکەی لە جێی خۆی دانایەوەو بیٚ ئەوەی سوپاسم بکات یان سەرێك دابنەوێنیٚ، بەوپەڕی نیگەرانی کەوتەوە هاتوچۆ بە قاوشەکەدا: دیار بوو لە تاو ئازار هۆشی ئەوەی نەبوو قسەم دەگەڵ بکات یان سوپاسم بکات! زیندانییەکانیش دوای ئەوەی برینەکانیان دەرمان کرد شاشیان لیٚ نا، ئیدی هیچ پرسیارێکیان لێنەکردو بەدەقی خۆیەوە وازیان لێهێناو دوور بە دوور چاویان لیٚ بوو. دیار بوو وایان بە باش دەزانی بە پرسیاران‌و هاوسۆزی‌و هاوخەمی ناڕەحەتی نەکەن. وام هەستکرد کە سەربازەکەش بەو هەڵوێست‌و بڕیارەی ئەوان رازی‌و ئاسوودەیە.

لەو کاتەدا شەو داهات، دنیا بەرە بەرە تاریك تر بوو، چرا داگیرسێنرا. هەندیٚ لە نەخۆشەکان مۆمی تایبەتی خۆیان هەبوو، بەلاّم ئەوانە ژمارەیان کەم بوو. دکتۆر هات‌و کەوتە معایەنەی شەوانەی خۆی، ئەوجا عەریف خەفەر هات، نەخۆشەکانی سەرژمێر کردو دەرگای لەسەر داخستین. پێشتر سەتڵێکیان بۆ پێشاوو ڕیتنی شەوانەی زیندانییەکان هێنا بووە ژوورەوە... کە زانیم ئەم سەتڵە تا بەیانی لە ژوورەوە دەبیٚ زۆرم پیٚ سەیر بوو، خۆ ئەدەبخانەکە هەمووی دوو شەقاو لە دەرگاکەوە دوور بوو. ئیدی ئەوە نیزامی خەستەخانەکە بوو. بە رۆژەوە تەنیا یەك دوو دەققەیەك رێی زیندانیان دەدرا بچنە دەریٚ بۆ دەست بە ئاو گەیاندن، بەلاّم بە شەو بە هیچ جۆریٚ رێی چوونە دەرەوەیان نەدەدرا.

نەخۆشخانەی زیندانییان لە نەخۆشخانانی ئاسایی نەدەچوو: زیندانی نەخۆش لەوێندەریش سزای خۆی وەردەگرت، نازانم کیٚ ئەم نیزام‌و سیستەمەی دانابوو. بەلاّم من دڵنیام لەوەی کە ئەم ئیجرائاتە هیچ سوودێکی نیە، نا ماقووڵی پابەندی بە شەکلیاتەوە لە هیچ شوێنێکدا وەکو ئێرە روون‌و دیار نییە. هەڵبەتە دکتۆرەکان ئەم نیزام‌و یاساو رێسایانەیان دانەنا بوو، چونکە دکتۆرەکان زۆر میهرەبان بوون‌و هەموو زیندانییەکان لێیان رازی بوون، بە چاوی بابی خۆیان تەمەشایان دەکردن، زۆریان رێزو حورمەت دەگرتن. ئەو پزیشك‌و دکتۆرانە دەیانزانی بە زمانی شیرین ئەو قەرەبەختانە بدوێنن‌و دڵخۆشی دەردیان بدەنەوە. زیندانییەکانیش بەمەیان دەزانی‌و زۆر مەمنوونی لوتف‌و میهرو رووخۆشی‌و زمان شیرینی دکتۆرەکان بوون، کەس نەبوو گلەیی لە دکتۆرەکان بکات‌وبڵیٚ سەختگیرن، تورەو تڕۆن، لە هەڵس و کەوت و مامەڵەیاندا دەگەڵ نەخۆشەکاندا خراپن، چونکە دکتۆرەکان لە ڕووی مرۆڤدۆستیەوەو ڕاستگۆیانە مامەڵەیان دەگەڵ

زیندانییەکاندا دەکرد. زۆر چاك دەیانزانی کە زیندانیی نەخۆش، وەکو هەر نەخۆشێکی دی پێویستی بە وەرزش‌و هەوای پاکە، پێویستی بە پیاسەی ناو ڕاڕەو و دالأنەکانە... بەلأم ئەم نیزامە لە دەستی ئەواندا نەبوو. نەخۆشانی قاوشەکانی دی، بۆ خۆیان بە ڕاڕەوەکاندا دەگەڕان، وەرزشیان دەکرد، هەوای پاکیان هەڵدەمژی، هەرچەندە ئەو هەوایەش زۆر پاك نەبوو، بەڵام لە هەوای قاوشەکانی ئێمەی زیندانی هەر پاکتربوو، هەوای قاوشەکانی ئێمە، بە حوکمی ئەوەی دەرگاکانی هەمیشە داخرابوون‌و قاوشەکان قەرەباڵغ بوون‌و بۆنی غازاتی نەخۆشەکان‌و دەرمان پەنگی دەخواردەوە یەجگار بۆگەن‌و ناخۆش بوو. تەسەور ناکرێ، وەختێ شەوان سەتڵی پیساییەکەیان لە قاوشەکەمان دادەنا، چ بۆن بۆگەنیەکی کوشندە بە قاوشەکەدا بلأودەبووەوە. تا شەو زیاتر ڕادەکشا، هەوای قاوشەکە، بە هۆی گەرماو میزکردنی زۆری هەندێ لە نەخۆشەکانەوە، پیستر دەبوو. کە دەڵێم زیندانی لە نەخۆشخانەشدا هەر سزای خۆی وەردەگرت، مەبەستم ئەوە نیە کە یاسا جگە لە سزا هیچ ئامانجێکی تری نیە، چونکە ئەمە بێ ئینسافیە... بە پێی یاسا نەدەبوو نەخۆش سزا بدرێت. کەواتە دەبێ زەروورەتێکی زۆر پێویست هەبووبێ کە ئیدارەی ناچار کردبێت بۆ جێبەجێکردنی ئەم زەبت‌و ڕەبتە توندو قورسە. بەڵام ئەو زەروورەتە چیە؟ ئەوەی زۆر ناخۆشە ئەوەیە کە پیاو دێتە سەر لێکدانەوەی ئەم مەسەلەیە ئەقڵی بە هیچ کوێیەك ناگات. ئاخر ئەم زەبت‌و ڕەبتە کە زۆر گەوجانەو نابەجێ دێتە بەرچاو لە پای چی‌و بۆچی؟ ئایا بەرپرسانی ئەم دام‌و دەزگایانە وا تەسەور دەکەن کە زیندانییەکان بە درۆ خۆیان نەخۆش دەخەن‌و دەچن بۆ نەخۆشخانەو دکتۆرەکان دەخەڵەتێنن‌و دەیانەوێ شەوێ بە بیانووی چوونە سەر ئاو، لە نەخۆشخانەکە وەدەربکەون‌و هەڵێن؟ ئەمە بیانوویەکی نابەجێیە. ئاخر نەخۆش چۆن‌و بۆ کوێ‌و بە چ جل‌و پۆشاکێکەوە هەڵبێ ؟ بە ڕۆژەوە مۆڵەتی چوونە سەر ئاو بە نەخۆش دەدرا، هەڵبەتە دەبوایە یەك یەك بچن، باشە بۆچی شەویش هەمان شت ناکرێت؟ هەمیشەی خوا لەبەر دەرگاکە، لە نزیکی ئاودەستەکەدا، پاسەوانێکی چەکدار وەستاوەو بۆی هەیە وەکو سێبەر دووی نەخۆشان بکەوێ‌و نەیەڵێ بە بست دوور بکەونەوە. ئەمە جگە لەوەی کە ئاودەسەکە پەنجەرەیەکی دەبڵ کەتیبەی پێوە بوو بە دێو نەدەشکا، ئەگەر هەر زیندانییەك بیویستبا هەڵێ دەبوایە ئەو کەتیبەیە بشکێنێ، ئاخر چ زیندانییەك ئەمەی پێدەکرێت؟ وای دابنێ زیندانییەك دەرفەتی هێناو توانی کابرای پاسەوان بکوژێت‌و کەسیش پێی نەزانی، ئاخر چۆن دەتوانێ ئەم دەبڵ کەتیبەیە بەو ئاسانیە بشکێنێ! ئەمە جگە لەوەی کە پاسەوانەکان لە نزیکی قاوشی زیندانییەکاندا دەخەوتن،و پاسەوانێکی دیکەش بە چەکەوە لەبەر قاوشەکەی تردا ئێشکی دەگرت. یانی ئەم هەموو خەفەرو پاسەوانە بەس نەبوو ؟ ئاخر بەو زستانە ساردە، بە جووتێ گۆرەوی‌و سۆڵەوە، بە بیجامەو کلێتەوە دەیتوانی بۆ کوێ بڕوات ؟ جا کە ئەگەری هەڵاتن بەم ڕادەیە کز بوو، بۆچی ئەم هەموو سەختگیرییە دەگەڵ نەخۆشەکاندا دەکرا، لە کاتێکا ئەوەندەی ئەوان پێویستیان بە هەوای پاك بوو، خەڵکی ساغ‌و سەلامەت پێویستیان پێی نەبوو؟ بۆچی؟ قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان هۆی ئەمەم بۆ لە بنج‌و بناوان نەکرا.

جا کە باسەکەمان هاتووەتە سەر ئەم پرسیارە بێ وەڵامە: بۆچی؟ حەز دەکەم لێرەدا ئاماژە بۆ مەسلەیەکی دیکەش بکەم، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان نەمتوانی بچمە بنج و بناوانی و هۆیەکەی بزانم، ئەویش مەسەلەی ئەو زنجیرانەیە کە دەبوایە تا دوا هەناسە لە دەست و پێی زیندانیدا بوایە، ئیدی با نەخۆشیەکەی ترسناکیش بوایە، با نەخۆشی مەرگیش بوایە. من چەندین نەخۆشم بینی کە نەخۆشی سیلیان بوو، بە بەرچاوی خۆمەوە پێ بە کۆت و زنجیرەوە مردن. هەموو خەڵکەکە لەگەڵ ئەمەدا ڕاهاتبوون و بەشتێکی ئاساییان دەزانی. نازانم چۆن هیچ کەسێك، تەنانەت پزیشکەکانیش ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەوەیان بە خەیاڵدا نەهات، داوا بکەن، کە نەخۆشانی تووشبوو بە نەخۆشی قورس یان زیندانییانی تووشبوو بە سیل و دەردەباریکە لە پێوەندو زنجیران ببەخشن و ئەو بارە قورسەیان لە کۆڵ بکەنەوە. ئەلهەقی زنجیرەکان زۆر قورس نەبوون، بە شێوەیەکی گشتی ٤-٥ کیلۆیەك دەبوون. ئەم کێشە بۆ مرۆڤێکی ساغ و سەلامەت زۆر قورس نەبوو، تەحەمول دەکرا. بەڵام ئەوەشیان بۆ باس کردبووم کە ئەم زنجیرانە بە درێژاو لە ماوەی چەند ساڵێکدا لاقی زیندانییەکانی دەپوکانەوەو لاوازی دەکردن، ئیدی نازانم ئەمە چەند ڕاستەو چەند ڕاست نیە، بەڵام پێموایە ڕاستە، چونکە باریك و چەندیش سووك بێ، ئەگەر لە چوار کیلۆش زیاتر نەبێت، ئەگەر بە یەکجارەکی لە پێی زیندانی ببەسترێت، بێگومان کێشی لاقەکە لە کێشی ئاسایی خۆی زیاتر دەکات و دوای ماوەیەك کاریگەریی نێگەتیف لە گەشەی ئەو لاقە دەکات... جا با وای دابنەین ئەمە بۆ زیندانییەکی ساغ و سەلامەت شتێکی ئەوتۆ نیەو ئاساییە، ئەدی بۆ بابایەکی نەخۆش ئاساییە؟ هەڵبەتە ئەمە بۆ کەسێك نەخۆشییەکەی قورس بێ، بۆ یەکێك کە سیل و دەردەباریکەی بێ، کە خۆی لێ بارە،وخۆبەخۆ بە دەم نەخۆشییەوە دەتوێتەوە، بارێکی یەجگار قورسەو لە کێشی ئەو جۆرە نەخۆشانەدا نیە. بۆیە پێموایە ئەگەر ئیدارەی پزیشکی داوای لابردنی کۆت و زنجیران لەسەر نەخۆشانی سیلدار بکات کارێکی زۆر چاك دەکات.خۆ ئەگەر بگوترێ زیندانییان خەڵکانێکی تاوانبارن و شایستەی هیچ سۆزو بەزەییەك نین. ئەوا دەڵێم، باشە کەسێك کە خوا باری قورسی نەخۆشی لێنا بێت، دەبێ ئێمەش هێندەی دی دەردی زیاد بکەین ؟ پیاو باوەڕ ناکات کە ئامانج لە زیاد کردنی عەزاب، سزادانی زیندانی بێت. چونکە سیلداران، دادگا سزای بەدەنییان لەسەر هەڵدەگرێت. بۆیە هیچ سەر لەو حیکمەتە پەنهانە گرنگە دەرناکەم کە دەخوازێت پێوەندی پێی سیلدارەکان هەر بمێنێ. پیاو باوەڕ ناکات کە بابایەکی سیلدار لە خەستەخانەوە هەڵبێ. ئاخر کێ بیر لە شتی وا دەکاتەوە. نەخاسما ئەگەر نەخۆشی کەسیرەی کردبێت ؟ خۆ مەحاڵیشە چاوڕاو لە پزیشکەکان بکرێت و زیندانییەکی ساغ و سەلامەتیان لێ بکرێ بە سیلدارێکی پەریشان، چونکە سیل نەخۆشییەکە لە دوورەوە هاوار دەکات. باشە مادامێکی باسی هەڵاتن هاتە گۆڕێ، با بپرسین ئایا کۆت و زنجیر دەتوانێ ببێتە کۆسپ لەبەردەم هەڵاتنی زیندانییدا ؟ هەرگیز... کۆت و زنجیر،حەقارەت و سووکایەتیەو بە زیندانی دەکرێت، بارێکی بەدەنی و سایکۆلۆژیە - بەلای کەمەوە خەڵکی وای لێکدەدەنەوە- بەڵام ناتوانێ ڕێی هەڵاتن لە کەس بگرێت. چونکە گەوجترین زیندانی دەتوانێ بە هەڕەیەك بیبڕێتەوە، یان بە ئاسانی بە بەردێکی گەورە ئەڵقەکانی بشکێنێ. کەواتە کۆت و زنجیر

سوودێکی ئەوتۆی نییە، جا ئەگەر هەر سزایەك بێو زیندانی پێ سزا بدرێ، باشە هەق نییە کەسێکی نەخۆش، کە لە حاڵی مردندایە، لەم سزایە عەفو بکرێت ؟

من ئێستا بەدەم نووسینی ئەم دێڕانەوە وێنەی پیاوێکم دێتەوە بەرچاو کە ئاوزینگی دەدا، لە گیانەللآدا بوو. ئەم پیاوە تووشی سیل ببووبوو، نێوی میخائیلۆف بوو، بەرانبەر بە تەختە خەوەکەی من بوو، لە ئوستیانتسف-ەوە دوور نەبوو، کە من گەییمە خەستەخانە، ئەو دوای چوار رۆژان مرد. من کە تۆزێ لەمە پێش باسی سیلدارانم کرد، ئەوە رەنگدانەوەی ئەوە هەستانە بوو، کە لە دەمی مردنی ئەو پیاوەدا لە دڵو دەروونم گەڕا. میخائیلۆف ئەوپەڕی بیستو پێنج ساڵ دەبوو، کوڕێکی کورتە باڵای، لاوازی رەزا سووكو خوێن شیرین بوو. ئەمە زیندانیی زیندانی تایبەتی بوو، پیاوێکی کەمدوو بوو، بەڵام خۆش مەشرەبو پیاوانە بوو، یەجگار خەمبارو لێوبەبار بوو: بە دەردی زیندانییەکان دەیانگوت زیندان تواندبوویەوە، هاوزیندانییەکانی زۆریان خۆش دەویستو بە چاکە یادیان دەکردەوە. لە بیرمە کە چاوەکانی زۆر جوان بوون، نازانم بۆچی لەم کاتەدا، بەم روونیە، چاوەکانیم هاتوونەتەوە بەرچاو. لە سەعات سێی پاش نیوەڕۆدا گیانی سپارد، رۆژێکی هەتاوی زۆر سارد بوو. تیشکی هەتاو بە خواری لە جامە ئامال کەسکەکەی پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورێ، دنیا هێندە سارد بوو زوقوم جامی پەنجەرەکەی گرتبوو: تیشکی هەتاوەکە رێك کەوتبووە سەر ئەم کلۆڵە بەدبەختەی کە کەوتبووە ئاویلکەو هۆشی بەخۆی نەما بوو، چەند سەعاتێك بەدەم گیانەللآوە مایەوە. هەر لە بەیانیەوە چاوەکانی گێژو وێژ بووبوونو ئەوانەی دەوروبەری خۆی نە دەناسینەوە. زیندانییەکان هەوڵیان دەدا بەپێی توانا یارمەتی بدەن، چونکە دیاربوو لە عەزابێکی کوشندەدایە، هەناسەی تەنگ بوو بوو،و کەوتبووە هانکە هانك، وەکو یەکێك لە حاڵی خنکاندا بێو پێویستی بە هەوا بێ، سینگی پەیتا پەیتا بەرزو نزم دەبووەوە. سەرەتا پەتۆکەی تووڕدا، ئەوجا بیجامەکەی داکەندو تووڕی دا، ئەوجا کەوتە دڕاندنی کراسەکەی وەکو ئەوەی بارێکی قورس بێ بەسەرییەوە. پیاو کە چاوی بەو جەستە لەڕو لاوازە، بەو دەستو لاقە رەقو تەقانەی، بەو سکە قوپاوە، بەو پەراسووە زەقانەی دەکەوت خەریك بوو زیرە بکات، لە بەشەری کەوتبوو، ئێسکە پەیکەرێك بوو لەو گۆڕە. هیچی پێوە نەما بوو تەنیا خاچێكو کیسەیەکی بچووك نەبێ. کە بە گەردنیەوە بوو، تەنیا پێوەندو زنجیرەکانی نەبێ کە بە ئاسانی لاقە رەقو تەقەکانی لێوە دەردەهاتن. بە چارەکە سەعاتێك بەر لە مردنی میخائیلۆف، بێدەنگی باڵی بەسەر قاوشەکەماندا کێشا. زیندانییەکان بە چپە دەدوان، لەسەر نووکی پێیان دەهاتنو دەچوون. ناو بە ناو بە دەم قسەیەکەوە، نیگایەکی میخائیلۆفیان دەکرد کە کەوتبووە تراویلکەو لە حاڵی مردندا بوو. لە پڕ بە دەستە لەرزێ کەوتە گەڕان بە دووی خاچەکەیدا، دۆزییەوە، کەوتە ڕاکێشانی، لەوە دەچوو خاچەکەش بوو بێ بە بار بە سەرییەوەو تەحەمولی نەکات. خاچو کیسەکەیان لە ملی داکەند. دوای دە دەقیقە کابرا گیانی سپارد. هەنگێ زیندانییەکان کەوتنە لێدانی دەرگاکە، تا هەواڵی مەرگی میخائیلۆف بە پاسەوانەکان بدەن. پاسەوانێك هاتە ژوورەوە، بە خەمساردییەوە تەمەشایەکی جەنازەکەی کردو پاشان چوو بانگی پەرستارەکە بکات. پەرستارەکە گەنجێکی

دڵپاك‌و نیهادچاك بوو، زۆری بایەخ بە خۆ دەدا، بە خۆی ڕادەگەیی، بەڵام خۆش مجێزو تەبیعەت بوو. پەرستارەکە دوای تۆزێك هات، بە پەلە خۆی گەیاندە سەر جەنازەکە، تەمەشایەکی قووڵی کرد، بە جۆرە بێ موبالاتییەکەوە کە بەڕای خۆی هەڵوێستەکە وای دەخواست، نەبزی جەنازەکەی گرت، ئەوجا بە ئاماژەیەکی گۆنگەوە دەستەکانی جوڵاندن‌و لە قاوشەکە وەدەرکەوت. هەواڵی مردنی زیندانییەکەی بە عەریف خەفەر ڕاگەیاند، جا لەبەر ئەوەی میخائیلۆف زیندانییەکی خەتەر بوو و زیندانی حەپسخانەی تایبەتی بوو، دەبوایە هەندێ ئیجرائاتی تایبەتی بکرێ تا بە فەرمی هەواڵی مردنەکەی ڕابگەیەنرێت. لە کاتێکا کە ئێمە چاوەڕوانی هاتنی عەریف خەفەر بووین، یەکێك لە زیندانییەکان بە دەنگی نزم گوتی، وا چاکە چاوانی مردووەکە بنوقێنین. زیندانییەکی دیکە کە گوێی لەو ئامۆژگارییە بوو، بە هێمنی لە میخائیلۆف نزیك بووەوەو بە ئەسپایی چاوەکانی نوقاندن، کە سەیری کرد خاچەکەی میخائیلۆف لەسەر سەرینەکەی کەوتووە، هەڵیگرتەوە، تەمەشایەکی کردو پاشان کردیەوە ملی میخائیلۆف‌و بە خۆی نیشانەی خاچی کێشا. دەموچاوی مردووەکە لەم کاتەدا وشك بوو بوو،و تیشکی هەتاوەکە لە دەموچاوی میخائیلۆڤ دەدا، دەمی بە ئاستەم کرا بووەوەو دوو ریز ددانی سپی کە لە بەینی لێوە باریك‌و تەنکەکانیەوە بە ئاستەم دیار بوون، لەبەر تیشکی هەتاوەکەدا دەبریقانەوە. ئەنجام عەریف خەفەر، بە جلکی سوپایی‌و خوودە لەسەرو تفەنگ لە شان، هاوڕێ دەگەڵ دوو سەربازدا وەژوورکەوت. بە هەنگاوی سست‌و پەشۆکاوەوە لە جەنازەکەی میخائیلۆف نزیك بووەوە، بە نیگایەکی پڕ گومانەوە ڕوانیە ئەو زیندانیانەی کە بە سیمای گرژو مۆنەوە لەویان دەڕوانی. کاتێ کە تەواو لە جەنازەکە نزیك بووەوە، لە پڕ وەستا، وەك بڵێی ئازارێکی کوت‌و پڕ لە جێی خۆی ڕایگرت. پێدەچوو جەستە رووت‌و قووت‌و پێ بە کۆت‌و زنجیرەکە زۆر کاری تێ کردبێت: لە پڕ شمشێرەکەی هەڵکێشا، کڵاوخوودەکەی لەسەر داکەندو ( هەڵبەتە هیچ پێویستی بەو ڕەفتارە نەبوو ) نیشانەی خاچی کێشا. ئەمە پیاوێکی گرژو مۆن‌و بە تەمەن بوو، ماوەیەکی زۆر بوو لە خزمەتی سوپاییدا بوو. ئێستاش لە بیرمە کە چیکونوف لەلایەوە وەستا بوو، ئەمیش پیاوێکی بە تەمەن‌و پۆڕ سپی بوو، چیکونوف، بە درێژایی ئەو ماوەیە دەیڕوانیە عەریفەکەو چاودێری هەر حەرەکەیەکی ئەوی دەکردو چاوی لێنەدەگواستەوە، لە پڕ نیگایان لێکدی هەڵەنگوت‌و لێوی ژێرینی چیکونوف کەوتە تەتەڵە. چیکونوف لێوی خۆی گەست‌و لە پڕ ئاوڕی بۆ لای جەنازەکە دایەوەو بە عەریف خەفەرەکەی گوت:

– ئەمیش ڕۆژێ لە ڕۆژان دایکێکی هەبووە...

هەستم کرد ئەم وشانە داچۆڕانە ناخی دڵمەوە، ناخیان سمیم... بۆچی ئەو قسانەی کردو چۆن ئەو بیرەی بەمێشك داهات ؟

جەنازەکەیان بە دۆشەکەکەیەوە هەڵگرت، پوش‌و کای ناواخنی دۆشەکەکە کەوتە خشەخش، لە پڕ زنجیرەکان بەزڕو هوڕ داکەوتن‌و بەعاردیدا خشان. یەکێك لە پاسەوانەکان زنجیرەکانی هەڵگرتەوەو جەنازەکەی میخائیلۆفیان لە قاوشەکە بردەدەرێ. لە پڕ هەموو بە دەنگی بەرز کەوتنە قسە کردن. لە ڕاڕەوەکە دەنگی عەریفەکە بەرز بووەوە، ئەمری بە یەکێك لە پاسەوانەکان

**دەکرد کە بچێ ئاسنگەرەکە بێنێ. دەبوایە بێت زنجیرەکان لە پێی جەنازەکە بکاتەوە... بەڵام من لە بابەتەکەی خۆی دەرچووم...**

## نەخۆشخانە

۲-۳

پزیشکەکان، دانی بەیانیان سەری قاوشەکانیان دەدا، نزیکی سەعات یازدە، سەرۆکی پزیشکان هاوڕێ دەگەڵ کارمەندەکانیا دەهات، بە سەعاتو نیوێك پێش گەییشتنی ئەوان، پزیشکی قاوشەکەی ئێمە، سەری دابووینو یەك یەك بەسەری کردبووینەوە. ئەم پزیشکە گەنجێکی زۆر میهرەبانو رووخۆش بوو، زیندانییەکان زۆریان خۆشدەویستو، لە پیشەکەی خۆیدا یەجگار شارەزاو لێزان بوو. بە گوتەی زیندانییەکان هیچ عەیبێکی نەبوو تەنیا ئەوە نەبێ کە زۆر "بێ هەواو خاکی بوو". بەڕاستی کەسێکی کەمدوو بوو. لەوە دەچوو شەرممان لێبکات، هەندێجار دەموچاوی سوور دەبووەوە. هەمیشە ئامادە بوو، ئەگەر نەخۆشێك داوای خواردنی زیاتری کردبا، دڵی نەشکێنێو خواردنەکەی بۆ زیاد بکات یان بۆی بگۆڕێت، هەروەها ئامادە بوو دەرمانی نەخۆشەکان بگۆڕێت: بەڕاستی مرۆڤێکی زۆر باش بوو. زۆربەی پزیشکانی رووسیا لە نێو خەڵکیدا خۆشەویستو بەڕێزبوون، ئەوەندەی من بۆم دەرکەوتبوو شایستەی ئەم ڕێزو خۆشەویستیە بوون. من دەزانم ڕەنگە ئەم قسەیەی من هەندێ موبالەغەئامێز بێ، بە تایبەتی ئەگەر ئەوە وەبیر خۆ بێنینەوە کە خەڵکەکە بە تەبیعەت جۆرە گومانێکیان لە (پزیشکگەری)و دەرمانی بیانی هەبوو، بەڕاستی خەڵکی تەنانەت بۆ نەخۆشی قورسو ترسناکیش لە جیاتی بچن بۆ لای دکتۆری پسپۆر و بۆ نەخۆشخانان زیاتر روویان لە سیحربازان دەکردو دەرمانی پڕو پیرەژنانیان پێ باشتر بوو لە هی دکتۆر. هەڵبەتە دەبێ ئەو ڕاستیەش بڵێین کە هۆی ئەم ترسو بەدگومانیە شتێك بوو بەهیچ جۆرێ پەیوەندی بە پزیشکگەریەوە نەبوو، بەڵکو گومانی گەلو خەڵك بوو لە هەر شتێکی حکومەتی فەرمی. دیارە دەبێ ئەوەش لە یادنەکەین کە خەڵکی ئەوەندەیان چیرۆکی ترسناك لەمەڕ خەستەخانان بیستبوو، هیچ متمانەیەکیان بە نەخۆشخانەو پزیشکان نەما بوو ( هەندێ لەم چیرۆکانەش ڕاست بوون ). ئەوەی کە لە هەموو شت زیاتر رۆڵەکانی گەلەکەمانی دڕدۆنگ دەکرد، ئەو دابو نەریتە ئەڵمانیە بوو کە لە نەخۆشخانەکاندا باو بوو،و وایان تەسەور دەکرد کە خەڵکانی بیانی لە نەخۆشخانەکاندا نەخۆش چارەسەر دەکەنو پارێزی قورسیان بۆ دادەنەن، ئەمە جگە لەو دەمگۆیانەی کە دەرهەق بە سەختگیری پەرستارو پزیشکەکان دەگێڕدرانەوە کە گوایە ئەندامانی جەستەی نەخۆش دەبڕنەوەو جەنازەی مردووان توێکاری دەکەن. ئەمە جگە لەوەی کە چینی ڕەشو رووتی خەڵك لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت خەڵکانی ئەشرافو ئەرستۆکرات چارەسەریان دەکەن ( چونکە پزیشکان هەر کێیەك بوایەن، لەلای ڕەمەکی خەڵکی، بە ئەشرافو خانەدان دەژمێردران ). تا بەرە بەرە ئەو پزیشکانەیان ناسی، هەنگێ ترسو گومانیان ڕەوییەوە: دیارە فەزڵی شکاندنی ئەم لەمپەری گومانو ترسە دەگەڕێتەوە بۆ پزیشکەکانمان، بە تایبەتی بۆ گەنجەکانیان، چونکە زۆربەیان دەزانن چۆن ڕێزو خۆشەویستی گەلو خەڵکی بەدەست دێنن. هەڵبەتە من ئەمە لە خۆڕا ناڵێمو بەڵکو ئەو شتانە دەگێڕمەوە کە بە چاوی خۆم دیتوومەو زۆر جارو، لە زۆر شوێندا هەستم پێکردووە، پێموانییە کە کاروبارەکان لە شوێنانی تردا بە پێچەوانەوە بن. ڕاستە پزیشکان لە شوێنە دوورە

دەستەکاندا بەرتیل وەردەگرن‌و نەخۆشخانەکان بۆ قازانجی شەخسی خۆیان بەکاردێنن‌و نەخۆشەکانیان پشتگوێ دەخەن‌و، بگرە زۆرجاریش بەتەواوەتی ئەرکە مرۆڤانیەکانیان لە بیر دەکەن. هەڵبەتە تاکو ئێستاش شتی وا هەیە، بەڵام من باسی ئەو کەمینەیە ناکەم، بەڵکو باسی ئەو زۆربەیە دەکەم کە گیانی جوامێری‌و مرۆڤدۆستی دەیان جوڵێنێ‌و حاڵی حازر، بە دڵ‌و بەگیان لە خەمی پێشخستنی زانستی پزیشکگەریدان لە وڵاتەکەماندا. بەڵام خوانەناسان، بێ ئینسافان، ئەو گورگانەی لە لەوەڕگە پەزاندا دەلەوەڕن، بیانوویان هەرچییەك بێ، چەند پاکانەی ئەوە بکەن کە ژینگە گەندەڵی کردوون، دادیان نادات‌و لە خەتا پاك نابنەوەو خەڵکی نایان بورێ، بە تایبەتی کە گیانی مرۆڤدۆستی لە دەست دەدەن، چونکە گیانی مرۆڤدۆستی‌و سۆزی برایانە دەرهەق بە نەخۆش، باشترین دەرمانە... ئیدی وەختی ئەوە بەسەرچووە گلەیی لە ژینگە بکەین‌و بڵێین ژینگە خووی شەڕکردووین، ژینگە گەندەڵی کردووین. ڕەنگە ئەم گلەییە ماکێکی ڕاستی تێدا بێ، بەڵام ئەو بودەڵەو خوبزەو سك لەوەڕێنە فێڵبازانەی کە دەزانن چۆن وەژووردەکەن‌و وەدەردەکەون، هەرگیز لەوە بێزار نابن کە تاوان‌و خەتاکانی خۆیان بدەن بەسەر ژینگەدا، بە تایبەتی ئەگەر قەڵەم سوارو زمان پاراوبن. ئەوە دیسان لە بابەتەکەی خۆم دوورکەوتمەوە: بە کورتی دەمویست ئەوە بڵێم کە ڕەمەکی مەردم، هیچ ڕق‌و گومانێکیان لە خودی پزیشکەکان نیە، بەڵکو ڕق‌و گومانیان لە داو‌و دەزگاو ئیدارە پزیشکگەرییەکانە، کە دکتۆرەکان بەدەم ئیشەوە لە گەرمەی کاردا دەبینن، هەموو گومانێکیان لەلا دەڕەوێتەوە. ئیدارەی نەخۆشخانەکانمان، نەك دەگەڵ داب‌و نەریتی جەماوەری گەلەکەماندا تێك ناکاتەوە، بەڵکو دژیەتی... تا ئەم حاڵە بەردەوام بێ ناتوانێ ڕێزو خۆشەویستی جەماوەری خەڵك بەدەست بێنێ. پزیشکەکەمان سەری یەك بە یەکی نەخۆشەکانی دەدا، بە دیاریانەوە دەوەستا، زۆر بە بایەخەوە قسەی دەگەڵ دەکردن، ئەحواڵی دەپرسین، پرسیاری لێدەکردن، ئەوجا دەرمانی پێویستی بۆ دادەنان‌و پێی دەگوتن چ جۆرە پارێزێك بکەن. هەندێجار هەستی دەکرد یەکێك لە نەخۆشەکان، هیچ عەیبی نیە، لە گوێز ساغترە. ئەو داماوە تەنیا بۆ ئەوە پەنای وەبەر نەخۆشخانە هێناوە کە خۆی لە سوخرەو بێگاری قورس بدزێتەوەو هاتووە چەند ڕۆژێك لێرە، لە ژوورێکی گەرماو، لەسەر جێیەکی نەرم بەسەربەرێ، جێیەك کە هەرچۆنێ بێ لەو تەختە خەوە ڕەق‌و تەقانەی قاوشێکی شێداری قەرەباڵغی پڕ لە خەڵکانی ڕەنگ زەردو کوڵەواری زیندان باشترە. ( پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەو قەرەبەختانەی لە رووسیادا هێشتا حوکم نەدرا بوون‌و دادگاییان بەردەوام بوو، بە زۆری خەڵکانێکی ڕەنگ زەردو لێو بەبارو لە ڕووی جەستەییەوە کوڵەوار بوون، بۆیە حاڵی جەستەیی‌و باری دەروونیان لەو زیندانییانەی کە دادگاییان تەواو بوو بوو و حوکم درا بوون، زیاتر مایەی بەزەیی بوو ). بۆیە پزیشکەکەمان لە رووی بەزەییەوە، لەسەر کارتەکەی دەنووسین تووشی "هەوی پەردەی گەدە" بووەو ڕێگەی دەدان بۆ ماوەی یەك هەفتە لە نەخۆشخانە بخەون. زیندانییەکان هەموو گاڵتەیان بە "هەوی گەدە" دەکرد، چونکە سوور دەیانزانی کە ئەم دەستەواژەیە خۆی لە خۆیدا سازشێکی پەنامەکی‌و ژێراوژێری نێوان پزیشکەکەو ئەو نەخۆشەیە کە بە درۆ خۆی نەخۆش خستووەو زیندانییەکان لە بەینی خۆیاندا ئەم

نەخۆشییەیان ناو نابوو "ژانە سکی درۆ"و زۆرجار ئەم جۆرە نەخۆشە بەزەیی‌و میهرەبانی پزیشکەکەیان دەقۆستەوەو لە کاتی خۆیدا لە نەخۆشخانەکە دەرنەدەچوون. خۆزگە ئەو کاتانە پزیشکەکەمانتان دەبینی! پزیشکەکە شەرمی دەکردو، لە رووی نەدەهات بە ڕاشکاوی پێی بڵێ کە ئیدی چاك بووەتەوەو پێویستە لە نەخۆشخانە دەربچێت، لە کاتێکا هەم هەقی خۆی بوو و هەم دەیتوانی بێ چەندوچوون لە نەخۆشخانەکە دەری بکات‌و لەسەر کارتەکەی بنووسێت: "چاکبووەتەوە"، ئەوەی نەدەکرد. لە سەرەتاوە ئاماژەیەکی دەدایە کە کاتی ئەوە هاتووە قاوشی نەخۆشان بە جێ بێڵی‌و، پاشان بە قسەی خۆش تکای لێدەکرد: "پێویستە دەربچی برادەر، شوکر عەلەمت نەماوە، چاك بوویتەوە، جێگە بەش ناکات، قاوشەکە قەرەباڵغ‌و تەنگە،.... تاد...."، تا نەخۆشەکە لە ئەنجامدا شەرم دەیگرت‌و داوای دەکرد لە نەخۆشخانەکە دەری بکەن. هەڵبەتە ئەمە ئیش‌و ئەرکی سەرۆکی نەخۆشخانەکە نەبوو، هەرچەندە ئەویش پیاوێکی میهرەبان‌و دلۆڤان‌و سەلارو سەنگین‌و ڕاست‌و دروستکار بوو ( هەموو نەخۆشەکان خۆشیان دەویست) بەڵام زۆر لە پزیشکی تایبەتی قاوشەکەی ئێمە توندترو بەزەبت‌و ڕەبتتر بوو. تەنانەت لە هەندێ حاڵەتدا ئەوەندە توند بوو، کە زیندانییەکان سڵیان لێدەکردەوەو مەراییان دەکردو زیاتر ڕێزیان دەگرت. پاش ئەوەی پزیشکی تایبەتی قاوشەکە، بەسەر نەخۆشەکاندا دەگەڕاو معایەنەی دەکردن، ئەوسا سەرۆکی نەخۆشخانەکە هاوڕێ دەگەڵ گشت پزیشکانی نەخۆشخانەکەدا، بە قاوشەکاندا دەگەڕا نەخۆشەکانی یەك یەك بەسەر دەکردەوە، معایەنەی دەکردن، ماوەیەکی زیاتر بەدیار ئەو نەخۆشانەوە دەوەستا کە دەردیان گران بوو، هەواڵی دەپرسین‌و بە قسەی خۆش دڵخۆشی دەدانەوەو، ورەی بەرزدەکردنەوەو ئەوجا خواحافیزی لێدەکردن. هەڵبەتە دەستی بە رووی ئەوانەشەوە نەدەدا کە بە بیانووی "ژانە سکی درۆوە" دەهاتنە نەخۆشخانەکە، بەڵام ئەگەر زیندانییەك لەوانە پێداگری کردباو بیویستایە ماوەیەکی زیاتر لە نەخۆشخانەکە بمێنێتەوە، یەکسەر لەسەر کارتەکەی دەنووسی چاك بووەتەوەو دەتوانێ لە نەخۆشخانە دەربچێت‌و پێی دەگوت: "دەی برا، دەی هاوڕێ! ئیسراحەتت کردووە، ئیدی کاتی ئەوە هاتووەو چیتر لێرە ماتەڵ نەبیت!..." ئەوانەی زیاتر سوور بوون لەسەر مانەوە، یا ئەوانە بوون کە لە سوخرەو بێگار بێزار بوون، بە تایبەتی لە قرچەی گەرمای هاویندا، یا ئەوانە بوون کە سزای شەلاقکارییان بۆ بڕابووەوەو لە ترسا و بە ناوی نەخۆشییەوە خۆیان دەدزییەوە. لە بیرمە کە پزیشکەکان جارێکیان ناچاربوون بەتۆبزی یەکێك لەو بەناو نەخۆشانە دەربکەن. ئەمە هاتبوو بۆ چارەسەری چاوی، چاوەکانی زۆر سوور بووبوونەوە، دەیگوت پێڵوی چاوەکانی زۆر دەکزێنەوەو ئۆقرەیان لێهەڵگرتووە، هەموو جۆرە چارەسەرێکیان لەگەڵیا بەکار هێنا، ئیدی هەتوان‌و مەڵحەم‌و قەترە نەما بەکاری نەهێنن، بەڵام ئەمانە هیچیان دادیان نەدا،و چاوی کەم‌و زۆر فەرقی نەکردو بەرەو باشی نەچوو. ئەنجام پزیشکەکان هەستیان کرد ئەمە بە درۆوە خۆی نەخۆش خستووەو هەڵیان دەخەڵەتێنێ. چونکە هەوەکەی نە زیادی دەکردو نە کەمی دەکرد، کەواتە دەبێ ئەم ماستە موویەکی تێدابێ. نەخۆشەکان لە مێژ بوو دەیانزانی کە یارۆ نمایش دەکات‌و دکتۆرەکان فریو دەدا. هەرچەندە گەنجێکی قۆز وجوان بوو، بەڵام ئەداو ئەتواری بە دڵی

زیندانییەکان نەبوو. کابرایەکی سرك‌و مەندو بە گومان بوو، ژێراو ژێرو بە گومانەوە سەیری خەڵکەکەی دەکرد، قسەی دەگەڵ کەسدا نەدەکرد، خۆی لێ دوور دەگرتین وەکو بڵێی لە گشتمان بە گومان بوو. ئێستاش لە بیرمە کە زۆربەمان دەترساین ئەم گەنجە کەتنێك بکات‌و دەستێك بوەشێنێ. ئەمە سەرباز بوو بوو، دزییەکی گەورەی لەسەر دەبێ بە ماڵ‌و سزای هەزار شوولی تەڕی بۆ دەبڕنەوە، بە مەرجێ دوای ئەوە بۆ سەربازگەیەکی تەمێکاری بگوزارێتەوە. لە بەشی یەکەمی ئەم یادگارییانەدا باسی ئەوەم کرد کە جاری وا هەبوو، زیندانییەك ئامادە بوو، لە پێناوی ئەوەدا کە سزایەکەی کەمێك دوا بکەوێ، هەر کارێکی نەشیاو، ترسناك بکات، بۆ نموونە بەرپرسێك یان هاوڕێیەکی خۆی، ڕۆژێك بەر لە جێبەجێ کردنی سزاکە، بەر چەقۆ بدات‌و حەیاتی لەبەر ببڕێت، هەر بۆ ئەوەی سەر لە نوێ دادگایی بکرێتەوەو، جێبەجێکردنی سزاکە مانگێ دوو مانگ دوابکەوێ، گرینگ ئەوەیە ئەو ئاواتەیان بێننە دی، ئیدی بەلایانەوە گرینگ نییە لەوە دوا، دوای ئەو یەك دوو مانگە چی دەبێت، خوای دەکرد سزاکەیان دوو قات و سێ قات زیادی دەکرد، گرینگ ئەوەیە ئەو ساتە ترسناکەیان بۆ چەند ڕۆژێك، لێ دووربکەوێتەوە، یانی بەو ڕادەیە ورەیان بەردەداو نەدەوێران ڕووبەڕووی ئەو ساتە ترسناکە ببنەوە!

نەخۆشەکان لە بەینی خۆیاندا دەیانگوت دەبێ ئەم کوڕە چاودێری بکرێ، چونکە دوور نییە، شەوێك، لە نا ئومێدی‌و ڕەشبینی خۆیدا، یەکێکیان بکوژێت. بەڵام ئەمە هەر قسەی ڕووت بوو. دەنا کەس خۆی لێنەدەپاراست، تەنانەت ئەوانەش کە جێگاکانیان بە تەنیشتی جێگاکەی ئەوەوە بوو، خۆیان لێنەدەپاراست. زیندانییەکان شەوێ دیتبوویان کە قسڵ لە دیوارەکە دەکاتەوەو لەگەڵ شتێکی دیدا لە چاوانی خۆی دەسوو تا ئەگەر دکتۆرەکە هات تەمەشایان بکات هەر سوور بن، ئەنجام گەورەی پزیشکەکان ئاگاداری کردەوە کە ناچارە فتیلەی بۆ دابنێ‌و بەو شێوەیە چاوی چارەسەربکات. دکتۆرەکان کە نەخۆشیەکی چاویان لێ عاسی بوایەو بە ڕێگا زانستییەکان نەهاتبایە چارەسەرکردن، بە ناچاری پەنایان دەبردە بەر فتیلە، ڕێك وەکو چۆن ئەم ڕێگە لە چارەسەرکردنی ئەسپدا بەکاردەبرا. بەڵام ئەم کوڕە گەنجە هەر ملی نەداو سوور بوو لەسەر ئەوەی چاك نەبووەتەوە. جا نازانم ئەمەی لە منجڕی و سەرسەختی بوو یان لە بودەڵەیی‌و ترسنۆکی بوو. هەرچەندە ئازاری فتیلە لەگەڵ ئازاری شەلاقدا بەراورد نەدەکرا، بەڵام ئەویش بایی خۆی ئازاری هەبوو، نەشتەرگەری فتیلە بەمجۆرە بوو: پێستی نەخۆشەکەیان لە نزیکی گەردنیەوە دەگرت‌و تا هێزیان تیا بوو بۆ دواوە ڕایان دەکێشا، ئەوجا نەشتەرێکیان لێ دەدا، بە درێژی‌و بە پانی شەقیان دەکرد، ئەوجا پلێتەیەکی لۆکەی ئەستوریان، بە ئەستورایی قامکێك، تێدەئاخنی، تا زامەکە وشك نەبێتەوەو هەر بە تەڕی بمێنێ، دیارە ئەم کارە ئازاری زۆر بوو، وەکو ئەوە بوو لە نوێ پێستەکە شەق بکرێتەوە، ئەم بەستەزمانە ئەو هەموو عەزابەی، بە درێژایی چەندین ڕۆژ تەحەمول کردو ئاخرییەکەی ناچار داوای کرد لە نەخۆشخانە مەرەخەسی بکەن. دوای یەك دوو ڕۆژێك چاوی بەتەواوی چاك بووەوە، هەرکە زامەکەی گەردنی سارێژ بوو، بۆ زیندانیان ناردەوە، بۆ ڕۆژی دوایی خرایە بن شوولك‌و داران‌و هەزار جەڵدەیان لێدا.

بەڕاستی ساتەکانی بەر لە جێبەجێکردنی سزای شەلاق، یەجگار قورس‌و سامناکە! پێدەچێ من هەڵە بووبم کە گاڵتەم بە دڵەڕاوکێی ئەو زیندانییانە دەکردو بە ترسنۆکم لە قەڵەم دەدان. دیارە دەبێ ئەم ترسە یەجگار بەسام بێ بۆیە زیندانییەکان ریسکیان دەکردو سزاکەیان لەسەرخۆ دەکرد بە دووقات‌و سێ قات، تەنیا بۆ ئەوەی ئەو ترسە کەمێك دوابخەن. بەڵام وێڕای ئەمەش، زیندانیانێکیش هەبوون، کە پێش ئەوەی زامەکانیان بە تەواوەتی سارێژ ببێتەوە، بە خۆیان داوای دەکرد لە نەخۆشخانە دەریان بکەن، تا پاشماوەی سزاکەیان وەربگرن‌و خۆیان لەو حاڵە رزگاربکەن، چونکە ژیان بە دەم چاوەڕوانی دادگاییەوە، زۆر لە ژیانی سوخرەو بێگاری خراتر بوو. هەروەها ملدان بۆ سزای شەلاق، ترسی زیندانییانی دەڕەواندەوەو لەگەڵیا ڕادەهاتن. ئەوانەی زوو زوو دەخرانە بن سزای شەلاقان، ترسیان دەشکا، لەگەڵی ڕادەهاتن‌و بە ناڕەحەتیەکی ڕەوتەنیان دەزانی‌و باکیان پێی نەبوو. یەکێك لە زیندانییەکانی بەشی تایبەتی بۆی گێڕامەوە، ئەمە کالموکی بوو و بە گەورەیی بوو بوو بە نەسرانی‌و زیندانییەکان لە زینداندا ئالکساندر یان ئالکساندرین- یان ناو نابوو. ( ئەمە گەنجێکی تۆکمەی توندو تۆڵی سەیر بوو، زیرەك‌و زیتەڵ، شەیتانی بە شاگرد ڕانەدەگرت، تا بڵێی ئازاو نەترس‌و ورە بەرز، بەڵام دڵپاك‌و خۆش مەشرەبیش بوو ). ئەمە بۆی گێڕامەوە کە چۆن جارێك حوکمی چوار هەزار شەلاق درابوو،و چۆن بە ئاسانی تەحەمولی کردبوو. هەڵبەتە بەدەم سوعبەت‌و پێکەنینەوە ئەو سزایەی بۆ دەگێڕامەوە، سوێندی بۆ خواردم ئەگەر هەر بە منداڵی، لە نێو تایفەکەی خۆیدا، بە قامچی‌و دارکاریان نەیان غاراندبا‌و قاڵ نەبوایەتەوە — هەڵبەتە جێ زامەکانی سەر پشتی هەر مابوون‌و گەواهی دروستی قسەکانی بوون — هەرگیز بەرگەی ئەو چوار هەزار شەلاقەی نەدەگرت. بۆیە زۆر منەتباری ئەو پەروەردە سەخت‌و دژوارە بوو کە لە منداڵییەوە قاڵی کردبووەوەو فێری ئەوەی کردبوو چۆن بەرگەی شەلاقان بگرێت. ئێوارەیەکیان، کە لەسەر جێگاکەی من‌و لەبەر ئاگرەکە دانیشتبووین بۆی گێڕامەوە: "ئەلکساندەر پترۆفیچ دەزانی لەسەر بچووکترین‌و هیچترین شت لێیان دەدام، دارکاریان دەکردم! بە درێژایی پازدە ساڵان رۆژی چەند جارێك حەسیر مەیدانیان دەکردم: ئیدی هەرکەسە هەڵدەستاو پێیدا دەکێشام، بەمجۆرە لەگەڵ کوتەکخواردنا بە تەواوەتی ڕاهاتم." ئێستا بیرم نەماوە چۆن بوو بوو بە سەرباز، ( لەوە دەچوو درۆ بکات، چونکە پیاوێکی درۆزنی بەرەڵڵا بوو ) بەڵام ئەوەم بیرماوە کە رۆژێك بۆی گێڕاینەوە، دوای ئەوەی ئەفسەرە بەرپرسەکەی خۆی کوشتبوو و سزای چوار هەزار جەڵدەیان بۆ بڕی بووەوە، چەند ترساوە. گێڕایەوە گوتی: " هەڵبەتە دەمزانی سزایەکی زۆر توند دەدرێم، رەنگە لە ژێر قامچیاندا وەکو کسۆکان بتۆپم... چوار هەزار قامچی... گاڵتە نییە... هەموو بەرپرسەکانم ڕقم لێ هەڵدەگرن... دەمزانی ئەمە کارێکی ئاسایی نییە... پێموابوو لە ژێر شەلاقان دەرناچم، دەمرم... بیرم کردەوە کە ببم بە نەسرانی، لە دڵی خۆدا گوتم: لەوەیە بمبەخشن، با ئەمەش تاقی بکەمەوەو بزانم چ دەبێ... هەڵبەتە هاوڕێکانم پێشتر ئاگاداریان کردمەوە کە شتی وا دادم نادات، بەڵام لە دڵی خۆدا گوتم: "کێ دەزانێ ؟ تەقو لێم خۆشبوون! بێگومان خاتری نەسرانیەك زیاتر لە نا نەسرانیەك دەگرن". بە هەرحاڵ غوسڵی تەعمیدیان کردم‌و ناویان نام ئەلکساندر، بەڵام ئەمە

دادی نەدام، نەك هەر نەیانبەخشیم، بگرە تاقە شەلاقێکیانیش بۆ کەم نەکردمەوە. ئەمە زۆری پەست کردم. لە دڵی خۆدا گوتم: "بۆم ڕاوەستن... بزانە چۆن فریوتان دەدەمو بەڕیشتان پێدەکەنمو پێتان ڕادەبوێرم!" باوەڕ دەکەی ئەلکساندەر پترۆفیچ ؟ بەڕاستی خەڵەتاندمنو پێم ڕابواردندا من دەمتوانی خۆم بگەیەنە حاڵی مردن... هەڵبەتە نەك حاڵی مردنی تەواوەتی بەڵکو حاڵی کەسێك کە بە درۆوە خۆی بگەیەنێتە حاڵی گیانەڵلا! بردیانم بۆ بەر فەوجەکە، خستیانمە ژێر شەلاقان، یەکەمین هەزار شەلاقیان لێدام. پشتم بە جۆرێ دەستووتایەوە لە تۆ وایە ئاگریان لەسەر کردووەتەوە. کەوتمە هاتو هاوار، فایدەی نەبوو، دەستی بە هەزار شەلاقی دووەم کرد، لە دڵی خۆدا گوتم: "تازە کارم کراوە، تەواو ئەمە کۆتاییمە." سەرم بە گێژەوە چوو، لاقم سست بوون، لە خۆ چووم... کەوتمە سەر عاردی، چاوم ئەبڵەق بوون، دەموچاوم بە تەواوەتی شین بووەوە، کەف کەوتە لالغاوەم. هەناسەم دەرنەدەچوو. پزیشك هاتە دیارمو گوتی: "لەگیانەڵلادایە". بۆ نەخۆشخانەیان بردم، یەکسەر وەخۆ هاتمەوە.

دوای ئەوە دوو جاری تریان لێدام. جا چەند توڕە بوون! بە قەستی کوشت لێیاندەدام! ئەو دوو جارەش خەڵەتاندمن: هەزاری سێیەمیان لێدام، دیسان خۆم کرد بە مردوو. باوەڕم پێ بکە هەر جەزرەبەیەکی هەزاری سێیەم بە سێ جەزرەبە دەچوو، وەکو چەقۆ ناخی دەبڕیم، دڵی لەت دەکردم... ئۆف... کە لێیاندام! جا چەند بە دڵو بە گیان، بە جۆشو خرۆش لێیاندەدام. بەڵام هەزاری چوارەم، هەر باسی مەکە! کوڕم دەویست بەرگەی بگرێت! هاوتای هەر سێ هەزارەکەی پێشووی دەکردەوە. خۆ ئەگەر لە دوا دواییدا، یانی کاتێ کە تەنیا دوو سەد جەزرەبە مابوو، فریا نەکەوتبامو خۆم نەکردبایە مردوو، بێگومان دەیانکوشتم. بەڵام من ئەوەندە گێل نەبووم بێڵم بەو ئاسانیە بیکەس کوژم بکەن، ئەمجارەش فریوم دان، خۆم کرد بە مردوو، بە جۆرێ خۆم گەیاندە حاڵی جاو: هەموو وایان زانی تەواو ئیدی لێبوومەتەوەو خاوەنی حەوت رووح بم شتاقیان دەرنابەم، نەك هەر جەلادەکان، بەڵکو دکتۆرەکەش دڵنیا بوو کە تەواو، لە گیانەڵلادام. بەڵام دوای ئەوە، کاتێ دوو سەد جەزرەبەکەی تریان لێدام، گوێم نەدانێ، هەرچەندە بە هەموو هێزی خۆیانەوە کوتایانم، ئەو دوو سەد جەزرەبەیە بەرانبەر بە دوو هەزار جەزرەبە دەبوو، بەڵام هەر گوێشم نەدایە، هەر منەتم لێنەزانین، نەیانتوانی لەنێوم بەرن. بۆیە تا ئێستا ماوم چونکە "هەموو ژیانم بریتی بوو لە لێدانو تێ هەڵدان !". ئەلکساندەر خەمینو خەمبار بەو ڕستەیە کۆتایی بە چیرۆکەکەی هێنا. لەوە دەچوو لە دڵی خۆیدا بیر لەو هەموو جەزرەبانە بکاتەوە کە بە درێژایی ژیانی خواردبووی! دوای بێدەنگیەکی کەم هەڵیدایەو گوتی: " نەخێر... فایدەی نییە... لە ژماردن نایەت... ئەوەندە زۆرە ژمارە بەشی ژماردنی ناکات !" پاش ئەو قسەیە نیگایەکی منی کرد، هەستا،و لە قاقای پێکەنینی دا، منیش ناچار بە بزەیەك وەڵامم دایەوە. ئەوسا گوتی: "جا ئەلکساندەر پترۆفیچ با ئەوەشت پێ بڵێم کە شەوان خەو دەبینم، جگە لە کوتەك خواردن خەو بە هیچی ترەوە نابینم ". جا ئەلکساندەر، بەدەم خەوەوە قسەی دەکرد، پڕ بەزار هاواری دەکرد، دەیقیژاندو دەگریا، هەموو زیندانییەکان لە قاوقیژی ئەو ڕادەپەڕین، بە بۆڵە بۆڵ هەڵیان دەستانو هاواریان لێدەکرد: " ئەم قاوقیژەت لە چیە شەیتان ؟" ئەلکساندەر پیاوێکی تۆکمە،

کورتە باڵا، گورج و گۆڵ، رووخۆش بوو، تەمەنی چل و پێنج ساڵێك دەبوو، بەینی دەگەڵ هەموو زیندانییەکاندا خۆش بوو، هەرچەندە سەری لە دزیان دەخوراو چەندین جار لەسەر ئەم کارە کوتەکی خواردبوو. بەڵام کام زیندانی دەرفەتی بۆ رەخسابا دزی نەدەکرد، کێ هەبوو لەسەر دزی کوتەکی نەخواردبێ ؟

حەزدەکەم لێرەدا ئەوەش بگێڕمەوە کە: زۆر جار سەرم لەوە سووڕ دەما، کاتێ ئەم قەرەبەختانە باسی سزاکانی خۆیان و جەلادەکانی خۆیان دەگێڕایەوە، بێ هیچ کەرب و کینەیەك بێ هیچ بەدخواییەك دەیانگێڕایەوە. ئەو داماوانە کە چیرۆکی نەگبەتی و لێدان و سزای خۆیان دەگێڕایەوە، من لە حەژمەتاندا دڵم دەگوشراو تورە دەبووم، کەچی ئەوان زۆر ئاسایی و بێ هیچ کەرب وکینەیەك، دەیانگێڕایەوەو هەندێجار وەکو منداڵ لە ناخی دڵەوە پێدەکەنین. بەڵام (م...کی(١)*) کە باسی سزایەکەی خۆی بۆ گێڕامەوە وا نەبوو. ئەم پیاوە ( لە چینی خانەدان و ئەشرافان نەبوو) حوکمی پێنج سەد شەلاق درابوو. قەت رۆژێ لە رۆژان باسی ئەمەی بۆ نەکردبووم.کە لێم پرسی ڕاستە جەڵدەی لێدراوە، بە بێ ئەوەی تەمەشام بکات، دەموچاوی سوور بووەوە، پێدەچوو ئەمەی لە دڵ دەرنەچووبێ، بەکورتی گوتی ڕاستە. کە چاوی هەڵبڕی پرشنگی ڕقم لە چاوەکانیا خوێندەوە، لە پەستی و تورەییدا لێوەکانی دەلەرزین. ئیدی یەکسەر بۆم دەرکەوت کە مەحاڵە بتوانێ ئەم بەسەرهاتەی خۆی فەرامۆش و لە بیربکات. بە پێچەوانەی هاوڕێکانی ترمانەوە ( هەڵبەتە ناتوانم بڵێم بێ ریزپەڕ ) کە بە شێوەیەکی ترو زۆر جیاوازتر لەم، دەیانڕوانیە ئەو ریسکانەی پێیدا رەت بووبوون، هەندێجار لە دڵی خۆدا دەمگوت: "مەحاڵە دان بە عەدالەتی قەساسەکەیاندا بنەن ، نەخاسما ئەگەر تاوانەکانیان دژی هاوڕێ و هاوچینەکانی خۆیان نەباو دژی بەرپرس و سەرۆکەکانیان بایە ". زۆربەیان هەر دانیان بەوەدا نەدەنا کە تاوانیان کردبێت. پێشتریش باسی ئەوەم کردووە کە هیچ جۆرە پەشیمانیەك یان عەزابێکی ویژدانم لە کەسیاندا بەدی نەدەکرد، تەنانەت لەوانەشدا کە تاوانیان دژی خەڵکی سەر بە چینەکەی خۆشیان کردبوو. خۆ ئەو تاوانانەی کە دژی سەرۆك و بەرپرسانی خۆیان کردبوویان، هەر باسی ناکەم. چونکە ڕای تایبەتی خۆیان دەربارەی ئەو تاوانانە هەبوو، رایەکی پراکتیکی، ئەو تاوانانەیان بە رووداوی لە ناکاوو قەزاو قەدەر دەزانی، هەر بیریان لێنەدەکردەوە،و بگرە بە تاوانیشیان نەدەزانی، چونکە لە سەرووی دەسەڵاتی ئەوانەوە بووە... ئەوە قەناعەت و باوەڕیان بوو... زیندانیی، تاوانی دژ بە بەرپرس و سەرۆکانی بەتاوان نەدەزانی، هەربیریشی لێنەدەکردەوە،و بەکێشەی نەدەزانی، بەڵام وێڕای ئەوەش لە ناخی خۆیدا، لە دڵی خۆیدا دانی بەوەدا دەنا کە بەرپرس و سەرۆکەکانی دژی ئەو رەئیەی ئەون و دەبێ بە سزای خۆی بگات،و تا بە سزای خۆی نەگات لە گوناح و تاوانەکەی پاك نابێتەوە.

کێشماکێشی نێوان ئیدارەو زیندانی، کێشماکێشێکی توند بوو. هەڵبەتە زیندانی بۆیە تاوانی لەلا ئاسان بوو و سڵی لێنەدەکردەوە، چونکە پێی وابوو ئەو ژینگەیەی تیای لە دایك بووەو تیای گەورە بووە سەر کۆنەی ناکات، دڵنیا بوو لەوەی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگە لۆمەی نەدەکرد، مەگەر تاوانەکەی دژی خەڵکانی سەر بە هەمان ژینگەی خۆی بوایە، دژی خەڵکی هاوسنفی خۆی

بوایە. لەم رووەوە دڵنیاو بێ خەمە، هەر ئەمەش گرینگە. هەست دەکات، ژێر پێی پتەوە، پشتی قایمە، بۆیە شەلاق و جەڵدەی بەئاسایی دەزانی، هیچ ڕقێکی لە دڵی خۆیدا هەڵنەدەگرت، ئیدی ئەمە قەساسە،و هیچ چارێك نیە، هەق بە هەق، بەوە دڵخۆشی خۆی دەدایەوە کە ئەو نە یەکەم کەسە بگیرێتە بن جەڵدەو شەلاخان‌و نە دوا کەسیش دەبێت،و ئەم ململانێ نێگەتیڤە سەخت‌و دژوارە تاماوەیەکی زۆر بەردەوام دەبێ. ئایا سەرباز ڕق لەو تورکە هەڵدەگرێ کە شەڕی دەگەڵ دەکات ؟ هەرگیز... لە کاتێکا ئەم تورکە دەستی لێ ناپارێزێ، بە شیرو خەنجەران لێی دەدا، دەیبڕێ‌و شەڕی دەکات‌و دەیکوژێت.

هەڵبەتە نابێ وامەزەندە بەرین کە ئەوانەی ئەم حیکایەت‌و سەربهووردانەیان دەگێڕایەوە، هەموویان بە هەمان ئارامی‌و خوێنساردی دەیانگێڕایەوە. بۆ نموونە کاتێ کە زیندانییەکان دەهاتنە سەر باسی ملازم جیربیانتیکوف، زۆر بە خراپی‌و بە ڕقەوە باسیان دەکرد. یەکەمجار لە نەخۆشخانەدا باسی ئەم ملازمەم بیست‌و ناسیم، هەڵبەتە لە ڕێگەی ئەو قسەو باسانەوە ناسیم کە زیندانییەکان بۆیان دەگێڕامەوە. دوای ئەوە، جارێك بینیم، کە پاسەوانێکی بۆ زیندان دەبرد. کابرایەك بوو سی ساڵان، درێژ، زۆر قەڵەو، تێکسمڕاو، گۆنا سوورەکانی لەبەر قەڵەوی داتەکی بوون، ددانەکانی لە دوورەوە سپی دەچوونەوە، پێکەنینە ناخۆش‌و ترسناکەکەی ڕێك لە پێکەنینی ( نوزدریوف(٢)*)دەچوو، ئەگەر کەسێك بیدیتبایە یەکسەر دەیزانی چ کەر پیاوێکە. ئەمە شەیدای شەلاخ وەشاندن بوو، خوا خوای بوو، ئەو کارەی پێ بسپێرن. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێم کە ئەفسەرەکانی دی (جیربیانتیکوف) یان بە مرۆڤێکی نائاسایی دەزانی، دیارە زیندانییەکانیش هەمان بۆچوونیان دەربارەی هەبوو. بێگومان ڕۆژگاری کۆن، زۆریش کۆن نا، "ئەو ڕۆژگارانەی کە هێشتا لە بیرماون، بەڵام خەڵکی بە زەحمەت باوەڕیان پێدەکەن" میر غەزەب‌و جەلادانێکی بەخۆوە دیتووە کە بە ئەشقەوە ئەمجۆرە کاریان کردووە، ئاشقی ئەمجۆرە کارە بوون. بەڵام زۆربەی ئەوانەی سەرپەرشتی جێبەجێکردنی سزای شەلاخکاریان دەکرد، بێ هیچ لەزەت‌و ئەشق‌و جۆش‌و خرۆشێك، بەوپەڕی هێمنی ئەرکی خۆیان جێبەجێ دەکرد.

ڕێك بە پێچەوانەی ئەم ملازمەی ئێمەوە، کە لەزەت‌و خۆشیەکی یەجگار زۆری لێدەبینی، وەکو پسپۆڕێکی کارامەو شارەزا داهێنانی تێدا دەکرد. ئیدی ئاشق‌و شەیدای کارەکەی، بەهونەرێکی دەزانی، کە لەبەر خاتری خودی هونەرەکە خۆشی دەویست. دەتگوت یەکێکە لە جەلادو میرغەزەبە بەناوبانگەکانی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما، لەزەتێکی زۆری لەم کارە وەردەگرت، ئیسراحەتی دەروونی پێدەکرد.

کە زیندانییەك بۆ سزادان دەبرا، ملازم جیربیاتنیکوف سەرپەرشتی جێبەجێکردنی سزاکەی دەکرد، کە دەیبینی ریزێکی دوورو درێژی سەربازان بە قامچی‌و شەلاخی ئەستوورەوە حازرو ئامادە وەستاون، دەگەشایەوە، سیمای پرشنگی دەدا. روحی گەشکەی دەکرد. بە روو خۆشی بەسەر یەك بە یەکی سەربازەکاندا دەگەڕا. هانی دەدان، بە جوانی ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەن ئەگینا... ئیدی سەربازەکان پێشوەختە دەیانزانی ئەم وشەی " ئەگینا "یە چ دەگەیەنێ... زیندانییەکە دەهێنرا، ئەگەر بە ڕێکەوت جیربیاتنیکوڤ نەناسیبا، شارەزای تەبیعەت‌و ڕەفتاری

نەبایە، ئیدی ملازم جیربیاتنیکوف سەری دەکردە سەری ( ئەمە یەکێك بوو لە داهێنانە زۆر دەگمەنەکانی جیربیاتنیکوف لەم بوارەدا)و پێی ڕادەبوارد: هەر زیندانییەك کاتێ دەهێنراو دەرەجەداران پشتیان رووت دەکردو بە قایشی تفەنگان درێژاو درێژا لەسەر "شەقامی کەسك" توند دەستو لاقیان دەبەست، زیندانیی قەرەبەخت، دەکەوتە لالانەوەو پاڕانەوە لە ئەفسەری سەرپەرشتیار، کە رەحمی پێدابکەن‌و زۆر بە توندی لێی نەدەن. دەپاڕایەوەو دەیگوت: "ئەزبەنی، رەحمم پێدا بکە، باوکێکی باش بە لەگەڵما، کارێکی وا بکە هەتا هەتایە دوعای خێرت بۆ بکەم، مەم کوژە، بەزەییت پێمدا بێتەوە ". جیربیاتنیکوفش ئەمەی دەویست. ئیدی بەمجۆرەو بە دەنگێکی میهرەبان‌و پڕ سۆزەوە دەکەوتە دواندنی زیندانییەکە:

– ئاخر برای ئازیز من چ بکەم، چیم لە دەست دێ ؟ بە خۆت دەزانی ئەمە یاسایە یاسا، یاساش دەبێ جێبەجێ بکرێت. من سزای تۆ نادەم. یاسا جێبەجێ دەکەم !

– گەورەم... هەموو شتێك بە دەست تۆیە، دەتوانی هەموو شتێك بکەی، رەحمم پێدابکە، بەزەییت پێمدا بێتەوە!...

– چما پێت وایە من دڵم بەحاڵت ناسووتێ، بەزەییم پێتدا نایەتەوە ؟ یانی پێت وایە من حەز دەکەم تۆ بخرێیتە ژێر شەلاخ، پێم خۆشە تۆ بەو حاڵەوە ببینم ؟ خۆ منیش بە شەرم. وایە یان نا؟

– بێگومان وایە گەورەم! هەموو خەڵکی دەزانن کە ئەفسەران باوکی ئێمەن‌و ئێمە کوڕی ئەوانین. جا تکام وایە باوکانە رەفتارم لەگەڵ بکە.

ئیدی زیندانییەکە بەو جۆرە، بە ئومێدی رزگاری لە سزا، دەپاڕێتەوەو دەلاڵێتەوە. ملازم دەڵێت:

– برادەری ئازیز، بە خۆت حوکم بدە، بە خۆت ئەقڵت هەیەو دەتوانی بیربکەیتەوە، مەرجی ئینسانیەت، مەرجی مرۆڤدۆستی وا دەخوازێت کە بەزەییم بە گوناهکارێکی قەرەبەختی وەکو تۆدا بێتەوە، بەلام من چ بکەم، بە خۆت دەزانی کە من سزای تۆ نادەم، ئەمە یاسایە یاسا!

– قسەکەت زۆر تەواوە پایەبەرز.

– بەڵێ، من لەسەرمە، ئەگەر گەورەترین گوناحکاری سەر رووی زەویش بی بەزەییم پێتدا بێتەوە. بەلام... ئەوەی سزات دەدات من نیم، بەڵکو یاسایە، یاساش لە سەرووی هەموومانەوەیە. تۆزێ بیر بکەرەوە! من خزمەتی خواو نیشتمان دەکەم. یاسا ئەو سزایەی بۆ دیاریکردوویت، ئەگەر من سزاکەت سووك بکەم، دەکاتە سەرپێچی لە یاسا، سەرپێچیش تاوانێکی گەورەیە.

– پایە بەرز!....

– چار چییە ؟ باشە با ئەمجارە بە دڵی تۆ بێ... ئەمجارە خاترت دەگرم‌و زۆر دەست داناگرم، هەرچەندە دەزانم ئەمە سەرپێچییە لە یاسا، بەلام دەترسم وا بزانی جارێکی دیکەش بە هەمان ئاسانی دەرباز دەبیت‌و ترست بشکێ‌و ئەمجارەیان کارێکی خراپتر بکەیت‌و وا بزانیت جاری دووەمیش بە زەییم پێتدا دێتەوە ؟ ها ؟ ویژدانم...

– پایە بەرز!. من لەبەر بارەگای پەروەردگارا سوێندت بۆ دەخۆم کە....

– باشە باشە... سوێندم بۆ دەخۆیت کە هیچ هەڵەیەك نەکەیت... رەفتارت باش بکەی....

– خوا لە دنیاو قیامەت بمگرێ ئەگەر...

– پێویست بە سوێند ناکات... تەنیا قسەو بەڵێن بەسە... ئەگەر بەڵێنم بدەیتێ... باوەڕت پێدەکەم.

– پایە بەرز!...

– زۆر باشە! گوێ بگرە! من لەبەر خاتری ئەم فرمێسکانەت، لەبەر ئەوەی هەتیویت، یارمەتیت دەدەم، رەحمت پێدا دەکەم، تۆ هەتیوی وانیە ؟

– پایە بەرز، بە داكو باب هەتیوم، من لەم دنیایەدا تەنیای تەنیام، کەسم نییە...

– دەی باشە... من رەحم بەفرمێسکەکانتا، بە بێکەسیتا دەکەم. بەڵام ئاگاداربە... ئەمە دوا جارت دەبێ. دەی بیبەن !

ملازم جیربیاتنیکوف ئەو قسەیە هێندە بە میهرەبانیو دلۆڤانی دەکات، کە زیندانییەکە نازانێ چۆن سوپاسی خوا بکات کە ئەم ئەفسەرەی بۆ رەخساندووە. زیندانییەکە دەبەن، دەنگی دەهۆڵ بەرز دەبێتەوە. سەربازەکانی پێشەوە قامچییەکانیان بەرزردەکەنەوە، جیربیانتیکوف پڕ بەزاری هاوار دەکات: " لێی بدەن! ئاگر لە پشتی بەردەن! لێیدەن لێیدەن! پێستی بگروون! دەی مەوەستن... ئەم هەتیوە بەر شەلاخان بدەن، ئەم بەرەڵڵایە تەمبێ بکەن! زیاتر دەی! مار ئەنجنی بکەن! هەنجن هەنجی بکەن !".

سەربازەکان، بە گشت هێزو توانایەکی خۆیانەوە، بە شەلاخ بەر دەبنە ئەم قەرەبەختە... چاوانی زیندانییەکە ئەبڵەق دەبن، ئاگریان لێدەبارێ، دەست بە هاتوهاوار دەکات،و (جیربیانتیکوف)ش قاقا پێی پێدەکەنێ، لەبەر پێکەنین خۆی پێناگیرێو دەست دەخاتە کەلەکەی، ئیدی جەژنیەتی. لە خۆشیا لە پێستی خۆی ناهێورێ، خەریکە لەبەر پێکەنین ببورێتەوە،وفرمێسك بە چاوەکانیا دێتە خوارێ، پیاو کە ئەو دیمەنە دەبینێ، دڵی بە حاڵی دەسووتێ. زۆر دڵی بە فێڵەکەی خۆی خۆشە، بۆیە جار لە جار توندتر پێدەکەنێ، جا پێکەنینێکی ناسازو ناخۆش، ناو بەناو بۆ چەند ساتێك لە پێکەنین دەوەستاو دیسان هاواری دەکرد: "لێی دەن، بیگروون، کەوڵی بکەن، ئەم دزە، ئەم خوێڕییە، ئەم هەتیوەم بۆ هەنجن بکەن!".

جیربیانتیکوف، تەکتیکاتی لەو بابەتەی زۆر بوو. بۆ نموونە هەندێجار کە زیندانییەکی بۆلا دەهێنرا تا سزا بدرێتو، زیندانییەکە لەبەری دەپاڕایەوە کە بەزەیی پێیدا بێتەوە، ئەمجارەیان ملازم جیربیانتیکوف بە جددی گوێی لێدەگرت، تەکتیکەکەی دەگۆڕیو بە زمانی لووس پێی دەگوت: – گوێ بگرە برای ئازیز، من ناتوانم سزات نەدەم، سزات دەدەمو ئەولاتریش، چونکە شایستەی سزایت، بەڵام دەتوانم سووکە یارمەتیەکت بدەم: بە قایشی تفەنگان ناتبەستمەوە، بۆ خۆت ئازادبە، تا هێز لە لاقتایە بە بەردەم ریزی سەربازەکاندا غاربدە. ڕاستە هەموو شەلاخەکانت بەردەکەون، بەڵام زووتر لە سزاکە رزگارت دەبێ، چ دەڵێی ؟ حەز دەکەی ئەمە تاقی بکەیتەوە ؟

زیندانییەکە بە دوو دڵییەوە گوێ دەگرێت، باوەڕناکات، بەڵام لە دڵی خۆیدا دەڵێت: " تەقو ڕاستی کرد ؟ ڕەنگە ئەم شێوازە باشتر بێ، ئەگەر بە توندی بە بەینی سەربازەکاندا غار بدەم، بە ماوەیەکی کەمتر ئەم ئەزموونە دەبڕمو لەوەشە هەموو شەلاخەکانم بەر نەکەون ". ئیدی زیندانیی داماو ناچار بە ملازم دەڵێت:

– ڕازیم پایەبەرز !

ملازم پێی دەڵێت:

– کەواتە منیش ڕازیم.

هەنگێ بانگ لە سەربازەکان دەکات:

– دەی کوڕینە ئامادەبن، هەرچاوێکتان بکەن بە چوارچاو.

ملازم دڵنیایە، کە تاقە جەزرەبەیەکیش بە خەسار ناچێو، هەر سەربازێکی چاك دەزانێ ئەگەر تاقە شەلاخێکی بە خەسار بچێو بەر پشتی زیندانییەکە نەکەوێ، ملازم بەو ئاسانیە لێی خۆش نابێت. زیندانیی داماو، هەوڵدەدا بە " شەقامی کەسك "دا غار بداتو بە خەیاڵی خۆی بەر لەوەی سەربازەکان فریا بکەون، دەگاتە ئەوسەری "شەقامی کەسك" بەڵام لە ناکاو قامچی وەکو تاوە تەرزە بەسەر پشتی ئەو بەستەزمانەدا دادەبارێ، لە عاردەکە تەخت دەبێو دەکەوێتە ناڵە ناڵ، ئیدی جوڵەی لەبەر دەبڕێ وەکو ئەوەی بە ئەرزەکەوە نووسابێ یان بەدەم گوللەیەکەوە سارد بووبێتەوە.

خۆ ئەگەر دوای ئەوە توانیبای بە هەزار زەحمەت، ڕەنگ زەردو لێو بەبار هەستاباوە، بە ملازمی دەگوت:

– پایە بەرز، من حەزدەکەم بە پێی قانون سزای خۆم وەربگرم.

هەنگێ ملازم جیربیانتیکوف، کە پێشوەختە ئاکامی ئەم گەمەیەی دەزانی، لە قاقای پێکەنینی دەداو لەبەر پێکەنین دوو لۆ دەنوشتایەوەو دەستی دەخستە کەلەکەی. هەڵبەتە ئەگەر بمەوێ هەموو تەکتیکەکانی ئەم ملازمە باسبکەم، یان هەموو ئەو چیرۆکانە بگێڕمەوە کە زیندانییەکان لێیان دەگێڕایەوە، هەر تەواو نابێتو، ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێت.

زیندانییەکانی قاوشەکەی ئێمە، باسی ملازمێکی دیکەیان دەکرد بە نێوی سمیکالوف، کە بەر لە هاتنی مێجەر، بەرپرسی زیندانەکە بوو. هەرچەندە زیندانییەکان جیربیانتیکوفیان خۆش نەدەویست، بەڵام بێ لایەنانە باسیان دەکرد، نە نەفرەتیان لێدەکردو نە ستایشیان دەکرد. بەڵام هەرهەموویان بەڕێزەوە یادی سمیکالوفیان دەکردەوەو ستایشیان دەکردو خۆزیایان بە سەردەمی ئەو دەخواست. هەڵبەتە تەبیعەتو ئاکاری ئەم ملازمە دەگەڵ ملازم جیربیانتیکوفدا جیاواز بوو، ڕاستە شەیدای شەلاخو شەلاخکاری نەبوو، بەڵام بەلاشیەوە گرینگ نەبوو، زیندانیی شەلاخکاری بکرێت یان نا. ئەدی کەوایە بۆچی زیندانییەکان خۆشیان دەویستو بە ڕێزەوە یادیان دەکردەوەو خۆزیایان بە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەو دەخواست ؟ چۆن توانی بووی ڕەزامەندی زیندانییەکان بە دەست بێنێ ؟ بەم ڕادەیە لە نێو هاوزیندانیەکانمدا خۆشەویست ببێ ؟ هاوزیندانییەکانمان، وەکو هەموو گەلی رووسیا، ئامادەن بە قسەیەکی

خۆش، هەموو کول‌و کۆڤانێکیان لە بیربکەن ( هەڵبەتە من ئەم خاڵە وەکو خۆی بیٚ هیچ وردکردنەوەو تۆژینەوەیەك تۆمار دەکەم ) بۆیە وەدەست هێنانی خۆشەویستی‌و ریٚزی ئەم گەلە زەحمەت نیە. سمیکالوف، توانی خۆشەویستییەکی تایبەتی بە دەست بێنیٚ... کە زیندانییەکان باسی سزاکانی خۆیان بە سەرپەرشتی ئەو دەکرد، زۆر بە رێزەوە یادیان دەکردەوەو خۆزگەیان بە سەردەمی ئەو دەخواست. تەنانەت هەندێجار کە بەراوردی ئەم مێجەرەی ئێستایان لەگەڵ ئەودا دەکرد، داخیان بۆ ئەو هەڵدەکێشاو دەیانگوت: " وەکو باوکمان وا بوو، بەڕاستی پیاوێکی باش بوو!" سمیکالوف پیاوێکی سادەو خاکی بوو، ڕەنگە بە شێوازی خۆی پیاوێکی باش‌و خۆشڕەفتار بوو بیٚ. بەڵام خۆ هەندیٚ بەرپرس هەن نەك هەر پیاوی باشن، بەڵکو میهرەبان‌و دلۆڤانیشن، کەچی بێزراون‌و کەس خۆشی ناوێن، بگرە گاڵتەشی پێدەکەن. سمیکالوف، لەوانە نەبوو، ئەوەندە خۆشڕەفتارو خاکی بوو، هەمووان بە یەکێك لە خۆیانیان دەزانی. ئەمە سیفەتێکی دەگمەنە، سیفەتێکی خۆڕسکە، زۆرجار خاوەنەکانیان، هەست بەوە ناکەن کە ئەو خووە باشەیان هەیە. سەیر ئەوەیە خەڵکانێك هەن کە هیچ باشییەکیان تێدا نیە، بەڵام بەهرەی خۆ خۆشەویست کردنیان هەیە، دەتوانن خەڵکی بەلای خۆدا ڕاکێشن. ئەوانە ژێر دەستانی خۆ نابوغزێنن، خۆیان لە خەڵکی بە گەورەتر نازانن، پێموایە ئەمە سەرچاوەو هۆی خۆشە ویستیانە. ئەوانە خۆیان لە خەڵکی جیا ناکەنەوە، کارێکی واناکەن عەوامی خەڵك بە ئەشراف‌و ئەرستۆکراتیان بزانیٚ، بە بێگانەیان بزانیٚ، بە چینێکی کۆمەڵایەتی ئەلاحەدەیان بزانیٚ، هەست بکەن یەکێك نیە لە خۆیان. ئەوانە خۆڕسك، بە تەبیعەت ماکێکی میللیانەیان تێدایە، بۆنی عەوامیان لێدێت‌و، عەوامی خەڵکەکەش بەدەم ئەو بۆنەوە دەچن.. باوەش بۆ ئەوە جۆرە کەسانە دەگرنەوە، لێی خڕدەبنەوە، پشتیوانی دەکەن،و هەمووشتێکی بۆ دەکەن.عەوامی خەڵکی (گەل) سەرۆکێکی توندو بەزەبریان، ئەگەر بۆنی خەڵك‌و ڕەمەکی مەردمی لیٚ بیٚ، لە سەد سەرۆکی نەرم‌و نیان‌و میهرەبان پیٚ باشترە. خۆ ئەگەر ئەم جۆرە سەرۆکە بە خۆی‌و بە شێوازی خۆی هەندیٚ خۆش خوو،و ئاکار بەرزو میهرەبان بیٚ، هەنگیٚ لە چاوی خەڵکیدا قیمەتی تەواو نابیٚ، دەیپەرستن ! جا ئەم ملازم سمیکالوفە، وەکو باسم کرد، هەندێجار سزای زۆر قورسی زیندانییەکانی دەدا، بەڵام ئەوەندە بە سلوکەت‌و خۆشڕەفتاری ئەم سزایەی دەدان، کە هیچ ڕقێکیان لێی هەڵنەدەگرت، بە پێچەوانەوە: کە یادی سزایەکانی ئەویان دەکردەوە، بە پێکەنینەوە یادیان دەکردەوە... دیارە ئەو یادەوەری‌و حیکایەتانەی ملازم سمیکالوف زۆر نەبوون، چونکە پیاو هەق بڵیٚ، لەو رووەوە کەسێکی بەرزە خەیاڵ‌و خۆشخەیاڵ نەبوو... تەنیا یەك تەکتیکی داهێنا بوو، نزیکەی یەك دانە ساڵ، لە زیندانەکەی ئێمەدا، بەخۆشییەوە مومارەسەی ئەو تەکتیکەی کرد، هەڵبەتە تەکتیکەش لە شۆخی بەدەر نەبوو. سمیکالوف بە خۆی سەرپەرشتی جێبەجێکردنی سزاکەی دەکرد، گاڵتەی دەگەڵ زیندانییەکەدا دەکردو پێی پێدەکەنی. ئەوەشی بە مەبەستێکی تایبەتی یان نیازێکی شاراوەو خراپ نەدەکرد، بەڵکو بۆیەی دەکرد، چونکە حەزی دەکرد بەخۆی‌و لە نزیکەوە ئاگاداری کاروباری ئەم زیندانییە ببیٚ. کورسییەکیان بۆی دێنا، ئەو شەلاخانەیان بۆ دێنا کە بۆ سزادانی تاوانبارەکە تەرخان کرابوون،

لەسەر کورسییەکە دادەنیشتو سەبیلە درێژەکەی پێدەکرد، یارۆی زیندانی لێی دەپاڕایەوە، ملازم پێی دەگوت: " دەی! نا.... دەی هاوڕێ.... پاڵ بکەوە... ئەوە چیتە ؟" یارۆی زیندانی هەناسەیەکی هەڵدەکێشاو لە سەر ئەرزەکە پاڵدەکەوت. ملازم لێی دەپرسی: " باشە برای ئازیز! تۆ نوێژت لەبەرە ؟" زیندانییەکە وەڵامی دەدایەوە: "ئەدی مەعنای چی پایە بەرز ؟ من مەسیحیم. لە منالییەوە ئەزبەرمە!" ملازم دەیگوت: " کەواتە وێردو نوێژی خۆت بخوینە !" زیندانییەکە پێشوەختە دەیزانی چ وێردێ دەخوێنێ، چۆن لەم وێرد خوێندنە تەواو دەبێت، چونکە ئەم گەمەیە پتر لە سی جاران دووبارە بوو بووەوە، هەروەها سمیکالوفیش دەیزانی کە زیندانییەکە ئاگای لەم گەمەیە هەیەو بە سەریا تێناپەڕێ، هەروەها سەربازە قامچی بە دەستەکانیش، چەندین جار ئەم گەمەیەیان دیتبوو. واتە گەمەکە بۆ هەموو لایەك ئاشکراو دیار بوو،و کەچی هەر دووبارەش دەکرایەوە. کابرای زیندانی دەستی بە نوێژو وێرد خوێندن دەکرد، سەربازانی چەکدار، قامچی بە دەست، حازرو ئامادە بە دیارییەوە دەوەستان. سمیکالوف دەستی لە سەبیل کێشان هەڵدەگرت، دەستی بەرزدەکردەوە، چاوەڕوانی دەکرد کە زیندانییەکە لە نوێژەکەیدا بگاتە ئەو شوێنەی ئەم دەیویست، زیندانییەکە بەردەوام دەبوو تا دەگەییە: "با فریشتەی ئاسمانان بێن" ملازم ئەوەی دەیویست، لەوێدا بە زیندانیەکەی دەگوت: "بەسە!" دەموچاوی سوور دەبووەوەو بە سەربازە شەلاخ بە دەستەکەی دەگوت: " فریای کەوە، فریشتەی ئاسمانانی بۆ بێنە !" بەدەم ئەو قسەیەوە بە دەست ئاماژەیەکی ئیلهامبەخشی بۆ دەکرد.

ئیدی بەدەم قاقای پێکەنینەوە خۆی بە کۆڵ کورسیەکەدا دەدا. ئیدی پێکەنین سیرایەتی دەکرد ریزە سەربازەکە، سەربازە شەلاخ وەشێنەکە،و تەنانەت تاوانبارەکەشی دەگرتەوە. لە کاتێکا کە ملازم سمیکالوف هاواری دەکرد: "پشتی بشکێنە!"و شەلاخەکە بە فیشكو هۆڕ لە ئاسمانەوە دادەهاتەوەو وەکو گوێزان بە پشتی تاوانباری قەرەبەختدا دەچزا، ئەو نەگبەتە پێدەکەنی!... سمیکالوف زۆر بەم گەمەیە خۆشحاڵ بوو، چونکە لە داهێنانی خۆی بوو. کە لە سزاکە دەبوونەوە، ملازمەکە بە ئاسوودەییو ڕەزامەندی دەڕۆیی، زیندانییەکەش بە خۆشحاڵیو ڕەزامەندییەوە هەڵدەستایەوەو دەچووەوە بۆ ناو هاوزیندانییەکانیو گەمەکەی سمیکالوڤ، کە ئەمە سیو یەکەمین جاربوو دووبارەی کردبووەوە، بۆ دەگێرانەوەو دەیگوت: " چەند پیاوێکی باشە... چەند رووخۆشە، چەند حەزی لە شۆخی و سوعبەتانە !"

زۆر جار پیاو گوێی لە زیندانییەکان دەبوو، کە ستایشی ملازمیان دەکردو بە تاسەوە یادی ئەو رۆژانەیان دەکردەوە کە ئەو دەیخستنە ژێر شەلاخو لیسان.

جارێ گوێم لێ بوو یەکێك لە زیندانییەکان، زۆر بە شادییەوە یادی دەکردەوەو دەیگوت:

– جارێکیان بۆ سەر کار دەڕۆییشتم، سەیرم کرد لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەیا، بە جلیماڵەوە دانیشتووە، بە دەم چا خواردنەوە سەبیلی دەکێشا، خێرا وەکو ڕێزو حورمەت کڵاوەکەم لەسەرم داگرت. لێی پرسیم: "ئاکسینوف بۆ کوێ دەڕۆی ؟" گوتم: "بۆ سەر کار میخائیل فاسیلیچ، بەڵام دەبێ لە پێشا بڕۆم بۆ کارگەکە" کە گوێی لە قسەکەم بوو، لە ناخی دڵەوە لە قاقای پێکەنینی دا، کە پیاوێکی باش بوو! بەڕاستی ناسکە پیاو بوو!

یەکێك لە گوێگرەکان هەڵیدایەو گوتی:
– ئەو جۆرە پیاوانە لێرە نایەڵنەوە!...

__پەراوێز:__

١– *م....کی: بڕوانە پەراوێزی یەکەمی فەسڵی سێیەم. رەنگە دۆستۆفسکی بە ئانقەست ئەو هەڵەیەی کردبێ کە گوتوویەتی "م...کی" سەر بە چینی خانەدان و ئەشرافان نەبوو، تا پێ لەسەر ناڕەوایەتی ئەو سزا جەستەییە دانەگرێت کە بۆ ئەلکساندەر میرتسکی بڕدرایەوە کە لەراستیدا سەر بە چینی ئەشراف و خانەدانان بوو.*
٢– *نوزدریوف: یەکێکە لە کاراکتەرەکانی رۆمانی: گیانە مردووەکانی گوگول. نوزدریوف، کابرایەکی بەدمەستی قومارچی بوو.*



## نەخۆشخانە

٣–٣

بۆیە ئێستا باسی سزا*(١)و ئەنجامدەرانی سزایان دەکەم، چونکە بەر لەوەی رێم بکەوێتە نەخۆشخانە، بیرۆکەیەکی روون و دیارم دەربارەی نەبوو، هەر بە بیستن هەندێ شتم لەو بارەیەوە بیستبوو. وابوو هەموو ئەوانەی کە سزای شەلاخیان بۆ دەبڕایەوە، هەموو زیندانییە سوپاییەکانی شارەکەی ئێمەو ناوچەکانی دەوروبەری، کە بۆ نەخۆشخانە دەهێنران، دەهێنرانە قاوشەکانی ئێمە. هەڵبەتە لە سەرەتای رۆژانی هەوەڵی حەپسییەکەمدا، کە هێشتا ژینگەکەم

بەلاوە تازە بوو، دیمەنی گشت زیندانییە قەرەبەختەکان یان ئەوانەی چاوەڕوانی سزابوون یان ئەوانەی تازە لە ژێر شەلاخکاری هاتبوونە دەرێ، زۆری کار تێدەکردمو زۆرم لە گیان ناخۆش بوو. زۆر دەشڵەژام،و یەجگار نیگەران دەبووم. کە گوێم لەو واریقاتو سەربوردانە دەبوو کە زیندانییەکان لەم بارەیەوە، لە بەینی خۆیاندا دەیانگێڕایەوە، هەزارو یەك پرسیارم لەلا دەهاڕوژاو عەودالی وەڵام دەبووم، حەزم دەکرد جۆرو ئاستی گشت حوکمو سزاکان بزانم، حەزم دەکرد ڕاو بۆچوونی خودی زیندانییەکان لە بارەیانەوە بزانم. هەوڵم دەدا باری دەروونی ئەو کەسانەی کە حوکمی شەلاخیان بۆ دەبڕایەوە، بێنمە بەرچاوی خۆم. پێشترو هەر لەم نووسینەدا باسی ئەوەم کردبوو، مەگەر بە دەگمەن، دەنا هیچ زیندانییەك نەبوو، لە سزا نەترسێت، لە رووی دەروونیەوە نەپەشۆکێتو بە ئارامیو بە ئاسوودەیی چاوەڕوانی سزاکەی بکات، تەنانەت خەڵکانی ئەزموونداریش، ئەوانەی پێشتر ئەو جۆرە سزایەیان دیتبوو، هەر دەترسانو نیگەران دەبوون. زیندانی هەستی بە ترسێکی بەسام دەکرد، بەڵام ئەمە زیاتر ترسێکی جەستەیی بوو، چونکە سامی ترسەکە، ئەقڵو هۆشی لەلا نەدەهێشت، ئەقڵو هۆشی سڕ دەکرد. ئیدی لە ماوەی ئەو ساڵانەی کە لە زینداندا مامەوە، توانیم ئەو زیندانییانە بخەمە بەر وردەبینی سەرنج کە بەرگەیان نەدەگرتو لە نیوەی جەزرەبەکانیاندا، بۆ نەخۆشخانە دەنێردران، تا زامەکانی پشتیان چاك ببێتەوە، ئەوسا پاشماوەی سزاکەیان بەسەردا جێبەجێ بکرێ. بە رێکەوت ژمارەیەکی زۆرم لەوانە بینی کە بۆ سبەینێ، داوایان دەکرد لە نەخۆشخانە مەرەخەس بکرێن، تا پاشماوەی سزاکەیان وەربگرن . دیارە پزیشکی تایبەتی ئامادەی رێو رەسمی جێبەجێکردنی سزاکان دەبوو،و ئەو بڕیاری دەدا کە هەموو جەڵدەکان لە یارۆی مەحکوم بدرێ یان نا. ئاخۆ زیندانییەکە بەرگە دەگرێت یان نا... ئەگەر ژمارەی جەزرەبەکان لەوە زیاتر بوایە کە زیندانییەکە بەرگەی بگرێت، بە گوێرەی بڕیاری پزیشك دەکرا بە دوو یان سێ وەجبەوە، پزیشك بڕیار دەدا کە ئاخۆ زیندانییەکە بەرگە دەگرێت هەموو جەزرەبەکانی بە کەڕەتێ لێبدرێت یان ژیانی دەکەوێتە مەترسییەوە. ئەگەر سزایەکە پێنج سەد تا هەزارو پێنج سەد جەڵدە بوایە، ئەوا هەر هەمووی بە کەڕەتێ جێبەجێدەکراو لە یارۆی زیندانی دەدرا، بەڵام ئەگەر دوو هەزارو سێ هەزار جەڵدە بووایە، ئەوا بە دوو یان سێ کەڕەت جێبەجێ دەکرا. جا مەحکومانی نەگبەت کە زامەکانی پشتیان سارێژ دەبووەوەو دەبوایە خۆ ئامادە بکەن لە نەخۆشخانە مەرەخەس بکرێن، تا پاشماوەی سزاکەیان وەربگرن، رۆژێ پێش دەرچوونیان لە نەخۆشخانە، خەم دایدەگرتن، رووناکی لە ڕوویان دەبڕا، دەمیان دەچووە کلیلە. پیاو کە تەمەشای دەکردن دەتگوت بروسکە لێی داون، لە تۆ وایە خۆڵ و دۆیان بە سەردا کراوە، هەموو حەپەساو و حەواسپەرت، هیچ قسەیەکیان نەدەکرد، زۆربەی کات ماتو بێدەنگ بوون. سەیر ئەوە بوو، زیندانییەکان خۆیان لەو مەحکوومانە دەبوارد، بە هیچ جۆرێ باسی ئەو سزایەیان نەدەکرد کە بۆیان بڕابووەوە، نە دڵخۆشیان دەدانەوەو نە هاوخەمییان دەکردن، دیارە ئەمە کارێکی ئاقڵانە بوو، چونکە زیندانییە مەحکومەکانیش، ئەوانەی جەڵدەیان بۆ بڕابووەوە، ئەم هەڵوێستەیان پێ باشتر بوو. هەڵبەتە هەندێجار حاڵەتی ریزپەڕیش دەهاتە پێشێ.یەکێك لەو نموونانە ئورلوفە کە لە فەسڵی چوارەمی

ئەم یادگارییانەشدا باسم کردووە. هەڵبەتە خوێنەران لە بیریان ماوە کە ئۆرلوف چەندی پەلە بوو زامەکانی پشتی زوو سارێژ ببنەوە، تا پاشماوەی سزایەکەی وەربگرێتو بۆ زیندانی بنێرنەوە، چونکە بە تەما بوو لە رێگەدا هەڵێ. ئۆرلوف، پیاوێکی سەرکێش‌و توندە تەبیعەت بوو، قسە هەر قسەی خۆی بوو، شتێك لە کەللەی دابا، دەست بەردار نەدەبوو تا پێی نەگەییشتبایە، زۆریش بۆ حاڵی خۆی زیرەك‌و چاوکراوەو بە فێڵ بوو.کە گەییە نەخۆشخانە زۆر خۆشحاڵ و شادمان دەهاتە بەرچاو، چونکە کاتێ کە سزای جەڵدەی بۆ بڕابووەوە، لە دڵی خۆیدا بە تەمای ئەوە نەبوو بوو بەرگە بگرێ‌و بە سەلامەتی دەربازببێ، بەڵکو پێی وابوو لە نیوەی جەڵدەکاندا، لێدەبێتەوەو دەمرێت... چونکە لەم لاو لەولا بیستبووی کە ئیدارە نیازی خراپەو ئەمجارە زۆر بە توندی سزای دەدەن، بۆیە بەڕاستی بە تەمای مردن بوو بوو. بەڵام ئێستا کە بە زندوویەتی لە ژێر نیوەی سزاکەی دەرچوو بوو، مەمنوونی بەختی خۆی بوو، بۆیە ئومێدی بە ژیان‌و مان پەیدا کردبووەو ورەی بەرز بوو بووەوە. ڕاستە کە بۆ نەخۆشخانەیان هێنا پشتی یەکپارچە زام‌و برین بوو، بە عەمراتم شتی وام نەبینی بوو، نیوە مەرگ بوو بوو، بەڵام وێڕای ئەوەش خۆشحاڵ بوو کە هێشتا زندووەو ماوە، بابایەك بوو تینووی ژیان. زۆر خۆشحاڵ بوو کە نەیان توانی بوو بیکوژن. بۆیە پێویستی نەدەکرد باوەڕ بە دەمگۆیان بکات، بە تایبەتی کە بەشی دووەمی سزاکەیان دواخستبوو. ئۆرلوف بە درێژایی ماوەی زیندانییەکەی خەونی بە هەڵاتن، بە ئازادی، بە مەزراو کێڵگان، بە بێشەو لێرەوارانەوە دەبینی... بەڵام بە دوو رۆژ دوای دەرچوونی لە نەخۆشخانە، هێنرایەوە بۆ نەخۆشخانەکە تا لەسەر هەمان تەختە خەوی هەوەڵجاری بمرێت... بەرگەی بەشی دووەمی سزاکەی نەگرتبوو. پێشتریش باسی ئەم پیاوەم کردووە.

بەڵام پێویستە ئەوەش بگوترێ کە هەر هەموو زیندانییەکان، تەنانەت ئەوانەش کە ناوی سزاو ئەشکەنجەیان بەر گوێ کەوتبا، زیڕەیان دەکرد،و شەوو رۆژیان لێدەگۆڕا، قارەمانانە خۆیان لەبەر ئەشکەنجە ڕادەگرت. مەگەر بە دەگمەن، دەنا قەت گوێم لە کەسیان نەبووە بناڵێ یان گلەیی بکات. تەنانەت لە شەوی رۆژی یەکەمی جێبەجێکردنی سزایەکەشدا، نەیان دەناڵاند... دیارە دەبێ ئەوەمان لە بیربێ کە ڕەمەکی مەردم، خەڵکی چەوساوەو قاڵبووی بۆتەی دەردو ئازاران، دەزانێ چۆن بەرەنگاری ئازار دەبێتەوە. لە بیرمە زۆرجار لە هاوزیندانییەکانم دەپرسی کە ئەم ئازارە چۆنە، ئایا بەڕاستی وەکو چۆن باسی دەکەن بەو ئاوایە بە سۆیە، هەڵبەتە بۆیە ئەم پرسیارەم دەکرد تا تەبیعەتی ئازارو ئەشکەنجەکەم بە تەواوەتی بۆ دەربکەوێ‌و بزانم لە چ عەزابێك دەچێت، نەك بۆ فزوڵیەتێکی نابەجێ‌و بێ مانا. وەکو پێشتریش باسم کردووە، من ئەو سزایەم زۆر لەبەر گران‌و لە گیان ناخۆش بوو، زۆرم بەلاوە سامناك بوو. بەڵام وێڕای پرسیاری زۆرم لە هاوزیندانیەکانم، ئێستاش وەڵامێکی قەناعەتبەخشم دەست نەکەوت. گشتیان یەك وەڵامیان دەدایەوە: " وەکو ئاگر پشت دەسووتێنێ ". هەوەڵجار ئەو پرسیارەم لە (م... کی) کرد، گوتی: " لە کێشا نییە، وەکو ئاگر پشت دەسووتێنێ، دۆزەخێکە بۆ خۆی، پیاو وا هەست دەکات تەنورێکیان لەسەر پشتی داخستووە ". ئیدی بەو قسەیە هەموو شتێکیان دەبڕییەوە. رۆژێك شتێکی زۆر سەیرم بۆ دەرکەوت، ئەویش ئەوە بوو کە هەموو زیندانییەکان دەیانگوت

جەزرەبەی دار زۆر سووکترە لە جەزرەبەی شەلاخ، جەزرەبەی شەلاخ بە ئازارترین ئەشکەنجەی باوی وڵاتی ئێمەیە. هیچ جەزرەبەیەك ناگات بە جەزرەبەی شەلاخ و قامچی. لەوەیە پیاو لە هەوەڵەوە باوەڕ بەمە نەکات. بەڵام وەکو دەڵێن لەوەیە پێنج سەد جەڵدەی شەلاخ، یان چوار سەد جەڵدە ئینسانێك بکوژێت. خۆ ئەگەر ژمارەی جەڵدەی شەلاخ لە پێنج سەد جەڵدە تێ بپەڕێ لەوەیە بە مسۆگەری ئینسان بکوژێت. کێ زۆر تۆکمەو گیان سەخت بێ بەرگەی هەزار جەڵدەی شەلاخ ناگرێت. بەڵام پیاو زۆر بە ئاسانی بەرگەی پێنج سەد دار دەگرێت، نە هەرەس دێنێ و نە مەترسی مەرگی لێدەگرێت. ئەگەر کەسێك توانای جەستەیی مامناوەندی بێت، بەرگەی هەزار دار دەگرێت بێ ئەوەی مەترسی مەرگی لێبکرێ، بە دوو هەزار داریش نامرێت. گشت زیندانییەکان دەیانگوت قامچی زۆر لە دار بە ئازارترە. دەیانگوت: " قامچی لەگەڵ دارا بەراورد ناکرێ، ئازاری قامچی لە کێشا نیە، کوڕی دەوێ نە گاڵتە. " هەڵبەتە ئاساییە کە ئازاری قامچی لە دار زیاتر بێ، چونکە زۆر بە توندی دەزگای عەسەبی ئینسان دەهاڕوژێنێ. ئیدی نازانم ئاخۆ تا ئێستاش، تا ئەم رۆژگارەی ئێمەش لەو بابەتە خەڵکانە ماون کە ( بەڵام دەزانم تا ماوەیەك لەمە پێشیش هەبون) لەزەتێکی زۆر لە ئازاردانی قوربانیان دەبینن. ئەمانە، خەڵکانی وەکو مارکیزساد و مارکیزە برنفلییە*(٢) وەبیر دێننەوە. پێموایە هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ نیگەرانی و پەریشانی دەروونی. ئەو خەڵکانە لە یەك کاتدا هەم هەست بەلەزەت دەکەن و هەم بە ئازار. خەڵکانێك هەن وەکو پڵینگ تینووی خوێنن، حەزدەکەن دەمی تێبنەن، بیلێسنەوە، ئەوانەی دەسەڵاتی بێ سنووریان بەسەر جەستەو خوێن و رووحی بەشەرەوە هەیە، ئەوانەی دەسەڵاتیان بەسەر ئەو کەسانەدا دەشکێ کە بە پێی شەریعەتی مەسیح برایانن، ئەوانەی هەست بەو دەسەڵاتە دەکەن و دەسەڵات وای لێکردوون تا ئەوپەڕی دڵڕەقی مرۆڤێك زەلیل بکەن کە لەسەر شێوەی خوا دروستکراوە... ئەوانە لەوە بێدەسەڵاتترن بتوانن جڵەوی ئارەزووی خۆیان بگرن،و تینویەتی خۆیان بە عەزابدانی خەڵکی نەشکێنن، ئەوانە لەزەت لە عەزابی خەڵکی دەبینن. هەڵبەتە زوڵم و زۆرو ستەمکاری کە بەردەوام بوو، بوو بە عادەت ئیدی لەگینە کەڵەکە ببێ و بە تێپەڕبوونی رۆژگار ببێ بە نەخۆشی. من دڵنیام دوور نییە، کە باشترین مرۆڤ، خێرخواترین بەشەر لە دنیادا بە جۆرێ دڵی رەش ببێ، دڵی رەق ببێ، تەبیعەتی بگۆڕێت کە هیچ جیاوازییەکی لە حەیوانێکی دڕندە نەمێنێ. خوێن و دەسەڵات مایەو سەرچاوەی مەستین، زەمینە بۆ نەشونمای دڵڕەقی و خراپەو بێ ئینسافی و بێدادی خۆش دەکات، ئیدی روح و ئەقڵ دەلەوتێن، پیس دەبن، لە خەتی خۆیان دەردەچن، ئەوپەڕی لەزەت، لەو کارانە وەردەگرن کە بە تەبیعەتی بەشەران نامۆن. مرۆڤ و هاووڵاتی بۆ هەتا هەتایە لە ویژدان و دەروونی ستەمکاردا دەسڕێنەوە، ئیدی گەڕانەوە بۆ کەرامەتی مرۆڤانی، بۆ پەشیمانی و تۆبە، بۆ بوژانەوەی ئەخلاقی ، دەچێتە خانەی نیمچە مەحاڵەوە. ئیدی لەوەیە ئەم پاشاگەردانییە سیرایەت بکات و سەرانسەری کۆمەڵگە بگرێتەوە: ئەم جۆرە دەسەڵاتە، مرۆڤ خەڵەتێنە. هەر کۆمەڵگەیەك بە بێ موبالاتی و خەمساردی بڕوانێتە ئەم شتانە، تا سەر ئێسقان نەخۆشە، بە کورتی: کە رێی کەسێك دەدرێ، ئەشکەنجەی هاوتاکانی خۆی بدات، ئەمە خۆی لە خۆیدا زامێکە لە زامەکانی کۆمەڵگە، ئەمە مسۆگەرترین رێگەیە بۆ

سڕینەوەو کوشتنی گیانی هاوسۆزی دەگەڵ خەڵکیدا، جا ئەم ڕێگەدانە بە شێوەیەکی نا ڕاستەوخۆ، ماکو تۆوی داوەشینی کۆمەڵگەی لە خۆدا هەڵگرتووە،و بێگومان کۆمەڵگە لە گرێژەنە دەبات.

کۆمەڵگە، جەلادو میرغەزەبی پیشەیی دەبوغزێنێ نەك دەسەلاتداری جەلاد، خەڵکانێك لەو دواییانەدا دەیانویست پێچەوانەی ئەو بۆچوونە بسەلمێننو دووپاتی بکەنەوە، هەڵبەتە سەلماندنو دووپاتکردنەوەیەکی تیۆری رووت. دیارە ئەوانەی بانگەشە بۆ ئەم بۆچوونە دەکەن، ئەوانەن کە هێشتا نەیانتوانیوە غەریزەی دەسەلاتخوازی لە دەروونی خۆیاندا خەفە بکەن. هەر خاوەن کارخانەیەك یان قۆنتەراتچییەك بگری، دەیان جار لە دلی خۆیدا، بەوە دڵخۆش بووە کە کۆمەڵێك کرێکاری هەژاری لە خزمەتدا بوونو چاویان لە دەستی ئەو بووە، هەڵبەتە هیچ نەوەیەك ناتوانێ بە ئاسانیو زوو بە زوو لە شتە بۆ ماوەییەکانی خۆی رزگار بێ. مرۆڤ ناتوانێ دەست بەرداری ئەو شتە بێ کە لە خوێنیدایە، کە بە شیری دایکییەوە خواردوویەتی. هەر ئەوەندە بەس نییە مرۆڤ دان بە تاوانو گوناحی خۆیدا بنێ،.... ئەوە کەمە، زۆر کەمە... بەڵکو دەبێ ئەو تاوانو گوناحە لە خۆیدا ریشەکێش بکات، ئەمەش وەختی دەوێ، زوو بە زوو نایەتە دی.

جا بە بۆنەی باسی جەلادەوە، دەمەوێ ئەوە بڵێم کە هەر ئەندامێکی کۆمەڵگەی هاوچەرخی ئێمە بگریت، بە شێوەیەك لە شێوەکان جۆرە ماکێکی جەلادی تێدایە. بەلام غەریزە ئاژەڵیەکانی مرۆڤ، بە شێوەیەکی یەکسان گەشە ناکەن، خۆ ئەگەر غەریزە ئاژەڵیەکان بەسەر لایەنە مرۆڤانیەکانی تری بەشەردا زاڵ بن، ئەوا ئەو بەشەرە دەشێوێ، دەبێ بە گووراوێکی دزێوی بێزراو، لە مرۆڤایەتی دەکەوێ. جەلادان دوو جۆرن: جەلادی خۆڕسك کە بە خوایشتی خۆی مومارەسەی جەلادی دەکات، و جەلادی پیشەیی کە بە حوکمی وەزیفەو لە پێناوی بژێوی ژیاندا ئەو کارە دەکات. دیارە جەلادی خۆڕسك لە هەموو روویەکەوە لە جەلادی کرێگرتەو پیشەیی سووکترو خوێڕیترە، کەچی جەماوەری گەل ئەوەندەی ڕقی لە جەلادی پیشەییەو لەو بێزارە، ئەوەندە رقی لە جەلادی خۆڕسكو خۆبەخش نییە، نازانم هۆی ئەمە چیەو بۆچی دەبێ وابێ ؟ دەبێ هۆی ئەم ڕقە ترسناکە ئەفسانەییە چی بێ کە خەڵکی بەرانبەر بە جەلادی پیشەیی هەیانەو گوێ بە جەلادی خۆڕسك نادەن ؟ من زۆر شتی سەیرم دەربارەی خەڵکانێك بیستووەو دیتووە کە خەڵکانی باش بوون، لە ناو خەڵکیدا بە قەدر بوونو، دەستیان داوەتە کاری ستەمکارانە. بۆ نموونە جەلادانێکم دیتوون، هەرچەندە ستەمکارو بەدنیهاد نەبوون، کەچی ئەگەر قوربانیو نێچیرەکانی بەردەستیان، لێیان نەپاڕابانەوە، داوای بوردنیان نەکردبا، زۆر توڕە دەبوون،و ئەمەیان پێ قووت نەدەچوو،و لالانەوەو پاڕانەوەو زەلیل نماییان بە پەسندو پێویست دەزانی. خۆ ئەگەر یارۆی مەحکوم بە جەڵدە، ملی نەدابا و لە کابرای جەلادی شەلاخوەشێن نەپاڕابایەوەو هاواری نەکردبا، ئەوا کابرای جەلاد، کە لە هەلومەرجی تردا بە ئینسانی باش دەژمێردرا، ئەمەی بە سووکایەتی دەزانی.و ئەگەر پێشتر بەو نیازە بووبێ سزایەکی سووکی بدات و دەست دا نەگرێ، کە دەی بینی مەحکومەکە لەبەری ناپاڕێتەوەو هاوار ناکات بۆ نموونە ناڵێت: "بیکە بە خاتری خوا پایەبەرز، بەزەییت پێمدا بێتەوە، باوکێکی باشەو با بەدرێژایی تەمەنم هەردوعای

خێرت بۆ بکەم" دەهری دەبوو، ئەمری دەکرد پەنجا جەڵدەی زیادە لە کابرای داماو بدرێ هەر بۆ ئەوەی هاواری لێ هەستێو بکەوێتە لالانەوەو پاڕانەوە،و بەڕاستیش چاری نەدەماو هاواری لێ هەڵدەستا. ڕۆژێك گلەییم لە یەکێك لەو زەلامانە کرد کە زۆر دڵڕەقە، زۆر بە جددی بەرسڤی دامەوە کە: "مەحاڵە، چۆن دەبێ هاوار نەکات، ئەمە گۆساخیو لاسارییە، من گۆساخیم پێ قبووڵ ناکرێت". بەڵام جەلادی پیشەیی، جیایە، یەکێکە لە زیندانیو دوور خراوەکان، ئیدی ئەو ئیشەی پێ سپێردراوە. دەخرێتە بەر دەستی جەلادێکی کۆن تا ئەو پیشەیەی فێربکات، کە فێری ئیشەکە بوو، ئیدی بە درێژایی تەمەنی لە زینداندا نیشتەجێ دەبێتو شوێنێکی ئەلاحەدەی دەدەنێ.خۆ هەندێجار خانووی تایبەتیشی دەدەنێ، بەڵام ڕێگەی نادەن بەبێ پاسەوان لە زیندان وەدەربکەوێ. خۆ مرۆڤ ئامێر نییە. ئیدی ئەم جەلادە، هەرچەندە وەکو وەزیفە ئەرکی جەلادی ئەنجام دەدات، هەندێجار ئەوەندە توڕە دەبێت، هونەرکاری تێدا دەکاتو هەست بە جۆرە لەزەتێك دەکات. بەڵام هیچ ڕقێك لە مەحکوومەکەی بەردەستی هەڵناگرێت. ئیدی ئارەزووی خۆنواندن،و خۆ سەلماندنو نیشاندانی کارامەیی لە کارەکەیدا، هەستی گەورەییو غروورو خۆپەرستی لەلا دەمەزەرد دەکاتەوە، ئیدی بەرە بەرە خۆی لێ دەبێ بە هونەرمەندو ئیشەکەی بە هونەر،و ئیدی دەکەوێتە هونەرنوێنی. جا وێڕای ئەمەش وەکو ڕۆژ لێی عەیانە کە مرۆڤێکی بێزراوە، ڕوو لە هەر شوێنێ دەکات ترسێکی ئەفسانەیی باڵ بەسەر ئەو شوێنەدا دەکێشێت، ئیدی مەحاڵە ئەو هەلومەرجو ژینگە تایبەتیە کاری تێنەکاتو مەیلو ئارەزووە هۆڤییەکانی بێدار نەکاتەوە.تەنانەت منداڵانیش دەزانن کە ئەم پیاوە وەفای بۆ باوكو دایکی خۆیشی نییە... سەیر ئەوەیە گشت ئەو جەلادانەی من ناسیوومن، خەڵکانێکی زیرەك، بە هۆش، خۆپەرست، لەخۆباییو مەغروور بوون. ئەو سەختگیریو دڵ ڕەقیەی لەلایەن دروست دەبێ، زادەی ئەوەیە ڕوو دەکەنە هەر شوێنێ بە سووکیو بە بچووکی تەمەشا دەکرێن، ئیدی ئەوانیش ئەمە بەو داماوانەی ژێر دەستی خۆیان دەڕێژنو پۆز بەسەر ئەو بێدەسەڵاتانەدا لێدەدەن. ئیدی بەمە بچووکیو ڕیسوایی خۆیان فەرامۆش دەکەن. جارێکیان بۆم ڕێکەوت بۆ ماوەیەك یەکێك لەو جەلادانە بدینم. کابرایەکی کورتە باڵا بوو، تەمەنی نزیکەی چل ساڵێك دەبوو. کابرایەکی تۆکمەو ڕەزا سووك، قژ لوول بوو، پیاوێك بوو پاكو خاوێن، سەلارو سەنگین، هێدیو هێمن، بە ڕواڵەت دەتگوت ئەشرافزادەیە. زۆر بە کورتی، ڕوونی، ڕەوانیو خاکیانە وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەدایەوە کە لێی دەکران. کە دەیبینی ئەفسەرەکان هەندێجار بە ڕێزەوە دەیدوێننو قسەی دەگەڵ دەکەن، ئەوەندەی دی خۆی قورس دەگرت،و ڕەسمیانە وەڵامی دەدانەوە، تا زیاتر ڕوویان دەدایە، ئەو پتر خۆی قورس دەگرتو لە خۆی بایی دەبوو. دەموچاوی هاواری دەکرد کە لەو کاتانەدا، لە دڵی خۆیدا، خۆی زۆر لە ئەفسەرەکان بە گەورەتر دەزانی. هەندێجار، لە وەرزی هاویندا، لە هەڕەتی گەرمادا، ئەم پیاوە ڕادەسپێردرا سەگانی شار بکوژێت، ڕمێکی درێژی نووك تیژیان دەدایە دەستو لەگەڵ پاسەوانێکدا بۆ شاریان دەنارد تا ئەو سەگە بەرەڵلایانە بکوژێت. ئەم سەگانە زۆر زۆر زیادیان دەکردو ئیدی هاوینان، لە قرچەی گەرمادا خەڵکەکەیان هەراسان دەکرد، ئەم جەلادە بە فەرمی لەلایەن دەسەڵاتەوە ڕاسپێردرا بوو کە ئەو سەگانە بکوژێت. هیچ

شەرمی لەم وەزیفە سووکە نەدەکرد. خۆزگە دەتبینی بە چ کەش‌و فشێکەوە لەگەڵ پاسەوانە شەکەت‌و ماندوو بێزارەکەیدا بە شەقام‌و جادەکانی شاردا دەسوڕایەوەو، چۆن مۆڕەی لە ژنان‌و منداڵان دەکردو دەیترساندن، بە چ لووتبەرزی‌و فڕناخییەکەوە دەیڕوانیە ڕێبوارانی سەر جادەو شەقامەکان.

ژیانی جەلادان خۆش بوو، خۆشخۆرو خۆش شۆر بوون، پارەیان هەبوو، دەچوونە گەڕان‌و سەفەران، مەیان دەخواردەوە. سەرچاوەی ئەم بوونەشیان، بەرتیل بوو، ئەو بەرتیلە بوو کە کەسوکاری دەوڵەمەندی هەندێ لە زیندانییە مەدەنیەکان دەیاندانێ، دیارە جەلادەکان بڕی بەرتیلەکەیان دیاری دەکرد، ئیدی بە گوێرەی دەوڵەمەندی زیندانیەکە دیارییان دەکرد، جاری وا هەبوو داوای سی ڕۆبڵ‌و زیاتریان دەکرد. ڕاستە جەلاد نەیدەتوانی زۆر چاوپۆشی لە مەحکوم بکات، چونکە ئەگەر شتی وای بکردایە خۆیان بەر جەڵدە دەدا، بەڵام بەڵێنی دەدا ئەگەر بەرتیلێکی باشی بدەنێ، لە کاتی جەڵدە لێدانەکەدا زۆر دەست دانەگرێت. هەڵبەتە زیندانییەکان هەمیشە ناچاربوون داواکارییەکانی جێبەجێ بکەن، چونکە ئەگەر داواکارییەکەیان جێبەجێ نەکردبا، زۆر بێڕەحمانە لێی دەدان، ئەو هەقەی هەبوو. تەنانەت جاری واهەبوو داوای بەرتیلێکی یەجگار زۆری لە زیندانیەکی زۆر هەژارو نەدارا دەکرد. هەنگێ هەرچی کەسوکاری زیندانیەکە هەبوو بۆی تێدەکەوتن، سازشیان دەگەڵ جەلادەکەدا دەکرد، لەبەری دەپاڕانەوە. جا وای بە حاڵیان ئەگەر ڕازییان نەکردبا. دیارە جەلادان ترسێکی ئەفسانەییان لە دڵی زیندانیاندا دروست دەکرد، ئەم ترسە ئەفسانەییە بوو بوو بە خێرو بەرەکەت بۆ جەلادەکان. هەندێ کەس بۆیان دەگێڕامەوە کە ئەم جەلادانە سامیان زۆر گرانە، تەنانەت زیندانییەکان بە دڵنیاییەوە بۆیان دەگێڕامەوە کە جەلاد ئەگەر بیەوێ، دەکارێ بە یەکەم جەزرەبە مەحکومەکەی ژێر دەستی بکوژێت. ئاخۆ ئەم قسەیە زادەی ئەزموون بوو ؟ لەوەیە... کێ دەزانێ!... زیندانیەکان هێندە بە دڵنیاییەوە ئەوە قسەیەیان بۆ دەکردم، نەمدەتوانی باوەڕنەکەم. دیاربوو لە تەجرەبەوە ئەو قسەیەیان دەکرد. جەلادەکە بە خۆیشی دڵنیای کردم کە دەتوانێ ئەو کارە بکات. شتێکی دیکەیشیان لە یارۆی جەلاد دەگێڕایەوەو دەیانگوت کە گوایە دەتوانێ فێڵ بکات‌و بە هەموو هێزو توانایەوە شەلاخەکە بە پشتی یارۆی مەحکوومدا بکێشێت، بێ ئەوەی بێڵێ ئازاری بگاتێ، یان شوێنەوارێك لە سەر پشتی بە جێ بێڵێ. بەڵام کابرای جەلاد ئەگەر بەرتیلیش وەربگرێ‌و بەڵێنی تەواو بدات کە دەست داناگرێت، جەزرەبەی یەکەم دەبێ زۆر توند بێ، ئیدی ئەمە دابێکی باو بوو و کەس لێی دەرنەدەچوو. دوای جەزرەبەی یەکەم، کە دەبوایە توند بێ، یارۆی جەلاد بەرە بەرە دەستی سووك دەکرد، بە تایبەتی ئەگەر بەرتیلەکەی چەور بایەو بەر دڵی گرتبا. نازانم جەلادەکان بۆ ئەمەیان دەکرد: بۆ ئەوە بوو تا یارۆی مەحکووم بۆ جەزرەبەکانی دواتر رابێنن‌و هەست بکەن لە چاو جەزرەبەی یەکەمدا زۆر سووك‌و کەم ئازارن، یان بۆ ترساندنی مەحکوومەکە بوو، بۆ نواندی هێزو دەسەڵاتی خۆیان بوو ؟ بە هەرحاڵ بۆ هەرچییەك بێ، جەلاد بەر لەوەی کارەکەی ئەنجام بدات هەمیشە نیگەرانە، هەست بە هێزو دەسەڵاتی خۆی دەکات: لەو کاتەدا خۆی لەبەر چاوی جەماوەردا دەنوێنێ، جەماوەرەکەش بەسەرسامی‌و ترسەوە تەماشای دەکەن.

بۆیە دەبینی بە خۆپەسندییەوە، بە جۆرە کەش‌و فشیکەوە روو لە مەحکوومەکەی بەردەستی هاوار دەکات: " ئامادە... تەمەشا چۆن بە شەلاخێك پێستت دەگرووم". ئەو هەڕەشەو گوڕەشانە، لە پێش هەموو یەکەمین جەزرەبەکاندا دەکران. بەڵام زۆر زەحمەت بوو پیاو باوەڕ بەوە بکات کە مرۆڤ بەو ڕادەیە مەسخ ببیّ‌و لە مرۆڤایەتی بکەویّ !.

کە یەکەمجار داخڵی نەخۆشخانە بووم، لە سەرەتاوە بە سەرنجەوە گوێم لەو چیرۆك‌و واریقاتانە دەگرت کە زیندانییەکان دەیانگێڕایەوەو کاتیان پیّ بەسەر دەبردو بێتاقەتی رۆژانی درێژی یەکهاوی سەرجێگەی نەخۆشییان پێدەڕەواندەوە. بەیانیان پزیشکەکان، قاوشەکان دەگەڕان، نەخۆشەکانیان بەسەر دەکردەوە، معایەنەیان دەکردن، ئەمە جۆرە دڵخۆشی‌و سوکناییەکی بە نەخۆشەکان دەبەخشی. دوای گەڕانی پزیشکەکان ئیدی کاتی فراڤین دەهات. کە گرینگترین رووداوی رۆژ بوو. هەڵبەتە جۆری ئەو خواردنەی بە نەخۆشەکان دەدرا، بە گوێرەی نەخۆشی نەخۆشەکان دەگۆڕا: هەندیّ لە نەخۆشەکان تەنیا نۆکاویان دەدرایە، هەندێکی تر تەنیا پاقلەمەنیان دەدرایە، هەندێکی دی تەنیا ساواریان دەدرایە... کە ئەمەیان مشتەری زۆر بوو. ئیدی زیندانییەکان بەرە بەرە قەڵەو دەبوون‌و ئیشتیایان دەکرایەوەو نەوسن دەبوون. ئەوانەی لە قۆناغی بوژانەوەو چاکبوونەوەدا بوون، یەکی پارچەیەك گۆشتی کوڵاوی گایان دەدانیّ. باشترین خواردن، خواردنی ئەو نەخۆشانە بوو کە تووشی ئێسکەرپوت بوو بوون کە بریتی بوو لە گۆشتی سوورەوەکراو بە پیازو تورو سەوزەواتەوەو هەندێجار پێکیّ شەرابیشیان لەگەڵیا دەدا... نانەکەش بە گوێرەی نەخۆشیەکە یان نانی سپی بوو یان نانی بۆر، بەڵام نانەکە لە هەموو حاڵێکا نانێکی هەلاّتەی پوختەو باش بوو. هەڵبەتە ئەم دیقەت‌و وردەکارییەی کە نەخۆشخانەکە، لە دابەشکردنی ژەمە خۆراکەکاندا پەیڕەوی دەکرد، مایەی پێکەنینی زیندانییەکان بوو: نەخۆشی وا هەبوو، ئیشتیای خواردنی نەبوو و بەحاڵ پروشەیەکی دەکرد و نەدەکرد، هی وا هەبوو زۆر نەوسن‌و چڵێس و زۆرخۆر بوو، هەندیّ لە نەخۆشەکان خواردنەکانیان دەگۆڕییەوە، هەڵبەتە ئەوانەی پارێزیان بۆ دانرابوو، تەنیا خواردنی سووکیان دەدرایە، ئەمانە دەچوون گۆشتەکانیان لەوانە دەکڕییەوە کە تووشی ئێسکەرپوت بووبوون،وشەرابی کواس یان بیرەی نەخۆشخانەکەیان لەوانە دەکڕییەوە کە ئیدارەی نەخۆشخانەکە شەرابی دەدانیّ. هی وا هەبوو بەشی دوو کەسی دەخوارد، هەم ژەمەکەی خۆی‌و هەم ژەمێکی تری دەکڕییەوە، چونکە هی وا هەبوو ژەمە خۆراکەکەی خۆی دەفرۆشتەوە. گۆشت گرانترین خواردن بوو، هەندێجار گرتکەگۆشتێك دەگەییە پێنج کۆبیکان. خۆ ئەگەر لە قاوشەکەی خۆماندا کەس نەبووایە بەشە خۆراکەکەی خۆی بفرۆشێتەوە، ئەوا چاودێرەکە بۆ قاوشی دووەم دەنێردرا بەڵکو فرۆشیارێك پەیدا بکات، خۆ ئەگەر لە قاوشی دووەمیشا کەسی دەست نەکەوتبا ئەوا دەچوو بۆ قاوشی سەربازەکان، یانی بۆ قاوشی، ئێمە گوتەنی "ئازادەکان". هەمیشە نەخۆشانێك هەبوو حەزیان دەکرد بەشە خۆراکی خۆ بفرۆشن. زیندانییەکان، بە شێوەیەکی گشتی هەژارو نەدار بوون، بەڵام ئەوانەی کە چەند عانەیەکیان بە خۆ شك دەبرد، دەیان نارد لە بازاڕ، کولیچەو کێك‌و شیرینەمەنی‌و نوقڵیان بۆ

بکرن. پاسەوانەکان، کە دەچوون بۆ بازاڕ بێ هیچ منەتێك یان بێ هیچ پاداشتو تەماحێك ئەو جۆرە پێویستیانەیان بۆ زیندانییەکان دەکڕی.

ناخۆشترن کات، کاتی دوای فراڤین بوو. هەندێ لە زیندانیەیکان، بە تایبەتی ئەوانەی هیچ کارێکیان نەبوو، وەختەکەیان بە خەوتن بەسەردەبرد، هەندێکی دی بە دەم گفتوگۆوە کاتیان بەسەر دەبرد، هەندێکی تر بەشەڕ دەهاتن، یان بە دەنگی بەرز واریقاتو حیکایەتیان بۆ یەکدی دەگێڕایەوە. خۆ ئەگەر نەخۆشی تازە نەهێنرابا، ئەوا بێتاقەتی بە جارێ زەیفی لێدەسەندن. هەرکە نەخۆشێکی تازەیان هێنابا، خێرا جموجۆڵ دەکەوتە قاوشەکەو خەڵکەکە دەکەوتنە ملەقوتێو سەرەتاتکێو مقۆ مقۆ بەرزدەبووەوە، بە تایبەتی ئەگەر نەخۆشەکە نەناس بوایەو نەخۆشەکانی تر نەیان ناسیبایە، هەموو بە کونجکاوی لێیان دەڕوانی و هەوڵیان دەدا بزانن ئەمە کێیە، لە کوێوە هاتووە، بۆچی کەوتووەتە زیندان. دیارە نەخۆشانی تازەو نەناس زیاتر مایەی سەرنجو فزوڵیەتی زیندانییەکان بوون، چونکە ئەوانە هەمیشە شتی تازەیان پێ بوو کە بۆ زیندانییەکانی بگێڕنەوە. هەڵبەتە ئەوانە باسی شتە تایبەتیەکانی خۆیانیان نەدەگێڕایەوە، ئەگەر بە خوایشتی خۆیان نەکەوتبانە باسی خۆیان، کەس لەو بارەیەوە پرسیاری لێنەدەکردن. بەڵکو زیاتر ئەمجۆرە پرسیارانەیان لێدەکرا: "لە کوێوە هاتووی؟ لەگەڵ کێدا هاتوویت؟ بە چ ڕێیەکدا هاتوویت؟ بۆ کوێ دەڕۆی؟" تاد.... هاوزیندانیەکانمان کاتێ گوێیان لە سەربهوردو واریقاتی تازە هاتووەکان دەبوو، بەسەرهاتەکانی خۆیان وەبیر دەهاتەوەو ئەوانیش دەکەوتنە گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتانەی کە لە ڕێگادا بەسەریان هاتبوو، بە تایبەتی باسی کاروانەکانو سەر قافڵەو چاودێرانو پاسەوانی کاروانەکانیان دەگێڕایەوە... هەندێجاریش دەمەو ئێوارانێکی درەنگ، زیندانییانی تازە جەڵدەخواردوویان دەهێنا. پێشتریش باسمکردووە کە ئەمانەو هاتنی ئەمانە زۆر کاری لە نەخۆشەکان دەکرد، دیارە هەموو رۆژێك لەو بابەتە خەڵکەیان نەدەهێنا. ئەگەر رۆژێك هیچ تاوانکارێکی تازەیان بۆ قاوشەکەمان نەهێنابا، هەستمان بە بێتاقەتیەکی زۆر دەکرد، ئیدی نەخۆشەکان مۆڕەیان لە یەکتر دەکرد، حەزیان نەدەکرد چارەی یەکدی بدینن، بگرە هەندێجار بە خۆڕایی‌و لە بێتاقەتیدا شەڕیان بە یەکدی دەفرۆشت. خۆ ئەگەر کەسێکی شێتیان بۆ موعایەنەی نوژداری هێنابا، زیندانییەکان بە جارێ خەنی دەبوون، ئەو زیندانییانەی کە سزای جەڵدەیان بۆ دەبڕایەوە، هەندێجار بەو ئومێدەی ببەخشرێن خۆیان لە شێتی دەدا، ئیدی فێڵەکەیان ئاشکرا دەبوو، یان خۆ بە خۆ ژێوان دەبوونەوە، دوای ئەوەی یەك دوو رۆژ، رەفتاری سەیرو شێتانەیان دەکرد، لە پڕ ئاقڵ دەبوونەوە، هێور دەبوونەوەو تاقەتیان لەو گەمەو نمایشە دەچوو و بە خۆیان داوایان دەکرد لە نەخۆشخانە مەرەخەسیان بکەن. ئیدی شێتە پەتەڕییەکەی دوێنێ لە پڕ دەبوو بە پیاوێکی ئاقڵو ئاغر. هەڵبەتە نە پزیشکەکانو نە نەخۆشەکان شتاقیان ئیرادیان لێنەدەگرتنو شتەکەیان لە روو نەدەدا. بەڵکو بە ڕێزەوە مەرەخەسنامەیان بۆ دەکراو بەڕێ دەکران. کەچی هەر دوای یەك دوو رۆژی دی، بە پشتی زامدارو خوێناوییەوە دەهاتنەوە بۆ نەخۆشخانەکە تا تیمار بکرێن. هەڵبەتە ئەم جۆرە حاڵەتانە زۆر کەم بوو... کارەساتی گەورە ئەوە بوو کە شێتی ڕاستەقینەیان دێنا، کە ئەم شێتانە بەدەم هاوارو گۆرانیو پێکەنینو

هەڵپەرکێوە وەژووردەکەوتن، لە هەوەڵەوە زیندانییەکان بە گەرمی پێشوازیان دەکردن‌و دەیانگوت: "ئەمە زۆر خۆشە.... مەزەی ڕابواردنە..." بەڵام دیمەنەکە زۆر خەمناك‌و دڵتەزێن بوو. کە چاوم بەو شتێتانە دەکەوت، بە خۆم نەدەوەستام‌و لە ناخی ناخمەوە دەهاڕوژام، دڵم دەگوشرا. بەڵام دوای دوو ڕۆژ، زیندانییەکان ئیدی بە تەواوەتی لە هات‌و هاوار، قاوقیژ، جرت‌و فرت،و هەڵبەزو دابەزو ئەداو ئەتواری یارۆی شێت بێزارو وەڕەز دەبوون، دەکەوتنە پرتەو بۆڵەو لە خوایان دەویست بەهەر نرخێ بووەو بە زووترین کات لە شەڕی ئەم میوانی ناوەختە ڕزگاربن. جارێکیان، پێموایە ساڵی سێیەمی حەپسییەکەم بوو، بۆ ماوەی سێ دانە هەفتە شێتێکیان لە قاوشەکەی ئێمەدا هێشتەوە، وامان لێهاتبوو، نەماندەزانی لە کوێ خۆمان وەشێرین. ئەوە حاڵمان بوو کەچی لە پڕ شێتی دووەمیشیان بۆ هێناین، هاتنی شێتی دووەم زۆری کار تێکردم.

لە ساڵی یەکەمی زیندانیەکەمدا، تۆ بڵێ مانگەکانی هەوەڵی ساڵی یەکەمی زیندانییەکەم، بەهار بوو، دەگەڵ کۆمەڵێك زیندانی دیکەدا، بۆ کارکردن ناردیانم بۆ کارخانەیەکی کەرپوچسازی، دەبوا کوورەکانی پاك بکەینەوەو ئامادە بکەین بۆ کاری هاوینە "م... کی"و "ب" ئەو بەیانیە بە عەریف "ئوستروسکی"یان، کە چاودێرو سەرپەرشتیارمان بوو، ناساندم. ئەمە پۆڵاندی بوو، تەمەنی نزیکەی شەست ساڵ دەبوو، کابرایەکی بەژن زراڤ باریك‌و بنێس‌و بە هەیئەت‌و بە سام بوو. زۆر دەمێ بوو لە سیبیریادا سەرباز بوو. "م....کی"و "ب"*(٣) خۆشیان دەویست‌و ڕێزیان دەگرت، هەرچەندە پیاوێکی خانەدان‌و ئەسڵزادەش نەبوو. ( لە یاخیەکانی ساڵی ١٨٣٠ بوو)، هەرکە دەستی بە تاڵ دەبوو، خێرا سەری بە سەر تەوراتەکەیدا دادەگرت‌و خەریکی خوێندنەوە دەبوو. لەگەڵیا کەوتمە قسە، هەستم کرد پیاوێکی ماقووڵ‌و میهرەبانە، حیکایەتبێژێکی دەماوەرو شیرین شێوازە، ئابڕوومەندو دڵپاکە. ئیدی تا دوو دانە ساڵ نەمبینییەوە، بەڵام بیستم کە گیراوەو لە ژێر تاقیق‌و لێکۆڵینەوە دایە، پاشان لە پڕ ڕۆژێك بۆ قاوشەکەی ئێمەیان هێنا: تومەز شێت بوو بوو. ئیدی بە هات‌و هاوارو قیژو هۆڕ، بە قاقای پێکەنین وەژوورکەوت‌و لە ناوەندی ژوورەکەدا کەوتە هەڵپەرکێ‌و جم‌و جۆڵی نابەجێ‌و ناپەسند، ئیدی سوڕو چەقەنەو سەمایەکی نایەوە، کە سەمای کامارنسکایای وەبیردێنایەوە... زیندانییەکان بە دیتنی هاوڕێکەیان خۆشحاڵ بوون. بەڵام من هەستم بە خەم‌و پەژارەیەکی زۆر کرد، نازانم بۆ! دوای سێ ڕۆژ، بە ڕادەیەك بێزاربووین نەماندەزانی چی بکەین: بەگژ هەموو کەسێکدا دەچوو، بە شەڕ دەهات، هاواری دەکرد، دەیقژاند، دەینالاند،و لە گەرمەی شەودا گۆرانی دەچڕی، پیاو قێزی لە قسە ناشیرین‌و بێتامەکانی دەبووەوە... لە کەس نەدەترسا... بە زۆر کۆت‌و زنجیریان کرد، بەڵام ئەمە سوودی نەبوو، وەزعمان باشتر نەبوو، بەو حاڵەشەوە شەڕی بە هەمووان دەفرۆشت. دوای سێ هەفتە هەموو خەڵکەکە بڕیاریاندا کە بچین لە سەرۆکی پزیشکان بپاڕێینەوە کە بۆ قاوشی دووەمی، کە ئەویش تایبەت بوو بە زیندانیان، بگوازێتەوە. بەڵام دوای دوو ڕۆژ، لەسەر داوای نەخۆشخانی قاوشی دووەم، دیسان بۆ قاوشەکەی ئێمەیان گێڕایەوە. ئیدی بوون بە دوو شێت، هەردووکیان شەڕانی‌و دەست وەشێن بوون، هەرقاوشەو دەیویست شێتەکەی خۆی بۆ قاوشەکەی دی بنێرێ، ئەنجام هەردوو قاوشەکە پێکهاتن لەسەر ئەوەی شێتەکانیان بگۆڕنەوە.

بەڵام شێتی دووەم لە یەکەم خراتر بوو. ئەنجام کاتێ کە شێتەکانیان لە نەخۆشخانە مەرەخەس کردو نازانم بۆ کوێیان رەوانە کردن، ئیدی نەخۆشەکان پشوویەکیان وەبەرهاتەوەو ئیسراحەتیان کرد....

جا ئەمە یادی شێتێکی پەتەڕی دیکەی وەبیرهێنامەوە، بەڕاستی شێتێکی سەیر بوو، ئێستاش لە بیرمە وەرز وەرزی هاوین بوو، رۆژێك نەخۆشێکی تازەیان بۆ قاوشەکەمان هێنا، زەلامێکی کەتەی ئازا دیاربوو. تەمەنی چل‌و پێنج ساڵێك دەبوو. سیمای خەمین‌و تاریك، دەموچاوی کونج‌و یەکپارچە جێ ئاوڵە بوو، چاوەکانی سوور دەتگوت گۆمی خوێنین. جێگایەکی تەنیشت منیان دایە، کابرایەك بوو هێدی‌و هێمن‌و بێوەی، هیچ قسەیەکی نە لەگەڵ من‌و نە لەگەڵ کەسی دیدا نەکرد، بە جۆرێ لە فکران ڕاچوو بوو، ئاگای لە کەس نەما بوو، لای ئێوارێ، لە پڕ سەری هەڵبڕی‌و بێ هیچ پێشەکییەك رووی دەمی کردە من‌و، وەکو یەکێك نهێنییەکی زۆر گەورە بدرکێنێ‌و ئاشکرا بکات، گوتی قەرارە سبەینێ دوو هەزار جەڵدەی لێبدەن، بەڵام خەمی نییە، چونکە "ج"ی کیژی کۆلۆنێل... بۆی تێکەوتووەو دەبەخشرێ. بە سەرسامی سەیرم کردو گوتم باوەڕ ناکەم خانمی ناڤبری با کیژی کۆلۆنێلیش بێ بتوانێ کاری وابکات، هێشتا بۆم روون نەبوو بووەوە کە یارۆ شێتە، چونکە وەکو نەخۆشی بەدەنی بۆ نەخۆشخانەکەیان هێنا بوو نەك وەکو نەخۆشی ئەقڵی. ئیدی لێم پرسی کە چ نەخۆشیەکیەتی، بەرسڤی دامەوە کە هیچی نیەو لە گوێزی ساغ ساغترەو بەخۆشی نازانێت بۆچی بۆ ئێرەیان ناردووە، تەنیا ئەوەندە دەزانێ کە کیژەکەی کۆلۆنێل کەوتووەتە داوی ئەشقی ئەوەوە. گوایە بە خەیاڵی خاوی، ئەم کیژە بەر لە دوو هەفتەیەك سەری بنکەی پاسەوانانی داوەو ئەمیش لە تەلبەندی زاندنەکەیەوە تەمەشای کردووە، ئیدی کیژە چاوی پێی دەکەوێ‌و، بە دڵی نا بە سەد دڵ ئاشقی دەبێت.و لەو ساتە بە دواوە سێ جاری دی، بە بیانووی جیاوازەوە سەری بنکەی پاسەوانان دەدات: جاری یەکەم بە بیانووی دیتنی براکەی، کە زابت خەفەر دەبێ، لەگەڵ باوکیا دێ. جاری دووەم بە بیانووی بەخشینەوەی خێرو سەدەقە بەسەر زیندانیەکاندا، دەگەڵ دایکیا دێ‌،و کە بە بەردەمی ئەمدا تێدەپەڕی بەچپە پێی دەڵێ خۆشی دەوێ‌و خەمی نەبێ لە زیندان دەری دەکات. هەر هەموو ئەم تورەهاتانەی بە تێرو تەسەلی بۆ گێڕامەوە، بێئەوەی هیچ بنج‌و بناوانێکی هەبێ، هەر هەمووی زادەی خەیاڵی پەریشانی خۆی بوو. ئیدی قەناعەتی تەواوی بە خۆی کردبوو کە عەفوو دەکرێ‌و بەردەبێت، زۆر بە دڵنیایی‌و ئاسوودەیی دەیگێڕایەوە کە چۆن ئەو کیژە گەنجە شێت‌و شەیدای بووە. هەڵبەتە ئەم چیرۆکە خەیاڵییە سەیرەی کە کیژێکی گەنجی خانەدان، بێت پیرە پیاوێکی نزیکەی پەنجا ساڵی، ناشیرین‌و نا حەزی کونجی خۆش بوێ، خۆی لە خۆیدا نیشانەی ڕادەی ئەو ترس‌و لەرزەیە کە سزایەکە خستوویەتی دڵی ئەم ئینسانە ترسنۆکەوە. دوور نیە بەڕاستی لە پەنجەرەکەوە کەسێکی دیتبێ‌،و لە ترسا لێی بووبێ بەو کیژەو ئیدی خەیاڵی خاوی ئەو سەربازە نەگبەت‌و بەلەنگازەی کە لەگینە رۆژێ لە رۆژان بیری لە خانمان نەکرد بێتەوە، یەکسەر ئەو چیرۆکەی دروست کردبێت‌و ئیدی وەکو خنکاو پەنای بۆ ئەو پووشە خەیاڵیە بردبێ. بە کڕی‌و کپی گوێم بۆ ڕادێراو پاشان حیکایەتەکەیم بۆ زیندانییەکانی دیکەش گێڕایەوە. بەڵام

کاتێ کە ئەوان لێی خڕبوونەوەو ویستیان بچنە بنج‌و بناوانی شتەکە، بێدەنگی لێکردو هیچ بەرسڤێکی نەدانەوە، ڕۆژی دوایی پزیشك هات‌و بە وردی معایەنەی کردو لەوە نەدەچوو هیچ نەخۆشیەکی هەبێت‌و بە خۆیشی دووپاتی دەکردەوە کە هیچ نەخۆشییەکی نییە، بۆیە یەکسەر دکتۆر بۆی نووسی عەیبی نییەو دەتوانێ لە نەخۆشخانە دەرچێت، ئیدی مەرەخەسیان کرد. پاش ئەوەی دکتۆرەکە ڕۆیی ئەوسا زانیمان لەسەر کارتەکەی نووسیوە عەیبی نییە، دەنا ئەگەر پێشتر بمانزانیبا لە دکتۆرمان دەپرسی کە چ نەخۆشیەکیەتی. ئیدی ئیدارە، بەبێ ئەوەی بڵێن چیەتی بۆ نەخۆشخانەیان فڕێکردبوو. دیارە ئەمە یەکێك بوو لە بێ موبالاتی‌و خەمساردیە گەورەکانی ئیدارە. هەڵبەتە ئەوانەی کە ئەمریان کردبوو بۆ نەخۆشخانە بنێردرێ، هەستیان بە شتێ کردبوو، بۆیە ویستبوویان ئەو بەسەزمانە بخرێتە ژێر چاودێرییەوە. بە هەرحاڵ دوای دوو ڕۆژان دەنێردرێت بۆ جەڵدە لێدان. هەڵبەتە زۆری پێ سەیر دەبێ، هەرچی دەکاو دەکۆشێ باوەڕ ناکات، تا دواساتیش قەناعەتی وابووە کە دەبەخشرێ‌و عەفووی بۆ وەردەگیرێت، کاتێ کە دەبرێتە بەردەم ریزی سەربازەکان دەست بەهات‌و هاوار دەکات، داوای کۆمەك دەکات. جەڵدەی خۆی دەخوات‌و ماشقەکەی فریای ناکەوێ ! ئەمجارە بۆ قاوشەکەی ئێمەیان نەهێنایەوە، چونکە جێگەی بە تاڵ نەبوو، بۆ قاوشەکەی تریان بردبوو. کە هەواڵم پرسی وتیان بە درێژایی هەشت دانە ڕۆژ، لە خەمینی‌و شەرمەزاریدا، قڕوقەپی کردووە، ورتەی لێوەی نەهاتووە، زاری لە زاری کەس نەگەڕاوە... کە زامەکانی پشتی سارێژ بووەتەوە، نازانم بۆ کوێندەریان ناردووە، ئیدی لەوە بە دواوە، هەرگیز نەمدیتەوە.

سەبارەت بە دەواو دەرمان، دەتوانم بڵێم، ئەگەر بە هەڵە نەچووبم، ئەوانەی کە نەخۆشیەکانیان سووك بوو، هەرگیز پەیڕەوی ئامۆژگارییەکانی دکتۆرەکانیان نەدەکرد، دەرمان‌و شرووبەکانیان نەدەخوارد، بەڵام ئەوانەی نەخۆشییەکانیان قورس بوو، حەزیان دەکرد چارەسەربکرێن ، بە ڕێك‌و پێکی دەرمان‌و شرووب‌و تۆزەکانیان دەخواردو بەکار دێنا. نەخۆشەکان زیاتر حەزیان لە چارەسەری دەرەکی وەکو حەجامات‌و خوێن بەردان‌و کەڵەشاخ‌و ئەم شتانە بوو و لەزەتیان لێدەبینی، تا ئەم ڕادەیە خەڵکی ڕەش‌و ڕووت باوەڕیان بەمجۆرە چارەسەرە میللیانە هەبوو. ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام‌و بەلامەوە سەیر بوو ئەمە بوو کە هەندێ لەو خەڵکانەی کە زۆر قارەمانانە، خۆیان لەبەر ئازاری لیس‌و شەلاخی قێزەون ڕادەگرت، لە کاتی حەجاماتێکی زۆر سادەدا لە تاوا لێوی خۆیان دەگەست‌و ئاخ‌و ئۆفیان لێ بەرز دەبووەوەو دەیان ناڵاند. ئیدی نازانم ئەمانە فێری ناز بووبوون یان نمایشیان دەکرد؟ پیاو ڕاست بڵێ، شێوازی حەجامات لە نەخۆشخانەکەی ئێمەدا، زۆریش بێ ئازار نەبوو، چونکە لە ڕۆژگارێکدا، کە کەس ئێستا بیری نایەت، ئامێری حەجاماتکێشییەکە، ئەو ئامێرەی کە پێستی نەخۆشەکەی پێ شەقارو توێ دەکرا، فەوتا بوو – ئیدی پەرستارەکە فەوتاندبووی یان هەر لە خۆیەوە ون بوو بوو– بۆیە دەبوایە لە جیاتی ئەو ئامێرە، نەشتەر بەکار ببرێت. بۆ هەر حەجاماتێك دەبوایە ١٢ شەقارو توێ بکرێتە پێستەکە. دیارە ئەم شەقارانە ئەگەر بە ئامێر بکرانایە زۆر ئێشیان نەدەبوو، چونکە ئامێرەکە دوازدە شفرەو دەمی هەبوو و پێستەکەی بە یەك کەڕەت‌و کوت‌وپڕ شەقار و توێ

دەکردو نەخۆش زۆر هەستی بە ئازار نەدەکرد. بەڵام نەشتەرەکە وا نەبوو، زۆر هێواش‌و خاوو بە ئازار بوو. بۆ نموونە ئەگەر نەخۆشێك پێویستی بە دە حەجامات بوایە، دەبوایە سەدو بیست نەشتەری یەك لە دوای یەکی لێدرابا. دیارە ئەمەش ئازارێکی زۆری لێدەکەوتەوە، من بە خۆم ئەمەم بەسەر هات، بەڕاستی یەجگار ناڕەحەت‌و ناخۆش بوو، بەڵام بەو ڕادەیەش نەبوو کە پیاو نەتوانێ بەرگەی بگرێت. بەڕاستی پیاو پێکەنینی بەو پیاوە گەورەو بەهێزانە دەهات کە بەو شێوەیە دەترسان‌و خۆیان سەغڵەت دەکرد. ڕێك لەو کەسە قارەمان‌و ورەبەرزانە دەچوون کە خۆیان لەبەر هەموو کارو ڕووداوێکی گەورە دەگرن، کەچی لە ماڵی خۆدا بە بچووکترین شت دەهاڕوژێن‌و لەسەر بچووکترین شت بەشەڕ دێن، بیانوو دەگرن و لە خواردن دەتۆرێن، نازدەکەن و دەیکەن بە شەڕو ئاژاوەیەك ئەوسەری دیار نەبێت‌و دۆو دۆشاو تێکەڵ دەکەن، بە هەموو شتێك ناشوکرن. جا بە هۆی هەڤژینی ناچارییەوە، ئەمجۆرە خوو و تەبیعەت‌و مجێزە لە زینداناو، لە نێو زیندانییاندا زۆرە.

ئیدی زیندانییەکان گاڵتەیان بەو جۆرە خەڵکە لە خۆبایی‌و ناشوکرو نازدارە دەکرد، یان جنێوبارانیان دەکرد، هەنگێ ئەویش لەنازو نوزو خوتەو بۆڵە دەکەوت‌و بێدەنگ دەبوو، وەکو ئەوەی چاوەڕوانی ئەو گاڵتەو جنێوانە بووبێ تا بێدەنگ ببێ. ئوستیانتسیف زۆری ڕق لەو ناسکە پیاوانە بوو، هەمیشە لە کەمینا بوو کە تەشەریان لێبدات‌و وایان لێبکات دەست لەو ئەداو ئەتوارە ژنانەیە هەڵگرن‌و تەحەمولیان هەبێت، ئیدی تەشەرو تەشەرکاری لێ بوو بوو بە نەخۆشی‌و بەبێ تەشەران هەڵی نەدەکرد. زۆرجار بە بێدەنگی لێی دەڕوانیت، ئەوجا بە کاوەخۆ، بە دەنگێکی هێدی‌و هێمن، بەوپەڕی قەناعەتەوە دەکەوتە ئامۆژگاری کردنت، هێندە بە جددی ئەو کارەی دەکرد لە تۆ وایە بۆ ئەوەیان لەوێ داناوە کە چاودێری‌و سەرپەرشتی زیندانییەکان بکات‌و زەبت‌و ڕەبتی قاوشەکە ڕابگرێت. زیندانییەکان بە پێکەنینەوە دەیانگوت:

– دەبێ خۆی لە هەموو کارێك هەڵبقورتێنێ!...

بەڵام زیندانییەکان خۆیان لێدەبوارد، چاوپۆشیان لێدەکردو نەدەهاتنە ئەو ئاستەی لەگەڵی بە شەڕبێن یان شەڕە جنێوی لەگەڵ بکەن، ئەوپەڕی ناو بەناو سووکە سوعبەتێکیان دەگەڵ دەکرد.

– ئازارەکەی لە کێشا نییە! باری سێ عارەبانە دەبێ!

– پیاو دەمی دەگەڵ ئەم کەرەدا شل دەبێ. ڕەنگ نیە نەشتەرێکی لێ بدەی، هاواری دەگاتە ئاسمان... ئاخر نەشتەرێك چییە،... نابێ کەمێك سەبری هەبێ! دوای گەرمی ساردی دێت....

– ئێ باشە ئێوە هەقتان چییە ؟

جارێکیان ئەو گفتوگۆیە ڕوو دەدات‌و، یەکێك لە زیندانییەکان لە پڕ قسەکەیان پێدەبڕێت‌و دەڵێت:

– بابە ئێوە نازانن، حەجامات هیچ نییە... من بەخۆم تاقیم کردووەتەوە... هیچ ئازارێك ناگاتە ئازاری گوێ ڕاکێشان، بە تایبەتی بۆ ماوەیەکی زۆر...

ئامادە بووان هەموو لە قاقای پێکەنین دەدەن.

– باشە گوێی خۆتیان ڕاکێشاوە ؟

– بەڵێ ڕایان کێشاوەو بە قەستی دەرهێنان ڕایانکێشاوە.

– ناشێ بە هۆی ئەمەوە گوێیەکانت وا درێژو قوت بووبن ؟.

ئەم زیندانیە کە نێوی شاپکین بوو، جووتێ گوێی درێژو قوتی هەبوون، کۆنە بەرەڵلایەکی بێکارەی، هێشتا گەنج بوو، کوڕێکی زرینگ‌و هێمن بوو، قسە نەرمێکی سوعبەتچی بوو، بەلاّم سوعبەتچییەکی جددی نەك بازاڕی، ئەمە جۆرە شەقڵێکی کۆمیدی بە چیرۆك‌و بەسەرهاتەکانی دەبەخشی‌و گوێگری دەهێنایە پێکەنین.

ئوستیانتسیف، هەڵدەستێتە سەر پێیان‌و بە توڕەیی لەسەر قسەکانی دەڕوات‌و دەڵێت:

– ئاخر من چۆن بزانم گوێیەکانت ڕاکێشراون هەی کەرپیاو؟

ئوستیانتسیف، بەرەو شاپکین چوو، هەرچەندە شاپکین ڕووی دەمی لە هەمووان بوو نەك لەو. بەلاّم شاپکین خۆی نەخستە ڕیزەی ئەوو هەر ئاوڕیشی لێنەدایەوە.

یەکێکیان لێی پرسی:

– باشە کێ گوێی ڕاکێشایت؟

– کێ ڕایکێشا ؟ سەرۆکی پۆلیس، هەڵبەتە بە هۆی دزی‌و وێڵگەردی‌و بەرەڵلاییەوە، کە گەییشتینە شاری (ك....) من‌و وێڵگەردێکی دیکە بووین بە نێوی یەفیم ( هەر ئەو ناوەی هەبوو، نازناو و ناوی شۆرەتی نەبوو ). لە ڕێگا، لە گوندی تولمینا، دامان بەسەر جووتیارێکداو توانیمان شتێك بدزین... بەڵێ گوندێك بەو ناوەوە هەیە. تولمینا... کە گەییشتینە شار، چاوێکمان بە دەوروبەری خۆماندا گێڕا، ئێ بەڵکو دەرفەت بێنین، دەستێ بوەشێنین‌و هەڵێین. پیاو لە گوندو دەشتا ئازادە، بەلاّم لە شارا وا نییە... لە سەرەتادا خۆمان بە باڕو خوارنگەیەکدا کرد... بەدەم کردنەوەی دەرگاکەوە چاوێکمان گێڕا... سەیرمان کرد کوڕێکی گەنج بەرەو ڕوومان دێت... پاڵتۆیەکی ئەڵمانی لەبەر بوو کە قۆڵەکانی لە ئاستی هەردوو ئانیشکییەوە دڕا بوون.... باسی زۆر شتمان کرد... ئەوجا گوتی:

– بەرگەتان پێیە*(٤) ؟

– نا... نەخێر پێمان نییە.

– ئێمەش پێمان نییە. من دوو هاوڕێی دیکەم لەگەڵدان، ئێمە سێ کەسین‌و لە خزمەتی جەنەڕاڵ (وەقواق*(٥)) داین... پارەمان پێ نەماوەو نازانم چی بکەین، دەتوانن قاپێ عەرەقمان بۆ بکڕن؟

وەلاّممان دایەوە:

– بەسەر چاو، هەر ئێوەو عارەق...

ئیدی پێکەوە دانیشتین‌و عارەقمان خواردەوە.ناونیشانی ماڵێکیان بۆ هەڵداین، دەمانتوانی دەستێکی باش بوەشێنین‌و دەستکەوتێکی زۆر وەدەست بێنین. ماڵەکە لە قەراخی شاردابوو. ماڵی پیاوێکی دەوڵەمەندی شار بوو. ئەم پیاوە بە تەنیا دەژیا. ئیدی بڕیارمان دا شەوێ بە پێنج قۆڵی بدەین بەسەر ئەو ماڵەدا، بەلاّم بۆ نەگبەتی هەر ئەو شەوە، هەر پێنجیان لە ماڵەکەدا دەستگیر کردین، بۆ بنکەی پۆلیسیان بردین‌و پاشان ڕادەستی سەرۆکی پۆلیس کراین. سەرۆکی پۆلیس گوتی:

– به خۆم لێکۆڵینەوەتان دەگەڵ دەکەم.

سەبیلەکەی دەرهێنا، کووپێ چایان بۆ هێنا. گەنجێکی قەڵەوی تۆکمەی سمێڵ بابڕی ریشن بوو. سەرۆکی پۆلیس لە بەردەممان دانیشت، جگە لە ئێمە کە پێنج کەس بووین، سێ دانە دزی دیکەشیان تۆزێ لەوە پێش بۆ بنکەی پۆلیس هێنابوو. برادەرینە دز عادەتێکی زۆر سەیری هەیە! خۆی لە گێلی دەدا، هیچ شتێك لە بیری خۆی نایەڵێتەوە، یانی بە تێڵاوە بەربیتە سەرو گوێلاکی ئیعتراف ناکاتو پێت دەڵێ هیچ شتێك نازانێ، هیچی لە بیر نەماوە، گشت شتەکانی لە بیر چووە. سەرۆکی پۆلیس ڕووی کردە منو تێی خوڕیم:

– تۆ کێی؟ نێوت چییە ؟

وەکو هەر دزێکی دی وەڵامم دایەوە کە:

– هیچ شتێکم لە بیر نییە پایەبەرز.

گوتی:

– بوەستە! دوایی قسەت لەگەڵ دەکەم! ئەم دەموچاوەم بەلاوە غەریب نییە .

ئەوجا بەوردی کەوتە تەمەشاکردنم. لە هیچ شوێنێك ئەم پیاوەم نەبینی بوو. هەنگێ ڕووی کردە دزێکی دی:

– تۆ ناوت چییە ؟

– نێوم پایە بەرز "بلەز غاردە".

– نێوت "بلەز غاردە"یە ؟

– وام پێدەڵێن پایەبەرز!

– باشە... تۆ نێوت "بلەز غاردە"یە.

ئەوسا ڕووی کردە دزێکی دی:

– ئەدی تۆ ؟

بەرسڤی دایەوە: – ناوم "لەگەڵی"دا پایەبەرز.

- ناوت ناوت، ناوت چییە ؟
- نێوم "لەگەڵی"دا پایە بەرز.
- کێ ئەم ناوەی لێناوی بەرەڵلا ؟
- پیاوچاکان پایەبەرز، دنیا پڕە لە پیاوی چاك! پایەبەرزتان، ئەم حەقیقەتە چاك دەزانن....
- باشە ئەو پیاو چاکانە کێن ؟
- پایە بەرز ببورە بیرم چوون !
- یانی هەر هەموو ئەو پیاوچاکانەت بیر چووە ؟
- بەڵێ پایەبەرز.
- باشە خۆ کەسو کارت هەبوون. دایكو باوکت هەبوون، ئەوانەت بیرن ؟
- هەڵبەتە هەمبوونە پایە بەرز. بەڵام ئەوانیشم بیرچوون!.... رەنگە کاتی خۆی کەسوکارم هەبووبن پایەبەرز.

- ئەدی تا ئێستا لە کویٚ ژیاوی ؟
- لە لێرەواران پایەبەرز !
- بەردەوام ؟
- بەردەوام.
- لە زستانیش دا ؟
- من نازانم زستان چیە پایە بەرز.
- باشە تۆ ناوت چیە ؟
- پایەبەرز من ناوم "تەور"ە.
- ئەدی تۆ ؟
- "هەڕە" پایەبەرز.
- ئەدی تۆ ؟
- پایەبەرز نێوم "دەرچۆو مەترسە".
- یانی کەستان هیچتان لە بیر نەماوە ؟
- هیچ

سەرۆکی پۆلیس لێرەدا هەستایە سەرپیٚو دەستی بە پێکەنین کرد. ئێمەش دوا بە دوای ئەو هەموو دەستمان بە پێکەنین کرد. بەڵام هەموو جاریٚ مەسەلەکە بەو ئاسانییە نەدەچووە سەر،و لەگێن بوو بە مست دەمو دانت بشکێنن. جا ئەو پۆلیسانە چەند بە قوەتن، چەند دەستیان گرانە!...

سەرۆکی پۆلیس گوتی:

– ئەمانە بەرن بۆ زیندان... پاشان پێیان ڕادەگەم.

ئەوجا لەسەری رۆیی:

– تۆ لێرە بمێنەوە! لەوێندەر دانیشە!....

تەمەشام کرد مێزێك لەوێندەرە، کاغەزو پەڕەمووچو مەرەکەبی لەسەر بوو. لە دڵی خۆدا گوتم: "دەیەویٚ چ بکات؟..."

لێی دووپات کردمەوە:

– لەسەر ئەم کورسییە دانیشە! پەڕەمووچەکە هەڵگرەو بنووسە !

توند لە گوێچکەم نەوی و کەوتە بادانی. وەکو چۆن شەیتانێك دەڕوانێتە قەشەیەك بەو ئاوایە روانیمە سەرۆكو پێمگوت:

– پایە بەرز من نووسین نازانم !

گوتی: – پێت دەڵێم بنووسە.

گوتم: بیکە بە خاتری خوا پایە بەرز، رەحمم پێدا بکە !

گوتی: بەکەیفی خۆت بنووسە! چی دەزانی ئەوە بنووسە!

ئیدی لە گوێم نەوی بوو و بە کەیفی خۆی ڕایدەکێشاو بای دەدا. باوەڕبکەن برادەران ئەگەر لەو کاتەدا لە نێوان سێ سەد جەڵدەو ئەو گوێ ڕاکێشانەدا سەرپشکیان بکردمایە، سێ سەد جەڵدەکەم هەڵدەبژارد. تەحا لەو ئازارە، دۆزەخم بە چاو بینی! گەنمگردی زۆری لێدەکردم: بنووسە!....

زیندانیەکان لە شاپکینیان پرسی:

– چما شێت بوو بوو ؟

شاپکین بەرسڤی دانەوە:

– نەخێر شێت نەبوو بوو برادەرینە! تومەز بە ماوەیەکی کەم لەوە پێش فەرمانبەرێکی بچووکی دەوڵەتی لە شاری توبولسکدا کاشێری سەر قاسە دەبێ، ئەم پیاوە پارەکەی دزی بوو و هەڵاتبوو! بەرێکەوت گوێچکەی وەکو گوێچکەی من درێژ دەبێت. ئیدی هەموو بنکە پۆلیسییەکان ئاگادار کرابوونەوە،و بۆ نەگبەتی هەموو وەسفەکانی یارۆی دز لە من دەچێت! ئیدی لە جیاتی ئەو گرتمی و گەنم گردی دایگرتمەوە: بنووسە!

تومەز بۆیە ئەم عەزابەی دەدام تا بۆی دەربکەوێ ئایا دەتوانم بنووسم و دەست خەتم چۆنە...

یەکێك لە زیندانیەکان هاواری کرد:

– هەی فێڵباز! عەزیەتی دایت ؟

– هەر مەپرسە، با بیرم نەکەوێتەوە.

زیندانیەکان لە قاقای پێکەنینیان دا. یەکێکیان پرسی:

– ئێ، نووسیت ؟

– نووسینی چی؟ پەڕەمووچەکەم خستە سەر کاغەزەکەو خوابەختەکی ڕامکێشاو هیچ دەرنەچوو، ئەنجام وازی لێهێنام. یەك دەرزەن زللەی مزری بە بنا گوێدا کێشام و ئەوسا ڕەوانەی زیندانی کردم.

– باشە بەڕاست نووسین دەزانی ؟

– بەڵێ ئەوسا دەمزانی. ئەدی مەعنای چی؟ بەڵام هەرکە قەڵەم داهات، ئیدی بەتەواوەتی لە بیرم چووەوە!...

ئیدی بەو جۆرە حیکایەت و قسە هەلەق و مەلەقانە ڕۆژانی درێژو بێ کۆتاییمان بەسەر دەبرد! چ ڕۆژگارێکی ناخۆش و ناڕەحەت بوو! چ بێزارییەکی کوشندە بوو! ڕۆژگار هێندە درێژ بوو، هێندە یەکهاوی و ناڕەحەت بوو هەر نە دەبڕایەوە! هەموو ڕۆژەکانی کۆپی یەکدی بوون، بە موو لێکدی جیاواز نەبوون! خۆزیا بەلای کەمەوە کتێبێکم لە لادەبوو! وێڕای ئەوەش زۆرجار بۆ نەخۆشخانە دەچووم، بە تایبەتی لە سەرەتای زیندانییەکەمدا، ئیدی یا بۆ نەخۆشی دەچووم یان بۆ ئیسراحەت و هەوا گۆڕین. ژیانی زیندان یەجگار سەخت و دژوار بوو، زۆر لە ژیانی نەخۆشخانە دژوارترو پڕ ئازارتر بوو، نەخاسمە لە ڕووی دەروونییەوە. لە زینداندا هەمیشە ڕووبەڕووی بوغزو دژمنایەتی و شەڕفرۆشی ئەو زیندانییانە دەبوومەوە کە بەدیتنی ئێمەی خانەدان و ئەشراف قەڵس دەبوون.... هەمیشە ئەو سیما بوغزن و ڕکوونی و هەڕەشە ئامێزانەم

دەبینی. بەڵام لە نەخۆشخانەدا، بەلای کەمەوە هاوڕێی یەکسان بووین. هەڵبەتە ئێوارانی درەنگو سەرەتای شەو ناخۆشترین کاتمان بوو. هەموومان زوو دەچووینە ناو جێگاوە... چرایەکی کزی بە دووکەڵ، لەوسەر قاوشەکە، لە لای دەرگاکەوە کزکز دەسووتاو ئێمەش لە شوێنی خۆمان، لە تاریکییەکی ئەونگوستە چاودا نقوم بووبووین. هەوای قاوشەکە، تا بڵێی پیس بوو، پیاو هەناسەی تەنگ دەبوو. هەندێ لە نەخۆشەکان خەویان لێنەدەکەوت، خەویان دەزڕا، هەڵدەستان، بەسەعات لەسەر جێگاکانی خۆ دادەنیشتنو سەریان لە نێو دەستیان دەناو لە تۆ وایە لە دەریای فکران نقووم بوون. ئیدی منیش کردبووم بە عادەت، بە سەعاتان تەمەشام دەکردنو بۆ ئەوەی وەختەکە بەسەربەرم، مەزەنەم لێدەدا تا بزانم بیر لە چی دەکەنەوە، هەندێجاریش دەستم بە خەو بینین دەکرد، خەو بە ڕابردووەوە، وردە شتی وام وەبیر دەهاتەوە، ئەگەر لە وەزعو حاڵو شوێنێکی دیدا بوایەم، هەرگیز نە بیرم لێدەکردنەوەو نە بە بیرم دەهاتنەوەو نە ئەو کارەیان تێدەکردم وەکو ئێستا تێی دەکردم. خەوم بە ئایندەوە دەبینی، بیرم لە ئاینده دەکردەوە، لە خۆم دەپرسی: "کەی لە زیندان دەردەچم؟ کە دەرچووم بۆ کوێ دەڕۆم؟ هەنگێ چیم دێتە ڕێ ؟ ئایا بۆ زێدو زاگەی خۆم دەگەڕێمەوە ؟...." ئیدی هەندێجار بەدەم بیر کردنەوەوە، تروسکەیەکی ئومێدو هیوام دەکەوتە دڵو دەروون. جاری وا هەبوو بۆ ئەوەی خەوم لێ بکەوێ، دەکەوتمە ژمێرەکاری: یەك، دوو، سێ...هتد. هەندێجار دەگەییشتمە سێ هەزارو خەوم لێنەدەکەوت! لە پڕ یەکێك بە ناڕەحەتی لەسەر جێگاکەی گینگڵ دەدات، سەیردەکەم ئوستیانتسیفی بەلەنگازە، بەدەم کۆکە کۆك و لرخەلرخی سینەی زامدارییەوە دەناڵێنێو لە بن لێوانەوە دەپرتێنێ: "خودایا من گوناحکارم!" لەو شەوە تاریکەدا دەنگی کزو لاوازو نەخۆشی ئەو بەلەنگازە، ترسو لەرزێکی یەجگار بە سامی دەخستە دڵی گوێدێرەوە! چەند نەخۆشێکی دی لە سووچێکی دیدا، هێشتا خەویان لێنەکەوتووە، لەسەر جێگاکانی خۆیانەوە، بە پاڵکەوتنەوە. بە چپە یەکدی دەدوێنن. یەکێکیان باسی ڕابردووی خۆی دەکات، شتی زۆر کۆن دەگێڕێتەوە، باسی ئاوارەیی خۆی، منداڵەکانی و ژنەکەی، خووخدەی کۆنی خۆی دەکات. پیاو کە گوێی لە دەنگی دەبێت، هەست دەکات، هەموو ئەو شتانە ڕۆیی و جارێکی دی ناگەڕێنەوە،و ڕۆژێ لە ڕۆژان پێیان ناگاتەوەو پێی ناگەنەوە. زیندانییەکی دی بە بێتاقەتی گوێی لێدەگرێت. چپەکانیان هێواش، کز، یەکهاوییە، لە خوڕەی ئاوێکی دوورە دەست، زۆر دوور، دەچێت.

لە بیرمە، جارێکیان، لە شەوێکی درێژی بێ کۆتایی زستاندا، گوێم لە چیرۆکێکی واهی بوو، هەوەڵجار وامزانی خەونێکەو خاوەنەکەی بە دەم کابوسێکەوە دەیگێڕێتەوە، خەونێك کە خاوەنەکەی بە دەم تاوە دەیبینی، بەدەم وڕینەوە....

<u>ژێدەر:</u>

***١- باسی سزاو ئەنجامدەرانی... گشت ئەوەی دەربارەی ئەشکەنجەو سزای بەدەنی دەیگێڕمەوە، لە زەمانی مندا هەبووە. بەڵام وەکو بیستوومە، گوایە ئێستا هەموو شتێك گۆڕاوەو بەردەوامیش گۆڕانی بەسەرادێت ( ئەم پەراوێزە دۆستۆیفسکی نووسیویەتی ).***

***٢- مارکیزە برنفلییە: مارکیزە مارین مادلین دی برنفلییەیە کە بابیو براکانیو خزمەکانی تری کوشتن بۆ ئەوەی دەست بەسەر میراتەکانیاندا بگرێت. ١٦٧٦،***

***٣- "م... کی، ب" میریکیو بوگوسلافسکی بوون کە لە شۆڕشگێڕانی پۆلاندی بوون.***

***٤- بەرگەتان پێیە: یانی پەساپۆرتتان هەیە.***

***٥- جەنەراڵ وەقواق: یانی لە لێرەواردان کە جێگەی تەیری وەقواقە، واتە ئەو دوو برادەرەی تریشی دزو وێڵگەڕن ( ئەم پەراوێزە هی دۆستۆیفسکی خۆیەتی ).***

((١٥))

## مێردەکەی ئاکولکا

شەوێکی درەنگ، دوای سەعات یازدە، ماوەیەك بوو خەوتبووم، لە پڕ لە خەو ڕاپەڕیم. تیشکی کزی چراکەی لای دەرگاکە، بە ئاستەم هۆڵەکەی رووناك دەکردەوە... زۆربەی هەرە زۆری نەخۆشەکان، تەنانەت ئوستیانتسیف*(١)-ش نووستبوون. لەخامۆشی شەوەکەدا گوێم لە دەنگی هەناسەی سوارو پرخەپرخی دژواری دەبوو. دەنگی قورسی پێیان لە قاوشەکەدا دەنگی دەدایەوە، دەنگی پێی دەورێی پاسەوانەکان بوو کە بەرە بەرە لە قاوشەکە نزیك دەبوونەوە. دەنگی قۆناغە تفەنگ هاتە گوێ کە بەر ئەرزەکە کەوت. دەرگا کرایەوە، عەریفەکە، بە ئەسپایی وەژوورکەوت، نەخۆشەکانی ژمارد، پاش دەققەیەك دیسان دەرگا داخرایەوە. حەسحەسێکی دی هاتە جێی. دەوریەکە رۆییو دیسان بێدەنگی باڵی بەسەرا کێشاین. هەنگێ سەرنجم دا، دیتم بە مەودایەکی کەم لەولای منەوە دوو زیندانی نەخەوتوونو خەریکی چپە دوون. هەندێجار وا رێکدەکەوێ کە دوو زیندانی تەنیشت یەکتر بە هەفتەو بگرە بە مانگ زاریان لە زاری یەکدی ناگەڕێ، کەچی لە پڕو لە نیوە شەوێکی درەنگو خامۆشدا، یەك دەگرنو باسی خۆیان بۆ

یەکتری دەکەن. لەوە دەچوو ئەم دوو زیندانییە دەمێ بێ قسە بۆ یەکتر بکەن. من لە سەرەتای گفتوگۆیەکەیان ئاگادار نەبووم‌و هیچی لێ حاڵی نەبووم. بەڵام گوێم هەڵخست، بەرەبەرە گوێم بە چپەدووەکەیان ڕاهات‌و سەرەداوی چیرۆکەکەم دەست کەوت‌و تا کۆتایی گوێم لێیان گرت. خەوم زڕا بوو، ئەگەر گوێم لەوان نەگرتبا چیم کردبایە ؟... یەکێك لەو دووانە لەسەر جێگاکەی شانی دا دابوو، سەری لە هاوڕێکەی هێنابووە پێشێ‌و بە ئاوو تاو، بە گەرمی باسی چیرۆکی ژیانی خۆی بۆ هاوڕێکەی دەکرد. دیار بوو ناخی هاتبووە کوڵ و جۆش و حەزی دەکرد بەتاڵی بکاتەوە.بەڵام هاورێکەی، خەمین‌و بێ حەواس لەسەر جێگاکەی رۆنیشتبوو، هەردوو لاقی لێ بڵاوکردبووەوەو ناوبەناو بە چەند وشەیەکی کەم لایەنگری یان هاوسۆزی‌و هاوخەمی خۆی بۆ قسەکانی دەردەبڕی. هەموو جارێکیش تۆزێ بڕنووتی لە قوتویەکی تایبەتی دەردێناو هەڵی دەمژی. ئەم پیاوە زیندانییەکی سوپایی سەر بە سەربازگەی تەمێکاری بوو. نێوی چیریڤین بوو، پیاوێکی خۆ پەسندی، گرژو مۆنی، منجڕی قسە ڕەقی کەودەن بوو، بەڵام هاوڕێکەی، کە چیرۆکەکەی خۆی بۆ دەگێڕایەوە، زیندانییەکی سڤیل بوو بە نێوی شیشکوف، تەمەنی سی ساڵێك دەبوو، تا ئەو کاتە هیچ بایەخێکم پێنەدا بوو، بە درێژایی ماوەی زیندانییەکەم سەرنجی ڕانەکێشابووم، چونکە پیاوێکی کاڵفام‌و بێ ئاوەزو سەرکێش بوو. هەندێجار دۆش دادەما، گرژو مۆن، توڕەو تڕۆو شەڕانی بە هەفتە ورتەی لێوە نەدەهات، کەچی لە پڕ، بەبێ هیچ ئەنگێزەیەکی دیارو ئاشکرا، خۆی لە شتێك هەڵدەقورتاند، بەرەڵلا دەبوو، پەتی دەپچڕی‌و لەسەر بچووکترین شت هەراو فەرتەنەیەکی دەنایەوە ئەوسەری دیار نەبێ، ئیستۆپی چەناگەی دەپچڕاو خۆیشی نەیدەزانی چ دەڵێت، لەم قاوشەوە دەچوو بۆ ئەو قاوش، لە پاشملەی ئەم‌و ئەوی دەگوت، دوو زمانی دەکرد، جنێوی دەدا، بە تەواوەتی لە تایم دەردەچوو، تا تێرو پڕیان تێ هەڵنەدابا، ئۆقرەی نەدەگرت‌و بێدەنگ نەدەبوو، کە تێیان هەڵدەدا بۆ خۆی ئیسراحەتی دەکردو دەمی لێك دەنا. جا چونکە پیاوێکی خوێڕی‌و نامەردو ترسنۆك بوو، زیندانییەکان روویان نەدەدایەو بە سووکی تەمەشایان دەکرد. پیاوێکی کورتە باڵای لاوازی، چاو زەقی، نیگا نەسرەوتی، خەواڵووی، گەوجانە بوو. کە باسی شتێکی کردبا، لە هەوەڵەوە زۆر بە گەرمی دەستی پێدەکردو بەدەم قسەوە دەستەکانی دەجوڵاندو دوای تۆزێك لە ناکاودا لە قسە دەکەوت یان دەچووە سەر بابەتێکی ترو بەپێ خاوسی بەناو دەکەوت‌و بابەتەکەی هەوەڵی هەر لە بیر نەدەما!.. شیشکوف پیاوێکی شەڕانی بوو، کەچی کە دەکەوتە گلەیی لە ڕەقیبەکەی زۆر بە سۆزەوە قسەی دەکردو چیوای نەدەما بگری. "بالالایکا"ژەنێکی باش بوو، زۆر حەزی لەو ئامێرە دەکرد، رۆژانی جەژن سەمای دەکرد، خۆ ئەگەر یەکێك داوای سەمای لێکردبا یان هانی دابا، سەمایەکی زۆر باش‌و جوانی دەکرد... ( زۆر بە ئاسانی هاندەدرا، پیاو دەیتوانی بۆ هەر کارێکی هانبدات، نەك لەبەر ئەوەی پیاوێکی خۆشباوەڕو گوێڕایەڵ بوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی حەزی دەکرد دۆست‌و هاوڕێی هەبن، دڵی رادەگرتن ).

لە سەرەتاوە سەرم لە چیرۆکەکەی شیشکۆف دەرنەدەکرد. نەمدەزانی باسی چ دەکات. وام هەست دەکرد وەکو هەمیشە لە ئەسڵی بابەتەکە دەرچووەو بۆ خۆی بە ناوکەوتووە. لەوە دەچوو

هەستی بە بێ موبالاتی و گوێ نەگرتنەکەی چیریڤین کردبێ، بەڵام هەستم دەکرد نایەوێ گوێ بەو هەڵویستەی چیریڤین بدات یان بە هەندێ بگرێ و تووڕە ببێ.

بۆیە لەسەر قسەکەی خۆی بەردەوام بوو و گوتی:

– ... کە دەچوو بۆ بازاڕ هەموو خەڵکی لەبەری هەڵدەستان، دەستیان بۆ بە سینگەوە دەگرت... کابرایەك بوو زۆر دەوڵەمەند، فرە دەستڕۆ!....

– گوتت، مامەڵەچی و بازرگان بوو ؟

– بەڵێ، بازرگان بوو! پیشەوەران لەلای ئێمە هەژارن: ئەوپەڕی نەدارن. وڵاتی ئێمە زۆر هەژارە. ژنان دەبوو ماوەیەکی زۆر بڕۆن تا لە ڕوباران ئاو بێنن و باخچەکانیان ئاو بدەن، ساڵ دوازدە مانگە هیلاك و ماندوو بوون، کە پاییزیش دەهات ئەوەندەیان کەلەرم نەدەبوو شۆربایەکی بە ئیسراحەت لێبنەن. ئیدی هەژاری و دەستکورتی تەواوەتی بوو. بەڵام وەکو گوتم ئەو پیاوە دەوڵەمەند بوو، مەزرایەکی گەورەی هەبوو، سێ کرێکاری گرتبوو و کاریان لەسەر دەکرد، چەند پورەمێش هەنگوینی هەبوو و هەنگوینەکەی دەفرۆشت، بازرگانی مەڕو ماڵاتیشی دەکرد... بەکورتی خەڵکەکە زۆر حورمەت و ڕێزیان دەگرت. پیر بوو، سەری پاك سپی بوو بوو. تەمەنی هەفتا ساڵ دەبوو. جەستەی، باری قورسی ئەو هەموو تەمەنەی بۆ هەڵنەدەگیرا. فەروەکەی بەری لە پێستی ڕێوی بوو، کە بە فەروەکەیەوە دەچوو بۆ بازاڕ، خەڵکەکە لە بەری هەڵدەستان و دەیانگوت:

– ڕۆژ باش، هاپۆ "ئەنگودیم تروفیمیچ"

– ڕۆژ باش، چۆنی ؟

ڕێزی هەموو کەسێکی دەگرت، کەسی نەدەبوغزاند.

– خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ ئەنگودیم تروفیمیچ!

– حاڵ و ئەحواڵت چۆنە ؟

– باشە، بە شەڕە شەق، نانێکی مەژی و مەمر پەیدا دەکەین. تا واش بین هەر باشە ئەدی تۆ چۆنی ئەنگودیم تروفیمیچ؟

– وا بۆ گوناحان دەژین... بووین بە بار بەسەر ئەرزەوە.

– خوا تەمەن درێژت بکات ئەنگودیم تروفیمیچ.

پیاوێکی میرەبان و بە ئەدەب بوو. قسەکانی هەموو پەندو ئامۆژگاری بوون. هەر وشەیەکی ڕۆبلێکی دەهێنا. خوێنەوارێکی زۆر باش بوو، هەمیشە کتێبی پیرۆزی دەخوێندەوە... هەندێ جار پیرەژنەکەی هاوسەری گاز دەکردو ودەیگوت:

– گوێ بگرە ئافرەت! با بۆتی شرۆڤە بکەم...

ئەوسا دەکەوتە شرۆڤەی ئایەتەکان. ئەگەر بڵێی ماریا ستیبانوفنا پیرش نەبوو، ئەمە ژنی دووەمی بوو، بۆسکوزا هێنابووی، چونکە ژنی یەکەمی نەزۆك بوو. مارستیبانوفنا دوو کوڕی هەبوون هێشتا بچووك بوون، کوڕی دووەمی کە "فاسیا"ی نێو بوو، وەختێ لە دایك بوو کە بابی نزیکەی شەست ساڵان بوو، "ئاکولکا"ی کیژیان کە نۆبەرەیان بوو، هەژدە ساڵان بوو.

چیریڤین لە شیشکۆڤ هاوڕێی پرسی:

- یانی ژنەکەی تۆ ؟

- سەبرکە. هەوەڵجار فیلکامارۆزۆف هات‌و کردی بە بۆڵەبۆڵ‌و هەراو زەنا، بە "ئەنگودیم"ی گوت:

- چوار سەد رۆبڵەکەم بدەوە! من کرێگرتەی تۆ نیم، ئاوا ئەمرم بەسەردا بکەی، نامەوێ شەریکایەتی تۆ بکەم‌و، ئاکولکای کچیشت ناخوازم ! نە دایکم هەیەو نە باوك‌و هەرچیم هەیەو نیە دەیدەم بە مەشرووب‌و دەیخۆمەوە، کە پارەشم نەما ئیدی دەچمە ریزی سوپاوەو دوای دە ساڵێك بە پلەی فیلدمارشاڵ بۆ ئێرە دێمەوە.

ئەنگۆدیم، هەموو پارەکەی دایەوە، هەرچییەکی لەلا بوو بۆیگێڕایەوە.ئەنگودیم لەگەڵ بابی ئەودا شەریك بوو.هەموو پارەکەی بۆ گێڕایەوەو گوتی:

- کوڕم ئاگات لە خۆ بێ، ئەم بایە لەم کونەوە بێ، ئاقیبەت خێر نابی.

فیلکا بەرسڤی دایەوە:

- ئاقیبەت خێر بم یان ئاقیبەت شەڕ، ئەمە پەیوەندی بە تۆوە نیە، خەڵەفاوی ریش سپی. لە عەمراتم چرووك‌و پوولەکی وەکو تۆم نەدیتووە! دەتەوێ فەروەیەك بە چوار کوبیکان بکڕی! عانە عانە کۆی دەکەیتەوەو دەیخەیتە سەر یەك، هەرچی گەنوگوی سەر ئەرز هەیە کۆی دەکەیتەوە تا پارەی پێ پەیدا بکەی! من ژیانی وام ناوێ، تف لە ژیانی وادەکەم! مەگەر شەیتان بزانێ تۆ بۆچی پارە کۆ دەکەیتەوە! بەڵام من شتی وا ناکەم، بۆ خۆم دەژیم! ئەوەش بزانە کە ئاکولکای کیژت ناخوازم! ئەوەندەم بەسە کە لەگەڵی نووستووم‌و کردوومە بە ژن...

ئەنگودیم کە لە حەژمەتاندا دەلەرزی گوتی:

- چۆن زات دەکەی پیاوێکی ئابڕوومەندو کیژەکەی لەکەدار بکەی ؟ ئاخر کەی لەگەڵیا نووستوویت هەی توخمە سەگی بەزی مار؟ ( فیلکا پاشان بەخۆی ئەوەی گێڕایەوە ).

فیلکا بە یارۆی پیرەمێری گوت:

- نەك هەر خۆم نایخوازم، بەڵکو تا بۆم بکرێ نایەڵم کەسی تریش بیخوازێت، تەنانەت "میکیتا گریگوریچ"ش نەیخوازێت، چونکە ئابڕووی تکاوەو ناوی زڕاوە! لە پایزی ڕابردووەوە من لەگەڵیا رادەبوێرم. بەڵام هەرگیز نایخوازم، ئەگەر هەموو موڵکی دنیاشم بدەیتێ نایخوازم!...

ئیدی ئەو کوڕە بە کەیفی خۆی رایدەبوارد. دەیخواردەوەو خۆی دەنواند! شار هەموو لێی بێزارو بێتاقەت بوو. چونکە پارەیەکی زۆری هەبوو دۆست‌و ئاشنای دنیای لە دەور خڕ بوو بوونەوە. بە درێژایی سێ دانە مانگی بەردەوام بەڕاست‌و بە چەپدا پارەی تەخشان‌و پەخشان دەکرد،‌و دەستی نەدەگرتەوە، تا دوا قرۆشی تەواو کرد. بەدەم پێکەنینەوە دەیگوت: کە ئەم پارەیەم تەواو کرد، هەنگێ ماڵەکەم‌و دارو نەدارم دەفرۆشم، کە ئەویشم تەواو کرد ئیدی یان دەچمە ریزی سوپا، یان بۆ خۆ بەرەڵلا دەبم‌و دەست بە دزی‌و جەردەیی دەکەم". لە بەیانیەوە تا ئێوارێ لەیەکبینە دەیخواردەوە، بە سواری عەرەبانەیەکی دوو ئەسپەی زەنگوڵەدار دەگەڕاو دەهات‌و چونکە "توربا"ژەنێکی باش بوو، کیژان رێیان پێدەگرت‌و حەزیان لێدەکرد...

چیریڤین لە هاوڕێکەی پرسی:

– باشە راستی دەکرد کە دەگەڵ ئارکولکادا خەوتبوو؟

– ڕاوەستە با بۆتی بگێڕمەوە! باوکم تازە مردبوو، ژیانمان زۆر خراپ بوو. دایکم ئەو کاتانە لە ماڵی ئەنگودیم کاری دەکرد، کێك‌و نانی زەنجەبیل‌و ئەو شتانەی بۆ دروست دەکردن بۆ فرۆتن. ئیدی مەڕی‌و مەمر بەوە دەژیاین. بەڵام بەوەشەوە ژیانمان دژوارو ناڕەحەت بوو. پارچە زەوییەکی کشتوکاڵیمان لەوپەڕی لێرەوارەکەدا هەبوو، دەمانکرد بە گەنم. بەڵام کە بابم مرد، فرۆشتمان‌و کەوتمە ڕابواردن‌و عەیش‌و نۆش، ئیدی ئەگەر دایکم پارەی نەدابامیٚ، بە شەق تێی بەردەبووم‌و بە تۆبزی لێم دەسەند...

– ئەمە کارێکی خراپە، تاوانە، تاوانێکی گەورەیە مرۆڤ لە دایکی خۆی بدات!....

– ئاخر هەندێجار لە بەیانییەوە تا شەویٚ دەمخواردەوەو مەستی مەست بووم. خانوویەکی خراپۆکەی خۆمان هەبوو، راستە داڕزاو و داڕوخاو بوو، بەڵام هەر باش بوو موڵکی خۆمان بوو. ئیدی لە برسا لاکەی سەرمان دەهات... جاری وا هەبوو بە هەفتەو بە دە رۆژ، زەوادمان لە ماڵ نەبوو. خوتەو بۆڵەو پرتاندن‌و گەوجە گەوجی پیرەژنەکەی دایکیشم لەولاوە بوەستیٚ... بەڵام من گوێم نەدەدایە... ئیدی چار ناچار خووم دایە فیلکاماروزوف. شەوو رۆژ پێکەوە بووین. هەر بێتاقەت بوایە دەیگوت:

– تۆ گیتارم بۆ لێبدە، منیش پاڵی لێدەدەمەوەو پارەت بۆ فڕیٚ دەدەم، چونکە من پیاوێکی دەوڵەمەندم.

ئیدی هەر جارەو داوایەکی تازەی دەکرد، بەڵام قەت دەستی بۆ دزی‌و ماڵی دزی نەدەبرد، دەیگوت:

– من دزو جەردە نیم! من پیاوێکی ئابڕوومەندم !

رۆژێك پێی گوتم:

– با بچین دەرگاکەی ماڵی ئاکولکا لە قیڕبگرین*(٢)، چونکە حەزناکەم شوو بە میکیتا گریگوریچ بکات! من ئێستا ئەمەم لە هەموو کاتێکی دی مەبەست ترە...

بابی ئاکولکا، دەمیٚ بوو دەیویست کیژەکەی بدات بە میکیتا گریگوریچ. گریگوریچ پیاوێکی زۆر پیر بوو، ژنەکەی مردبوو، عەینەکی لە چاو دەکرد، کاری بازرگانی دەکرد... کە ئەو واتەواتەی دەربارەی ئاکولکا بەر گویٚ کەوتەوە، بە باوکی گوت:

– ئەوە بۆ من دەبیٚ بە عەیبەیەکی گەورە ئەنگودیم تروفیمیچ. ئەمە جگە لەوەی تەمەنم بەسەر چووەو کەڵکی ژنهێنام پێوە نەماوە.

بە هەرحاڵ قیڕمان لە دەرگاکەی ماڵی ئاکولکا هەڵسوو. ئاکولکایان لە ماڵەوە حەپس کرد، هێندەیان لێدا خەریك بوو دەمرد. ماریاستیبانوفنای دایکی هاواری دەکرد: "بەداخی ئەم ریسواییەوە دەمرم." بابە پیرەکەی دەیگوت: "ئەگەر سەردەم سەردەمی دەرەبەگایەتی دەبوو، بۆم هەبوو پارچە پارچەی بکەم، بەڵام دەڵێی چی، زەمان گۆڕاوەو رۆژ رۆژی گەندەڵی‌و هەرچی‌و پەرچیانە".

دراوسێکان هەندێجار لەم سەری شەقامەکەوە تا ئەوسەری شەقامەکە گوێیان لە هاوارو فیغانی ئاکولکا دەبوو. کەس و کارەکەی لە بەیانییەوە تا ئێوارێ ئەشکەنجەیان دەداو دارکاریان دەکرد. "فیلکا"ش لە بازاڕداو لە نێو هەموو خەڵکیدا دەیگوت:

– ئەم ئاکولکایە کیژی باشە، بەڕاستی ماڵی ڕابواردنە!... چاك پۆرتم شکاندن، تا ماون من لە بیر ناکەن!

ڕۆژێ تووشی ئاکولکا بووم کە دوو سەتڵی پێ بوو و دەچوو لە ڕووبار ئاو بێنێ، بانگم لێکردو گوتم:

– ڕۆژ باش ئاکولیناکودیموفنا! سڵاو لە پاکیزەییەت! پێم بێژە لەگەڵ کێدا دەژی و کێ دەنکتەو کێ پارەت دەداتێ وا ناز بەسەر ئەرزا دەکەی ؟ من ئەوەندەم گوت و ئەویش هیچ وەڵامێکی نەدامەوە. بەڵکو چاوە خەمناك و درشتەکانی تێ بڕیم و هیچی نەگوت... زۆر لاواز بوو بوو، بوو بوو بە داسك و دەرزی. تەنیا تەمەشایەکی کردم و هیچی تر. بەڵام دایکی کە وایزانی سوعبەتم لەگەڵ دەکات، لە ئاستانەی دەرگاکەوە هاواری لێکردو گوتی:

– هەی سەر تاشراوی بێ حەیا ئەوە قسەی چیت لەگەڵ کرد ؟

ئیدی ئەو ڕۆژە سەر لە نوێ دەستی بە لێدانی کردەوە. جاری وا هەبوو بە سەعات دەستی لە لێدانی هەڵنەدەگرت و دەیگوت: "بە من بێ بیکوژم، ئەمە کچی من نییە، حاشا کچی من نییە."

چیریڤین پرسی:

– یانی سۆزانی بوو ؟

– پەلە مەکە با بۆتی بگێڕمەوە برادەر! من و فیلکا ئیش و کارمان بوو بوو بە خواردنەوەو مەی نۆشی. ڕۆژێکیان پاڵکەوتبووم، دایکم هات و پێی گوتم:

– تاکەی پاڵ دەکەوی، هەی بەرەڵڵا، هەی دز ؟

لە سەرەتاوە تێر جنێوی کردم و پاشان گوتی:

– ئاکولکا بخوازە! داك و باوکی ئامادەن بە کراسی بەرییەوە بتدەنێ و سێ سەد ڕۆبڵیشت وەکو جیازی دەدەنێ. بەرسڤم دایەوە:

– بەڵام هەموو خەڵکی دەزانن کە ڕووی سووری و کچێنی نەماوە.

– حەیوان مەبە! هەر کە تاجی بوکێنی لەسەرنا، هەموو ئەو قسەو قسەلۆکانە بیر دەچنەوە! خۆ ئەگەر بەڕاستی وا بێ و قسەلۆکی خەڵکی لەو بارەیەوە ڕاست بێ، باشتر، قازانجی تۆیە، هەتا ماوە چاو بەرەوژێری تۆ دەبێت و لێت دەترسێت، بۆ خۆمان بە پارەو سامانی ئەو وەکو پاشا دەژین. لەم بارەیەوە قسەم دەگەڵ ماریا ستیبانوفنادا کردووەو ڕێککەوتووین.

پێمگوت: – ئەگەر ئێستا بیست ڕۆبڵم بدەیتێ، ڕازی دەبم و دەیخوازم.

جا باوەڕدەکەیت یان نا کەیفی خۆتە، بەڵام بەڕاستی تا ڕۆژی گواستنەوەی بوکێ، هەمیشەی خوا مەست و سەر خۆش بووم. "فیلکا ماروزوف"ش بەردەوام هەڕەشەی لێدەکردم و دەیگوت:

– خوێڕی، هەموو پەراسوکانت دەشکێنم، دەزگیرانی ئاکولیکا، دڵت خۆشە ژن دێنی، ئەگەر خۆم بمەوێ، هەموو شەوێ سواری دەبم!

بەرسڤم دایەوە:

– درۆ دەکەی توخمە سەگ.

بە بەرچاوی هەموو خەڵکییەوە، لە ناو جەرگەی بازاڕا کەوتە تانەو تەشەران لێم، هەر ریسوای کردم. لە شەرمەزاریو تەریقیدا بەلەز بۆ ماڵ گەڕامەوە. کەوتمە بیانووگرتن کە ئەگەر هەر ئێستا پەنجا رۆبڵم نەدەنێ، نامەوێو نایخوازم.

چیریڤین گوتی:

– یانی ئەوان رازی نەبوون بتدەنێ ؟

– حەدیان چیە، بۆچی رازی نەبن؟ ئێمەش بە ئەندازەی ئەوان بە رێزو حورمەت بووین، لە نێو خەڵکیدا بەقەدەر سەنگین بووین، ناوزڕاوو ڕیسوا نەبووین، بابم لە ئەنگودیم تروفیمیچ–ش دەوڵەمەندتر بوو، ئیدی پێش مردنەکەی بە ماوەیەکی کەم ئاگرێك کەوتەوە، هەموو ماڵو سەروەتەکەی سووتاو هیچی بۆ دەرنەچوو، ئەو کەوتنەی کەوت ئیدی هەڵنەستایەوەو نە هاتەوە مایە. ئەنگودیم پێی گوتم:

– دەبوایە رووتەیەکی بێ کراسی وەکو تۆ مەمنوونی خوا بێ کە کچی من بخوازێ.

بەرسڤم دایەوە:

– مەگەر بیرت چوو کە دەرگای ماڵەکەت لە قیڕگیرا ؟

– ئەو قسەیە چیە بەبێ بەڵگە بوختان مەکە... فەرموو ئەو دەرگا کراوەیەو دەتوانی بڕۆیت! کەس مەجبووری نەکردویت بیخوازی، بەڵام دەبێ ئەو پارەیەم بدەیتەوە کە پێمداویت.

ئیدی لەگەڵ فیلکاماروزوف دا بڕیارمان دا متری بیگوف بنێرین بۆ لای ئەنگودیم تا پێی بڵێ لەبەر چاوی هەموو خەڵکی ڕیسوایی کچەکەی لە قاو دەدەین. تا رۆژی زاوایەتی هەر سەرخۆشو مەست بووم. لە کڵێسادا کەمێ وەخۆ هاتمەوە. کە لە کڵێسا گەڕاینەوە، دایان ناینو، "متروفان ستیبانیچ"ی مامی ئاکولکا گوتی:

– تەواو، هەرچەندە کیژێکی پاك و پاکیزەت نەخواستووە، بەڵام هیوادارم ژنێکی لە بارو رێكو پێك بێ، پێکەوە پیرو خەڕۆ ببن.

ئەنگودیم، دانیشتبوو و دەگریا، ڕوندك هۆن هۆن بە ڕدێنە چەرمووەکەیدا دەهاتە خوارێ. جا هاوڕێ گوێ بگرە بزانە من چیم کرد: پێش ئەوەی بۆ کڵێسا بچین، قامچییەکم لە بەرکم نا، بەو نیازەی بە بەرچاوی خەڵکەکەوە دڵی خۆم بکەم بە تەرزە، بە کاری بێنمو بۆ خەڵکەکەی بسەلمێنم کەس ناتوانێ فریوم بدات، و من کابرایەکی گەوج نیم.

چیریڤین گوتی:

– دەست خۆش... ژنەکەشت بزانێ چ شتێك چاوەڕوانیەتی...

– بوەستە، لەزێ مەکە برادەر! لە دەف ئێمە وا باوە پاش ئاهەنگی زەماوەند بووكو زاوا دەکەنە پەردەوە، دەیانخەنە ژوورێکی ئەلاحەدەوە، خەڵکەکەی تریش دەچن لە ژوورێکی گەورەداو بەدەم خواردنەوەوە چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەیان دەکەن. بە هەرحاڵ کراینە پەردەوە. ئاکولکا، لێو بە بارو رەنگ زەرد، زۆر دەترسا، رەنگی بوو بوو بە زەعفەرانی زەرد. قژی زەردو خاو، چاوەکانی

درشت. ئاکولکا، زۆربەی کات بێدەنگ بوو، بە تەبیعەت کەسێکی کەم دوو بوو، هەندێجار واتدەزانی لاڵە. ئافرەتێکی سەیرە! جا تۆ دیمەنەکە بێنە بەرچاوی خۆت: قامچییەکەم لە بەرکم دەرهێناو لەسەر جێگاکە دامنا. دەزانی چیم بۆ ئاشکرا بوو ؟ لە پەرەی گوڵ پاکتر بوو، کچ بوو، کچێنی خۆی نەدۆڕاند بوو... ناتوانم هیچ گلەییەکی لێبکەم... کچێکی بێ عەیبو عار بوو....

– بەڕاست!

– بەڕاستی راست! وەکو هەر کچێکی بە حەیاو حورمەت، روو سوورو پاکیزە بوو. ئیدی ئەم کیژە بەلەنگازە بە ناهەق ئەم هەموو ئازارو عەزابەی لێ بارکرا بوو، نازانم بۆچی فیلکا ماروزوف ئەو بوختانەی بۆ کردبوو ؟

– راستە، بۆچی ؟

– هەنگێ لەسەر جێگەکە هاتمە خوارێ، هەردوو دەستم جووت کردنو بەدەم کڕنۆشەوە پێم گوت:

– بمبوورە ئاکولینا کودیموفنا! بمبەخشە، چونکە من زۆر کەر بووم، گەوجو کاڵفام بووم کە باوەڕم بەو هەموو بانگەشەو درۆو بۆختانانە کردبوو! ببورە، زۆر ببوورە... من کابرایەکی خوێڕی و بودەڵەم!....

لەسەر تەختە خەوەکە دانیشتبوو و تەمەشای منی دەکرد، دەستی خستە سەر شانم، دەستی بە پێکەنین کرد، بەڵام بە دەم پێکەنینەکەیەوە دەگریاو ڕوندك بەسەر گۆناکانیدا دەهاتە خوارێ... هەم هەنسکی هەڵدەداو هەم دەگریا... هەنگێ وەدەرکەوتمو ڕووم کردە خەڵکەکەو پێمگوتن:

– مەگەر فیلکا ماروزوف نەبینم! بەزاتی خوا هەواڵەی ئەو دنیای دەکەم !

دایكو باوکی زۆر خۆشحاڵ بوون، لە خۆشیا نەیاندەزانی چ بڵێنو چ بکەن. دایکی ئاکولکا، ئەوەندەی نەمابوو، لە خۆشیا خۆی باوێتە سەر پێیەکانم، بە کوڵ دەگریا. پیرەمێردەکەی بابی ئاکولکا گوتی: "ئەگەر زووتر ئەمەمان دەزانی، شوویەکی باشترمان بۆ پەیدا دەکردیت ".

خۆزگە کاتێ کە یەکەم یەکشەممەی دوای زەماوەندەکەمان لە کڵێسا هاتینە دەرێ دەتبینی چ جلو بەرگێکمان لەبەر بوو. من کڵاوێکی فەروی زۆر چاكو چاکەتو پانتۆڵێکی ماهوتی زۆر نایابم لەبەر بوو، ئەویش پاڵتۆیەکی فەروە کەروێشکی لەبەر بوو و سەرپۆشێکی حەریری بەسەرا دابوو. ئیدی ژنو مێردێکی لە بارو هاوکوف بووین، خەڵکەکە بەسەرسامی سەیریان دەکردین. هەردووکمان قۆزو جوان بووین، نەبێ بەخۆ هەڵکێشان، نموونەمان لە نێوان ژنو مێردانداا زۆر نەبوو....

– بەڕاست ؟

– جارێ گوێ بگرە با بۆت بگێڕمەوە. دوای زەماوەندەکەمان خۆم لە میوانان دزییەوەو، بەسەرخۆشی بە ناو جادەو بانان کەوتمو هاوارم دەکرد: "ئەو هەرزەی خوێڕییە، فیلکا ماروزوف لە کوێیە ؟ با بیگرم، ئەگەر پیاوە با خۆیم نیشان بدات!" هەڵبەتە سەرخۆشو مەست بووم. ئەنجام لە نزیکی ماڵی فلاسوف دەستگیریان کردم. بە سێ زەلام بەرزەفتیان نەدەکردم، بە هەر

حاڵ به خورتیو تۆبزی بۆ ماڵیان بردمەوە. ئیدی مەسەلەی پاکیزەییەکەی ئاکولکا بوو به داستانو کەوتە سەرزاری خەڵکی سەرانسەری شار. کیژان که له بازاڕا یەکیان دەبینی، بۆ یەکیان دەگێڕایەوە: "ئەرێ بیستت ؟ ئاکولکا کچ دەرچوو!" پاش ئەوە به ماوەیەك "فیلکا ماروزوف"م بینی، به بەر چاوی خەڵکییەوەو زەقاو زەق پێی گوتم:

– باشترین شت ئەوەیە ژنەکەت بفرۆشیتو به پارەکەی عارەق بخۆیتەوە. وەکو یاشکا بکە، یاشکا سەرباز بوو، تەنیا بۆ ئەو مەبەستە ژنی هێنا، تاقە شەوێکیش دەگەڵ ژنەکەیدا نەخەوت، بەڵام پارەیەکی زۆری دەستکەوتو سێ دانەساڵی خشت پێی خواردەوە...

بەرسڤم دایەوە:

– بەڕاستی هەرزەو بێ شەرەفی.

گوتی:

– کەر پیاو. ئاخر تۆ چوزانی کچ بوو یان ژن؟ تۆ له شەوی زاوایەتیدا فوول سەرخۆش بووی.

به پەله خۆم گەیاندەوە ماڵێ، دەستم به هەراو هاوار کرد:

– ئێوە به ئانقەست سەرخۆشتان کردووم، تا ئاکولکام بەسەرا ساغ بکەنەوە، بەسەر خۆشی بووکتان بۆ گواستوومەتەوە.

دایکی ئاکولکا ویستی هێورم بکاتەوە، بەڵام من به توڕەیی پێمگوت:

– لاکەوە پیرەژن، ئەمە ئیشی تۆ نیە، ئێوە هەر بۆ پارە مردوون! بڕۆ بەلای پارەی خۆتەوە! کوا ئاکولکام بۆ بانگ بکەن! بگرە کوێت دێشێت... دوو دانە سەعاتی ڕێك من دارکاریم کرد، وام لێهات هێزو شنگم لەبەر بڕاو کەوتمە سەر عاردی، ئاکولکاش سێ هەفتەی خشت له جێگادا کەوت.

چیریڤین به خوێنساردییەوە گوتی:

– ئەدی وایە، ژن کوتەکی لەسەر نەبێ بەرەڵلا دەبێ... باشە تۆ دەگەڵ دۆستەکەیدا گرتت ؟

شیشکوف، پاش کەمێك بێدەنگی، به زەحمەت گوتی:

– هەرگیز! قەت شتی وا ڕووی نەدا بوو! بەڵام لەو ناوچەیەدا بوو بووم به بنێشتە خۆشەی ژێر دانانو گەپجاڕی خەڵکی، هەمووشی خەتای فیلکا بوو. پێی دەگوتم:

– ژنەکەت بۆ ئەوە دروست بووە، خەڵکی لەگەڵی ڕابوێرن. ڕۆژێکیان دەعوەتێکی گەورەی بۆ کردین، بردینییە ماڵەوە، له پڕ هەستاو کەوتە قسان:

– تەمەشای ئەم ژنە باشە بکەن، زۆر خێرەومەندە، دەست به ڕووی کەسەوە نانێ، لەگەڵ هەموو کەسێکدا نەرمو نیانو میهرەبانو دڵاواو به کەرەمە! ئەرێ کابرا تۆ له بیرت چوو که پێکەوە چووین دەرگاکەیانمان له قیر گرت.

لەو کاتەدا زۆر سەرخۆش بووم. لێم هاتە پێشەوەو چنگی له قژم ناو ڕایکێشا ئەمما ڕاکێشان، دوو لۆ چەمامەوەو خەریك بوو سەرم له عاردی دەدا... ئەوجا گوتی: دەی مێردەکەی ئاکولکا بڕەقسە. دەبێ تا ئەو کاتەی قژت بەر دەدەم هەر بڕەقسی.

– هەی خوێڕی بێ شەرەفە.

– ڕاوەستە بۆم، دەبێ لەگەڵ هاوڕێکانمدا بێم بۆ ماڵتان‌و بە بەرچاوی تۆو ئەوانەوە ژنەکەت پڕ شەق بکەم. ڕاوەستە، با ئەو قسەیەت کردبێ...

باوەڕ دەکەی یەک مانگی ڕەبەق لە ماڵ نەهاتمە دەرێ، لەوە دەترسام هەڕەشەکەی بێنێتە دی‌و بێت ولە ماڵەکەی خۆمدا ژنەکەم دارکاری بکات‌و ببم بە مەخسەرەو گەپجاڕی خەڵکی... مەگەر خوا بزانێ بە درێژایی ئەو مانگە چەندم لێداوە!

– بۆچی لێت دەدا ؟ ڕەنگە بتوانی دەستی خەڵکی ببەستی، بەڵام دەمی خەڵکی نابەسترێ. لێدانی زۆرو بەردەوامی ژن باش نییە، کە جارێکت لەسەر نەسیحەت‌و بۆ تەمێ کردن لە ژنەکەت دا، پاشان بچۆ مەرایی‌و مجامەلەی بکە، ژن بۆ ئەوە دروست بووە، دەنا لە ماڵی بابی نان هەبووە بیخوات.

شیشکوف بۆ چەند ساتێک بێدەنگ بوو، ئەوجا لە سەری ڕۆیی‌و گوتی:

– هەستم بە شەرمەزاری‌و سووکایەتیەکی زۆر دەکرد. گەڕامەوە سەر عادەت‌و خووە کۆنەکانم. لە بەیانییەوە تا ئێواری لێم دەدا، لەسەر بچووکترین شت لێم دەدا، بیانووم پێدەگرت، بۆ نموونە لەسەر ئەوە لێم دەدا کە بە دڵی من هەڵنەدەستا، یان بە دڵی من نەدەڕۆیی... وام لێهاتبوو ئەگەر لێم نەدابا بێتاقەت دەبووم. ئیدی هەندێجار دەچوو لەبەر پەنجەرەیەک دادەنیشت‌و بە کوڕی دەگریا، زۆرجار کە دەمبینی دەگری، دڵم بە حاڵی دەسووتا، کەچی هێشتاش هەر لێم دەدا. دایکی لۆمەی دەکردم‌و جنێوی دەدامێ‌و دەیگوت:

– خوێڕی نا پیاو، قەلەڕەشی شووم.

منیش وەڵامم دەدایەوەو دەمگوت:

– بێدەنگ! فزە نەکەی دەنا دەت تۆپێنم! فریوتان دام بەسەر خۆشی کیژەکەتان دا بەسەرما، دەستان بڕیم.

لە سەرەتاوە ئەنگودیمی پیر، دەیویست خۆی لە مەسەلەکە هەڵقورتێنێ، کەوتە هەڕو گیڤ. ڕۆژێک پێی گوتم:

– ئاگاداری خۆت بە ها! تۆ ئەوە نیت بتوانی یاخی بیت....

بەڵام زۆری پێنەچوو، دەستبەرداری هەڕوگیڤ بوو. ماریا ستیبانوفناش دایە نەرمی. جارێکیان بەدەم گریانەوە هات‌و گوتی:

– گوێ بگرە ئیڤان سیمیونیچ! دڵم بە بەرییەوە نەماوە، خەریکە لە داخ‌و پەژارەدا دەمرم. من داوایەکم لە تۆ هەیە، بۆ تۆ بچووکە، بەڵام بۆ من گەورەیە. لە ڕاهی خوا وازی لێ بێنە، بیبەخشە، لێیگەڕێ با بڕوات.

پیرەژن بەدەم ئەو قسانەوە کەوتە سەر چۆکان‌و دەستی بە پاڕانەوە کرد:

– پیاوی باش بە، ئاقڵ بەو بیبورە. بەدکاران بوختانیان بۆ کردووە، باوەڕیان پێ مەکە. عەیب لەو ئافرەتەدا نییە، بە خۆت دەزانی بە کچی هاتە لای تۆ، لە پەڕەی گوڵ پاک‌و پاکیزە تر بوو.

ئەو دەگریاو من پتر دەهری دەبووم. گوتم:

– نەخێر، نامەوێ گوێم لەو قسانە بێت، نامەوێ یەك وشەی ترم گوێ لێ بێ، من بە دڵی خۆم دەکەم، چیم پێ خۆش بێ ئەوە دەکەم، بە قسەی عەبدەل بەشەر ناکەم جگە لە فیلکا ماروزوف، هەر ئەو برادەری منە، دۆستی هەرە ئازیزو گیانی بەگیانی منە.

چیریڤین گوتی:

– یانی دیسان یەکتان گرتەوە ؟ بوونەوە بە برادەر ؟.

– نەگیانە! برادەری چیو دۆستی چی! کوڕم دەویست بوێری لێی نزیك ببێتەوە. دارو نەداری بە بادا، دا کەوتە سەر ساجی عەلیو خۆی ئامادە کرد کە لە جیاتی کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەندی شار، بچێ بۆ سەربازی. لەلای ئێمە وا باوە کە ئەگەر یەکێك قەبووڵ بکات لە جیاتی گەنجێکی دی بۆ سەربازی بڕوات، ئەوا دەبێ بە گەورەی ئەو ماڵە، کەس بەبێ پرسی ئەو پەنجە بە ئاوا ناکات، تا دەڕوات بۆ سەربازی. ئەو ڕۆژەی کە سەفەر دەکات پارەکەی کاش وەردەگرێت، بەڵام تا ڕۆژی سەفەرەکەی لەو ماڵەدا دەژی، ڕەنگە ئەمە شەش مانگی تەواو بخایەنێ. جا ئەو جۆرە گەنجانە، لەو ماوەیەدا هەرچیەکیان بە خەیاڵدا بێ دەیکەن! لە هیچ قۆڕیاتێك ناپرینگێنەوە. بۆیە پێویستە لەو حاڵەتەدا هەرچی ئیکۆنەو وێنەی وەلیان هەیە لە ماڵەکە بگوازرێنەوە. ئیدی ئەو گەنجانە، تا ئەو ڕۆژەی بۆ سەربازی ڤڕێ دەکران، خۆیان بە گەورەی ئەو ماڵە دەزانن، و دەبێ ئەوپەڕی ڕێزیان لێبگیرێ دەنا لە قەولو قەرارو بەڵێنەکانی خۆیان ژێوان دەبوونەوە... جا فیلکا ماروزوفش لەو ماڵەدا ئەو جۆرە ڕەفتارەی دەکرد، لە هیچ نامەردییەك نەدەپرینگایەوە، تەماحی دەکردە ژنانو کچان، لە دوای شیو لە ڕدێنی خودان ماڵەکە دەنەوی ڕاکێشە، هەرچیەکی بە خەیاڵدا بهاتبایە دەیکرد. هەموو ڕۆژێ خۆی دەشت. خەڵکی ماڵەکەی ناچار دەکرد گەرماوی بۆ دابخەن،و لە جیاتی ئاو، مەی بۆ دابنەن. ژنانی ماڵەکەی ناچار دەکرد بچنە ژێر باڵیو بۆ گەرماوەکەی بەرن. خۆ ئەگەر بە مەستی بۆ ماڵ بگەڕایەوە، لە ناوەندی شەقامەکەدا دەوەستاو هاواری دەکرد:

– نامەوێ لە دەرگاوە وەژوور بکەوم، تەیمانەکەم بۆ لابەرن.

بەمجۆرە خەڵکی ماڵەکەی ناچار دەکرد، لەلای دەرگاکەوە لایەکی تەیمانو محاجەرەکەی بۆ لا بەرن تا بێتە ژوورەوە. ئەنجام کە ڕۆژی ڕەوانە کردنی فیلکا بۆ سەربازی هات، هەر هەموو ئەو کەربازاڕە کۆتایی هات. ناچار ئەو ڕۆژە دەستی لە خواردنەوە هەڵگرت. گشت خەڵکی لە ماڵ هاتنە دەرێو لە جادەوبانان گردبوونەوە، تا تەماشای فیلکا ماروزوف بکەن کە شاری بە جێ دەهێشتو بۆ سەربازی دەڕۆیی. بە یەکتریان دەگوت:

– فیلکا ماروزوف بۆ سەربازی دەبرێ.

فیلکاش، لە نێو گالیسکەیەك دانیشتبوو، هێدی هێدی دەڕۆییو بەڕاستو بە چەپا سڵاوی لە خەڵکەکە دەکرد. بە ڕێکەوت لەو کاتەدا ئاکولکا لە مەزرا دەگەڕایەوەو بەوێدا ڕەت دەبوو، هەرکە چاوی پێی کەوت بانگی لێکرد:

– بوەستە.

ئەوسا، خۆی لە گالیسکەکە هەڵدایە خوارێ، کەوتە سەر چۆکان و گوتی: "ڕوحەکەم، گیانەکەم! حەیاتەکەم! مزرە سێوەکەم. من لەم دوو ساڵەدا شەیدای تۆ بووم،و ئەمێستا بە مۆسیقاوە بو سەربازیم دەبەن! بمبوورە ئەی پاکیزە ئابڕوومەندەکە، ئەی نەشیملە ڕوو سوورەکە، ئەی کیژی ئابڕوومەندترین باب، چونکە من هەرزەو خوێڕیم، من بەرپرسی هەموو کوێرەوەرییەکی تۆ بووم، من بەرپرسی هەموو عەزابێکی تۆ بووم.

فیلکا بە دەم ئەو قسانەوە، جارێکی دی لەبەردەمیا هاتە سەرچۆکان و کڕنۆشی بۆ برد. ئاکولکا لە هەوەڵەوە ترسا، بەڵام دوای تۆزێك وەخۆ هاتەوە، سلاوی لێکردو دوو لۆ لە هەنبەریا چەمایەوەو گوتی:

– تۆش لە من ببوورە کوڕی باش. قەت لێت زویر نیم.

خێرا لە دوای ئاکولکاوە، بۆ ماڵ گەڕامەوەو لێم پرسی:

– چیت پێ گوت دێڵە سەگ.

بێ ترس و دوو دڵی چاوی بڕییە دوڕ چاوانم و ( ئیدی باوەڕ دەکەی یان نا کەیفی خۆتە) گوتی:

– خۆشم دەوێ... بە قەد هەموو دنیام خۆشدەوێ.

چیریڤین گوتی:

– سەیرە !

– ئەو شەوو ڕۆژە هیچ قسەیەکم نەکرد. بەڵام ئێوارێ پێمگوت: "ئاکولکا، دەتکوژم".

بە درێژایی ئەو شەوە خەو نەچووە چاوم، تاکو خوا ڕۆژی کردۆتەوە من لە ژوورەکەی پێشەوە مەیم خواردووەتەوە. کە ڕۆژ هەڵات گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆمان. بە ئاکولکام گوت: "ئاکولکا خۆت ئامادە بکە تا بڕۆین بۆ مەزرا". پێشتر باسی ئەوەم کردبوو کە بە نیازم سەرێکی مەزراکە بدەن،و ژنەکەم بەوەی دەزانی. گوتی: " پێم خۆشە سەری مەزراکە بدەیت! کاتی درەوە، بیستوومە گوایە وەرزێرەکە دوو ڕۆژە نەخۆشەو لە جێدا کەوتووە". بێئەوەی هیچ قسەیەك بکەم عەرەبانەم لە ئەسپ بەست. لەوسەری شاردا، دارستانێکی گەورە هەیە کە درێژییەکەی یازدە فەرسەخە، مەزراکەی ئێمە دەکەوێتە کۆتایی ئەو دارستانەوە، دوای ئەوەی سێ فەرسەخمان بڕی، ئەسپ و عەرەبانەکەم لە ژێر دارەکاندا ڕاگرت. بە ژنەکەمم گوت: "ئاکولکا، دابەزە، ئیدی ئەجەلت هاتووە". لە کاتێکا کە لە ترسا دەلەرزی، بە بێدەنگی هەستاو لە بەردەممدا وەستا. پێمگوت: "بەڕاستی بێزارو بێتاقەت بووم، زۆرت عەزاب دام... دەی دوا نوێژی خۆت بکە". قژیم گرت، پرچێکی درێژی چڕوپڕی هەبوو، پرچیم لە دەستمەوە پێچا، خستمە نێوان هەردوو زرانیمەوە. کێردەکەم دەرهێنا. سەریم بۆ دواوە برد. کێردەکەم لە ملی نا... هاواری کرد... خوێن فیچقەی کرد... هەنگێ کێردەکەم تووڕدا، ژنەکەمم لە باوەش گرت، لە عاردەکەم ڕاکشاند، ماچم کرد، پڕ بە زار دەگریام... من دەگریام و ئەو دەیقیژاند، خوێنەکەی بەسەرو چاوودەست و پلم دا هەڵدەپژا. لە پڕ ترسم لێنیشت، هەستام، ئەسپ و عەرەبانەکەم بەجێ هێشت و پێم وەغارێوەنا. نەوەستامەوە تا گەییمەوە ماڵ. لە پشتەوە خۆم بە ماڵدا کرد، خۆم لە کوختەیەکی چۆڵدا

حەشاردا کە جاران لە جیاتی گەرماو بەکاردەهات. لەوێ خۆم وەبن تەختێك دا، تا شەوێ لەوێندەر مامەوە.

– ئەدی ئاکولکا ؟

– ئەویش هەڵدەستێو دەیەوێ خۆی بگەیەنێتەماڵەوە، بەڵام بڕ ناکات، چونکە دواتر لە دووری سەد مەتری هەمان شوێن دەیدۆزنەوە.

– یانی بەتەواوەتی نەتکوشتبوو ؟

– نەخێر.

شیشکۆف، کەمێك بێدەنگ بوو. چیریڤین گوتی:

– ئا، ڕاستە دەمارێك هەیە ئەگەر یەکسەر نەبردرێ، ئەو کەسە، چەندیش خوێنی لەبەر بڕوات نامرێ.

– بەڵام وێڕای ئەوەش هەر مرد، بۆ شەوێ مرد. خەبەری پۆلیس دەدەن. پۆلیس کەوتە تاقیبو سۆراخم. شەوێ لەو کۆنە گەرماوە چۆڵەدا دەستگیریان کردم.

شیشکۆف تۆزێ بێدەنگ بوو و لەسەری رۆیی:

– ئیدی ئەوە چوار دانە ساڵە لێرەم !

چیریڤین، بەوپەڕی خەمساردیو خوێنساردییەوە، قوتووە بڕنووتیەکەی دەرهێنا، بەدەم بڕنووتی هەڵمژینەوە گوتی:

– بەڵێ، ژن بەبێ کوتەك نابێ بە بەشەر. بەڵام کوڕی باش تۆ کەرێتییەکی گەورەت کردووە. منیش کاتی خۆم ژنەکەمم دەگەڵ عاشقەکەیدا گرت، بەڕای تۆ چ بکەم باشە ؟ بردم بۆ تەویلەکە، هەوسارێکم هەڵگرتو دوو قەدم کردو پێم گوت: "تۆ لە کڵێسادا بەڵێنی وەفاداریت بە کێ دا ، سوێندی ئەمەکداریت بۆ کێ خوارد ؟" بگرە کوێت دێشێت، بە هەوسار تێی بەر بووم، یەك دانە سەعاتو نیو لێم دا، تا ئەنجام هاواری لێهەستا، کەوتە پاڕانەوە: "هەردوو پێت دەشۆمو ئاوەکەی دەخۆمەوە. تۆبە!" نێوی ئەفدوتیا بوو.

***<u>پەراوێز:</u>***

*١- لە قیرگرتنی دەرگای ماڵێك کە کچی تیا بێ، نیشانەی ئەوەیە کە ئەو کچە روو سووریو کچێنی خۆی دۆڕاندووە.*

((١٦))

## وەرزی هاوین

مانگی نیسان هات. زۆری بۆ جەژنی پیرۆز، جەژنی ڕابوونی مەسیح نەمابوو، ئیدی خۆمان بۆ کاری هاوینە ئامادە دەکرد. ڕۆژ بە ڕۆژ دنیا گەرمترو هەتاو پرشنگدارتر دەبوو. هەوا بۆنی بەهاری لێدەهاتو، دەماخی زاخاو دەداو گیانی دەبوژانەوەو خوێن جمان دەستی پێدەکرد. زیندانی دەستو پێ بە کۆتش خوێنی دەبزواو، ڕۆژانی خۆشو جوانی بەهار ناخی دەشڵەقاندو، ئارەزوو کەڵکەڵەی ئازادیو خەمی غوربەتو تاسەی دووری لە دڵو دەروونو هەستو نەستدا بێداردەکردەوە. پێموایە مرۆڤ، لە ڕۆژانی خۆشو هەتاوی بەهاریدا، پتر لە ڕۆژانی هەورو هەڵاو باراناوی خەمناکی پایزوزستان، داخ بۆ ئازادی لە دەست چووی هەڵدەکێشێت. هەرچەندە بە خۆشیو تاسەوە چاوەڕوانی بەهاردەکەن، بەڵام کە بەهاریش دێت، زیاتر دەهاڕوژێنو بێ قەراری دەکەن، سەرنجم دەداو دەمبینی کە لە بەهارا، قەرقەشەو دەمەقاڵەو هەراو هەنگامە لە زیندانەکەماندا پتر دەبوو. ڕۆژ نەبوو شەڕو ئاژاوە بەرپا نەبێت. هەندێجار کە بۆ سوخرەو بێگار بۆ کەناری ڕوباری ئارتیش دەبراین، بە چاوی خۆت خەڵکانێکی بەلەنگازو داماوت دەبینی کە بە حەسرەتەوە، نیگای خەمناکیان بەرەڵلای ئاسمانی شین دەکردو چاویان دەبرییە خاڵێکی دوور دووری ئەوبەری ڕوباری ئارتیش، کە تا چاو بڕی دەکرد، بە سەدان فەرسەخ هەر دەشتو بیابان بوو، دەشتی بەرینو بێ پایانی "کیرخیز"ی ئازاد بوو،و ئەوسا دەتبینین چۆن لە ناخی دڵەوە هەناسەیەکی قووڵ قووڵیان هەڵدەکێشا، دەتگوت دیمەنی ئازادی دەشتە بێ کۆتاییەکە باری دڵەی خەمباری سوک کردوون. ئەرێ، یارۆی زیندانی لە ناخی دڵەوە

ئاهێکی دوورو درێژی هەڵدەکێشاو پاشان لە پڕ وەکو کەسێك بیەوێ ئەو خەون‌و خەیاڵانە لە خۆی بتارێنیّ، بە توڕەیی دەستی دەدایە بێڵەکەی‌و بە ئەرزەکەیدا دەکرد یان سەفتە خشتەکانی هەڵدەگرت‌و دەیگوازتەوە بۆ شوێنی مەبەست. ئیدی هەر دوای تۆزێك ئەو هەست‌و سۆزە ڕەوتەنیانەی لە بیردەکردو بەپێی مجێز دەگەڕایەوە سەر پێکەنین یان جنێوەکانی خۆی. بە جۆش‌و خرۆشێکی بێ وێنەوە، بە هەموو هێزو توانایەکی خۆیەوە ملی وەبەر کارەوە دەنا، وەکو ئەوەی بیەوێ بە کارکردن‌و خۆ ماندووکردن، داخی دڵی خۆی هەڵڕێژێ. هەموو ئەوانە لە هەڕەتی هێزو توانادا بوون، لە بەهاری تەمەندا بوون.... بەڵام باری کۆت‌و زنجیران لەم وەرزەدا، یەجگار قورس بوو! ئەم قسانەم زادەی سۆزو گودازان نیە. بەڵکو سەرنج‌و تێبینییەکی دروست‌و تەواوە. لە وەرزی بەهارا، لە ژێر خۆرەتاوی پرشنگدارا، کاتێ پیاو هەست دەکات سروشت لە هەر چوار نکالیدا، ڕادەبێ، دەگەشێتەوە، کاتێ هەست بە خوێن جمانی سەراپای خۆی دەکات، زیندانی لێ دەبێ بە دۆزەخ، چاودێری پاسەوانانی لە جاران لە لا قورستر دەبێت.

لە وەرزی بەهارا، لەگەڵ خوێندنی یەکەم کلاّوەندا، ئیدی نەك هەر لە سیبیریا بەڵکو لە سەرانسەری روسیادا، خەڵك‌و خوا لە زیندانان وەدەردەکەون‌و روو لە لێرەوارو جەنگەلاّن دەکەن، دوای ژێر زەمینانی بۆگنخ‌و سزاو کۆت‌و زنجیری قورس‌و قامچی‌و شەلاخی بە ئازار، ئەو خەڵکە بەرەڵلا دەبن، وێڵ‌و سەرگەردان بە دەشت‌و دەراندا بلاّودەبنەوە، لە کوێ ژیان بوار بدات‌و ئاسان بێ لادەدەن. هەرچیەکیان لە خواردن‌و خواردنەوە بە ڕێکەوت بێتە ڕێ دەیخۆن‌و دەیخۆنەوە، شەوان لە دارستان‌و مەزرایاندا، بێ خەم‌و خەیاڵ، بێ ترسی زیندان لێی دەنوون، وەکو ئەوەی باڵندەبن، بێ خەم‌و خەیاڵ، بێ خەمی سبەینێ، تاقە ئیشیان ئەوە بێ بە بەرچاوی خواوە روو بکەنە ئەستێرانی ئاسمان‌و بڵێن:سلاّو ئەی ستێران! بەڵام وێڕای ئەوەش هەندێجار، چەرخی ژیان بەبەختی ئەوان ناگەڕێ‌و، لە خزمەتی "جەنەراڵ وەقواق دا" برسێتی‌و تینوویەتی بەرۆکیان دەگرێت‌و سەغڵەتیان دەکات، جاری واهەیە بە هەفتە پارووە نانێکیان دەست ناکەوێ. ئەمە جگە لەوەی ترسی ئەوەشیان هەیە دووبارە دەستگیر بکرێنەوەو بخرێنەوە زیندان، بۆیە ترس‌و برسێتی ناچاری دەکردن، دزی‌و تالاّنی بکەن، دەست لە کوشتن‌و برین نەپارێزن. لە سیبیریادا قسەیەکی باو سەبارەت بە زیندانی‌و دوورخراوان هەیە کە دەڵێت: "زیندانی‌و دوور خراوە وەکو منداڵ وایە، هەر شتێ بدینێ ورکی لێدەگرێ‌و پڕی دەداتێ". بەڵام ئەم قسەیە زیاتر ئاوارەو وێڵگەڕان دەگرێتەوە. زۆربەی هەرە زۆری ئاوارەو وێڵگەڕان، ڕێگرو دزن، هەڵبەتە زیاتر ناچاری بۆ ئەم کارەیان هاندەدا تا مەیل‌و ئارەزوو، زیاتر پێویستیی ئەمەیان پێدەکات تا پیشە. هەندێ ئاوارە هەن، ئاوارەیی چووەتە خوێنیانەوەو ناتوانن دەستبەرداری بن. لە نێو زیندانییاندا خەڵکانێك هەن، دوای ئەوەی ماوەی مەحکومیەتەکەیان تەواو کردووەو ئاکنجی بوون، ئەوجا گەڕاونەتەوە سەر وێڵگەڕی‌و ڕێگری. لەوەیە پیاو لە دڵی خۆیدا بڵێ مادامێکی ماوەی مەحکومیەتەکەیان تەواوکردووە، ئیدی دەبێ لە ژیانی تازەیان رازی بن، کەچی بە پێچەوانەوە، شتێکی پەنهان ئۆقرەو ئارامیان لێ هەڵدەگرێت‌و بەرەو ڕێگری‌و ئاوارەییان ڕادەکێشێت. ئیدی ژیانی دەشت و لێڕەواران، سەرباری ئەوەی سەخت‌و دژوارە، ئازادی و ڕیسکی تیایە، لە

روانگەی ئەوانەوە، ئەفسوونێکی نهێنی هەیە. سەیر ئەوەیە هەندێجار لە نێو ئەو زیندانییانەدا خەڵکانێك دەبینی، سەلارو سەنگین، خۆش مەشرەبو هێدیو هێمن، ئومێدی ئەوەیان لێدەکرێ کە بەر بوون، ببن بە جووتیاری سەرکەوتوو و بۆ خۆیان ئاکنجی ببنو بژین، کەچی دەگەڕێنەوە سەر وێڵگەڕییەکەی جارانیان. لە نێو ئەو زیندانیو دوورخراوانەدا هی وا هەن، ژن دێنن، منداڵ دەخەنەوە، بۆ ماوەی چوار پێنج ساڵ جێگیر دەبیو لە یەك شوێندا دەژی، کەچی لە پڕێکا، بەیانییەك هەڵدەستیو ژنو منداڵەکەی بەجێ دێڵیو کەس نازانێ بۆ کوێ سەری خۆی هەڵدەگرێت. ڕۆژێکیان لە زینداندا یەکێك لەوانەیان نیشاندام کە ماڵو منداڵەکەی بەجێ هێشتبوو. ئەمە نە هیچ تاوانێکی کردبوو، نە هیچ گومانێکی لەسەر بوو، کەچی لە ماڵ هەڵاتبوو و دەستی بەژیانی ئاوارەییو سالوکی کردبوو، هەموو ژیانی بە ئاوارەیی بەسەر بردبوو. بەو ئاوارەییە سەرانسەری رووسیای تەی کردبوو:لە باشووری وڵاتەوە بۆ ئەوبەری روباری دانوبو لەوێندەرەوە چووبوو بۆ دەشتو بیابانی کرخیزو هەموو سیبیریای ڕۆژهەڵات گەڕابوو،و سەرانسەری قەفقازی تەی کرد بوو. ئیدی شوێن نەما بوو بۆی نەچووبێ. لەوە بوو ئەم پیاوە، ئەم ئاشقە گەڕانە، ئەگەر بۆی لوابا و هەلومەرجی بۆ هەڵکەوتبا ببوایە بە ڕۆبنسون کروزۆیەك! هەڵبەتە من لە زیندانییەکانی ترەوە ئەم شتانەم دەربارەی بیستبوو، چونکە زۆر کەمدوو بوو، لە حاڵەتی زۆر زەروریدا نەبوایە هەر قسەی نەدەکرد. جووتیارێکی کورتە باڵای ریوەڵە بوو، تەمەنی پەنجا ساڵێك دەبوو، کابرایەکی هێمنو ئارام بوو، کە دەتڕوانییە دەموچاوی جۆرە گێلییەکت لە سیمادا دەخوێندەوە. ئارامیەکی شێتانەی پێوە دیار بوو. زستانان حەزیدەکرد لەبەر هەتاوەکە دانیشێتو لەبەر خۆوەو لە بن لێوانەوە گۆرانی بڵێو سۆزە بکات، بەڵام هێندە بە هێواشی گۆرانی دەگوت، دوو هەنگاو لێی دووربکەوتبایتەوە گوێت لە دەنگی نەدەبوو. کابرایەکی نە دوو و کەمخۆر بوو، خواردنی سەرەکی نانی بۆر بوو. باوەڕ ناکەم بە عەمراتی نانێکی سپی خواردبێ یان قاپێ شەرابی کڕی بێت، باوەڕناکەم بە حەیاتی پارەی بە خۆوە دیتبێ، نەیدەزانی پارە بژمێرێ. زۆر خەمساردو بێ موبالات بوو گوێی بە هیچ نەدەدا، دنیای دابووە بەر کلکان. هەندێجار بە دەستی خۆی خواردنی بە سەگەکانی زیندان دەدا، کەسی تر ئەو کارەی نەدەکرد، چونکە رووس بە گشتی سەگ بە گڵاو دەزاننو حەزی لێناکەن. دەڵێن گوایە دووجار ژنی هێنا بوو،و چەند منداڵێکی لە شوێنێکی دوورە دەستی روسیادا هەبوو... بۆچی هەواڵەی زیندان کرا بوو؟ هیچ شتێك لەو بارەیەوە نازانم... بەڵام هاوزیندانیەکانمان هەمیشە لەو باوەڕەدا بوون مەحاڵە هەڵنەیەت... کە تا ئەو کاتە داسەکنی بوو،و هەڵنەهاتبوو، لەبەر ئەوە بوو دەرفەتی بۆ هەڵنەکەوتبوو، یان لە خۆی ڕانەدەبینیو بە خۆیا ڕانەدەپەرموو. فرِی بەو ژینگە بێگانەیەوە نەبوو کە تێی کەوتبوو. لەوە تەریكو گۆشەگیرتر بوو کە پەیوەندی دەگەڵ هیچ کەسێکدا پەیدا بکات، ئیدی سەری خۆی کز کردبوو و بە هێمنی ڕۆژی بەسەر دەبرد. باشە ئەگەر هەڵاتبا چ قازانجێکی دەکرد ؟ ئەلهەقی ژیانی ئاوارەییو دەربەدەری نێو جەنگەڵو بێشەڵانان، لە چاو ژیانی ناو زینداندا، بە هەشتە. ڕاستە ژیانی ئاوارەییو چەتەگەری قورسو زەحمەتە، بەڵام بەلای کەمەوە ژیانێکی ئازادە، لەبەر ئەوەیە هەر زیندانییەك، لە هەر شوێنێکی رووسیادا بێ،

لەگەڵ یەکەم رۆژی بەهارا، دەخرۆشیٚ‌و جمو جوڵی پێدەکەویٚ. بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە هەموو زیندانییەکان بڕیاری هەڵاتن بدەن. نەخێر، رەنگە تەنیا لە سەدا یەك کەس بڕیاری هەڵاتن بدات، ئەوانی دی هەردەمن، دەترسن لەو کۆسپ‌و تەگەرانەی کە لەگینە بێتە ڕێیان، لەو قەساسە دەترسن لەگینە تووشی بن. یانی لە سەدا نەودو نۆیەکەی دی، تەنیا بە خەیاڵ بیر لە هەڵاتن دەکەنەوە،و دڵخۆشی خۆیانی پێدەدەنەوە، خەون بەوەوە دەبینن کەی‌و چۆن هەڵبێن ؟ ئیدی ئەم خەون‌و خەیاڵە، خۆی لە خۆیدا دەبێتە مایەی دڵخۆشیان‌و باری سەرشانیان سووك دەکات... من لێرەدا مەبەستم تەنیا ئەو زیندانیانەیە کە حوکم دراون، بەڵام ئەوانە دەست بەسەرن‌و هێشتا حوکم نەدراون زۆر ئاسانتر بڕیاری هەڵاتن دەدەن. بەڵام حوکمدراوەکان تەنیا لە سەرەتای حەپسیەکانیاندا بیر لە هەڵاتن دەکەنەوەو هەڵدێن، هەرکە یەك دوو ساڵ بەسەر مانەوەیان لە زینداندا تێپەڕی، ئیدی مل بۆ واقیع دەدەن‌و هەست دەکەن باشتر وایە ماوەی حەپسییەکەیان بە گوێرەی یاسا تەواوبکەن‌و لە کۆڵۆنییەکدا ئاکنجی بن... ئەوەیان باشترە لەوەی بکەونە ریسککاری‌و سەرنەکەون‌و هێندەی دی گیرۆدە بن، چونکە لە دەیا، یەك کەس ئەگەری سەرکەتنی هەبوو، ئەگەری سەرکەوتنی "گۆڕینی چارەنووسی خۆی" هەبوو. ئەم هەوڵی هەڵاتنەیان ناو نابوو " گۆڕینی چارەنووس ". زیاتر ئەو زیندانییانە ئەم ریسککاریانەیان دەکرد، کە حوکمەکەیان زۆرو دوورو درێژ بوو. ئەوانەی کە پازدە ساڵ‌و بیست ساڵ حوکم دەدران، هەستیان دەکرد، حوکمەکەیان یەجگار زۆرەو هەر نابڕێتەوە.... دیارە دەبیٚ ئەوەش بڵێین کە ئەو داغمەیەی بەزیندانیانەوە دەنرا، ئەویش بۆ خۆی کۆسپ‌و تەگەرەیەکی گەورە بوو لەبەردەم هەڵاتندا. جا زاراوەو دەستەواژەی " گۆڕینی چارەنووس " زاراوەیەکی تەکنیکی پڕ بە پێستی حاڵەتەکە بوو. چونکە ئەوانەی لە کاتی هەوڵی هەڵاتندا دەگیران، بەو ناوەوە پرسوجۆیان لێدەکرا کە ویستوویانە " چارەنووسی خۆیان بگۆڕن "... جا ئەم دەربڕین‌و زاراوە مەیلەو ئەدەبیە، دەقاودەق، ئەو هەوڵی گۆڕانەی بەرجەستە دەکرد. زۆر بە باشی هەڵیان بژارد بوو، پڕ بە پێستی حاڵەتەکە بوو. هیچ هەڵاتوویەك، بە تەمای ئەو نەبوو، بە تەواوەتی ئازاد بیٚ، چونکە دەیزانی ئەمە مەحاڵە، هەرکاتیٚ بگیریٚ دەگیرێت، بەڵام دەیویست بنێردریٚ بۆ زیندانێکی تر، لە شوێنێکی تری وڵاتدا ئاکنجی بکریٚ، جارێکی دیکەو لەسەر تاوانێکی دی کە لە دەربەدەریدا دەیکرد، دادگایی بکرێتەوە، دەیویست بۆ هەر شوێنێکی دەنێرن بینێرن، بە مەرجیٚ ئەو شوێنە، هەمان ئەم زیندان‌و گرتووخانەیە نەبیٚ، کە لێی وەڕەزو بێتاقەت بوو بوو، زیندانە تازەکە هەر چۆنیٚ بیٚ بۆ خۆی جۆرە گۆڕانێکە!

زۆر جار ئەو زیندانییە هەڵاتووانە، کە لە وەرزی هاویندا پەناگەیەکیان بۆ مانەوەی زستانیان دەست نەدەکەوت یان کەسێکیان نەدەدۆزییەوە کە بە هیمەت یان بە قیمەت پەنایان بدات‌و بیان شارێتەوە یان ئەگەر بە تاوان‌و پیاوکوژیش بووە، نەیان دەتوانی پەساپۆرتێك پەیدا بکەن‌و بەبیٚ خەم پێی بسوڕێنەوە، هەموو ئەوانە لە وەرزی پایزدا روویان دەکردەوە شار، ڕادەستی زیندان‌و حەپسخانەکان دەبوونەوەو دانیان بە خەتاباری خۆیاندا دەناو ئیدی زستانەکەیان لە زیندان، ژێراو ژێر بە ئومێدی ئەوە دەبردە سەر کە لە هاوینی داهاتوودا، جارێکی دی هەڵبێنەوە.

بەهار کاری لە دڵو دەروونی منیش کرد. ئێستاش لە بیرمە بە چ تاسەو تامەزرۆییەکەوە، لە درزی دیواری حەوشەکەوە دەمڕوانییە ئاسۆی دوور! سەرم بە درزی دیوارەکەوە دەناو بە سەعات چاوم دەبڕییە سەوزەگیای ناو خەنەکی پەنای دیوارەکە، لە ئاسمانی شینو ساف ڕادەمام، لە تەمەشای ئەم دیمەنانە تێر نەدەبووم، بێزارو بێتاقەت نەدەبووم. ڕۆژ بە ڕۆژ خەمو پەژارەم زیادی دەکرد، ڕۆژ بە ڕۆژ پتر لە زیندان بێزار دەبووم، تا ئومێدی بەرۆکی دەگرتم. هەروەها ڕقو بوغزی زیندانییەکان، لە هەوەڵی ماوەی حەپسییەکەمدا، لەبەر ئەوەی سەر بە چینی ئەشرافو خانەدانان بووم، بە جارێ ژیانی لێدەکردم بە دۆزەخ. بۆیە زۆرجار بەبێ ئەوەی نەخۆش بمو پێویستم بە نەخۆشخانە بێ، هەر بۆ ئەوەی لەو بوغزو کینەیە رزگاربم، داوام دەکرد بۆ نەخۆشخانەم بنێرن. زیندانییەکان پێیان دەگوتین: " ئەی مەعشەری ئەشرافان ئێوە دەنووکی ئاسنتان هەیە، کە مسکێنی ئێوە بووین، بە دەنووك هەڵتان دەدڕین..." زۆرجار بەغیلیم بە ڕەشو رووتان دەبرد، هەرکە دەگەیینە زیندانەکە، زیندانییەکان یەکسەر دەبوون بە هاوڕێو دۆستیان! بەو جۆرە کە بەهار دەهات، بەجارێ خەم دای دەگرتمو تاسەی ئازادیو جوانی سروشت دەیهاڕوژاندم. من لە هەفتەی شەشەمی ڕۆژووی گەورەدا سرووتە ئاینییەکانی خۆم بە جێ هێنا. عەریفەکە زیندانییەکانی کرد بە شەش دەستەوە ( بە گوێرەی ژمارەی هەفتەکانی ڕۆژوو) تا هەر دەستەیەو لە هەفتەی خۆیداو بە نۆرە سرووتی ئاینی خۆی بە جێ بێنێ. هەر دەستەیەك لە ٣٠ کەس پێکهاتبوو. ئەو هەفتەیە زۆر ئاسوودەو دڵخۆش بووم! ڕۆژی دووجار یان سێ جار دەچووین بۆ کڵێسا، کڵێساکە زۆر لە گرتووخانەکەوە دوور نەبوو. لە مێژ بوو نەچوو بووم بۆ کڵێسا. ڕێوڕەسمی ڕۆژووی گەورە، ئەو ڕێوڕەسمەی هەر لە منداڵییەوە زۆر چاکم دەزانی، چونکە لە ماڵی خۆماندا زۆرم بیستبوو و دیتبوو، ئەم ڕێو رەسمو قوداسەی کە بریتی بوو لە نوێژو وێردو پاڕانەوەو کڕنۆش، ڕابردوویەکی دووردووری لە دڵو دەروونما ژیاندەوە، کۆمەڵێك هەستی زۆر کۆنی لە هەستو نەستمدا بێدارکردەوە. ئێستاش لە بیرمە چەند شادو خۆشحاڵ بووم کە بەیانیان بەسەر شەختەو زوقمدا دەچووین بۆ ماڵی خودا. هەڵبەتە بە چاودێری پاسەوانانی تفەنگ بە شان بۆ کڵێسا دەبراین. پاسەوانەکان نەدەهاتنە ناو کڵێساکە. کە ئێمەش دەچووینە ژوورەوە، هەمووومان لای دەرگاکەوەو لە ریزی دواوە کۆدەبووینەوەو دەوەستاین، لە دووری دوورەوە گوێمان لە دەنگی ڕەبەنەکە دەبوو کە لە ناخی دڵەوە وێردی دەخوێندو نوێژی دەکرد،و ناو بە ناویش لەسەر نوێژکەرەکانەوە جبە ڕەشەکەی یان سەرە سافەکەیمان دەبینی. هەنگێ بیرم کەوتەوە کە چۆن بە منداڵی حەزم دەکرد تەمەشای ئەو خەڵکە ڕەشو رووتە بکەم کە لەبەر دەرگای کڵێساکەدا خڕدەبوونەوەو کە ئەفسەرێکی گەورە، یان ئەشرافێکی ورگن یان خانمێکی خۆشپۆش دەهاتن، بەلەز دەکشانەوەو ڕێگەیان بۆ چۆڵ دەکردن، هەر خەڵکی بوو بۆ ریزی پێشەوە تاوی دەدا. زۆر جار خەریك بوو لەسەر ریزی پێشەوە لێیان ببێ بە شەڕ، بە منداڵی وام هەست دەکرد، ئەو شوێنەی لای دەرگاکەوە، باشترین شوێنە کە مرۆڤ نوێژی تیا بکات، بە ئیمانەوە لە حوزوری خوادا بوەستێو بە قەناعەتەوە کڕنوشی بۆ بباتو لەزەتی روحی لەو سرووتو ڕێوڕەسمە ببینێ.

قەت بیرم لەوە نەدەکردەوە رەنگە رۆژێ لە رۆژان، لەو شوێنەدا، لە شوێنی ڕەمەکی مەردمدا بوەستم، کەچی ئەوەتا رۆژگار هاتوچوو، وا لە هەمان شوێنی رەشوروتان وەستاوم،و هەزار خۆزگەم بەوان، بەس نەبوو ئەوان خەڵکێکی ئازادو دروستکار بوون، من وەکو تاوانبار دەستو پێ بە کۆتو زنجیر، تەریقو شەرمەزار وەستاوم. خەڵکی خۆیانمان لێ لادەدەن، سڵمان لێدەکەنەوە، خێرمان پێدەکەن. ئێستاش لە بیرمە کە لەزەتێکی زۆرم لە وەرگرتنی ئەو خێرو سەدەقانە وەردەگرت. لە دڵی خۆدا دەمگوت: " ئیرادەی خوایە !" زیندانییەکان زۆر بە گەرمی، بەدڵو بەگیان نوێژو عیبادەتیان دەکرد. هەر زیندانییەك بە گوێرەی توانا، پارەو پولێکی دێنا تا مۆمێکی پێ بکڕێت یان بیخاتە سەندووقی خێرو کۆمەکانەوە. دیارە دڵیان بەو کارەی خۆیان خۆش دەبوو،ورەنگە لە دڵی خۆدا گوتبێتیان: " ئێمە هێشتا بەشەرینو، هەموو بەشەریش لەبەردەم یەزداندا چوون یەكو یەکسانن!....". دوای نوێژی سەعات شەش قوربانیمان دەخوارد. تا ڕەبەنەکە بە دەم بەرزکردنەوەی جامی قوربانەکەوە دەگەییە ئەو ئایەتەی کە دەیگوت: "خودایا رەحمم لێ بکە وەکو چۆن رەحمت بەو دزەدا کردو رزگارت کرد...." ئیدی هەموو زیندانییەکان بە دەم زڕەی زنجیرەوە دەچوونە سوجدە. لەوە دەچوو خۆیان لەو وشانەدا ببیننەوەو وا هەست بکەن دەقاو دەق بۆ ئەوان گوتراوە.

هەفتەی مقەدەس هات، ئیدارەی حەپسخانەکە هێلکەی جەژنی پاكو، سەرو نانی سپیان داینێ. لە شارەوە خێرو سەدەقەمان بە سەردا داباری. بە هەمان دەستووری جەژنی نوئیل، جەژنی پاکیش بەرپا کرا: سەردانی ڕەبەن بە خۆیو خاچەکەیەوە، سەردانی سەرانی زیندان، دابەشکردنی شۆربای کەلەرمی بەڕۆنی بەراز لێنراو، بە شینەوەی شیرینیو نوقوڵ، لەگەڵ یەك جیاوازیدا، ئەویش ئەوە بوو، ئێمەی حەپس دەمانتوانی بچینە حەوشەو خۆمان بدەینە بەر هەتاو. ئێستا هەموو شتێك روناکترو کراوەترە، بەڵام لە هەمان کاتدا خەمناکترە. رۆژگاری هاوین خۆی لە خۆیدا درێژە، لە جەژنو بۆنەکاندا درێژتر دەبوو، رۆژ ناخۆشتر بوو لە رۆژانی کارو بێگار، چونکە بەلای کەمەوە ماندوویەتی ، درێژی رۆژەکەی لە بیر دەبردیتەوە...

هەڵبەتە کاری هاوین زۆر ناخۆشترو قورستر بوو لە کاری زستان. زیندانییەکان لە هاویندا بە سەرپەرشتیو ئەمری ئەندازیاران دەچوونە ئیش، ئیشەکەش یان بیناکردن بوو یا ئەرز هەڵکەندن یان کەرپوچسازی، یان نۆژەنکردنەوەی بینایاتی حکومەتی یان ئاسنگەریی یان دارتاشی یان بۆیەکاری. هەندێك دەبران بۆ کارگەی کەرپوچسازیو کەرپوچیان لە کوورەدا سوور دەکردەوە، ئەو کارەمان لە هەموو کارەکانی دی پێ قورستر بوو. ئەم کارگەیە چوار فەرسەخێك لە بەندیخانەکەمانەوە دووربوو. بە درێژایی هاوین، هەموو بەیانییەك، لە سەعات شەشدا، دەستەیەکی پەنجا نەفەریان لە زیندانییەکان بۆ ئەوێندەر دەنارد. دیارە زیاتر ئەو کەسانە بۆ ئەوێ دەنێردران کە غەشیم بوونو هیچ کارو پیشەیەکیان نەدەزانیو لە هیچ کارگەیەکدا کاریان نەدەکرد. ئەو زیندانییانەی بۆ کارگەی کەرپوچسازی دەنێردران، نانی نیوەڕۆیان دەگەڵ خۆدا دەبرد، چونکە لەبەر دووری رێگا نەیان دەتوانی بۆ فراڤین بگەڕێنەوە بۆ زیندانەکەو بۆ نیوە رۆژەیەك هەشت فەرسەخان بەم سەرو بەوسەر بڕن. ئیدی لەوێ کاری هەموو

رۆژەکەیان بۆ دیاری دەکرا، بەڵام ئەم کارانە ئەوەندە زۆر بوون کەس نەیدەتوانی تەواوی بکات. دەبوایە هەوەڵجار ئەرزەکە هەڵکەنن‌و گڵی سوور دەربێنن، بیگوازنەوەو لە چاڵێکا بیگرنەوەو بە پێیان بیشێلن‌و، دوای ئەوە خشت‌و قەرمیدی لێدروست بکەن، نزیکەی دوو سەد، دوو سەدو پەنجا خشت‌و قەرمیدی لیٚ دروست بکەن. من تەنیا دوو جاران چووم بۆ کارگەی خشت سازی. ئیدی زیندانییەکان کە ئێواران بەسەر وسەکوتی تۆزاوی‌و بەوپەڕی ماندوویەتی دەگەڕانەوە بۆ زیندان، دەکەوتنە گلەیی‌و گازاندە لەوانی دی کە ئیشە قورسەکەیان بە ملی ئەواندا داوە. پێموا بوو گلەییەکەیان زیاتر لەو رووەوە بوو کە بڕێك خەمی دڵی خۆیان بە با بدەن‌و دڵخۆشی خۆیانی پیٚ بدەنەوە. هەندێکیان هەبوو حەزیان لەم کارە دەکردو لە کاری تریان پیٚ خۆشتر بوو، لەبەر ئەوەی یەکەم لە شار دەردەچوون‌و دەگەییشتنە کەناری روباری ئەرتیش کە شوێنێکی بەرفراوانی دڵگیر بوو،ودیمەنی دەرێی شار زۆر جوانترو دڵگیرتر بوو لە بینا قێزەونە حکومەتیەکان‌و، دووەم چونکە دەیانتوانی بە کەیفی دڵی خۆیان، بەوپەڕی ئازادی سەبیل بکێشن‌و دووکەڵ بکەن،و بگرە بۆ ماوەی نیو سەعاتێك لەسەر سەوزەگیای ئەو دەشتەدا راکشێن‌و پشوو بدەن.

بەڵام من یان لە کارگەکەدا کارم دەکرد، یان بەردی گەچم دەشکاند، یان خشتم دەگواستەوە. نزیکەی دوو دانە مانگ، خشت گواستنەوە بوو بە کارم . دەبوایە خشت لە ڕەخی روباری ئارتیشەوە بۆ ماوەی سەدو چل مەتران بەرم‌و لەوێوە خەندەکی قەڵاکە ببڕم تا دەگەییشتمە ئەو بینایەی کە خەریکی دروستکردنی بوون، ئەم کارە، هەرچەندە ئەو پەتەی خشتەکانم پیٚ دەگواستەوە شانی دەبڕیمەوەو دەیڕوشاند، ریٚك پڕ بە پێستی من بوو. ئەوەی کە دڵی خۆش دەکردم، ئەوە بوو کە ئەم کارە خۆی لە خۆیدا وەرزش بوو، بە ئاشکرا ماسولکەکانمی بە هێز دەکردو هێزو توانام تێدەگەڕا. لە سەرەتاوە نەمدەتوانی بە کەڕەتیٚ هەشت خشت هەڵگرم، هەر خشتێك نزیکەی دوازدە رەتڵ دەبوو. بەرە بەرە وام لێهات دەمتوانی دوازدە، بگرە پازدە خشت هەڵگرم، زۆر دڵم بەوە خۆش بوو. چونکە چەند پێویستم بە هێزی دەروونی بوو، ئەوەندەش پێویستم بە هێزی بەدەنی بوو، تا بتوانم، باری قورسی ئەو ژیانە شووم‌و نەعلەتیە هەڵگرم‌و بەرگە بگرم.

من دەمویست کە لە زیندان دەرچووم، بژیم. بۆیە لەزەتم لە خشت گوێزانەوە دەبینی، نەك هەر لەبەر ئەوەی جۆرە وەرزشێك بوو و جەستەی دەبوژاندمەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەش بوو دەچووم بۆ کەنار روباری ئارتیش. بۆیە زۆر باسی ئەم شوێنە دەکەم، چونکە تاقە شوێنیٚ بوو کە دەمتوانی پشت لە زیندان تەماشای دەشتی بەرینی خوا بکەم، ئاسۆی دووری رووناك بدینم، دەشت‌و بیابانی رووتەنی بیٚ پایانی ئازادو چۆڵ بدینم، کە رووتەنیەکەی کارێکی سەیری لە دڵ‌و دەروونم دەکردو ئۆخژنێکی سەیری پێدەبەخشیم. بەڵام مەیدانەکانی دیکەی کارو بێگار هەر هەمووی لە نێو زیندانەکەو دەوروبەریدا بوون، هەر لە یەکەم رۆژی زیندانییەکەمەوە، لەم زیندانە، لە بینایەکانی بێزار بووم، بە تایبەتی لەوماڵەی کە مێجەر تیایدا دەژیا، تەحا کە بە لامەوە قێزەون بوو، هەرکە بەلایا تێدەپەڕیم،و تەمەشام دەکرد، نیگام پڕ دەبوو لە کەرب‌و کینە.

بەڵام کەناری روبارەکە وانەبوو، لەوێ پیاو دەیتوانی بەدەم تەمەشای ئاسمانی بەرینەوە، بەدەم تەمەشای بیابانی بێ پایانەوە، بەلای کەمەوە خۆیو بەدبەختی خۆی لە بیربکات، وەکو چۆن زیندانی کاتێ لە تەلبەندی زیندانەوە،لە شیش بەندی زیندانەکەیەوە دەڕوانێتە دەرێ، دەڕوانێتە جیهانی ئازاد، زیندانەکەی لە بیر دەکات. گشت شتێکی ئەو شوێنەم بەلاوە دڵگیرو ئازیز بوو: هەتاوی پرشنگداری ئاسمانی بێ پایانی شینو ساف، سەدای دوورە دەستی گۆرانیو سترانی ئەو قەرخیزیانەی لەوبەری روبارەکەوە دەهاتن...

زۆر جار چاوم دەبڕییە کوختەیەکی هەژارانەی دووکەڵاوی یەکێك لە بیابان نشینەکانی ئەو ناوە!.... زۆر جار چاوم لەو دووکەڵە شینباوە دەکرد کە بە ئاسماندا بڵاودەبووەوە، دەمڕوانیە ئەو ژنە قەرخیزیەی چەند سەر پەزێکی دەلەوەڕاند!.... راستە دیمەنێکی سامناكو قاقڕ بوو، بەڵام ئازاد بوو.... لە پڕ باڵندەیەکم دەبینی ئاسمانی شینو ساف دەدایە ژێر باڵی فڕین، لە بەرزییەکی بەرزەوە دادەکشا... بە ئاستەم خۆی بە ئاوی روبارەکەدا دەدا، دیسان بەرز دەبووەوە، بەرز دەبووەوە تا لە قوڵایی ئاسماندا دەبوو بە خاڵێکی بچووك... تەنانەت ئەوگولیلکە بەستەزمانانەش کە لە درزێکی کەنارەکەدا سیس دەبوونو هەڵدەوەرین، لە سەرەتای بەهارا سەرنجیان ڕادەکێشامو سۆزو گودازیان بێدار دەکردمەوە... ئەو خەمو پەژارەیەی کە لە ساڵی یەکەمی زیندانیەکەمدا، چۆکی بەسەر سینەمدا دادابوو، لە کێشا نەبوو، زۆری نیگەران دەکردمو دەماری دەگرتم. ئەم نیگەرانیە لە هەوەڵەوە کردییە کارێك کە نەتوانم سەرنجی ئەو شتانەی دەوروبەرم بدەم. چاوم دەنوقاندنو نەمدەویست هیچ شتێك بدینم. کەسێکم نەدەبینی بڕێك بە ئاوەزو هەستیار بێ، قسەیەکم نەدەبیست سۆزێکی تیا بێ، ئیدی تەوسو توانجی ژاراوی وەکو باران بەسەرما دادەباری.... هەرچەند ئەو قسانە زۆر بە ئاسایی دەکران، هیچ مەبەستێکی شاراوەیان تێدا نەبوو،و لە کانگای دڵی کەسانێکەوە دەردەچوو کە لە من زۆرترو زیاتریان بەسەر هاتبوو. بەڵام ئەو لالەوەڕییە لە پای چی؟

ماندوو بوونی زۆرم پێخۆش بوو، ئەو رۆژەی شەکەتو ماندوو بوایەم، باش دەخەوتم. خەوی وەرزی هاوین لە چاو خەوی وەرزی زستاندا، عەزابێکی گەورە بوو، بەڵام پیاو هەق بڵێ هەندێ ئێوارانی زۆر خۆشیشی تێدەکەوت... کاتێ خۆر ئاوادەبوو، دنیا فێنکی دەکرد، شەو سارد دەبوو... ئیدی کەشو هەوای بیابانان وایە... زیندانییەکان بە دەم چاوەڕوانی ئەوەوە کە بکرێنە ژوورو قاوشەکانەوە، بڕبڕ بەدەم قسەو باسەوە پیاسەیان دەکرد، یان لە موبەقەکەدا کۆ دەبوونەوەو ئیدی کۆڕی قسەو باسان لەوێ گەرم دەبوو.... لەوێ ئەو دەنگۆو هەواڵانەی لە دەرەوە دزەیان دەکردو دەگەییشتنە نێو زیندانەکە، دەخرانە بەر باسو گەنگەشان، هەڵبەتە زۆربەی کات ئەو دەنگۆو هەواڵانە، دەنگۆو هەواڵی، پڕوپوچو نابەجێو مەحاڵ بوون، بەڵام هەمیشە جێگەی بایەخی ئەو خەڵکە بوون کە لە کۆمەڵگە دابڕێنرا بوون. بۆ نموونە یەکێك لەو دەنگۆیانە ئەوە بوو دەیانگوت مێجەر دەرکراوە. زیندانییان وەکو منداڵ وان، زۆر خۆشباوەڕن، بە هەموو شتێ باوەڕدەکەن، سوور دەزانن ئەم هەواڵە درۆیە،و دەرکردنی مێجەر ماقووڵ نییە،و ئەو پیاوەی هەواڵەکەی بڵاوکردووەتەوە (کفاسوف)ـە کە بابایەکی درۆزنە، کەچی زۆر بە جدی

هەواڵەکە وەردەگرن، موناقەشەی دەکەن، کەیفیان پێدێتو دڵخۆشی خۆیانی پێدەدەنەوە، کەچی زۆری پێناچێت درۆکە ئاشکرادەبێت، شەرمەزارو تەریق گلەیی لەخۆ دەکەن کە چەند خۆشباوەڕ بوونو چۆن ڕێگەیان داوە کەسێکی وەکو کفاسوف فریویان بدات. زیندانییەك لەلاوە هەڵدەداتیٚو دەڵێت:

– کیٚ دەتوانیٚ دەری بکات ؟ خەمی ئەوت نەبیٚ، پشتی ئەستوورە، کەس ناتوانیٚ پشتی لە عاردی بدات، دەزانیٚ چۆن پێگەو پایەی خۆی بپارێزێت !

زیندانییەکی دیکەی زرینگو زیتەڵی، قسەزانوگەنگەشەکار، پڕئەزموونو دنیادیدە، هەڵدەداتیٚو دەڵێت:

– باشە لەو گەورەتر نییە ؟ ماری مارانخۆر نییە ؟

یەکێکی دی، گرژو مۆنو سیما پەست، وەك ئەوەی خۆی بدوێنیٚ دەڵێت:

– گورگ یەکدی ناخۆن .

ئەو زیندانییەی ئەو قسەیەی کرد، پیاوێکی سەر سپی بوو، لە سووچێکدا کزکۆڵەی کردبوو،و شۆربای کەلەرمی دەخوارد.

زیندانییەکی چوارەم: قامك بە ژێی بالالایکاکەیدا دێنیٚو بەوپەڕی خەمساردیو بیٚ موبالاتی دەڵێت:

– لەوە دەچیٚ بە تەما بی، بەرپرسان بێن راوێژ بە تۆ بکەنو چاوەڕوانی قسەی تۆ بن کە دەری بکەن یان نا ؟

یەکێکی دی، بە توندیو بە توڕەیی وەڵامی دەداتەوە:

– جا بۆ پرسو راوێژ نەکەن ؟ برادەرینە ئەگەر پرسیاریان لێکردن بەڕاشکاویو بیٚ دوو دڵی وەڵام بدەنەوە. هەرچییەکتان هەیە بیڵێن. بەڵام نا... ئێمە فێرین لە ناو خۆماندا دەیکەین بە هەراو هەنگامەو گەنگەشەیەك کلکی کەری تیا دەپچڕیٚ، کەچی هەرکە کاتی کارو چوونە سەر کار دێت، قوڕو قەپ دەدەینەوە کەندیٚ.

بالالایکاژەنەکە دەڵێت:

– ئەی وایە!... لەبەر دوو شتی وا بێگارەزیندان(سجن الاعمال الشاقە) دانراوە!

زیندانییەکەی پێشوو، بێئەوەی گویٚ بگریٚو بزانیٚ چ وەڵامێکی درایەوە، لە سەری رۆیی:

– دوێنیٚ پێریٚ تۆزیٚ پاشماوەی ئاردمان کۆکردبووەوە دەمانویست بیفرۆشینو سوودێك لە پارەکەی وەربگرین، کەچی چاودێرەکەمان خەبەری لێداینو هاتنو دەستیان بەسەر ئاردەکەدا گرت... هەڵبەتە تا بۆ خۆیان بیفرۆشن!... ئەمە ڕاستە یان نا ؟

– کیٚ دادت دەپرسێت، دادت دەبەیە لای کیٚ ؟

– دەیبەمە لای کیٚ ؟ دەیبەمە لای ئەو سەرپەرشتیارە تازەیەی کە بەم زووانە دێت.

– کام سەرپەرشتیار ؟

– ڕاستە هاوڕێیان، بەم زووانە سەرپەرشتیار دیٚ!

ئەو زیندانییەی ئەو قسەیەی کرد، گەنجێکی خورتی خوێنەوار بوو، کتێبی "دۆشس دی لافالییر"و ئەو جۆرە کتێبانەی خوێندبووەوە ، کاتی خۆی لە سوپادا عەریف بوو. پیاوێکی حەنەکچیو قۆشمەباز بوو، بەڵام زیندانییەکان لەبەر شارەزاییو خوێنەوارییەکەی ڕێزیان دەگرت. هەرکە ئەو قسەیەی کرد، بێ ئەوەی گوێ بە گەنگەشەو مشتو مڕی زیندانییەکان بدات، هەستاو یەکسەر بۆ لای ئاشپەزەکە ڕۆییو لێی پرسی ئاخۆ جگەر ماوە ( زۆر جار ئاشپەزەکان ئەو جۆرە خواردنانەیان دەفرۆشت. دەچوون جگەرێکی تەواویان دەکڕی، دەیانجنی وپارچە پارچە بە زیندانیەکانییان دەفرۆشتەوە. ئاشپەزەکە لێی پرسی:

– بایی چەند ؟ بایی دوو کۆبیك یان چوار ؟

– بایی چوار کۆبیك، با خەڵکی کام بکەن... هاوڕێیان، جەنەراڵێك، جەنەراڵێکی راستەقینە لە پوترسبۆرگەوە دێت بۆ تەفتیشی سیبیریا. ئەمە ڕاستە. ئەم قسەیە لە ماڵی ئامیرەوە بڵاوبووەتەوە.

ئەم هەواڵە، زیندانییەکانی بە جارێ هاڕوژاند. زیندانییەکان نزیکەی چارەکە سەعاتێك گەنگەشەی ئەوەیان کرد کە ئەم جەنەراڵە کێیە، نازناوی چیە، ئاخۆ لە جەنەراڵەکانی شارەکەی ئێمە گەورەترە یان نا ؟ زیندانییان زۆریان حەز لە باسی پلەو پایەی بەرپرسانە،وحەزدەکەن بزانن کێ لەو بەرپرسانە لەوانی دی گەورەترە، کێ دەتوانێ پشتی کارمەندانی دی لە عاردی بداتو کێ پشت بۆ کارمەندانی دی دادەنەوێنێ ؟ ئیدی لەسەر باسی ئەو جەنەرالانە دەکەوتنە ململانێو دەمەقاڵەو هەندێجار دەیانگەیاندە شەڕە مستودەستان. دەبێ چ قازانجو بەرژەوەندییەکیان لەمەدا هەبێ ؟ کە گوێت لە زیندانییەکان دەبێ، باسی جەنەرالانو بەرپرسان دەکەن، یەکسەر بۆت بە دیاردەکەوێ کە ئەو زەلامانە لە کۆمەڵگەدا، بەر لەوەی زیندانی بکرێن، لە چ ئاستێکی ئەقڵیدا بوون. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێین کە باسی جەنەرالانو ئیدارەی باڵاو ئەو شتانە لە ناو ئێمەدا لە هەر باسێکی دی گرینگترو گەرمتر بوو.

ماسوف، کە پیاوێکی کورتە باڵای، دەموچاو سوورەی، توندە تەبیعەتی،کەم ئاوەز بوو،و هەر ئەو بڵاوی کردبووەوە کە مێجەر دەگۆڕدرێ، گوتی:

– کەواتە کوڕینە ڕاستە کە مێجەر دەگۆڕن.

پیرەمێرە گرژو خەمبارە پۆڕ سپییەکە، لە خواردنی شۆربایەکەی بووەوەو بە دەنگێکی پچڕپچڕ گوتی:

– بە بەرتیل دەمبەستی دەکات .

– بێگومان بەرتیلی دەداتێ. ئەم دزە سەروەتو سامانێکی زۆری دزیوە، بە تایبەتی کە پێش ئەوەی بۆ ئێرەش بێ هەر مێجەر بووە. ماوەیەك لەوەپێش خوازبێنی کیژی سەرۆکی کەشیشانی کردووە.

– بەڵام نەیگواستەوەو دەرکرا. ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە هەژارو نەبووە. خۆش خوازگار! تەنیا خاوەنی جلەکانی بەرێتی. پار لە جەژنی پاکدا، هەرچی هەبوو و نەبوو لە قومارا دۆڕاندی، فیدکا ئەوەی بۆ گێڕامەوە.

سکوراتۆف هەڵیدایەو گوتی:
– کوڕینە باوەڕم پێ بکەن، هەژارو ژن هێنانیان نەگوتووە. من تەجرووبەم هەیەو وەرن لە من بپرسن. پیاو زۆری پەلەیە، بەڵام لەزەتەکەی زۆر ناخایەنێ.
ئەو گەنجە خوێنگەرمە زیتەڵەکەی کە کاتی خۆی لە سوپادا عەریف بوو گوتی:
– تۆ پێت وایە ئێستا ئێمە هیچ ئیش‌و کارمان نیە گوێ لە تۆ بگرین باسی خۆتمان بۆ بکەی؟ بەڵام توکفاسۆف هەر زۆر کەری! ئەگەر پێت وابێ مێجەرێك بتوانێ بەرتیل بە جەنەراڵێکی سەرپەرشتیار بدات، ئەوا زۆر زۆر سەهویت! پێتوایە جەنەراڵێکی گەورەوگران لە پوترسبۆرگەوە بە تایبەتی بۆ ئەوە دەنێرن کە مێجەری هاوڕێت تەفتیش بکات ؟ ئەم بیرکردنەوەیە ئەوپەڕی گەوجیەتیە کوڕی باش! ئەم قسەیە لە من وەربگرە...
یەکێك لە ئاپۆراکە بە گومانەوە گوتی:
– یانی لات وایە لەبەر ئەوەی جەنەراڵە بەرتیل وەرناگرێ ؟
– هەڵبەتە... خۆ ئەگەر بەرتیلیش وەربگرێ، بەرتیلی گەورە وەردەگرێت.
– ڕاستە... بەرتیلیش بەگوێرەی پلەیە، تا پلەکە بەرزتر بێ دەبێ بەرتیلەکە زیاتر بێ !
کفاسۆف بە تۆنێکی بنجبڕ دەڵێت:
– هیچ جەنەراڵێك نیە بەرتیل وەرنەگرێت !
باکلۆشین لە پڕ قسەکەی پێ بڕی‌و بە تەوسەوە گوتی:
– باشە تۆ بەخۆت بەرتیلت بە هیچ جەنەراڵێك داوە، وا بەو دڵنیاییە ئەو قسەیە دەکەی ؟ باوەڕ ناکەم بە عەمراتت جەنەراڵێکت دیتبێ !
– بۆ نەمدیوە ؟ دیوومەو زیاتریش.
– درۆ دەکەی !
– تۆ درۆ دەکەی !
– باشە ئێستا من درۆکەت تاقی دەکەمەوە. کوڕینە ئێوە بە شایەد بن، ناڵێ جەنەراڵی دیتووە، با پێمان بڵێ کام جەنەراڵی دیتووە! دەی بیڵێ! من هەموو جەنەراڵەکان دەناسم !
کفاسۆف، بە دوو دڵی گوتی:
– جەنەراڵ زیبەرتم دیتووە.
–زیبەرت ؟ جەنەراڵی وا لە سوپادا نییە. ڕەنگە مەبەستت ملازم زیبەرت بێ کە لە کاتی شەلاقکارییەکەتدا یەك دوو جار پشتی دیتوویت، ئیدی تۆ لە ترسا، لێت بووە بە جەنەراڵ و بە جەنەراڵت زانیوە.
سکوراتۆف هاواری کرد:
– نا... برادەرینە گوێ لە من بگرن، چونکە من پیاوێکی ژندارو پوختەم. ڕاستە کاتی خۆی لە مۆسکۆ جەنەراڵێك هەبوو بە نێوی زیبەرت. کابرایەکی ئەڵمانی بوو،و بوو بوو بە رووسی. ئەم جەنەراڵە هەموو ساڵێك دەچووە لای قەشەو ئیعتراف بەو خەتایانە دەکرد کە دەگەڵ کچانی چکۆلەدا کردبوونی... وەکو مراوی ئاوی دەخواردەوە. بەلای کەمەوە چل پەرداخ ئاوی لە

رووباری موسکۆڤا دەخواردەوە. خولاٌمەکەی بۆی گێڕامەوە کە گوایە نەخۆشە، نەمزانی چ نەخۆشییەکیەتی، دکتۆران خواردنەوەی ئەو ئاوەیان وەکو دەرمان بۆ دانابوو.

زیندانییە بالالایکا ژەنەکە گوتی:

– دیارە ورگی حەوزی ماسییان بووە.

زیندانییەکی دیکە بە ناوی مارتینوف، کە پیاوێکی پیری بزێوی هەمیشە جەنجالْ بوو،و کۆنە سوپایی، بەشی سوارە بوو، خۆی لە قسەکان هەڵقورتاندو گوتی:

– ئەریٚ تۆزیٚ بێدەنگ نابن ؟ ئەم مەسەلەیە، مەسەلەیەکی زۆر جددیە، بۆچی وا کردووتانە بە فشقیاتو ڕابواردن ؟ باسی سەرپەرشتیار لە من بپرسن، سەرپەرشتیاری چی ؟

یەکێك لە گوماندارەکان گوتی:

– ئەوانە خەڵکی درۆزنن! خوا دەزانیٚ ئەم هەواڵەیان لە کێوە هێناوە! ئەمە هەمووی قسەی رووتە، فڕی بە راستیەوە نییە...

کولیکوف، کە تا ئەو کاتە بێدەنگ بوو، هەڵیدایەو گوتی:

– نەخێر... قسەی ڕووت نییە، ئەمجارەیان درۆ نیە.

کولیکوف، پیاوێکی سەنگینی پەنجا ساڵە، رەزا سووك بوو، هەڵسوکەوتو رەفتاری غروور ئامێز بوو. دەمارێکی قەرەجانەی تیا بوو، کاری بەیتاڵی دەکرد، پارەیەکی زۆری لە چارەسەری ئەسپان دەست دەکەوت، لە زیندانەکەدا ئارەقی دەفرۆشت، پیاوێکی گەوج نەبوو، بگرە زیرەکیش بوو، ئەمە جگە لەوەی یادگەیەکی پڕو دەوڵەمەندی هەبوو. بە ئەسپایی قسەی دەکرد، وشەکانی، وەکو ئەوەی زێڕو زیو بن، بە دانسقە هەڵدەبژارد. بە هێمنی لەسەر قسەکەی ڕۆیی:

– ئەم قسەیە ڕاستە. من هەفتەی رابردوو بیستم. ئەمە جەنەراڵێکی زۆر گەورەیە، بۆ پشکنینی سەرانسەری سیبیریا هاتووە. بێگومان بەریتل وەردەگرێت، بەڵام مێجەرە (هەشت چاوەکەی) ئێمە بەرتیلی ناداتیٚ! هەر ناوێریٚ بچێتە نزیکیشیەوە، چونکە ئێوە خۆتان دەزانن، جەنەراڵانیش گەورەو بچووکیان هەیە. هەموویان وەکو یەكو لە یەك ئاستو پلەدا نین. بەڵام من دڵنیاتان دەکەم کە مێجەرەکەی لەمەڕ خۆمان لەجێی خۆی دەمێنیٚ. چونکە ئێمە زمانمان نییە، دەمو پلمان نییە . هەقی قسەکردنمان نییە،و بێگومان بەرپرسەکانمان زمانی لیٚ نادەن، لە عەلەیی نادوێن، ئەفسەران یەکتر ناشکێنن، سکالاٚ لە یەکدی ناکەن. دەبینن یارۆی سەرپەرشتیار دێت بۆ زیندانەکەمان، چاوێکی پێدا دەگێڕیٚو دەڕواتو پاشان ڕاپۆرتێك بەرزدەکاتەوە کە هەموو کاروبارەکان بە ڕێكو پێکی دەڕۆنو هیچ کەمو کوڕییەك لە ئارادا نییە.

– ڕاستە، بەڵام مێجەر ترساوە. لە بەیانییەوە تا ئێستا سەرخۆشە.

– ئەم ئێوارەیە داوای دوو گالیسکەی کردووە.... هەڵبەتە بە قسەی فیدکا.

– ئێوە دڵی خۆتان بە چی خۆش دەکەن، چما ئەمە یەکەمجارە بە سەرخۆشی بیدینن ؟

زیندانییەکان هاڕوژان، لە نێوان خۆیاندا دەیانگوت:

– بەڕاستی نەهەقییە ئەگەر شتیٚ لەم مێجەرە نەکریٚ.

هەواڵی هاتنی سەرپەرشتیار لە سەرانسەری زیندانەکەدا بڵاوبووەوە. زیندانییەکان بەدەم باسی هەواڵەکەوە بەنێو حەوشەکەدا دەهاتن‌و دەچوون. هەندێك بەگەرمی خەریکی گفتوگۆ بوون. هەندێکی دی هێدی‌و هێمن هیچیان نەدەگوت، هەندێك خەمساردو بێ موبالات بوو. ژمارەیەکیش بە خۆو بالالایکاکانیانەوە لەسەر سەکۆی بەر دەرگاکان دانیشتبوون‌و خەریکی مۆسیقاژەنین‌و ستران چڕین بوون. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی زیندانییەکان خرۆشا بوون.

لە دەوروبەری سەعات نۆی شەودا، سەرژمێر کراین‌و خراینە قاوش‌و ژوورەکانەوەو دەرگاکانمان لەسەر داخرا.

وەرز وەرزی هاوین بوو، شەو، خۆی لە خۆیدا کورت بوو، ئێمەش سەعات پێنجی بەیانی هەڵدەستاین. بەو حاڵەشەوە کەس پێش سەعات یازدەی شەو نەدەخەوت، چونکە قسەو باس تا ئەو کاتانە هەر نەدەبڕایەوەو تەواو نەدەبوو، زیندانییەکان لە جم‌و جۆڵ‌و هاتوچۆ نەدەکەوتن... تەنانەت هەندێجار وەکو شەوانی زستان کۆڕی قومار دەبەسترا. گەرمی دنیا لە کێشا نەبوو. ڕاستە پەنجەرەکان دەکرانەوەو هەوای فێنکی شەو دەهاتە ژوورەوە، بەڵام زیندانییەکان لەسەر تەختە خەوەکانیان ئارامیان نەدەگرت‌و لێکدا لێکدا گینگڵیان دەدا. جا کێچ‌و مێشوولە چەند زۆر بوو! بە زستان زۆرمان هەبوو، بەڵام کە بەهار دەهات هێندەی دی زیادیان دەکرد، ئەگەر بە خۆم نەمدیتبا، باوەڕم نەدەکرد. جا لە هاویندا کێچ‌و پێشکە لە ڕادەبەدەر زیادی دەکرد. ڕاستە پیاو دەتوانێ دەگەڵ کێچ‌و پێشکەدا ڕابێ، بەڵام بەڕاستی عەزابە، عەزابێکە ئارام‌و حەوانەوەت لێ هەڵدەگرێت، نەخۆشت دەخات، تات لێ دێ!... خەوت لێ حەرام دەکات، کە دەنوویت وەکو ئەوەیە نەنوستبیت... ئەنجام لە بەرەبەیاندا، کە دژمنەکەت ماندوو دەبێت، لە فێنکی بەیاندا خەوت لێدەکەوێ، لە پڕ دەنگی دەهۆڵی نامۆبارەکی بێداریاش بەرز دەبێتەوە... سات بە سات دەنگی لێدانی دەهۆڵەکە بەرزو بەرزتر دەبێتەوە... هەزارو یەك نەفرەت بۆ ئەم دەهۆڵ کوتانە دەنێریت‌و خۆت لە پاڵتۆ فەروەکەتەوە دەپێچیت‌و ناچار لە دڵی خۆتا دەڵێی: بەزمەکەیە، ئەمە نە ڕۆژێکەو نە دووان‌و... سبەی‌و دوو سبەی‌و... بە درێژایی ساڵان دووبارە دەبێتەوە تا ئەو ڕۆژەی ئازاد دەبیت. جا کەی ئەو ڕۆژە دێت ؟ ئەم ئازادییە لە کوێیە ؟... چارنییە دەبێ هەستیت، زیندانییەکانی دەوروبەرت هەستاون، کەوتوونەتە جم‌و جوڵ، ژاوە ژاو بەرە بەرە بەرز بووەوە زیندانییەکان، خۆیان گۆڕی‌و حازر وئامادە بوون کە بۆ کار بڕۆن. ئیدی تۆش بەپەلە دەبێ هەستیت‌و فریا بکەوی، گرینگ نییە هەرچۆنێ بێ دەتوانی دوای نیوەڕۆ سەعاتێك بخەوی. ئەنجام هەواڵی هاتنی سەرپەرشتیارەکە بوو بە ڕاست. فەرمانبەرێکی گەورە، بە پلەی جەنەراڵ، لە پوترسبۆرگەوە نێردرا بوو بۆ پشکنینی گشت دایەرەو فەرمانگەکانی دەڤەری سیبیریا،و گەیی بووە توبولسك، حاڵی حازر لەوێ بوو.

هەر ڕۆژەی شتێکی تازەمان دەبیست. دەنگوباس‌ودەنگۆکانمان لە شارەوە بۆ دەهات. دەیانگوت شار خرۆشاوە. هەموو دەترسن. هەرکەسەو لە خەمی ئەوەدایە بە باشترین شێوە دەربکەوێ. حکومەت‌و دەزگا فەرمییەکان، سەرگەرمی ئەوەن کە کۆڕو ئاهەنگی هەمە جۆری هەڵپەڕکێ‌و گۆرانی بۆ هاتن‌و پێشوازی ئەو سازبکەن. ژمارەیەك زیندانیی نێردران بۆ

پاككردنەوەو پڕكردنەوەی چاڵو چۆڵی شەقامو ڕێگاكانی تاراوگەكەمان، بۆ بۆیە كردنی دیوارو كۆڵەكەو عامودو دەرگاكان، بۆ چاككردنی هەر شتێكی دیارو بەرچاو. زیندانییەكان زۆر چاك لە مەبەستی ئەم كارە حاڵی دەبوون، سات بە سات گەنگەشەو گفتوگۆكانیان توندترو گەرمتر دەبوو. ئیدی پەتیان بۆ خەیاڵ بەرەڵلا كردبوو. تەنانەت خۆیان سازدەدا كە جەنەراڵ هات، گلەیی و سكاڵای خۆیان لە ئیدارەی زیندان بكەن و داخوازییەكانی خۆیانی پێ بڵێن، بەڵام ئەمە بەو مانایە نەبوو كە تەباو كۆك بن و هەموو دەمبۆڵەو قەرقەشەیەك وەلاوە بنەن. مێجەرەكەشمان، دەتگوت لەسەر ئاوو ئاگرە، زۆر نیگەران بوو. بەردەوام سەردانی زیندانەكەی دەكردین، لە جاران زیاتر دەیبۆڵاندو زیندانییەكانی سەركۆنە دەكرد، لەسەر بچووكترین سەرپێچی بۆ بنكەی پاسەوانی(قەرەوڵخانە) دەناردن تا سزا بدرێن، بایەخێكی زۆری بە پاكو خاوێنی و رواڵەتی ژوورو قاوشەكان دەدا. لەو ماوەیەدا، ڕووداوێكی بچووك ڕوویدا، لە جیاتی، وەكو چاوەڕوان دەكرا، مێجەر تووڕە بكات، بە پێچەوانەوە زۆری خۆشحاڵ كرد. زیندانییەك دەگەڵ زیندانییەكی دیدا بەشەڕ هاتبوو و، ڕێك درەوشەیەكی كردبوو بە سینگیداو چیوای نەما بوو بەر دڵی بكەوێ. كابرای درەوشە وەشێن نێوی لوموف بوو. ئەویتر لە زیندانەكەدا پێیان دەگوت گافریلكا: ئەمە یەكێك بوو لە چەتەو ڕێگرە كۆن و كارامەكان، پێشترش باسم كردووە. ئیدی نازانم ناوی دیكەی هەبوو یان نا، بە هەرحاڵ من ڕۆژێ لە ڕۆژان نەمبیست كە ناوێكی تری هەبێ.

لوموف، لە ماڵباتێكی جووتیاری دەوڵەمەندی، خەڵكی (تومسك)ی هەرێمی ك.... بوو. ئەم ماڵباتە لە پێنج كەس پێكهاتبوو: دوو براو سێ كوڕ... ئەمانە جووتیاری دەوڵەمەند بوون، لە نێو خەڵكی هەرێمەكەدا وا باوبوو كە پتر لە سێ سەد هەزار ڕۆبڵی كاشیان هەیە. ئەمانە بە فەلاحەتو جووتیاری و دەباغچیەتییەوە خەریك بوون. بەڵام دەوڵەتو سامانەكەیان زیاتر لە ڕێگای سووخۆری و كڕین و فرۆشتنی ماڵی دزیاری،و پەنادان و شاردنەوەی یاخی و چەتەو ڕێگران و ئەو جۆرە كارانەوە بوو.... نیوەی جووتیارانی هەرێمەكە قەرداری ئەوان بوون، دەستیان لە ژێر باری ئەواندا بوو. ئەندامانی ئەم ماڵباتە، زیرەكو چاوكراوە بوون، ئیدی خۆیان بە گەورەی هەرێمەكە دەزانی و هەرچیەكیان بویستایە دەیانكرد. تا ڕۆژێكیان فەرمانبەرێكی گەورە بە ڕێكەوت دەبێ بە میوانیان، ئەم فەرمانبەرە گەورەیە مەحەبەتی دەچێتە سەر باوكەكەیان و زیرەكی و بوێری باوكەكەیانی دەچێتە دڵەوە، ئیدی ماڵباتەكەی لوموف، ئەمە بەهەل دەزانن و واخەیاڵ دەكەن دەتوانن هەرچیەكیان بوێ بیكەن، بۆ خۆ لەسەر پێشێلكاری یاسایی و كارێن خۆسەری بەردەوام دەبن و شولی لێ هەڵدەكێشن و خەڵكەكە بەرە بەرە دەكەونە پرتەو بۆڵەو، لێیان دەخوێنن و خۆزیا دەخوازن بە ناخی ئەرزا بچن. بەڵام ماڵباتەكەی لوموف پەند وەرناگرن و گوێ بە پرتەو بۆڵەی خەڵكی نادەن، لەسەر پێشێلكاری خۆ بەردەوام دەبن، وایان لێدێت نە منەتی سەرانی پۆلیس،و نە دادسێنان و دادگاكانی ئەو هەرێمە دەزانن. بەڵام ئەنجام بەخت لێیان هەڵدەگەڕێتەوەو بە جارێ باریان دەكەوێتە لێژی و لێیان دەقەومێ، هەڵبەتە نەك بە هۆی ئەو تاوانە نهێنیانەوە كە دەیانكرد، بەڵكو بە هۆی تۆمەتێكی هەڵبەستراوو درۆوە. ئەم ماڵە مەزرایەكیان هەبوو لە دووری دە فەرسەخی ماڵەكەی خۆیان. هاوینان شەش وەرزێری

قەرخیزی کاریان لەم مەزرایەدا دەکرد، ئەم وەرزێرانە لە مێژبوو کاریان لای ئەم بنەماڵەیە دەکرد.
لە پڕێکا، ئەم شەش وەرزێرە، بە کۆمەڵ لەو مەزرایەدا دەکوژرێن، دوای لێکۆڵینەوەی دوورو درێژ، زۆر شتی ناڕەواو نابەجێ ئاشکرا دەبێت. ئیدی لێکۆڵینەوە ئەوە دەردەخات کە ماڵباتی لوموف، ئەو شەش وەرزێرەیان کوشتووە. لوموفو برازایەکەی ئەم واریقاتەیان گێڕا بووەوەو کەوتبووە سەر زاری گشت زیندانییەکان، گوتبوویان، حکومەت ئەوەی بۆ ساغ دەبێتەوە کە قەرخیزییەکان قەرزێکی زۆریان لەسەر ماڵباتی لوموف دەبێت، ئەم ماڵباتە وێڕای پارەداریو زەنگینیان، لە بەغیلیوچرووکیدا قەرخیزییەکان دەکوژن تا قەرزەکەیان نەدەنەوەو بە یەجگاری لە شەڕیان بخەلەسێن. ئیدی بەدەم لێکۆڵینەوەو دادپرسییەوە دەست بەسەر سەروەتو سامانەکەیاندا دەگیریو دەکەونە سەر ساجی عەلی. بابەکەیان دەمرێت. کوڕەکان دەگیرێن، یەکێك لە کوڕەکان لەگەڵ مامەکەیاندا حوکمی پازدە ساڵ بێگارە زیندان دەدرێنو هەواڵەی زیندانەکەی ئێمە دەکرێن، هەڵبەتە ماڵباتی لوموف، بێتاوان بوون، نە لە دوورو نە لە نزیك دەستیان لەو تاوانەدا نەبوو بوو. رۆژێك گافریلکا، کە مرۆڤێکی هەرچیو پەرچیو ناکەس بەچە، گوایە یاخیو چەتەش بووە، بەڵام تا حەزبکەی بە دەماخو حەنەکچی بوو، بەخۆی دانی بەوەدا نابوو کە ئەو وەرزێرانەی کوشتبوو، بە هەرحاڵ دڵنیانیم لەوەی کە بەڕاستی خۆی دانی پێدا نابوو یان نا، بەڵام زیندانییەکان بێ چەندو چوون بە بکوژی شەش قەرخیزییەکەیان دەزانی. ئەم گافریلکایە، پێشتر، لە سەردەمی یاخیگەریو چەتەگەرییەکەیدا، سەروسرێکی دەگەڵ ماڵباتی لوموفدا هەبوو بوو ( ئەم پیاوە بەشێوەیەکی کاتی ڕەوانەی زیندانەکەی ئێمە کرا بوو، بە تۆمەتی هەڵاتن لە سەربازی بۆ ئێرە نێردرا بوو )، ئەم گافریلکایە، بە هاودەستی سێ چەتەی دیکە، بە ئومێدی تاڵانکردنی مەزرایەکە، قەرخیزییەکانی کوشتبوو.
زیندانییەکان، نازانم بۆچی، لوموفو برازاکەیان خۆش نەدەویست! برازایەکەی، گەنجێکی خۆش مەشرەبو زیرەك بوو، لەگەڵ هەموو کەسێکدا دەسازاو هەڵی دەکرد. بەڵام مامەکەی، ئەوەی درەوشەکەی لە گافریلکا دابوو، جووتیارێکی گەوجی، هەڵچووی شەڕانی بوو، هەمیشە بەگژ زیندانییەکاندا دەچوو،و ئەوانیش دەستیان لێنەدەپاراستو هەموو جارێ بە قەد کەرێکیان دەکوتا. بە پێچەوانەوە گافریلکا، چونکە پیاوێکی روو خۆشو حەنەکچیو زەمانسازو خۆش مەشرەب بوو، لای هەموو زیندانییەکان خۆشەویست بوو. لوموفو برازاکەی دەیانزانی، گافریلکا سەرچاوەی ئەو تاوانەیە کە ئەوان لەسەری حوکم دراون، یانی باجی تاوانی ئەو دەدەن، بەڵام شەڕیان پێنەدەفرۆشت. گافریلکاش کەمو زۆر خۆی لێ تێنەدەگەیاندن. بەڵام شەڕەکەی لوموف و گافریلکا لەسەر ئافرەتێکی قێزەون بوو، کە گوایە ئەو دووە هەڤڕکییان لە سەر دەکرد، تا رۆژێ گافریلکا بە کەشو فشێکی زۆرەوە باسی ئەو ئافرەتەی کردبوو کە چۆن بۆی دەستەمۆ بووە، ئیدی کە لوموف گوێی لێدەبێ، بە جارێ دەهری دەبێ، غیرەتی دەجوڵێو درەوشەیەك بە سینگی گافریلکادا دەکات.
هەرچەندە ماڵباتی لوموف، بە هۆی ئەو ڕووداوەوە هەموو سەروەتو سامانی خۆیان لە دەست دابوو، ماڵیان بە تەواوەتی وێران بوو بوو، هێشتاش لە زینداندا لە هەمووان پارەدارتر بوون.

پارەو سەماوەریان هەبوو، هەرکاتێ حەزیان کردبا، چایان دەخواردەوە. مێجەر بەمەی دەزانی و ڕقی گەورەی لە لوموف‌و برازاکەی بوو، لێیان بە بیانوو بوو. مام‌و برازا هۆی ئەم بیانووەیان بەوە دەزانی کە بەرتیلیان نەدابوویە.

ئەگەر لوموف، درەوشەکەی لە سینگی گافریلکادا خەتم کردبوایە، بێگومان کوشتبووی، بەڵام ئیدی تەنیا بە سووکی برینداری کردبوو. یەکسەر هەواڵی ئەم شەڕە بە مێجەر گەیەنرا. بۆیە بەلەز خۆی گەیاندە قاوشەکەو نەك هەر ناڕەحەت نەبوو، بەڵکو زۆریش خۆشحاڵ بوو. تا ئێستاش لەبەر چاومە چۆن خۆی بە ژووراکرد، یەکسەر خۆی گەیاندە گافریلکاو بە میهرو سۆزێکی باوکانەوە، وەك ئەوەی کوڕی خۆی بدوێنێ گوتی:

– ها برادەری ئازیز، لە خۆت ڕادەبینی بەتەنیاو هەر خۆت بڕۆی بۆ نەخۆشخانە، یان پێویستت بەوەیە بە گالیسکە بڕۆیت ؟ نا.... پێموایە باشتر وایە ئەسپێکت بۆ بێنن. ئادەی یەکسەر ئەسپێکی بۆ زین بکەن.

گافریلکا گوتی:

– بەڵام پایە بەرز من هەست بە هیچ ناکەم. تەنیا تۆزێك سینگم ڕووشاوەو هیچی تر.

– نا برادەر تۆ نایزانی، تۆ نایزانی.... پاشان دەبینی لە چ شوێنێکی هەستیارو ترسناکی داویت... شوێنێکی زۆر ترسناکە... ڕێك ژێر دڵتە... ئەم بێ شەرەفە خوێڕییە ڕێك لە ژێر دڵی داویت!

مێجەر دوای ئەو قسانە ڕوویکردە لوموف‌و گوتی:

– ئەمەت لێ بەسەر ناچێ، ڕاوەستە بۆم... بزانە چۆن ئەم دڕکەت لە ژێر پێ دەردێنم! دەی بیبەن بۆ بارەگای پاسەوانی!

مێجەر هەڕەشەکەی خۆی بردە سەر. لوموف حوکم درا. هەرچەندە زامەکەی یارو زۆر سووك بوو، مەسەلەکە بە ناهەق خرایە ئەو خانەیەوە کە بە تەما بووە دژمنەکەی خۆی بکوژێت، بۆیە ماوەی زیندانیەکەی لوموف، چەند ساڵێك زیاد کراو، هەزار داریشی بۆ بڕایەوە. هەڵبەتە مێجەر بەو کارە زۆر خۆشحاڵ بوو.

ئەنجام سەرپەرشتیاری گۆڕین گەیی. بۆ ڕۆژی دووەم هات بۆ پشکنینی زیندانەکە. ڕۆژەکە ڕۆژی جەژن بوو. هەموو شتێك، دارو دیوار، چەند ڕۆژێك بوو پاك‌و خاوێن کرا بووەوەو شۆردرا بوو و لە دوورەوە دەبریقایەوە. زیندانییەکان، سەریان تاشرا بوو، جلی سپی خاوێنیان لەبەر کردبوو. جلی هاوینەمان بریتی بوو لە دەستێك جلی کەتانی چوون یەك، پارچەیەکی ڕەشی چوارگۆشەی چکۆلەی چەند سانتیمەتری بە پشتی چاکەتی بیجامەی هەر یەکێکمانەوە دورا بوو. یەك دانە سەعاتی تەواو مەشقمان پێکرا بوو کە ئەگەر ئەو فەرمانبەرە گەورەیە سڵاوی لێکردین چۆن وەڵامی بدەینەوەو چ بڵێین، تەنانەت هەندێ تاقیکردنەوەی پراکتیکیشمان پێکرا، تا دڵنیا بن لەوەی کە زیندانییەکان مەشقەکە فێر بوون‌و لەبەریان کردووە. مێجەر دەتگوت ژانی کردووە، ئۆقرەی نەدەگرت، وەکو شێتان دەهات‌و دەچوو. بە سەعاتێك پێش هاتنی جەنەراڵ گشتی سەربازەکان لە جێی خۆ ریز بوون، وەکو پەیکەر بێ جووڵە لە جێی خۆ چەقین، قۆڵ‌و

باسكیان ڕێك‌و بێ جووڵە شۆڕ كردبووەوە. ئەنجام جەنەڕاڵ، لە سەعات یەكی دوا نیوەڕۆدا خۆی بە ژووراكرد. جەنەراڵێكی ئەوەندە مەندو مۆن‌و بەسام‌و هەیبەت بوو، هەر فەرمانبەرێكی دەڤەری سیبیریای رۆژاوا بیدیتبایە، بێگومان لە ترسا ڕادەچڵەكی. جەنەڕاڵ، بە كەش‌و فش‌و لووتبەرزییەوە، وەژووركەوت، دنیایەك خولام‌و دەست‌و پێوەندی بە دواوە بوو كە زۆربەیان جەنەڕاڵ‌و كۆلۆنێل بوون، زیاتر گەورە كارمەندو فەرمانبەری ئەو شارە بوون كە زیندانەكەی تیا بوو. كابرایەكی مەدەنی بالأبەرزی، سیما جوانی، فەروە لەبەریشی لەگەڵ بوو، كە زۆر ئازادانەو سەربەستانە رەفتاری دەكرد، جەنەڕاڵ بەردەوام لە ناو هەمووان‌دا رووی لەو دەكردو بەوپەڕی ڕێزو حورمەتەوە قسەی دەگەڵ دەكرد. ئەم پیاوە مەدەنیەش لە پوترسبۆرگەوە هاتبوو. زیندانییەكان لەوە حایرمابوون، كە چۆن جەنەرالێكی وا گەورە ئەو هەموو ڕێزە لە بابایەكی مەدەنی دەنێت، بە هەرحاڵ ناوی زانراو پاشان پۆست‌و ئەركەكانی زانرا، بەلأم مەگەر هەر خوا بزانێ تا چوونە بنج‌و بناوانی ناوو ناوبانگ‌و پۆست‌و فەرمانەكانی،‌و قوڕی بنیان دەرهێنا، چەند گەنگەشەو قسەكراوە! بەلأم مێجەرەكەی لەمەڕ خۆمان، كە خۆی لە چاكەت‌و پانتۆڵێكی تەسكدا جەڕاند بوو،‌و قردێلەیەكی پڕتەقاڵی لە مل كردبوو، نەچووە دڵی جەنەڕاڵەوە، چاوانی سوور دەتگوت گۆمی خوێنن، گۆناكانی سوور هەڵگەڕا بوون، دڵڕەقی لە سیمای دەباری، وەكو ڕێز بۆ میوانە گەورەكە ، چاویلكەكەی داكەند بوو،‌و كەمێك دوور لەو بەرێزەوە ڕەق ڕاوەستا بوو،‌و چاوەڕوانی هەر ئەمرو فرمانێك بوو تا بەسەر بۆ پایە بەرزی ئەنجام بدات. بەلأم جەنەڕاڵ هیچ داوایەكی نەبوو تا بۆی جێبەجێ بكرێت. جەنەڕاڵ بە بێدەنگی بەسەر قاوش‌و ژوورەكاندا گەڕا، چاوێكی بە مووبەقەكەدا گێڕا،‌و تۆزێكی لە شۆرباكە، كە شۆربای كەلەرم بوو چەشت، منیان پێ نیشانداو گوتیان ئەمە ئەشراف‌و نەجیمزادەیە،‌و گوایە ئەمەو ئەوەم كردووە...
جەنەڕاڵ گوتی:

– ئا.... ئەدی ئێستا رەفتاری چۆنە ؟

پێیان گوت:

– پایە بەرز، رەفتاری زۆر باشە، عەیبی نییە.

جەنەڕاڵ سەرێكی لەقاندو دوای دوو دەقیقە لە زیندانەكە وەدەركەوت. زیندانییەكان هەموو پەست‌و ناڕازی‌و سەرسام بوون. هیچ كەسێك زاتی نەكرد نەك سكالأ لە مێجەر بكات بگرە ناویشی بێنێ.هەڵبەتە مێجەر بە خۆیشی دڵنیا بوو كەس ناوێرێ پرکێشی وا بكات.

## ئاژەڵەماڵییەکانی زیندان

دوای سەردانەکەی سەرپەرشتیار بەماوەیەکی کەم، ئیدارەی زیندان ئەسپێکی کوێتی کڕی، ئەم رووداوە بۆ زیندانییەکان لە سەردانەکەی جەنەڕاڵ زۆر خۆشتر بوو. ئیدی باو بوو کە لە زینداندا هەمیشە ئەسپێك رادەگیرا بۆ هێنانی ئاوو فڕێدانی زڕو زبڵو خۆڵو خاشاكو ئەو شتانە. یەکێك لە زیندانییەکان، دەکرا بە بەرپرسی ئەسپەکە، دەیهێناودەیبرد، هەڵبەتە بە چاودێری پاسەوانێك. ئەم ئەسپە لە بەیانییەوە تا ئێواریَ کاری دەکرد. حەیوانێکی باش بوو، بەڵام ئەوەندە کاری کردبوو بە تەواوەتی چروسابووەوە، تەواو لەڕو لاواز بوو بوو. رۆژێك پێش جەژنی سان پتروس، لە کاتێکا بەرمیلێ ئاوی بەسەر پشتەوە بوو، لە ناوەندی حەوشەکەدا کەوتو دوای چەند ساتێك لیچ بووەوەو مردار بووەوە. زیندانییەکان زۆریان خەفەت بۆ خوارد. لە دەوری خڕ بوونەوە، هەر کەسەو قسەیەکی لە بارەوە دەکرد.خەڵکانی ئەزموونداز: ئەوانەی لە فەوجی سوارە کاریان کردبوو، قەرەجان، بە یتاڵانو هی دیکە، کە شارەزاییان دەربارەی ئەسپو ئەسپ بە خەم کردن هەبوو، هەرکەسەو قسەیەکیان دەکرد،و کەسیش گوێی لە کەس نەدەگرت. بەڵام فایدەی نەبوو، ئەسپەکوێت زندوو نەبووەوە، لە عاردەکە کەوتبوو، بای کردبوو، ئاوسا بوو.... مێجەر لەم رووداوە ئاگادار کرایەوە. مێجەر یەکسەر دەستووری کڕینی ئەسپێکی تری دا.

بۆ سبەی بەیانی زوو کە رۆژی جەژنی سان پتروس بوو، کاتێ زیندانییەکان دوای نوێژ، کۆبوونەوە، ئەسپ فرۆشان، بە خۆو ئەسپەکانیانەوە هاتن. مەسەلەی هەڵبژاردنو کڕینی ئەسپ بە زیندانییەکان سپێردرا بوو، چونکە بەڕاستی مەیتەرو ئەسپەوانی زۆر شارەزایان تیا بوو، ئەمە جگە لەوەی کە زۆر زەحمەت بوو دوو سەدو پەنجا پیاوی شارەزاو ئەسپەوان، کە سەریان لە ئەسپەوانیدا سپی کرد بوو، فریو بدرێن. ئیدی قەرەجو قەرخیزو دەلاڵی ئەسپانو خەڵکی شار هەموو هاتن. زیندانییەکان، بە تاسەوە چاوەڕوانی هاتنی هەر ئەسپێکی تازە بوونو منداڵ ئاسا دڵیان بەو سەوداو مامەڵەیە خۆش بوو. ئەوەی زۆر دڵی خۆش دەکردن، ئەوەبوو کە وەکو هەرخەڵکێکی ئازاد دەیان توانی مامەڵەی وڵاخێکی بەرزە بکەن، دەتگوت بۆ خۆیانی دەکڕنو پارەکەی کاش لە گیرفانی ئەوان دەردەچێ. سێ ئەسپیان هێنا، پێش ئەوەی رەئی زیندانییەکان لەسەر کڕینی ئەسپی چوارەم بگیرسێتەوە. فرۆشیارەکان بە سەرسامیو جۆرە ترسێکەوە

دەيانڕوانییە ئەو سەربازە پاسەوانانەی کە دەگەڵ زیندانییەکاندا بوون، بەڕاستی دیمەنی دوو سەد پیاوی سەرتاشراوی پێ بە کۆت و زنجیر، بۆ ئەوان، بە تایبەتی کە لە ماڵی خۆدا، لە لانەو کاشانەی خۆدا، کەس نەبوو بچێتە سەریان، بڕێك سەیرو ترسناك بوو. زیندانییەکان ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان خستبووە کار کە باشترین ئەسپ هەڵبژێرین و بە نرخێکی گونجاو بیکڕن. بەوپەڕی جددی بە دەوری ئەسپەکاندا دەهاتن، لێی ورد دەبوونەوە، تەمەشایان دەکرد، وەکو ئەوەی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی ئایندەیان لە زیندانەکەدا، پەیوەست بێ بەو ئەسپەوە کە دەیانکڕی، تەنانەت چەرکەسیەکان سواری ئەسپەکەش دەبوون و لە خۆشیا چاویان دەبریقایەوەو بەگەرمی بە زمانی خۆیان، کە کەس تێی نەدەگەیی یەکتریان دەدوان و ددانە سپییەکانیان دەردەکەوت و سەریان دەلەقاند. هەندێ رووس لەوێ بوون، زۆر بەوردی گوێیان لە موناقەشەکانیان دەگرت و بەجۆرێ تەمەشایان دەکردن، لە تۆ وایە دەیانەوێ بە نیگا بیانخۆن. لە تاقە وشەیەکی قسەی هاوڕێکانیان نەدەگەییشتن، بەڵام دیار بوو، حەزیان دەکرد، نیگایان بخوێننەوەو بە نیگایاندا ئەوەیان بۆ دەربکەوێ کە ئاخۆ ئەسپەکەیان بە دڵە یان نا. تۆ بڵێی زیندانییەکی بەدبەختی داماو، کە تا ئێستا زاتی نەدەکرد بە دەنگی بەرز لەبەردەم هاوڕێ و هاو زیندانییەکانی خۆیدا قسە بکات، بۆچی ئەم هەموو موناقەشەیە لەسەر کڕینی ئەم ئەسپ یان ئەو ئەسپ بکات، وەك بڵێی بۆ خۆیی بکڕێت ؟ دیارە لەم سەوداو مامەڵەیەدا زیاتر هەقی قسەکردن بە چەرکەسیەکان و پاش ئەوان بە قەرخیزەکان و پاشتر بە کۆنە مامەڵەچیانی ئەسپ، درا بوو، جۆرە مشت و مڕو هەڤڕکییەك کەوتە نێوان دوو زیندانییەوە، یەکەمیان کولیکوف ناو بوو کە کۆنە دەلاڵ و دزی ئەسپان بوو، دووەمیان بابایەکی بەیتاڵی بەهرەمەندو لێزان بوو، جووتیارێکی سیبیریایی بوو، ماوەیەکی کەم بوو بۆ بێگارە زیندان نێردرابوو، ئیدی لە مەسەلەی بەیتاڵیدا بوو بە هەڤڕکی کولیکوف،و بەرە بەرە سنعەتەکەی لە دەست دەرهێناو ئەو بازاڕەی جارانی لای خەڵکی شار نەما. جا هەر بەم بۆنەیەوە دەبێ ئەوەش بڵێین کە خەڵکی متمانەیەکی یەجگار زۆریان بە بەیتاڵانی، بێ شەهادەی زیندانەکەی ئێمە هەبوو، خەڵکی شارەکە، بازرگانان و بگرە گەورە فەرمانبەرانیش کە ئەسپەکانیان نەخۆش دەکەوت، لە جیاتی روو بکەنە بەیتاڵانی پسپۆڕو خودان شادەتنامە، روویان دەکردە بەیتاڵە نە پسپۆڕەکانی زیندانەکەی ئێمە. جا کولیکوف، پێش ئەوەی ئەو جووتیارە سیبیریاییە، یانی یولکین بێتە زیندانەکەمان، مشتەرییەکی زۆر زۆری لە شاردا هەبوو،و هەقدەست و بەخشیشێکی زۆریان دەدایەو کەس نەبوو لەو بوارەدا ڕکابەری و هەڤڕکی بکات. وەکو هەر قەرەجێکی راستەقینە کاری دەکرد، فێڵی دەکردو دەستانی دەبڕی. ئەوەندەی بە دەمی خۆی هەڵدەکێشاو بەشان و باڵی شارەزایی و لێزانی خۆیدا هەڵیدەدا، بە کردەوە ئەو شارەزاو پسپۆڕە نەبوو. ئیدی بەهۆی دەسکەوتە مادییەکانیەوە، لە نێو زیندانییەکاندا وەکو ئەرستۆکراتێك سەیردەکرا، زیندانییەکان گوێیان لێدەگرت و بە قسەیان دەکرد، بەڵام پیاوێکی کەمدوو بوو، لە بۆنەی گەورەدا نەبوایە، ڕای خۆی دەرنەدەبڕی. زۆر بە خۆی دەنازی و دەفشی، بەڵام ئەلهەقی پیاوێکی چالاك و چەلەنگ و گورج و گۆڵ و بە توانا بوو. تەمەنی هەبوو، زۆر قۆز بوو، زیرەکییەکی تایبەتی تێدا هەبوو. زۆر بە ڕێزو حورمەتەوە ئێمەی

کۆنە نەجیمزادانی دەدواند، بەڵام قەدری خۆشی دەگرت. دڵنیام ئەگەر جل‌و بەرگێکی کەشخەی لەبەر کرا بوایەو، برا بوایە بۆ یانەیەکی پایتەخت‌و، وەکو کۆنتێك بە خەڵکی ناسێنرابا، دەیتوانی زۆر بە باشی ئەو رۆڵە بدینیٚ‌و تەنانەت تویست بکات‌و، بە شێوەیەکی زۆر دڵگیر قسان بکات‌و سەرنجی خەڵکی ڕابکێشێت، وەکو هەر پیاوێکی بەشان‌و شەوکەت لە کاتی پێویستدا بێدەگ ببیٚ‌و بە درێژایی ئاهەنگەکە کەس هەست بەوە نەکات کە ئەم کۆنتە، کۆنە چەتەو ڕێگرێکەو هیچی تر. پیاوێك بوو زۆر شارەزا لە داب‌و نەریتی چینە بالاکانی کۆمەڵگە، پیٚ دەچوو دنیای زۆر دیتبیٚ.... هیچمان دەربارەی ڕابردووی ئەم پیاوە نەدەزانی، سەر بە بەشی تایبەتی زیندان بوو. هەرکە یولکین هات – کە جووتیارێکی سادەو ساکاری سەر بە ئاینی "باوەڕدارانی دێرین" بوو، بەڵام لە هەر جووتیارێکی دی بە فێڵتر بوو– ئیدی ئەستێرەی کولیکوف، وەکو بەیتاڵێکی کارامەو لێزان، ئاوا بوو، بەیتاڵە تازەکە لە ماوەی کەمتر لە دوو هەیڤان، گشت مشتەرییەکانی لێکرد، چونکە لە ماوەیەکی کەمدا، گەلێك لەو ئەسپانەشی چاك کردنەوە کە کولیکوف گوتبووی دەردیان بێچارەیە،و بەیتاڵە پسپۆڕو خودان شادەتنامەکانیش چاریان نەکردبوون‌و دەستیان لە چارەسەریان هەڵگرتبوو، ئەم جووتیارە، لەسەر پارە تەزویر کردن گیرابوو، وخرا بووە بێگارە زیندانەوە، بە شەریکی لەگەڵ کەسانی تردا پارەی تەزویر کردبوو، ئاخۆ چ تەماحێك هانی دابوو دەست بداتە ئەم سنعەتە ؟ خۆی جارێك، بە گاڵتەکردن بەخۆیەوە، بۆی گێڕاینەوە کە چۆن بۆ دروستکردنی دراوێکی تەزویر پارچە زێڕی خالیسەیان بەکار بردووە !

کولیکوف، زۆری پیٚ ناخۆش بوو کە دەیبینی ئەو جووتیارە سادەیە، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر سەرکەوتن بەدەست دێنیٚ‌و ناوبانگ پەیدادەکات،وئەستێرەی ئەویش بەو خێراییە ڕادەخوشێت‌و بەرەو ئاوا بوون دەچێت. ئەم پیاوە لە شاروچکەیەکی ئەو نزیکاندا ماشقەیەکی هەبوو، پاڵتۆیەکی فەروی جوانی لەبەر دەکرد،و جووتیٚ پوتی درێژی نایابی لە پیٚ دەکرد، لە پڕێکا سەیری کرد ناچارە دەست بداتە مەیفرۆشی. ئیدی لە بەیتاڵییەوە بۆ مەیفرۆشی. بۆیە هەموو زیندانییەکان، پێشبینی ئەوەیان دەکرد، لەم ئەسپ کڕینەدا، لێیان ببیٚ بە شەڕو قەرقەشەیەکی توند. هەریەکێك لەم دووپیاوە، لایەنگرو هەواداری خۆیان هەبوو. توندڕەوەکانیان کەوتنە مۆڕە لە یەکدی، بگرە لە ئێستاوە کەوتنە شەڕە جنێو، بزەیەکی تەوسامێز بە سیمای پڕ فێڵ‌و دەهۆی یولکینەوە خۆی دەنواند. کەچی مەسەلەکە ڕێك بە پێچەوانەی پێشبینییەکەی جماعەتەوە دەرچوو: کولیکوف خۆی لە جێی خوڕان نەدا، زۆر زیرەکانە خۆی لە شەڕو قەرقەشە بوارد. لە سەرەتاوە هەموو شتێکی بۆ هاوزیندانییەکەی سەلماند، بە ڕێزەوە گوێی بۆ بۆچوون و ڕەخنەکانی هەڤڕکەکەی گرت، بەڵام زۆری پێنەچوو، یولکین ڕەئێکی هەڵەی لە دەم دەرچوو، ئیدی کولیکوف، بەوپەڕی خوێنساردی‌و خاکیانە پێی گوت کە هەڵەیە. بەر لەوەی یولکین فریابکەویٚ‌و لە ڕەئی خۆی ژێوان ببێتەوە، ئەو کەوتە سەلماندی ئەوەی کە یولکین هەڵەیەکی زەق‌و ئاشکرای کردووەو بەمجۆرە یولکین بە جۆریٚ کەوتە داوەوە کە خۆیشی تەسەوری نەدەکرد، بەو جۆرە حیزبەکەی کولیکوف بردیانەوەو زۆر دڵخۆش بوون‌و گوتیان:

– کوڕینە خۆ بەچاوی خۆتان بینیتان ؟ نەخێر ئەم هەڵە ناکات! دەزانێ چ دەکات!

ئەوانی دی، بە زمانێکی نەرمی دوور لە هەر هەڤڕکییەك گوتیان:

– یولکین لەو شارەزا ترە.

هەردوو حیزب ئامادە بوون بۆ سازش و ئاشتەوایی.

هەوادارانی کولیکوف گوتیان:

– کولیکوف جگە لەوەی بە ئەندازەی ئەو شارەزایە، دەستیشی لەو سووکترە... سەبارەت بە ماڵات کەس شان لە شانی نادات.

– یولکینش وایە !

– کولیکوف لەمەدا بێ هاوتایە !

ئەنجام ئەو ئەسپە تازەیە هەڵبژێردرا کە پاشان هاتە کڕین. ئەسپێکی زۆر باشە، کەم تەمەنە، تۆکمەو ڕەزا سووکە: حەیوانێکی بێ عەیبە. سەوداو مامەڵە دەستی پێکرد،خودان ئەسپ داوای سی ڕۆبڵ دەکات، زیندانییەکان گەرەکیانە بە بیستو پێنج ڕۆبڵ لە دەستی دەربێنن. سەوداو مامەڵەکە درێژەی کێشا، گەرم بوو، لایەك کەمێ دەچێتە سەرێو لایەکی دی تۆزێ دێتە خوارێ، ئەوسا زیندانییەکان لە نێو خۆیانداو خۆبەخۆ دەکەونە پێکەنین.

هەندێکیان دەیانگوت:

– باشە ئەم هەموو پێ داگرتنو مامەڵەیە لە پای چی؟ چما لە کیسەی خۆت دەیکڕی ؟

هەندێکی دی هەڵیاندایە:

– دەتەوێ پاشەکەوت بۆ خەزێنە بکەی ؟

– ئەم پارەیە، پارەی گشتییە، هاوبەشە !

– پارەی گشتییە! ڕاستە کەس گەوجو کەودەنان ناڕوێنێ، بەڵام گەوجو کەودەنان، خۆڕسك، بێ ئەوەی کەس بیانڕوێنێ، دەڕوێن.

ئەنجام ئەسپەکە بە بیستو هەشت ڕۆبڵ هاتە کڕین. مێجەر لە ئەنجامی مامەڵەکە ئاگادار کراو ڕازی بوو، بەلەز نانو خوێ هێنراو، ئەسپە تازەکە، بە شکۆو جەلالێکی زۆرەوە بۆ ناو زیندانەکە هێنرا. پێموایە هیچ زیندانییەك نەما دەست بە گەردنو قەپۆزی ئەسپەکەدا نەیەنێو نەوازشی نەکات. هەر ئەو ڕۆژە ئەسپەکە خرایە ژێر باری ئاوکێشان بۆ زیندانەکە: گشت زیندانییەکان بە کونجکاوییەوە تەمەشایان دەکرد کە چۆن بەرمیلە ئاوەکەی ڕادەکێشا. ڕومان، کە سەقاو ئاوکێشی زیندانەکە بوو، بەوپەڕی خۆشحاڵیو ڕەزامەندییەوە دەیڕوانییە ئەسپەکەی. ئەم زیندانییە، کاتی خۆی جووتیار بوو، تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵ دەبوو، پیاوێکی زۆر جدیو ئیشکەرو بێدەنگ بوو، وەکو زۆربەی هەرە زۆری عارەبانچیانی ڕووس، لەوە دەچێ، هەڵسوکەوت دەگەڵ ئەسپاندا جۆرە ویقارو جددیەتێك بە پیاو ببەخشێت. ڕومان، کەسێکی هێدیو هێمن،و خۆش مەشرەب بوو، لەگەڵ خەڵکیدا نەرمو نیانو میرەبانو کەمدوو بوو. شەیدای بڕنووتیو ئەسپەوانی بوو. لە مێژبوو، کەس نەیدەزانی لە کەیەوە، ئەسپەکانی زیندان بەو سپێردرا بوون، ئەو ساوە کە هاتبووە ئەم زیندانە، ئەمە ئەسپی سێیەم بوو کە بەو سپێردرا بوو. گشت

زیندانییەکان قەناعەتیان وابوو کە ئەسپی "کویت" لە بارترین ئەسپە بۆ زیندانەکەی ئێمە، "رومان"ش هەمان بۆچوونی هەبوو. بۆیە مەحاڵ بوو، بۆ نموونە، ئەسپێکی بەڵەك بکردرێ!...
ئیدی کاری ئەسپەوانیو میرئاخوری وەقف بوو لەسەر رومان،و کەس لەو بوارەدا هاوتای نەدەکردەوەو شانی لە شانی نەدەدا، کە ئەسپە کوێتی یەکەم مردار بووەوە هیچکەسێك، تەنانەت مێجەرش، خەتای رومانی نەگرت بڵێ بێ موبالاتی یان کەمتەرخەمی دەرهەق بە ئەسپەکە کردووە. بەڵکو بە قەزاو قەدەریان زانیو هیچی تر. رومان بە ڕاستی مەیتەرو ئەسپەوان بوو نە گاڵتە.
زۆری نەبرد، کوێتە تازەکە لە سەرانسەری زیندانەکەدا خۆشەویستی پەیدا کرد. زۆرجار زیندانییەکان هەرچەند زۆربەیان خەڵکی میهرەبان نەبوون، لێی خڕەبوونەوەو نەوازشتیان دەکرد.
هەندێجار کاتێ رومان، لەسەر روبار بە بەرمیلە ئاوەوە دەگەڕایەوەو عەریف خەفەرەکە دەروازەکەی بۆ دەکردەوە، ئەسپە کوێت وەژووردەکەوت، رومان خەریکی داخستنی دەروازەکە دەبوو، جنیدکو ( ئەسپی کوێت ) لە جێی خۆی ڕەق ڕادەوەستاو چاوەڕوانی خاوەنەکەی دەکرد، لە لاوە چاوێکی لە خاوەنەکەی دەکرد، رومان تێی دەخوڕی: "بەتەنیا بڕۆ!" ئەسپەکە، بەکاوەخۆ دەڕۆییو ڕێك لەبەر مووبەقەکەدا دەوەستا تا ئاشپەزو شاگردەکان بێن سەتڵەکانیان لە ئاو پڕ بکەن. ئیدی زیندانییەکان بە خۆشحاڵیەوە دەیانگوت:
- جنیدکۆ ئەسپە نە گاڵتە! هەرخۆی بەرمیلەکەی هێناوەتەوە! ئەسپێکی گوێڕایەڵە! بەڕاستی بەختمان هەیە!...
- ڕاستە حەیوانە، بەڵام زرینگە، هەرچییەکی پێ دەگوترێ تێی دەگات!....
- جنیدکۆ، ئاقڵە ئاقڵ !
هەنگێ ئەسپەکە وەك بڵێی لەو هەموو ستایشە گەییشتبێ، بە دەم سەر لەقاندنەوە دەی حیلاند. یەکێك لەو لاوە تۆزێ نانو خوێی بۆ دەهێنا، کە لە خواردنی نانو خوێیەکە دەبووەوە جارێکی دی سەری دەلەقاند وەك ئەوەی منەتباری خۆی دەربڕیێو بیەوێ بڵێت: "من تۆ باش دەناسم، باشت دەناسم، من ئەسپێکی باشمو تۆش پیاوێکی پیاوانەو باشیت !".
منیش زۆرم پێ خۆش بوو، نازی جنیدکۆ هەڵگرمو نانی بدەمێ. لە تەمەشا کردنی دەمو قەپۆزە جوانەکەی تێر نەدەبووم، چەندم لەزەت لەوە دەبینی کە دەمو قەپۆزە گەرمو نەرمو شێدارەکەی لەنێو دەستم دەناو بە تامەزرۆییەوە نانەکەی ناو دەستی دەخواردم. زیندانییەکان، حەیواناتیان خۆش دەویست، خۆ ئەگەر ڕێگەیان بدرایە، قاوشەکانیان پڕدەکرد لە تەیرو توو گیانلەبەرانی ماڵی. چ شتێك دەیتوانی بە ئەندازەی بەخێوکردن و پەروەردەی حەیواناتی ماڵی، تەبعی هۆڤیانەی زیندانییەکان نەرمو ڕام بکات ؟ بەڵام حەیفێ نە یاساو ڕێسای زیندانەکە ڕێگەیان دەداو نە جێگەو ڕێگە هەیە. پێموایە من پێشتر باسی سەگەکەمان "شاریك"م کرد. شاریك سەگێکی زیرەکی بە هۆش بوو، بەینم لەگەڵیا خۆش بوو. بەڵام چونکە سەگ لە نێو ڕەمەکی خەڵکی رووسیادا بەگڵاو حەساو دەکرا کەس خۆی لێ نەدەگایاندو بایەخی نەدەدایە.

ئەم سەگە بەردەوام لە نێو زیندانەکە بوو و لەوێندەر دوور نەدەکەوتەوە، لە سێبەری دیواران دەنووستو پاشماوەی مووبەقەکەی دەخوارد، سەرباری ئەوەی گشت زیندانییەکانی دەناسیو خۆی بە هی هەمووان دەزانی، نە کەس رووی دەدایەو نە کەس دەیلاواندو نەوازشتی دەکرد. کە زیندانییەکان ئێواران لەسەر کارو بێگار دەگەڕانەوەو بانگیان لە عەریف خەفەر دەکرد دەرگایان لێبکات، شاریك بەلەز بەرەو دەروازەکەی زیندان بە پیریانەوە دەچوو، شادو بە کەیف کلکی بۆ دەلەقاندن، بە خۆشەویستییەوە تەمەشای یەك بە یەکی دەکردن، وەکو ئەوەی چاوەڕوانی ئەوە بێ یەکێکیان روویەکی خۆشی بداتێ، یان دەستێکی نازو نەوازشت بە پشتیا بێنێ. بەڵام سەرباری ئەو هەموو مەراییەی کە دەیکرد بە درێژایی چەندین ساڵ، جگە لە من، کەسی تر لای لێنەکردەوە. کەس ئامادە نەبوو نازی هەڵگرێو یان روویەکی خۆشی بداتێ. بۆیە منی لە گشت زیندانییەکانی دی خۆشتر دەویست. بەڵام سەبارەت بە سەگی دووەم کە نێوی بایلکا (واتە بەفر) بوو، لە بیرم نایەت کەیو لە کوێوە هات. بەڵام سەگی سێیەم کە نێوی (کولیتابکا) بوو، من بەخۆم، بە تووتکی، کە هێشتا چاوی بە تەواوەتی نەتروکابوو، هێنام بۆ زیندانەکەمان.

بایلکا، گووراوێکی عەنتیکە بوو. بە تووتکی کەوتبووە ژێر گالیسکەیەکەوەو پشتی سەقەت بوو بوو، لە ناوەڕاستەوە چاڵ بوو بوو، کە لە دوورەوە دەتبینی، بەتایبەتی ئەگەر بەغاردان بەرەو پیرت هاتبوایە، وادەهاتە بەرچاو دوو سەگی جمك بنو پێکەوە لکابن. وێڕای ئەمەش گوڕو و چاو پڕووش بوو، تووکی کلکی هەڵوەری بوو، بە ناو گەڵۆزیدا شۆڕ بوو بووەوە. ئەم سەگە پێدەچوو هەست بکات کە قەدەر غەدری لێکردووە، بۆیە بڕیاری دابوو، سەری خۆی کزبکاتو خۆی لە هیچ شتێك هەڵنەقورتێنێ. بە کەس نەدەوەڕی، لەوەدەچوو بترسێت بکەوێتە ژێر شتێکەوەو جارێکی تریش شتێك پانی بکاتەوە. زۆربەی کات لە پشت ژوورو قاوشەکانەوە کزکۆڵەی دەکرد. هەرکەسێك لێی نزیك ببوایەتەوە، رێك لەبەر پێیدا وەردەکەوتو خۆی دەخستە سەر گازی پشت وەك ئەوەی بڵێ: "چیم لێ دەکەی بیکە، من بە تەما نیم هیچ جۆرە بەرگرییەك بکەم!" ئیدی هەر زیندانییەك بە لایدا تێدەپەڕی، وەکو ئەوەی گەنمی خێر بێ، نووکە شەقێکی تێ دەسرەواند،وسەگەش نەیدەوێرا قروسکەیەکیش بکات، خۆ ئەگەر ئازارێکی زۆریشی پێ گەییشتبا، مڕەیەکی خنکاوی دەکردو هیچی تر. ئەم سەگە، هەمان تاکتیکی وەرکەوتنو مەراییو خۆ خستنە سەر پشتی بەرانبەر بە شاریك (قەڵەو)و هەر سەگێکی دی، کە بۆ مڵو مووش دەهاتنە دەوروبەری مووبەقەکە، بە کاردەبرد. هەر سەگێکی دڕ پێی وەڕیبا یەکسەر بۆی مت دەبوو. سەگانیش وەکو بەشەر حەزدەکەن هاورەگەزەکانیان لێیان بترسنو مەراییان بکەن. بۆیە تورەترین سەگ کە دەبینن هاوڕەگەزەکەیان لێیان دەترسێتو لە بەردەمیا وەردەکەوێ، یەکسەری تورەییەکەی دادەمرکێتەوەو ماوەیەك بە دیار سەگە کەساسو زەبوونەکەی بەردەوامی دا دەوەستێو لێی ڕادەمێنێو ئەوجا دەکەوێتە بۆنکردنی سەرانسەری. تۆ بڵێی بایلکا لەو کاتانەدا کە لە ترسا روحی پێ نەبووە، بیری لەچی کردبێتەوە ؟ رەنگە لە دڵی خۆیدا گوتبێتی: "تۆ بڵێی ئەم بەراز بابە بمگەزێ ؟". کە سەگە دڕەکە لە بۆنکردنی دەبووەوەو بێ هیچ وەزنێ بە جێی دەهێشتو دەڕۆیی، هەنگێ بایلکا بەلەز هەڵدەستاو بە شەلەشەل دوای ڕەوە سەگێك

دەکەوت کە بە دووی دێڵێکی دڵڕفێنو بەرچاوی کەوتبوون . هەڵبەتە بایلکا زۆر چاك دەیزانی، کە ئەو دێڵە بەو قاییل نابیٚو بۆ ئاستی ئەو نایەتە خواریٚ، خۆی لەوە بە گەورەتر دەزانیٚ روو بداتە گەماڵێکی وەکو ئەو، بەڵام ئەم کارە بۆ ئەو جۆرە خەمڕەوێنییەك بوو،و بۆ ماوەیەك کلۆڵی کەساسیو نەگبەتی خۆی لە بیردەکرد. سەبارەت بە کەرامەتو حورمەت، ئەوا هەر باسی مەکە، بە جۆریٚ لە دەستی دابوو، نە هەستی پێدەکردو نەدەیناسی. کە هیچ هیوایەك بە ئایندە نەمێنیٚ، خەمی گەورە دەبێتە خەمی ورگو خۆ تێرکردن، هەر واش بوو، زۆر بیٚ ئابڕوانە ورگی تێر دەکرد. جارێك کەمێك نەوازشتم کرد، ئەمە بە لای ئەوەوەو بۆ ئەو شتێکی تازە بوو، پێشتر شتی وای بە خۆوە نەبینی بوو، یەکسەر لەبەردەستما وەرکەوت، لە کەیفو خۆشیاندا هەڵدەلەرزیو دەیقروسکاند، جا چونکە بەزەییم پێیدا دەهاتەوە، زۆرجار یاریم دەگەڵ دەکردو دەم لاواند. بۆیە هەرجاریٚ کە دەیبینم، بەلەز بە نوزە نوزو بە چاوانی فرمێسك تیٚ زاوەوە بەرەو پیرم دەهات. رۆژێك، لەودیو زیندانەکەدا، لە خەندەکەکەی دیوی دەرەوەی زیندانەکەدا تۆپی بوو، تومەز لە شەڕە سەگێکدا، سەگان پارچە پارچەیان کردبوو.

بەڵام کولیتابکا، تەبیعەتێکی زۆر جیاوازی لە تەبیعەتی بایلکا هەبوو، خواشیان یەك نەبوو، نازانم بۆچی رۆژیٚ هات بەسەرما، لە یەکێك لەو شوێنانەدا کە کارمان تیادەکرد، هێشتا تووتکێکی بچکۆلەی چاو نەپشکوتوو بوو، لەبەر دایکیم هەڵگرتو بۆ زیندانەکەمانم هێنا. زۆرم لەزەت لە بەخێوکردنو پەروەردەی دەبینی. شاریك زۆر زوو هۆگری بوو وخستیە ژێر باڵی خۆیو دەیپاراستو لەسەری دەکردەوە، وای لێهات دەگەڵی دەخەوت، تەنانەت کاتیٚ کە گەورە بوو و بوو بە سەگی تەواویش شاریك هەر جۆرە سۆزو خۆشەویستییەکی بەرانبەری هەبوو، بۆ نموونە قاییل دەبوو، قەپ بە گوێیدا بکات، تووکەکەی ڕاکێشێت، شاریکیش بەو نەفەسەوە گەمەی دەگەڵ دەکرد کە سەگی گەورە دەگەڵ تووتەڵاندا دەیکەن. ئەوەی مایەی سەرنج بوو کولیتابکا، باڵای نەدەکرد، بەڵکو بەباری پانی ودرێژیدا گەورە دەبوو. کولیتابکا زۆر تووکن بوو، رەنگی تووکەکەی، لە ڕەنگی تووکی مشك دەچوو، یانی شینکی بوو، گوێچکەیەکی قوتو قیت بوو، ئەویتری شۆڕو ئاوێزان بوو. سەگێکی زۆر گورجو گۆڵو چالاك و چەلەنگ بوو، وەکو هەر سەگێکی کەم تەمەن کە چاوی بە خاوەنەکەی دەکەویٚ لە خۆشیدا دەکەوێتە هەڵبەزو دابەزو بەرەو پیری دەچێتو بگرە سەروچاویشی دەلێسێتەوە، بەو ئاوایە رەفتاری دەکرد. سەگێکی بە سۆز بوو و نەیدەتوانی سۆزی خۆی وەشێرێت، لە تۆ وایە لە دڵی خۆیدا دەڵێت : " ئەوەندەم بەسە، شادمانییەکەم بدینیٚ، ئیدی گلەییو گازاندەکانی دی ناکەنە هیچو بایەخێکی ئەوتۆیان نییە!". هەرکە گوێی لە دەنگم بوایە کە بانگی دەکەم، یەکسەر لە سووچێکەوە وەدەردەکەوت، وەك ئەوەی لە ژێر عاردییەوە هەڵتۆقیٚ، بەلەزو بە غاردان، بەدەم نوزکە نوزکەوە بۆ لام دەهات، ئیدی لەبەر پێمدا وەکو تۆپ خۆی غل دەکردەوە یان لەسەر پشت وەردەکەوت. ئەم تووتکە سەگە، بەرە بەرە خۆی لە دڵدا شیرین کردم. لەوە دەچوو قەدەر لەم دنیایەدا جگە لە کەیفو سەفاو شادمانی هیچی تری لە چارە نەنووسی بیٚ، بەڵام رۆژێك زیندانییەك بە نێوی نوستروێف کە پیشەی دەباغچیەتی بوو،و قۆندەرەی ژنانەی دروست دەکرد، دەی بینیٚ، کولیتابکا گاز

دەكات، دەست بە تووكەكەیدا دێنیٚ‌و تاقیدەكاتەوە، نەوازشتی دەكات‌و سەگەی بەستەزمان، كە ئەم لاوانەوەیە دەبینیٚ، هیچ گومانێكی خراپ ناكات، لە خۆشیا دەست بە حەپین دەكات، ئیدی بۆ سبەینیٚ سەگەی تاین دیارنامێنیٚ، كەس نازانیٚ ئەرز قووتی دەدا یان ئاسمان هەڵیدەكێشێت.
ماوەیەكی زۆر بێهودە بۆ سەگەكەم گەڕام، سەرو سۆراخی نەبوو، بەڵام دوای دوو هەفتە هەموو شتێك روون بووەوەو دەركەوت، تومەز نوسترویف تەماح دەكاتە فەروەكەی‌و دەیكوژیٚ‌و پێستەكەی دەگرووی‌و دەیكات بە ئەستەڕی جووتیٚ پێڵاوی ژنانە، كە ژنە فەرمانبەرێك ڕای سپاردبوو بۆی دروست بكات. تەنانەت نوسترویف ئەوەندە گۆساخ بوو كە لە دروست كردنی قۆندەرەكان بووەوە، پیشانی دام، ئەستەڕو ناوەكەی هێندە نەرم‌و جوان بوو هەر زینەت بوو تەمەشای بكەی، ژارۆ كولیتابكا!....

گەلێك لە زیندانییەكان كاری دەباغچیەتیان دەكرد، زۆرجار سەگی تووكنی، تووك جوانیان بۆ زیندانەكە دێناو لە پڕێكا ون دەبوون. زیندانییەكان ئەم سەگانەیان دەكڕی یان دەیان دزین. لە بیرمە رۆژێك دوو زیندانیم لە پشت مووبەقەكەوە بینی كە بەدوو قۆڵی ڕاویێژو تەگبیریان دەكرد. یەكێكیان ڕستی سەگێكی ڕەشی زۆر جوانی بە دەستەوە بوو، دیاربوو سەگەكە لە تیرەیەكی رەسەن بوو. تومەز نۆكەرێكی ناڕەسەنی ناكەس بەچە لە ئاغاكەی خۆی دزی بوو،و بە سی كۆبیكان بەم جووتە قۆندەرەچیەی لەمەڕ ئێمەی فرۆشتبوو. ئەم پیاوانە خۆیان سازدەدا كە سەگەكە لە سێدارە بدەن، ( هەڵبەتە ئەمە كارێكی ئاسایی بوو، لە كوشتنی سەگاندا بەكاریان دێنا). تا پاشان پێستەكەی بگروون‌و كەلاكەكەی فڕیٚ بدەنە ئەو چاڵەوە كە بۆ فڕێدانی زڕو زبڵ‌و خۆڵ‌و خاشاك تەرخان كرابوو، هەمیشە بۆنێكی زۆر ناخۆشی لێدەهات، بە تایبەتی لە گەرمای هاویندا، چونكە بە دەگمەن پاك دەكرایەوە. لەوە دەچوو ئەم سەگە بەستەزمانە بزانیٚ چ چارەنووسێكی لە پێشە، بۆیە بە نیگەرانییەوە تەمەشای دەكردین، ناو بەناو بەترسەوە كلكە تووكنە جوانەكەی كە بە گەڵۆزیا شۆڕ بوو بووەوە، دەلەقاند، وەك ئەوەی بیەویٚ بەو رەفتارە سۆزو بەزەییمان ببزوێنیٚ. من بەلەز خۆم لەو دوو زیندانییە دوورخستەوە، كە بیٚ هیچ دوو دڵییەك ئەو حەیوانە بەلەنگازەیان كوشت.

لە زینداندا پۆلە قازێكیشمان هەبوو، یەكەم قاز بە رێكەوت لە زیندانەكەماندا گیرسابووەوە. بە هەرحاڵ نەمدەزانی ئەم قازانە هی كێ‌و كیٚ بە خێوی دەكردن، بەڵام جۆرە سەرگەرمییەك بوون بۆ زیندانییەكان، تەنانەت لە شاریشدا نێویان دەركردبوو. ئەم قازانە لە مووبەقەكەدا دەژیان. هەر كاتیٚ زیندانییەكان، لەبەر دەروازەی زیندانەكە كۆ دەبوونەوە تا بۆ كار بڕۆن‌و دەهۆڵەكە لێی دەدا، قازەكان بەخنەخن‌و باڵەفڕكیٚ دوایان دەكەوتن‌و بەسەر سەكۆو دیوارەكاندا وەدەردەكەوتن‌و بەگەڵ زیندانییەكان دەكەوتن. كە زیندانییەكان دەكەوتنە كاركردن، قازەكان لە نزیكی ئەوانەوە دەكەوتنە لەوەڕین. كە زیندانیەكان لە كاردەبوونەوەو خۆیان بۆ گەڕانەوە ئامادە دەكرد، قازەكانیش سەر لە نویٚ بەگەڵیان دەكەوتنەوە، ڕێبواران بەدەم ڕێگاوە تەماشایان دەكردن‌و دەیانگوت: " تەمەشاكەن، زیندانییەكان لەگەڵ قازەكانیاندا دەڕۆن". جارێكیان، ڕێبوارێك لێی پرسین: " ئێوە چۆن ئەم قازانەتان فێركردووە بەمجۆرە دووتان بكەون ؟".

پیاوێکی تر، کە دەستی لە بەڕکی نابوو، گوتی: " ها ئەم خێرەم لێوەربگرن بۆ قازەکانتان". سەرباری ئەو هەموو دڵسۆزیو ئەمەکدارییەی قازەکان دەرهەق بە ئێمە هەیانبوو، زیندانییەکان، لە جەژنی گەورەی پاش ڕۆژووی ساڵێکدا هەموویان سەربڕینو خواردیانن.

سەبارەت بە گیسکەکەمان، ڤاسکا، ئەگەر بۆنەیەکی زۆر تایبەتی نەبوایە، کەس بۆی نەبوو بڕیاری سەربڕینی بدات. نازانم ئەم گیسکە چۆن لە زیندانەکەماندا گیرسابووەوە، کێ هێنا بووی: گیسکێکی سپی زۆر جوان بوو، بە ماوەیەکی زۆر کەم ڤاسکا بۆ بە نازداری هەمووان، مایەی دڵخۆشیو سەرگەرمی هەمووان بوو. کەس بیری لە فەوتانی نەدەکردەوە، بیانووشیان ئەوە بوو گیسك*(١) بەرەکەتو فەڕی هەر ئاغەڵو پەچپەیەکە. وێڕای ئەوەش گیسکە سپی نە لە ئاغەڵو نە لەپەچە نەحەوایەوە، بەڵکو لە مووبەقەکەدا گیرسایەوە، کارگەییە ئەوەی بەرە بەرە سەرانسەری زیندانەکەی کرد بە ماڵی خۆیو بە کەیفی دڵی خۆی تیایدا دەسوڕایەوە. ڤاسکا، حەیوانێکی بەکەیفو بە دەماخو جوانو زیتو زیتەڵو چالاکوچەلەنگ بوو، بەسەر مێزو کورسیو تەختە خەوەکاندا هەر هەڵبەزو دابەزی بوو،و دەگەڵ زیندانییەکاندا دەکەوتە شەرە قۆچ، هەرکاتێ بانگیان کردبا، بەغارو بە شادمانی دەهات. ڕۆژێك لە زخینی بابای، لەگەڵ چەند زیندانییەکی دیکەدا، لەسەر پلەکانی بەر دەرگای قاوشەکەدا دانیشتبوو، ئەم پیاوە لێبڕا زۆرانبازییەك دەگەڵ ڤاسکادا بکات، کە شاخەکانی بڕێك درێژ بوو بوون، پیاوەو ڤاسکا کەوتنە شەرە قۆچ، ئەم گەمەیە خۆشترین یاری بوو بەلای زیندانییەکانەوە. ڤاسکا خۆی گەیاندە سەر بەرزترین پلەی قاڵدرمەی بەر دەرگای قاوشەکە، هەرکە (بابای) پشتی تێکرد، لە پڕ گیسکە سپی هەستایە سەر هەردوو پاشوویو تا هێزی تیا بوو بە هەردوو دەست کێشای بە پشتی سەریاو بابای کەوتو بەسەر پلەکاندا غل بووەوە، هەموو ئەوانەی لەوێ بوون بە (بابای)شەوە، بە شادمانی لە قاقای پێکەنینیان دا. بە کورتی هەموومان ڤاسکامان زۆر خۆش دەویست، کە بەرە بەرە گەورە بوو، بوو بە سابرێن، بەیتاڵە زیندانییەکانی لەمەڕ خۆمان، پاش ڕاوێژو تەگبیرێکی زۆر، نەشتەرگەرییەکیان بۆ کرد کە تیا پسپۆڕو کارامە بوون، مەبەستم نەشتەرگەری خەساندنە. ئەوسا زیندانییەکان بە تەشەرەوە دەیانگوت: " باشە، ئیدی منەتی نێرایەتیمان بەسەردا ناکات". ڤاسکا لەوە بەدواوە دایە قەڵەوی ئەمما قەڵەوی. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێین کە زیندانییەکان خواردنێکی یەجگار فرەیان دەدایە. ڤاسکا بوو بە سابرێنێکی زۆر جوانی، شاخ درێژی، قەڵەوی ئەوتۆ کە هەندێجار لە ڕۆییشتندا بە خورتی خۆی بکێش دەکرد. ئەویش لەگەڵمانا بۆ سەر ئیشو کاران دەهات، ئەمە مایەی شادمانیو سەرگەرمی هەم زیندانییەکانو هەم ئەو ڕێبوارانەش بوو کە ڤاسکای زیندانیان دەناسی. ڤاسکا، بە ناوی (ڤاسکای زیندان)ـەوە ناوبانگی دەرکرد. ئەگەر زیندانییەکان لە کەناری ڕوباردا کاریان بکردایە، گوڵو گەڵای ناسكو جوانیان لە دارودرەختان دەکردەوەو لە شێوەی ملوانکەدا دەیان هۆنیەوە، سەروگەردنی ڤاسکایان پێ دەڕازاندەوەو تاجە گوڵینەیان لەسەر دەنا، ئیدی ڤاسکا لە گەڕانەوەدا بەرەو زیندان، بەو هەموو شکۆوجەلالەوە پێش زیندانییەکان دەکەوتو زیندانییەکانیش بە شانازییەوە دوای دەکەوتنو بە جوانیو شکۆکەیەوە دەنازین، هەندێ لە زیندانییەکانمان بەڕادەیەك شەیدای

ڤاسکا بوو بوون، که وەکو مندالْ پێشنیازی ئەوەیان کرد، که شاخەکانی بە زێڕ زاخاو بدەن، بەلاّم پێشنیازەکەیان سەری نەگرت. له بیرمه جارێکیان له (ئاکیم ئاکیمیچ)م پرسی، که له دوای ئەشعیا فومیچ باشترین زێڕینگەری زیندانەکەمان بوو، باشه دەکریٚ شاخی سابرێن زێڕکفت بکریٚ، زۆر بە دیقەت لە شاخی ڤاسکا وردبووەوە، دوای کەمێك بێدەنگی بەرسڤی دامەوە، دەکریٚ، بەلاّم بەرگە ناگرێتو زۆر زوو دەچێتەوە، بۆیە پێویست بەوکارە ناکات. ئیدی نەخشەکە لەم سنوورەدا وەستا. تەسەورم دەکرد ڤاسکا سالاّنێکی زۆر بژی، بەلاّم رۆژێك که زیندانییەکان له کار دەگەڕانەوەو ڤاسکا کە بە گولْ رازابووەوە پێشیان کەوتبوو، تووشی مێجەر، که بە سواری گالیسکە بوو،دەبن. مێجەر هاواریان لێدەکات: " بوەستن! ئەم سابرێنه هی کێیه ؟" حالْو حیکایەتەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش بە تووڕەیی گوتی: "شتی واچۆن دەبیٚ، یانی بەبیٚ ئاگاداری من، ئەم سابرێنه له زیندان‌دا بەخێو دەکەن ؟ ئادەی عەریف!" هەنگیٚ دەستووری بە عەریفەکە دا یەکسەر سابرێنەکە سەر ببڕیٚو کەولّی بکاتو کەولّەکەی له بازاڕ بفرۆشێتو پارەکەی له سەندووقی زیندان‌دا دابنیٚ، بەلاّم گۆشتەکە بکولّێنریٚو دەگەلْ شۆرباى کەلەرمدا لیٚ بنریٚو دەرخواردی زیندانیەکان بدریٚ. گشت زاندانییەکان زۆریان خەفەت بۆ سابرێنه سپی خوارد، بەلاّم کیٚ دەسەلاّتی مێجەری هەبوو، یان دەیتوانی قسه له قسەی بکات. ئیدی ڤاسکا، له قەراخ چالّی زبلْو خاشاکەکەدا سەربڕدراو یەکێك لە زیندانییەکان سەروپێیەکەی، بە رۆبلْو نیوێك کڕی.و بەو پارەیە نانی سپی کردراو بەسەر هەموو زیندانییەکاندا دابەش کرا. ئەو زیندانییەی کە سەروپێیەکەی کڕی بوو، هەستا لەتو پەتو پارچە پارچەی کردو سووری کردەوەو بەزیندانییەکانی فرۆشتەوە. بەڕاستی گۆشتەکەی زۆر بەتامو لەزەت بوو!

یەکێك لە گیانلەبەرەکانی دیکەی زیندانەکەمان هەلّۆیەکی بیابان بوو ( کاراجوش ) لە تیرەی هەلّۆ چکۆلەکان بوو. رۆژیٚ یەکێك لە زیندانییەکان بە نیمچە مردوویی هێنابووی. گشت زیندانییەکان دەوریان دا، نەیدەتوانی بفڕیٚ، بالّی ڕاستی شکا بوو و بە قەدیا شۆڕبوو بووەوە، لاقێکی دەرچوو بوو. زۆر بە تووڕەیی دەیڕوانیه ئەو ئاپۆرایەی لێی خڕبوو بوونەوەو دەندووکە کولینگییەکەی دەکردەوەو ئامادەبوو تا دوا هەناسە داکۆکی لە خۆی بکات. کاتیٚ کە زیندانییەکان بەرە بەرە بلاّوەیان لێکرد، ئەویش بە شەلە شەلو بالّە تەپیٚ خۆی گەیاندە سووچێکی لاچەپو تەریکی حەوشەی زیندانەکەو سیٚ دانە مانگی خشت لەوێدا مایەوە. زیندانییەکان لە سەرەتاوە ناو بەناو دەهاتنە تەمەشایو هەندێجار "شاریك"شیان تیٚ بەردەدا تا سەر بخاتە سەری، هەرچەندە شاریك بەڕقەوە گوڕی دەبەستەوەو بۆی دەچوو، بەلاّم نەدەوێراش زۆر لێی نزیك ببێتەوە، ئیدی بەمە کەیفو سەفای زیندانییەکان دەردەچوو. زیندانییەکان لە نێو خۆیاندا دەیانگوت: " حەیوانێکی دڕە ها! دەست درێژی له کەس قبوولْ ناکات !".

بەرە بەرە شاریك ترسی لێی شکاو ناو بەناو شەڕی پیٚ دەفرۆشتو تەشقەلّەو گەڕی پێدەکرد، تاکتیکی پەلامارەکانی خۆی گۆڕی، لە لای بالّە شکاوەکەیەوە بۆی دەچوو، لە بالّە شکاوەکەی دەنەویو هەلّۆیەکەش بە دەندووكو چنگالّەکانی بەرگری لە خۆی دەکرد، لە سووچەکەی خۆیدا هەلّدەکوڕماو وەکو سولّتانێکی بریندار بە فیزەوە دەیڕوانیه ئەو خەلّکانەی هاتبوونە تەمەشای.

ئەنجام زیندانییەکان لێی بێتاقەت بوون،و بە تەواوەتی فەرامۆشیان کرد، خۆ ئەگەر هەرجارەی یەکێك بە خێری خۆی، پارچەیەك گۆشتی کاڵ‌و تۆزێ ئاوی لە کاسە شکاوێکدا بۆ نەبردبا، لەگێن بوو لەو سووچەدا مرداربێتەوە.هەڵۆیەکە لە سەرەتاوە هیچی لە دەستی کەس نەدەخوارد، یان لەبەرچاوی خەڵکەکە هیچی نەدەخوارد. چەندین جار لە دوورەوە تەمەشام دەکرد. ئەگەر کەسی نەدیتباو وای زانیبا بە تەنیایەو کەسی لە دەور نییە، بە بن دیواری حەوشەکەدا، نزیکەی دە دوانزە شەقاوێك دەڕۆیی‌و پاشان دەگەڕایەوە شوێنەکەی خۆی، پاشان بۆ جاری دووەم هەمان مەودای دەبڕی‌و ئەوجا دەگەڕایەوە، ڕێك لە نەخۆشێك دەچوو کە پزیشك ئەو وەرزشەی بۆ دانا بێت ! بەڵام هەرکە چاوی بە من دەکەوت، بەلەز، بە شەلە شەل‌و باڵە تەپێ، غاری دەدا بۆ شوێنەکەی خۆی. هەنگێ سەری بە پشتا دەبرد، دەندووکی دەکردەوەو، پەڕەکانی گیڤ دەکردەوە، وەکو ئەوەی خۆی بۆ شەڕێك ئامادە بکات. زۆرم هەوڵدا ڕامی بکەم‌و تۆزێ دەستەمۆ ببێ، بەڵام بێهودە: هەرکە دەستم بۆ بردبا، بەر دەنووکی دەدام، تاقە جارێکیش ئەو گۆشتەی نەدەخوارد کە بۆم ڕادەگرت. بە نیگایەکی بوغزنی پڕ ڕق‌و کینەوە لێی دەڕوانیم. ئەم هەڵۆ بەدبەختە زۆر گۆشەگیرو کینە لە دڵ بوو، ئامادە بوو بە تەنیا بمرێت، بەڵام دۆستایەتی کەس نەکات. زیندانییەکان، ئەنجام دوای دوو مانگ لە فەرامۆشی‌و پشت گوێ خستن، بیریان کەوتەوەو بڕیاریان دا کە لە زیندانەکە بیبەنە دەرێ‌و ئازادی بکەن، لە بەینی خۆیاندا دەیانگوت: " ئەگەر مرداریش دەبێتەوە، با بەلای کەمەوە لە ئازادیداو بە ئازادی مردار ببێتەوە ".

زیندانییەك گوتی:

– ئەمە باڵندەیەکی ئازادە، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان دەگەڵ زینداندا ڕانایەت.

یەکێکی دی گوتی:

– وەکو ئێمە نییە، زۆر جیاوازە لە ئێمە....

زیندانییەکی تر هەڵیدایە:

– هەڵبەتە جیاوازە، باڵندە لە کوێ‌و بەشەر لە کوێ !....

سکوراتۆف هەڵیدایەو گوتی:

– هەڵۆ، برادەرینە، پاشای دارستانە...

بەڵام کەس گوێی نەدایە.

ڕۆژێك دوای فراڤین، دەهۆڵی چوونە سەر کار لێدرا، چەند زیندانییەك هاتن بەلای هەڵۆکەوە، دەندووکیان بەستەوە،چونکە دەندووکی دەوەشاند، ئیدی بەسەر دیواری حەوشەکەدا ئاودیویان کرد. ئەو زیندانییانەی کە ئەم کارەیان کرد، ژمارەیان دوازدە زیندانی بوو، زۆر بە تاسەوە بوون بزانن ئەم هەڵۆیە بەرەو کوێ دەفڕێ. سەیر ئەوە بوو هەموویان زۆر شادمان‌و خۆشحاڵ بوون، دەتگوت خۆیان ئازاد دەکرێن، ئازادی خۆیان لە ئازادی هەڵۆیەکەدا دەبینییەوە!

ئەو زیندانییەی کە هەڵۆکەی بە دەستەوە بوو، نیگایەکی پڕ میهری هەڵۆکەی کردو گوتی:

– ئەی شەڕانی، تۆ دەتەوێ چاکەی دەگەڵ بکەی، ئەو بە دەنووك دەستت هەڵدەدڕێ، ئاوا چاکەت دەداتەوە.

– میکیتکا، بەرەڵلای بکە با بفڕێ !

– هەڵۆو دیلییان نەگوتووە. ئازادی بکە، با ئازادی خۆی وەربگرێت!

هەڵۆکەیان بەسەر دیواری حەوشەکەدا بەرەو بیابانی بێ پایان هەڵدا. دنیا، کەوە رۆژێکی ساردی ئاخرو ئۆخری پاییز بوو. گژەبای بیابانی چۆڵو هۆڵ، بە فیکو هوڕ خۆی بە نێو پنجە گیای زەردهەڵگەڕاودا دەکرد. پیرە هەڵۆ، بە باڵە نەخۆشەکەیەوە، بێ ئەوەی بە ئاستەم ئاوڕێك بداتەوە لە شەقەی باڵی دا، دەتگوت پەلەیەتی کە ساتێ زووتر چاوی لە چاومان ببڕێو لە چاومان ون بێ. زیندانییەکان لە دواوە، تەمەشای سەرە رەشەکەیان دەکرد کە بە پەلە بەسەر گیاو دەوەنەکاندا دەڕۆیی. یەکێك لە زیندانییەکان، کەمێك لە فکران ڕاچووو ئەوسا گوتی:

– چاوتان لێیە ؟

یەکێکی تر گوتی:

– هەر ئاوڕیش ناداتەوە! تاقە جارێکیش ئاوڕی پاشەوەی نەدایەوە!

زیندانی سێیەم گوتی:

– چما بەتەمای بگەڕێتەوە تا سوپاسمان بکات ؟

– ئێستا بۆ خۆی ئازادە. نە مرد تامی ئازادی چەشتەوە !

– بەڵێ ئازادە !

– برادەرینە جارێکی دی نای بینینەوە !

سەربازە پاسەوانەکان تێیان خوڕین.

– بۆچی لێرە وەستاون ؟ دەی بڕۆن بۆ سەر کاری خۆتان !....

زیندانییەکان، بە بێدەنگیو بە خاوەخاو بۆ سەر کار وەڕێکەوتن.

***<u>پەراوێز:</u>***

***١– گیسك: بوونی کیسك لە پەچەو ئاغەڵاندا، لە نك رووسان: نیشانەی فەڕو بەرەکەتە... یانی خێر دێتە ڕێت..***

## سكالاْ

وەشانكاری "یادگارییەكانی خانەی مردوان"ی ئالكسندەر پترۆفیچ گۆریانچیكوڤ رەحمەتی، بە پێویستی دەزانێت لە سەرەتای ئەم فەسڵەوە ئەم تێبینیانە بخاتە بەردەستی خوێنەران:

"نووسەری یادگارییەكانی خانەی مردووان، لە فەسڵی یەكەمی كتێبەكەی خۆیدا باسی تاوانێكی بابكوژی كردبوو كە گوایە لەلایەن نەجیمزادەیەكەوە*(١) ئەنجام درابوو، ئیدی نووسەر ئەم تاوانەی كردبوو بە نموونەیەك بۆ دڵرەقیو بێ هەستی ئەو زیندانییانەی كە بەوپەڕی بێ موبالاتی خوێنساردییەوە تاوانەكانی خۆیان دەگێڕایەوە. هەروەها نووسەری یادگارییەكان ئەوەشی گوتبوو. هەرچەند كوڕەی تاوانبار، لە بەردەم دادگادا دانی بە هیچ شتێكدا نەنا بوو، بەڵام ئەوەی خەڵكو خوا بۆ نووسەریان گێڕابووەوە، بە تایبەتی ئەوانەی هەموو شتێكیان لەمەڕ رووداوەكە دەزانی، ئەوەندە بەجێو ڕێو ڕوون بوو كە پیاو نەیدەتوانی كەمترین گومان لە تاوانی بابكوژییەكەی یارۆ بكات. ئەو خەڵكە بۆ نووسەری "یادگارییەكانی خانەی مردووان"یان گێڕابووەو كە تاوانباری ناڤبری كوڕێكی سەرسەری، ناوزڕاو بووەو تا بیناقاقای لە قەرزا بووە، بۆیە بابی كوشتبوو تا دەست بەسەر میراتیەكەیدا بگرێت. هەروەها هەموو خەڵكی ئەو شارەی كە یارۆی بابكوژ كاری تیا دەكرد، مەسەلەكەیان بە هەمان شێوە گێڕا بووەوە، ئیدی بەو جۆرە نووسەر زانیاریەكی زۆری لەو بارەیەوە دەست كەوتبوو. هەروەها نووسەر ئەوەشی باس كردبوو كە ئەم بابكوژە، كاتێ كە لە زیندانیشدا بووە، كەسێكی بە ورە، رووخۆش، سوعبەتچیو بێباكو خەمسارد بووە، نەك گەوجێتی پێوە دیار نەبووە، بەڵكو زیرەكو بە ئاوەز دیار بووە،و نووسەری یادگارییەكان... رۆژێ لە رۆژان دڵرەقی لێ نەدیتووە،و نووسەر دەڵێت: "بۆیە هەرگیز باوەڕم نەدەكرد تاوانبار بێو ئەو جۆرە تاوانەی كردبێت."

"وەشانكاری ئەم كتێبە ((یادگارییەكانی خانەی مردووان))، چەند رۆژێ لەمە پێش لە سیبیریاوە هەواڵێكی پێ گەییووە دەڵێت ئەم گەنجەی كە بە تاوانی كوشتنی بابی تاوانبار كراوەو گیراوە، بێ گوناحەو نە لە دوورو نە لە نزیك دەستی لەو تاوانەدا نییە، بە ناهەق دە دانە ساڵی تەمەنی لە بێگارە زیندان دا بەسەر بردووەو، بە فەرمیو لە دادگادا بێ تاوانی ناڤبری سەلمێنراوەو بكوژە ڕاستیەكان دانیان بە تاوانی خۆیاندا ناوەو ئەو گەنجە بەدبەختە ئازاد كراوە.

دیارە وەشانكاری ئەم كتێبە هیچ گومانێكی لە دروستی ئەم هەواڵانە نییە"....

"پێویست ناكات هیچی تر لەمبارەیەوە بڵێین، لەوەی پتر باسی ئەم رووداوە پڕ تراجیدیایە بكەین. باسكردنی ئەم ژیانەی كە بە هۆی تۆمەتێكی ئاوهاوە، وێران بوو بە چی دەچێ ؟ رووداوەكە بەخۆی باسی خۆی دەكات، مانگی چواردە ئەنگوستی ناوێ "...

" بە بۆچوونی ئێمە ئەگەری روودانی ئەم جۆرە هەڵانە زۆرە،و ئەم ئەگەرەش خۆی لە خۆیدا رۆشناییەكی زیاتر دەخاتە سەر ئەو دیمەنو رووداوانەی كە لە كتێبی ((یادگارییەكانی خانەی مردووان))دا باس كراونو دەكرێن...."

جا ئێستا با بگەڕێینەوە سەر چیرۆکەکەی لەمەڕ خۆمان، سەر ئەو یادگارییانەی کە ئەلکساندەر پترۆفیچ گوریانچیکۆڤ ڕەحمەتی نووسیویەتی:

ئەوەبوو گوتم ئەنجام لەگەڵ ئەم هەلومەرجو ژینگەیەدا ڕاهاتم، بەڵام ئەم "ئەنجامە" زۆر بە ئازار،و درێژ خایەن بوو. یانی ڕاستت دەوێ نزیکەی یەك ساڵی تەواوی پێچوو تا لەگەڵ ژینگەی زینداندا ڕاهاتم، تا ماوم ئەو ساڵەم لە بیر ناچێت، سەختترینو دژوارترین ساڵی تەمەنم بوو. بۆیە بە تەواوەتی، بە هەموو وردو درشتێکیەوە لە مێشکمدا نەخش بووە، بگرە سات بە ساتی ئەو ساڵی یەکەمەم لە مێشکدا چەسپیوە. هەروەها باسی ئەوەشم کرد کە زیندانییەکانی دیکە نەیان دەتوانی وەکو من بەم ژیانو ژینگە تازەیە ڕابێن. بە درێژایی ئەو ساڵی یەکەمە بەردەوام لە خۆم دەپرسی کە ئاخۆ ئەمانە بەڕاستیو لە ناخەوە ئەوەندە هێمنو ئارامن ؟ ئەمجۆرە پرسیارانە بە زۆری بەرۆکیان دەگرتمو عەوداڵی وەڵام بوون. گشت زیندانییەکان وەکو پێشتریش گوتوومە، هەستیان بە غوربەتو نامۆیی دەکرد، بە ژیانی زیندان بێگانە بوون. زیندانیان بە ماڵی خۆیان نەدەزانی، هەستیان نەدەکرد لە ماڵی خۆیاندان، بەڵکو وایان هەست دەکرد، لە قۆناغێکی ڕێگادان، بۆ پشوویەك لە کاروانسەراو ئوتێلێك بە شێوەیەکی کاتی لایان داوە. ئیدی ئەو پیاوانەی کە حوکمی ئەبەدیش درابوون، نیگەرانو بێ ئۆقرە بە ئومێدی مەحاڵان دەژیان، هەر چەندە ئەم نیگەرانیو ئومێدەوارییە نەدەهاتە دەربڕین، بەڵام لە چاوی تیژ دەرباز نەدەبوون. ئەم بێ قەراریو ئومێدەوارییە کە خۆبەخۆ لە مرۆڤدا پەیدا دەبوو، ئەوەندە خەیاڵی و مەحاڵ بوو، زۆرجار لە ورێنە دەچوو، هەر هەموو ئەم حاڵەتانە شەقڵێکی سەیرو غەریبیان بەم شوێنە بەخشی بوو، هەر بۆیەش ڕەوشێکی تایبەتی وەرگرتبوو، پیاو کە یەکەمجار دەچێتە زیندانەوە، هەست دەکات، لە دەرێی زینداندا شوێنێکی تری لەو جۆرە شوێنە نییە، یانی لە هیچ شوێنێکی دەرەوە ناچێت. هەرچی خەڵکی ناو زیندان هەیە ڕادەستی زندە خەونان دەبنو لە ونگەکانی خەیاڵدا ئاوارەو سەرگەردان دەبن، ئەمە حاڵەتێکە لە چاو ون نابێتو بەخۆی بەرۆکی بینین دەگرێت. من ئەمەم لەبەر گران بوو، چونکە ئەو خەونپەروەرییەی زاندانییەکان تیایدا نقوم بوو بوون، دەیکردە کارێك زۆربەیان هەمیشە گرژو مۆن، شەڕەنگێزو نەخۆش بنوێنن. زۆربەی هەرە زۆریان بێدەنگ بوونو قسەیان نەدەکرد، پیشیان دەخواردەوەو لە هەموو ئانو ساتێکا لەسەر چزو تەقینەوە بوون. حەزیان نەدەکرد، دڵیان بۆ کەس بکەنەوە، بۆیە ڕقیان لە سادەییو ڕاشکاوی بوو. تا خەونو خەیاڵو ئارەزوو ئومێدەکان نیمچە مەحاڵ بوایەن، تا زیندانی لە دڵی خۆیدا، زیاتر پەی بە مەحاڵ بوونی هیواو ئاواتەکانی خۆی ببردایە، زیاتر سوور دەبوو لەسەر ئەوەی بیشارێتەوەو لای کەسو بۆ کەسی نەدرکێنێ. تۆ بڵێی شەرمیان کردبێ ئەو هیواو ئاواتە خەیاڵیو مەحاڵانەی خۆیان بگێڕنەوە ؟ خۆ خەڵکی رووس، خەڵکانێکی واقیع بینن، ئامادەن ئیراد لە خۆ بگرن، گاڵتە بە عەیبو کەموکووڕییەکانی خۆیان بکەن!....

ڕەنگە هەر ئەم لە خۆ ناڕازی بوونە پەنهانو هەمیشەییە هۆیەك بووبێ، لە هۆیەکانی سستی پەیوەندی نێوان زیندانییەکانو چیکڵدانە تەنگیو ڕووگرژیو دڵڕەقیانو یەکتر قەبووڵ نەکردنیان. خۆ ئەگەر یەکێکی لەوانی دیکە ساویلکەتر، بە ڕێکەوت، بە دەنگی بەرز گوزارشتی

لەو خەون و ئومێدانە بکردایە کە هەموو کەسێك لە بێدەنگیدا بیری لێدەکاتەوە، شاخ و باڵی لە خەون و خەیاڵەکانی بنابایە، کۆشك و تەلاری لە ئەسپانیادا رۆبنایە، ئەوا هاوڕێکانی یەکسەر تەریقیان دەکردەوەو گاڵتەیان پێدەکردو دەیانکرد بە گەپجاڕی خۆیان. بە زۆریش ئەوانە گاڵتەیان پێدەکرد کە بە خۆیان لە هەموو کەس پتر خەیاڵاوی بوون و ئومێدو هیوای شێتانەیان لە دڵ و دەروونی خۆیاندا پەروەردە دەکرد.

پێشتر باسی ئەوەم کردبوو کە زیندانییەکان بە چاوی سووك تەمەشای خەڵکانی سادەو ساویلکەیان دەکردو بە گەوج و گەلحۆیان دەزانین. زیندانییەکان ئەوەندە گرژو مۆن و خۆپەرست بوو بوون، چاویان بەرایی نەدەدا خەڵکی سادەو ئاسایی و خۆش مجێز بدینن و بدوێنن، دەیان بوغزاندن. جا سەرباری ئەو خەڵکە سادەو ڕاشکاوە، دەشێت زیندانییەکان بکرێن بە دوو دەستەی تەواوی جیاوازەوە: باش و خراپ، روو خۆش و روو گرژ. روو گرژو خراپ وبەدخووەکان زۆرینە بوون، خۆ ئەگەر بە ڕێکەوت خەڵکانێکی زۆربێژو دەم شڕیان تیا هەڵکەوتبا، ئەوا ئەو دەم شڕو زۆر بێژانە، دەکەوتنە دوو زمانی و ئاژاوەگێڕی و حەسوودی و بەغیلی و خۆیان لە کاروباری خەڵکی تر هەڵدەقورتان و لەزەتێکی زۆریان لەو کارە دەبینی، ئەمانە زۆریش هەوڵیان دەدا، دڵ و دەروونیان نەکەنەوەو ئەوەی لە مێشك و خەیاڵیاندایە دەرنەبڕن و بیشارنەوە، چونکە ئەوە لە نێو زیندانییەکاندا کارێکی ناپەسند بوو.

بەڵام خەڵکە رووخۆش و باشەکە – کە کەمینە بوون – خەڵکێکی هێدی و هێمن و بێوەی و لاشەڕ بوون،خەون و ئاواتەکانیان لە ناخی دڵدا دەشاردەوە،و زیاتر بەلای خۆشخەیاڵیدا دایاندەکێشا، لە خەڵکە خراپ و روو گرژەکە پتر باوەڕیان بە خەون و خەیاڵەکانی خۆیان هەبوو. پێموایە جگە لەو دەستانە، دەستەیەکی دیکەش لە زیندانەکەماندا هەبوو کە دەستەی رەشبینان و بێ ئومێدان بوو، نموونەی ئەوانەش، کە ژمارەیان یەجگار کەم بوو، پیرەمێرێك بوو بە نێوی ستارودوب.

ئەم پیرەمێردە بە ڕواڵەت زۆر هێمن و هێدی بوو، بەڵام بە گوێرەی هەندێ نیشانان، ئەوەم بۆ دەرکەوت کە باری دەروونی و سایکولۆژی ئەو پیاوە یەجگار نالەبارو ترسناکە، لە کێشدا نییە. ئەم پیاوە بۆ سوکنایی دڵی خۆی ڕێگەیەکی تایبەتی دۆزی بووەوە، کە بریتی بوو لە عیبادەت و چلەکێشی و قەناعەتی بەخۆی هێنابوو کە شەهیدە. ئەگەر بیرتان مابێ پێشتر باسی زیندانییەکی دیکەم کردبوو کە هەمیشەی خوا خەریکی خوێندنەوەی تەورات بوو، مەبەستم ئەو زیندانییەیە کە شێت بوو،وخشتەکەی خێواندە مێجەر، لەگینە ئەویش یەکێك بووبێ لەو ڕەشبین و نائومێدانەی کە دوا تروسکەی ئومێدیان لەدڵدا دەکوژێتەوە، جا چونکە مەحاڵە مرۆڤ بتوانێ بەبێ هیواو ئومێد هەڵبکاو بژی، بۆیە زیندانی ناڤبری لە نا ئومێدیدا، ڕێگەیەکی بۆ خۆی هەڵبژارد بوو وبە خوایشتی خۆی، بە حوسن و رەزای خۆی پەنای بۆ شەهادەتێکی دەستکرد بردبوو. ئیدی ئەم زیندانییە بە خۆی گێڕابوویەوە کە لەبەر ئەوە پەلاماری مێجەری نەدابوو کە خراپەی لەگەڵ کردبێت، یان ڕقی لێی بووبێ، بەڵکو لەبەر ئەوە پەلاماری دابوو کە ئازاری بدات و هیچی تر. کێ دەزانێ لەو کاتەدا چ ئەنگێزەیەکی دەروونی و سایکولوجی بۆ ئەو کارەی هانداوە؟ کەس بەبێ ئومێدو ئامانج هەڵناکات و ناژی، هەر مرۆڤێك لە پێناوی ئامانج و ئاواتێکدا دەژی، کە

ئومێدو ئامانج نەما، نیگەرانی لە مرۆڤ دەوڕوکیۆ دەبێ بە گووراوێکی نەسازو سەیر... هەموو ئاوات‌و ئامانجێکی ئێمەی زیندانی ئازادی بوو، ئەوە بوو لە زیندان ڕەها ببین.

جا ئێستا من دەمەوێ زیندانییەکانی خۆمان پۆلێن بکەم، بەڵام ئاخۆ شتی وا دەشێت ؟ هەڵبەتە واقیع هێندە هەمە جۆروهەمە ڕەنگە، مەحاڵە هیچ هزرینێکی ڕووت بتوانێ پۆلێنی بکات. واقیع بە وردیو بە ڕوونی پۆلێن ناکرێ، واقیع بێ ئەندازە هەمە جۆرو هەمە ڕەنگە، مەحاڵە سنوور بەندیو پۆلێن بکرێت. ئێمە هەر هەموومان، ژیانی تایبەتیو شەخسی خۆمان هەبوو، مەبەستم ژیانی دەرێی ژیانی فەرمییە، ژیانی دەرێی ئەو ژیانەی کە سیستەم‌و یاساو ڕێسای فەرمی دەیسەپێنێ.

بەڵام من، وەکو پێشتریش باسم کردووە، لە سەرەتای حەپسییەکەمدا نەمدەتوانی بچمە بنج‌و بناوانی ئەو ژیانە تایبەتیەو پەی بە جەوهەری ناخ ببەم، بۆیە هەموو ڕواڵەتە دەرەکیەکان ئازاریان دەدام، لە ڕادەبەدەر خەمباریان دەکردم. هەندێجار وارێدەکەوت پڕ بەدڵ رقم لەو هاوزیندانییە شەهیدانەم دەبووەوە کە وەکو من بەدەم ژان‌و ئازارەوە دەتلانەوە. تەنانەت بەغیلی ئەوەشم پێ دەبردن کە لە نێو هاوڕەگەزانی خۆیاندا دەژیان‌و لێکدی حاڵی دەبوون، ئەلهەقی ئەو پەیوەندییەی کە زیندانییانی کۆ دەکردەوەو دەیکردن بە هاوڕێ، واتا، پەیوەندی دارو قامچی، ژیانی هاوبەشی ناچاری، بوغزو نەفرەتی لەلا دروست دەکردن،و هەرکەسە هەوڵی دەدا بۆ خۆیو بە تەنیا لە سووچێکدا بژیو لە بەندو باوی هاوڕێیەتی ناچاری ئازادبێ. بەڵام ئەو بەغیلیو نەفرەت‌و بێزارییەی لە دەمی هەڵچوون‌و تووڕەییدا بەرۆکی دەگرتم، ئەنگێزەی رەواو هۆی بەجێی خۆی هەبوو. ئەوانەی دەڵێن بابایەکی نەجیمزادە یان رۆشنبیرو خوێنەوارو خانەدان، لە بێگارەزیندان‌دا، هەمان دژواریو ناڕەحەتیو ئازاری بابایەکی جووتیاری ساویلکە دەبینن، زۆر سەهون. من لەو دواییانەدا لەم بۆچوونە ئاگادار بوومەوەو تەنانەت هەندێ شتیشم لە بارەیەوە خوێندەوە. ئەلهەقی بیرۆکەو بۆچوونەکە لە ڕووی پرەنسیپ‌و سەرەتاوە پەسندو بەجێ‌و دادوەرانەیە: زیندانییان هەموو بەشەرن‌و، بەشەر دەبێ یەکسان بن. بەڵام ئەم بیرە، بیرێکی زۆر ئەبستراکت‌و مجەڕەدو ڕووتەڵە : چونکە زۆر وردەکاری ئاڵۆز هەیە، تا بە خۆمان لە ژیانی واقیعیو پراکتیکیدا تووشی نەبین‌و تاقی نەکەینەوە، ناتوانین لێی بگەین. هەڵبەتە مەبەستم ئەوە نیە بڵێم هەست‌وسۆزی نەجیمزادەیەکی رۆشنبیروخوێنەوار، چونکە پێشکەوتووترو شارستانی ترە، ناسکتروباڵاترە. بەڵام یەکسانی سایکۆلۆژیو دەروونی مەحاڵە،و رۆشنبیری لێرەدا نابێ بە پێوەرو پێوانە. من یەکەم کەسم کە شایەتی ئەوە دەدەم لە نێو ئەو زیندانییە قەرەبەختانەدا، خەڵکانێك هەبوون، دوور لە هەر رۆشنبیریو خوێنەوارییەك، بەڵام تا حەزبکەی لە ڕووی دەروونیو سایکۆلۆژییەوە بە سۆزو ناسك‌و میهرەبان بوون، واتا لە باری دەروونییەوە لە ئاستێکی پێشکەوتوودا بوون. زۆرجار لە زینداندا خەڵکانێکم دەناسی لە دڵی خۆدا بە ئاژەڵێکی دڕندەم دەزانین‌و زۆرم ڕق لێیان دەبووەوەو بە سووکی تەمەشام دەکردن، کەچی لە پڕێکاو لە ساتێکی چاوەڕوان نەکراودا، ئینسانیەتی ناخیان کەشف دەبوو،و هاوسۆزیو هاوخەمییەکی هێندە مرۆڤدۆستانەیان دەرهەق بە خەم‌و ئازارو ئاواتی خەڵکی

دەنواندو دەردەبڕی پیاو نەیدەتوانی باوەڕ بە چاوو بە گوێی خۆی بکات، وەکو ئەوە بوو لە پڕ پەردەیەك لەسەر چاوت لاچووبیٚ و شتێکی تازەی باوەڕ نەکردەنی بدینی. هەندێجار پێچەوانەی ئەمەش رووی دەدا: لە پڕ یەکێکی زۆر رۆشنبیرو خوێنەوار، بەدخوایی و دڕندایەتیەکی وای دەنواند تەزووت پێدا دەهات، دڵت لێی تێك هەڵدەهات، چەندیش خاترت بگرتایەو نەتدەتوانی هیچ پاکانەیەکی بۆ بێنێتەوە.

من هیچ باسێکی گۆڕانی ژینگەو عادەت و ڕەوشی ژیان و جۆری خواردن و ئەو شتانە ناکەم، کە بێگومان تەحەمولی ئەم گۆڕانە بۆ بابایەکی ئەرستۆکرات و نەجیمزادە، زۆر قورسترە تا بۆ جووتیارێکی هەژار کە ڕەنگە لە دەرێی زیندانیشدا، کاتیٚ کە ئازاد بووە، تێر بە سکی خۆی نانی نەخواردبیٚ، بەلای کەمەوە لێرە، لە زینداندا، تێر بە سکی خۆی نانی دەخوارد، نا نەخێر باسی ئەوە ناکەم! گریمان ڕاستە خەڵکی بە ورەو خۆڕاگر، گویٚ بەو تورەهاتانە نادات کە لە چاو حورمان و مەحرووم بوونی تردا ناکەنە هیچ. بەڵام گۆڕینی عادەتی مادی و واقیعی کارێکی هەر وا ئاسان و ئاسایی نییە. ژیانی زیندانی، ناڕەحەتی و ریسوایی ئەوتۆی تێدەکەویٚ، کە ژینگەی چەپەڵ، غوربەت وغەریبی، خواردنی کەم و پیس، کۆت و زنجیر، لە چاویا ناکەنە هیچ. نازدارترین نەجیمزادەو دەست سپی ترین خانەدان پاش ئەوەی رۆژێکی تەواو کاردەکات و لە بێگار دەگەڕێتەوە، بیٚ چەندوچوون بەردەبێتە نانە بۆرەکەی زیندان و مل دەنیٚ بە شۆربا پڕ لە کێچ و پێشکەکەی زیندانەوە. ئەمانە لەو شتانەن کە پیاو بەرە بەرە لەگەڵیا ڕادیٚ، وەکو چۆن ئەمە لە گۆرانیەکی تەوسامێزدا دەرهەق بە بابایەکی نەجیمزادە کە زیندانی کراوە، بەرجەستە کراوە:

***خواردنم شۆربای کەلەرمە،***

***هەڵیدەلوشم و دەم دەلێسمەوە.***

ئەوەی گرینگە هەرکەسێکی عەوام کە دەگاتە زیندان دوای دوو سەعات دەبیٚ بە هاوڕێی زیندانیەکان: وا هەست دەکات لە ماڵی خۆیدایە، لە نێو کەس و کاری خۆیدایە، هەموو ئەو مافانەی هەیە کە هاو زیندانییەکانی هەیانە. لێیان دەگات و لێی دەگەن، هەموو زیندانییەکانیش بە یەکێك لە خۆیانی دەژمێرن. سەبارەت بە بابایەکی نەجیمزادە مەسەلەکە وانەبوو، ئەو زیندانییەی سەر بە چینی نەجیمزادان بوایە، چەند پیاوی باش بوایە، چەند دڵپاك و دروستکار، چەند بەئاوەزو ئەقڵمەند بوایە، هەموو زیندانیەکان بۆ ساڵانێکی زۆر دەیان بوغزاند، نە لێی حاڵی دەبوون و نە متمانەیان پێدەکرد. نەیدەتوانی ببیٚ بە دۆست و هاوڕێیان، خۆ ئەگەر توانیبای کارێکی وەها بکات، تەشقەڵەو گەڕی پیٚ نەکەن، سووکایەتی پیٚ نەکەن و ڕێزی بگرن، هەر وەکو بێگانەیەك تەمەشایان دەکردو مامەڵەیان دەگەڵ دەکرد، ئیدی ئەویش بەردەوام هەستی بە تەنیایی و گۆشەگیرییەکی ناخۆش دەکرد. دیارە زیندانییەکان لە نیهادپیسییەوە ئەو گەمارۆیەیان نەدەخستە سەری، بەڵکو خۆ بە خۆ و بە شێوەیەکی ئاسایی دروست دەبوو. هەموو مەسەلەکە ئەوە بوو، کە ئەم زیندانییە نەجیمزادەیەو لەوان نییە، سەر بە چینی ئەوان نییە، بەوان نامۆو غەوارەیە....

ناخۆشترین شت ئەوەیە کە پیاو لە ژینگەی خۆی نەژی، لە ژینگەی خۆی دای بڕن. بۆ نموونە ئەو جووتیارەی کە لە "تاگانروك*(٢)"ـەوە بۆ بەندەری "پتروبافلوفسك" دەگوازرایەوە، لەوێندەر تووشی هەمان جۆرە جووتیارانی رووس دەبوو، کە لە زاگەی خۆیدا هەبوون. بۆیە دوای دوو سەعاتان هۆگری یەکتر دەبوون، ئیدی وای هەست دەکرد لە ماڵی خۆیدایە، پێکەوەو بە تەبایی لە یەك گالیسکەو لە یەك کەپردا دەحەوانەوە، بەڵام بۆ بابایەکی نەجیمزادە ڕەوشەکە زۆر جیاوازتر بوو، بۆشاییەکی زۆر لە نێوان ئەوو خەڵکە عەوامەکەدا هەبوو. ئەمەش وەختێ بەدیار دەکەوت کە یارۆی نەجیمزادە لە ژینگەکەی خۆی دادەبڕاو ئەو نازەی جارانی نەدەماو بە ناچاری دەکەوتە ناو ڕەمەکی خەڵکییەوە. لە غەیری ئەم حاڵەتەدا، خوای دەکرد هەموو ڕۆژێك سەروکاری دەگەڵ جووتیاراندا دەبوو، رۆژانە بەدەم ئەرکی ئیدارییەوە دەیدیتن،وەکو بابێکی باش خزمەتی دەکردن وچاکەی دەگەڵ دەکردن ، بەڵام قەت ڕۆژێ لە رۆژان وەکو پێویست و بە قووڵی نەیدەناسین‌و لەیەکتر نەدەگەییشتن. خۆ ئەگەر وای هەستکردبا ناسیوونی‌وناخی خوێندوونەتەوە، ئەمە لە سنووری وەهم‌و خەیاڵ تێ نەپەڕیوە. بێگومان ئەوانەی ئەم بۆچوونە دەخوێننەوە، ئەم قسانەم بە موبالەغە ئامێز دەزانن، بەڵام من دڵنیام کە تێبینی‌و بوچوونەکەم زۆر ڕاست‌و دروستە. هەڵبەتە من لە ڕێگەی خوێندنەوەی کتێبانەوە ئەم بۆچوونەم لەلا گەڵاڵە نەبووە، بەڵکو ئەزموونی ژیانی واقیعی خۆم، ئەو بۆچوون‌و قەناعەتەی لەلا دروست کردووم. هەڵبەتە پاش ئەزموونێکی زۆرو بە درێژا، ئەو قەناعەتەم لەلا چێبووە. ڕەنگە رۆژێك بێ هەمووان رادەی دروستی ئەو بۆچوونەی منیان بۆ بەدیاربکەوێ....

ئیدی، ڕووداوەکان هەر لە سەرەتاوە، دروستی‌و ڕاستی سەرنج‌و بوچوونەکانی منیان سەلماند، ئەم ڕووداوانە زۆریان کارتێکردم، بە تەزاندن تەزاندمیان. لە یەکەم هاوینی سەرەتای حەپسییەکەمدا هەمیشە بە تاقی تەنیا بە گۆشەو کەناری زیندانەکەدا دەسووڕامەوەو پیاسەم دەکرد. پێشترش باسی ئەوەم کردبوو، کە ئەو کاتە، لە بارێکی دەروونی ئەوتۆدا نەبووم کە بتوانم زیندانییەکان هەڵبسەنگێنم‌و بزانم کێ بە کەڵکی دۆستایەتی دێت‌و کێ بە کەڵك نایەت. چەند دۆستێکی کۆنە نەجیمزادەم پەیدا کرد، بەڵام دۆستایەتیانم نەچووە دڵەوەو هیچ سوکناییەکی بە روحم نەبەخشی. بگرە خۆزیام دەخواست کەسیانم نەناسیبا،و لە هەمووان بێزار بووم، بەڵام چار چییە ؟ جا با ڕووداوێکتان بۆ بگێڕمەوە کە هەر لە یەکەم ساتەوە تێی گەیاندم کە من لەم زیندانەدا غەریب‌و نامۆو تەنیام. مانگی ئاب بوو، لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا، دەوروبەری سەعات یەکی پاش نیوەڕۆ بوو، یانی ڕێك ئەو کاتانە بوو، کە زیندانیان بەر لەوەی بۆ سەر کار هەستنەوە، چاوێکیان گەرم دەکرد، لە پڕ هەموو زیندانییەکان، پێکەوە ڕابوون‌و لە حەساری زیندانەکەدا خڕبوونەوە، من تا ئەو کاتە هیچ شتێکم نەدەزانی. هێندە نقومی بیرو خەیاڵاتی خۆم بووم، نەمدەزانی چ شتێك لە دەوروبەرم دەگوزەرێ. زیندانییەکان سێ دانە رۆژ بوو جم‌و جۆڵیان تێکەوتبوو، شپرزەو پەریشان دیار بوون. من دەڵێم سێ ڕۆژ بوو، بەڵام پاشان کە هەندێ لە قسەکانی زیندانییە پەست‌و توڕەو ترۆکانم وەبیر کەوتەوە، بۆم دەرکەوت نەخێر ئەم جموجوڵ‌و خرۆشانەیان زۆر لە مێژتر، دەستی پێکرد بوو. من لە دڵی خۆمدا هۆی ئەم هاڕوژان‌و خرۆشانەم

دەگێڕایەوە بۆ قورسی کار لە وەرزی هاویندا، بۆ درێژی ڕۆژگاری تاقەت پڕوکێنی ئەم وەرزە، بۆ ئەوەی کە زیندانیان بە بێ ویستی خۆیان بۆ کار دەبران بۆ دەشتو دەرو مەیلی ئازادییان لەلا دەمەزەردو تازە دەبووەوە، بۆ کورتی شەوگار کە تێر خەو نەدەبوون، وام هەست دەکرد هەر هەموو ئەو فاکتەرو هۆکارانە یەکیان گرتووەو پەنگاونەتەوەو ئەم جموجوڵو هاڕوژانو خرۆشانەی دروست کردووەو مەسەلەی خراپی خواردن کراوە بە بیانوو هەنجەت.

زیندانییەکان چەند ڕۆژێك بوو کەوتبوونە گلەیی لە خواردنەکە ئیدی لە هەموو شوێنێ، چ لە قاوشەکەو چ لە مووبەقەکەدا، بە ئاشکرا گلەییو گازاندەیان دەکرد. یەکێك لە ئاشپەزەکانیان گۆڕی، بەڵام هەر دوای دوو ڕۆژ ئاشپەزی دووەمیان دەرکردو ئاشپەزی یەکەمیان هێناوە. بە کورتی گشت زیندانییەکان شپرزەو نیگەران بوون.

یەکێکیان بە دەم پرتەو بۆڵەوە گوتی:

– ئەو هەموو کارەمان پێدەکەنو خراپترین خواردنمان دەدەنێ!....

زیندانییەکی دی هەڵدەداتێ:

– ئەگەر ئەم خواردنەت بە دڵ نییە، ئەمر بفەرموو خواردنی نایابو تایبەتیت بۆ دروست بکەن!.

زیندانی سێیەم دەڵێت:

– کوڕینە لە گەدگین خۆشتر نییە، من زۆری حەز لێدەکەم !

– ئەگەر هەموو ڕۆژێك گەدگین بخۆی، هێشتا هەر لەلات خۆشە !

زیندانی چوارەم گوتی:

– هەقە گۆشتی گامان بدەنێ... ڕۆژ هەتا ئێوارێ لە کوورەخانەدا شانو باڵ دەوەشێنینو ئێوارە ماندوو مردووو، دەگەڕێینەوەو گەدگینمان دەرخوارد دەدەن... ئاخر گەدگین لە کوێ بەری دڵ دەگرێو پیاو تێر دەکات!....

– یا گەدگینمان دەدەنێ یان عور.

– بەڕاستی....خواردنێکی خراپە.

– ئیدی گیرفانی خۆی پڕ دەکات!

– ئەمە پەیوەندی بەتووە نییە. تۆ هەقت چییە !

– ئەگەر پەیوەندی بە منەوە نەبێ، پەیوەندی بە کێوەیە ؟ خۆ ورگم هی خۆمە. ئەگەر هەموو قسەمان یەك بخەینو سکاڵا بکەین، هەنگێ دەبینن....

– سکاڵا ؟

– بەڵێ....

– نەهەقت ناگرم، وادیارە لێدانی باشت لەسەر ئەو جۆرە سکاڵایانە نەخواردووە ! بەڕاستی گەوجو کەودەنی!....

زیندانییەکی دی، بە خەمینیو بە پەستی هەڵیدایەو گوتی:

– ڕاستە! پەلەکردن پەشیمانی لە دوایە... ئەرێ قەل پیاو پێمان ناڵێی سکاڵا لە کێ دەکەی؟ سکاڵا لە چی دەکەی ؟ خۆ دەبێ لە پێشا ئەوە بزانینو لەسەری ڕێك بکەوین.

– دەڵێم ئەگەر هەمووان سکاڵا بکەن، منیش سکاڵا دەکەم، لەگەڵ عامیّ دەچمە شامیّ، چونکە خەریکە لە برسا دەتۆپم. بەڵام ئەوانەی خواردنی تایبەتی خۆیان دەخۆن، هەقی خۆیانە بەشداری نەکەن، لەجێی خۆیان نەجوڵێن... بەڵام ئەوانەی نانی زیندان دەخۆن...

– ئەی بەغیلی حەسوود! چاوی بەرایی نادات شتی خەڵکی دی بدینیّ!

– باشە هاوڕێیان! بۆچی قەراری خۆمان نەدەین ؟ ئەم عەزابە هەتاکەی ؟ ئەو دزانە خەریکە کەوڵمان دەکەن، دەیانەویّ پێستمان بگروون! با سکاڵا بکەین! با ناڕەزایی دەربڕین!

– ناڕەزایی چی؟ یانی دەتەویّ پارووەکەت بۆ بجوون‌و ئەوسا بیکەنە دەمتەوە ؟ ها ؟ کوڕی باشە دەیەویّ پارۆکەی بۆ بکەن‌و بیکەنە دەمییەوە! کوڕینە ئێمە لە بێگارە زینداندا‌ین‌و تەواو.... ناوی خۆی بە خۆیەوەیە .

– ئیدی هەروا بووەو وا هاتووە، گەل لە برسا دەمرێت‌و بەرپرسینیش لە خەمی ورگی خۆیاندان. لەسەر حیسابی ڕەش‌و رووت قەڵەو دەبن.

– راستە، یارۆی لەمەڕ خۆمان "هەشت چاو" قەڵەو بووە، لەو ئاخرو ئۆخرەدا دوو ئەسپی شێی کڕیوە.

یەکێك لە زیندانییەکان بە تەشەرەوە گوتی:

– فەقیرە حەز ناکات بخواتەوە!....

– هەرچییەکی هەبووە، ماوەیەك لەمەپێش لە قوماردا دایناوە، دوو دانە سەعاتی ڕێك، بەبیّ ئەوەی قرۆشێکی لە گیرفاندا بووبیّ، یاری دەگەڵ بەیتاڵەکەدا کردووە.

– بۆیە گەدگێن دەرخواردی ئێمە دەدەن !

– ئێوە هەمووتان کەرن! ئێمە هەقمان چیە بەسەر ئەمەوە ؟

– ئەگەر گشتمان پێکەوە یەك دەست‌و یەك دەنگ ڕابین چی لە دەست دیّ ؟ پێویستە یەك بگرین‌و عەزممان جەزم بکەین.

– چی لە دەست دیّ ؟ تاهێزی تیا بیّ یەکێك دەکێشێت بە دەم‌و فلْقت داو....

– هەر ئەوەندە...

– دەشتداتە دادگا...

زیندانییەکان هەموو پەریشان‌و نیگەران بوون. پیاو هەق بلّیّ خواردنی ئەو دەمانەمان زۆر خراپ بوو. ئەمە جگە لەوەی ناڕەزاییەکی گشتی لە نێو زیندانییەکاندا هەبوو، هەموو نیگەران‌و دڵتەنگ بوون‌و لە چاوەڕوانییەکی بیّ کۆتاییدا بوون. زیندانی بە تەبیعەت شەڕ فرۆش‌و یاخی‌و سەرکێش‌ووازوازییە، بەڵام بە دەگمەن ڕێدەکەویّ زیندانییان پێکەوەو بەکۆمەڵ ڕابن، هۆیەکەشی نیفاقی هەمیشەیی نێوان خەڵکییە، نەسازانی خەڵکییە. هەموویان پەیان بەو مەسەلەیە بردبوو، بۆیە زیاتر خەریکی مشت‌ومڕو شەڕە جنێوان بوون تا کارو کردەوە، یانی هەر دەم بوون، کردەوە نەبوون. بەڵام وێڕای ئەوەش ئەمجارەیان، هاڕوژان‌و خرۆشانەکە بیّ ئەنجام نەبوو. زیندانییەکان، لە حەوشەو قاوشەکاندا لە دەوری یەکدی خڕدەبوونەوەو بە ئاشکرا گەنگەشەو مشت‌ومڕیان دەکرد، گازاندەیان دەکرد، جنێویان دەداو بە ڕقەوە کەموکووڕی‌و عەیب‌و عاری ئیدارەکەی

مێجەریان دەژمارد،و تەنانەت نهێنییەکانیان لە قاو دەدا. هەڵبەتە ئاشکرایە کە هەر مەسەلەیەکی وەکو ئەم مەسەلانە خۆبەخۆ ڕێبەران‌و هاندەرانی خۆی دەخوڵقێنێ‌و بەرهەم دێنێ. ڕێبەرانی ئەم جۆرە هەلومەرج‌و قۆناغانەش دەبێ، کۆمەڵێك سیفەتی تایبەتیان تێدا بێ، نەك هەر لە زینداندا، بەڵکو لە هەموو ژینگەو کۆمەڵگەیەکدا، لە ناو سوپاو لە شوێنانی دیکەشدا. نموونەی ڕێبەر لە هەموو کات‌وشوێنێکدا هەمان نموونەیە :خەڵکانێکن خوێنگەرم،چاونەترس، تینوی دادپەروەری،وخۆشباوەڕ،خۆشخەیاڵ،لەکانگای دڵەوە باوەڕیان بەوەیە کە ئاوات‌و ئامانجەکانیان دێتە دی. هەڵبەتە ئەمانە لە خەڵکی دی گەوجتر نین، بەڵکو هی وایان تێدایە یەجگار پڕ ئاوەزو زیرەك‌و ئەقڵمەند، بەڵام لەوە شۆڕشگێڕترو خوێنگەرمترن کە لە هیچ شتێك بپرینگێنەوەو سڵ بکەنەوە. هەڵبەتە لەو جۆرە هەلومەرج‌و قۆناغانەدا خەڵکانێکیش هەڵدەکەون کە دەزانن چۆن ریزەکانی جەماوەری خەڵك جۆش دەدەن، چۆن ڕێبەرییان دەکەن، چۆن دەیان گەیەنن بە ئامانج، ئەمانە ڕێبەری میللین‌و نموونەیان لە وڵاتی ئێمەدا زۆر کەمە. ئەوانەی کە ئێستا باسیان دەکەم، زیاتر پێشڕەوان‌و هاندەرانی یاخیگەرین، ئەوانە خەڵکانێکن زۆربەی کات مەسەلەکەیان دەدۆڕێنن‌و بەئامانج ناگەن‌و حەپس‌و زیندان دەبێ بە جێگەیان. عەیبی هەرە گەورەی ئەوانە، خوێنگەرمی‌و جۆش‌و خرۆشە، بەڵام هەر ئەم خوێنگەرمی‌و جۆش‌و خرۆشەیە کە وایان لێدەکات کار لە جەماوەربکەن !خەڵکی دوویان دەکەون، چونکە ئەو گڕوکڵپەو بڵێسەو توڕەییە ڕاستگۆیانەیەی کە لە دڵ‌و دەروونیانەوە دەردەچێ، کار لە هەموو کەسێك دەکات، تەنانەت سڵۆکترین کەسیش جۆش دەدات. متمانەیەکی کوێرانەی ئەوتۆیان بە سەرکەوتن هەیە، کە گومانداترین خەڵك دەخەنە سەر کەڵکەڵە، ئەگەرچی ئەم متمانەیەی کەخۆی دەسەپێنێ، زۆر جار لەسەر بنەمایەکی هێندە سست‌و منداڵانە ڕۆنراوە، کە پیاو سەری سوڕدەمێنێ چۆن خەڵکانێك باوەڕیان پێکردووە. نهێنی کاریگەرییەکەیان لەوەدایە کە بە خۆیان بێ هیچ ترس‌و دوو دڵییەك، بێ هیچ سڵەمینەوەیەك دەکەونە پێشی پێشەوەی خەڵکەکە. وەکو گای بوغە سەر دادەنوێنن‌و شاخیان ڕەپێش دەخەن‌و بۆ پێشەوە مل دەنێن بێ ئەوەی زۆرجار بزانن چی دەکەن، یان بیر لە هیچ جۆرە سازش‌و بادانەوەیەك بکەنەوە، یان بیر لە هیچ جۆرە تاکتیکێکی هەلپەرستانە بکەنەوە، کە زۆرجار دەبێتە مایەی ئەوەی خوێری ترین زەلام مەسەلەیەك بباتەوەو بێ هیچ ئاسیوو زەرەرێك بە ئامانج بگات. ئەمانە دەبێ شاخەکانیان بشکێنن. ئەوانە لە ژیانی ئاسایی خۆیاندا خەڵکانی سەرکێش‌و خۆسەرن، زوو هەڵدەچن، زۆر ڕقن‌و ڕکونین، لێبوردەییان زۆر کەمە، زۆربەی کات خەڵکی کورت بینن، ئەم کورتبینییە خۆی لە خۆیدا بەشێکە لە توانایان، جا ناخۆشترین شتیان ئەوەیە یەکسەرو ڕاستەوخۆ بەرەو ئامانجی خۆیان ناڕۆن، زۆربەی کات بە دەوری ئامانجەکەیاندا دەسوڕێنەوەو ڕەنجیان بە فیڕۆ دەڕوات. بەڵام جەماوەری خەڵك گوێیان لێدەگرن‌و باوەڕیان پێدەکەن، ئەمەش یەکێکە لە نهێنییەکانی توانای ئەوانە.

بەڵام با بێمەوە سەر سکاڵاو چەند وشەیەکی لە بارەوە بڵێم.

هەندێ لە زیندانییەکانی لای ئێمە تەنیا لەبەر ئەوە بۆ سیبیریا دوورخرابوونەوەو لە زیندان پەسترا بوون سکاڵایان بەرز کردبووەوە. ئەوانە لە هەموو زیندانییەکانی دی پەرۆشترو نیگەرانتر

بوون. یەکێك لەوانەم لە بیرە کە نێوی مارتینوف بوو، لە تیپی سوارەدا کاری کردبوو، هەرچەندە پیاوێکی خوێنگەرمو سەرەڕۆو هەڵەشەو توڕەوتڕۆ بوو، بەڵام مرۆڤێکی ڕاستگۆو دروستکار بوو. یەکێکی دیکەم لێدەناسین نێوی ڤاسیلی ئانتونوف بوو، پیاوێکی ئاگرین مجێز، نیگا گۆساخ،و بزە تاڵ بوو، بەڵام وێڕای ئەوەش تا بڵێی هۆشنو زیرەك،و مەردو ڕەندو راستگۆو سەر ڕاست بوو. هەڵبەتە هەر بۆ نموونە ناوی ئەو دووانەم هێنا، دەنا ژمارەی ئەو جۆرە پیاوانە زۆر بوو. "پترۆف"ش لەم کۆمەڵەوە دەچوو بۆ لای ئەو کۆمەڵ، زۆر کەم قسەی دەکرد، بەڵام دیار بوو زۆر توڕەو بەداخ بوو، چونکە لە پێش هەمووانەوە لە قاوشەکە دەرپەڕیو خۆی گەیاندە ناو ئەو ئاپۆڕایەی کە لە حەوشەکەدا کۆببووبوونەوە. دەرجەداری زیندانەکە کە بە پلەی گروبان بوو (سەر عەریفان ) بەپەلە خۆی گەیاندە خەڵکەکەو ترسو نیگەرانیەکی زۆر لە سیمای نیشتبوو. زیندانییەکان ریزیان بەستو بەوپەڕی نەزاکەتەوە تکایان لێکرد کە بە مێجەر بڵێت زیندانییەکان حەزدەکەن قسەی دەگەڵ بکەنو دەربارەی هەندێ شت پرسیاری لێبکەن. لە دوای دەرەجەدارەکەوە هەموو سەربازە سەقەتەکانی جەنگیش هاتنو لە بەرانبەر زیندانییەکاندا ریزیان بەست. ئەو داوا نائاساییەی زیندانییەکان، ترسو نیگەرانییەکی زۆری خستە دڵی گروبانەکەوە، چونکە پێشتر داوای وانەکرا بوو، بەڵام نەدەوێراش راپۆری خۆی نەگەیەنێتە مێجەر، چونکە لەگێن بوو زیندانییەکان یاخی بنو ڕووداوی زۆر خراپ بقەومێ... لەوە دەچوو هەموو بەرپرسانی زیندانەکەمان لە زیندانییەکان بترسن. خۆ ئەگەر هیچیش رووی نەدابا و زیندانییەکانیش ژێوان ببونایەوەو بڵاوەیان لێکردبا، سەر گروبانەکە دەبوایە ئیدارەی زیندان لە مەسەلەکە ئاگادار بکاتەوە... بۆیە بێ ئەوەی هیچ چەندوچوونێك دەگەڵ زیندانییەکاندا بکاتو هۆی ئەم داواکارییەیان لێ بپرسێتو هەوڵبدات ژێوانیان بکاتەوەو قەناعەتیان پێبکات کە ئەمە کارێکی ئاقڵانە نییە، بەلەزو بە ڕەنگی هەڵبزڕکاوەوە چوو بۆ لای مێجەر. چونکە بۆی دەرکەوتبوو کە زیندانییەکان قەناعەتیان بە قسەی ئەو نییە.

منیش بێئاگا لە نیازو مەبەستی ئەم جموجوڵە، ڕێك خۆم بە نێو ئاپۆڕاکەدا کردو لەگەڵ ئەواندا بە ریز وەستام ( پاشان بۆم دەرکەوت کە نیازو مەبەستیان چی بووە ). وام دەزانی ئەم ریز بەستنە بۆ تەفتیشو سەرژمێری زیندانییەکانە، بەڵام کە سەیرم کرد هیچ پاسەوانێك لەوێ نییە، ئەبڵەقو سەرسام کەوتمە روانینی دەوروبەرم. سیمای زیندانییەکان توڕەو ئاگرین بوو. هەندێکیان ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕا بوو. هەموو کڕوکپو خەیاڵاوی بیریان لەوە دەکردەوە چی بە مێجەر بڵێن. سەیرم کرد زۆربەیان بە سەرسامی لە من دەڕوانن و پێیان سەیرە کە لەگەڵ ئەواندا وەستاوم، بەڵام بێئەوەی هیچ قسەیەك بکەن روویان لێ وەردەگێڕام. پێیان سەیر بوو کە منیش لە ریزی ئەواندا وەستاوم، گەرەکمە بەشداری سکاڵاکەی ئەوان بکەم، باوەڕیان نەدەکرد. دوای تۆزێك هەمدیس کەوتنەوە تەمەشاکردنی من، نیگایان یەکپارچە پرسیار بوو.

ڤاسیلی ئانتونۆف، بە دەنگێ کە هەموو ئەوانی دی گوێیان لێی ببێ،و بە زمانێکی زبرو بە راناوی (تۆ)، کە جاران بە ڕاناوی کۆی (ئێوە) دەیدواندم، گوتی:

– باشە تۆ لێرە چ دەکەی ؟

بە پەشۆکاویو سەرسامی لێم روانی، دەمویست بزانم مەبەستی چییە، هەنگێ هەستم کرد کە شتێکی نا ئاسایی لە گۆڕێیە.

زیندانییەکی سوپایی گەنج، کە تا ئەو کاتە نەمدەناسی، دیاربوو گەنجێکی باشو میهرەبان بوو، پێی گوتم:

– راست دەکات ! چ دەکەی لێرە ؟ بچۆوە بۆ قاوشەکە، ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە تۆوە نییە !

بەرسڤم دایەوەو گوتم:

– چوزانم، هەمووتان لێرە ریزتان بەستبوو، وامزانی بۆ تەفتیشو سەرژمێری وەستاون!

زیندانییەك هاواری کرد:

– هاتووە خۆی بە ئێمەوە هەڵواسێت !

یەکێکی دی گوتی:

– لووت ئاسنین !

زیندانی سێیەم، بە تەشەرێکی لە وەسف نەهاتووەوە گوتی:

– مێش کوژ !

هەموو زیندانییەکان، بەم ناتۆرە تازەیەی کە یارۆ لێی نام، لە قاقای پێکەنینیان دا

یەکێکی دی گوتی:

– ئاخر جەنابیان جار جار تەشریف بۆ مووبەقەکە دێنن!

– ئەمانە لە هەموو شوێنێ داشیان سوارە! ئێرە زیندان نییە، لەگەڵ ئێمەدا زیندانی نین ؟ کەچی نانی سپیو بەرازە کۆرپە دەخۆن! باشە تۆ خواردنی تایبەتی ناخۆیت ؟ ئەدی بۆچی بۆ ئێرە هاتووی ؟

کولیکۆف، بێ لە ڕوودامان دەستی گرتم، لە ریزەکەی هێنامە دەرێو بە رێزەوە گوتی:

– ئێرە شوێنی ئێوە نییە.

رەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو، چاوە رەشەکانی پرشنگیان دەدا،و بە جۆرێ لێوی دەگەست لەزگ بوو خوێنی لێ بێ. زۆر هەڵچوو بوو، ئەوە نەبوو وەکو ئەوانی دی بە ئارامیو خوێنساردی چاوەڕوانی هاتنی مێجەر بکات. زۆرم حەزدەکرد لەو حاڵەتانەدا تەمەشای کولیکۆف بکەم، واتە لەو کاتانەدا کە ناچار بوو، خۆی وەکو چۆن هەیە، بەلایەنی چاكو خراپییەوە، ئاشکرا بکاتو دەربخات. راستە کولیکۆف لافو گەزافی لێدەدا، بەڵام هەر لافو گەزاف نەبوو، بەڵکو کردەوەشی هەبوو.دڵنیام ئەگەر بۆ ئیعدامیش ببرایە، قیتو قۆزو سەربەرزو بێ منەت وەکو خانەدانێکی چکۆلە بەرەو پیری دەچوو. لە کاتێکا هەموو ئەوانی دی گاڵتەیان پێدەکردمو تانەیان لێدەدامو بەتەوسەوە تەمەشایان دەکردم، کولیکۆف، دوو هێندەی جاران رێزی دەگرتمو بە شێوەیەکی بنجبڕ لە سەری رۆیی:

– ئەلکساندەر پترۆفیچ، ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە، هیچ پەیوەندییەکی بە تۆوە نییە. بڕۆ بۆ شوێنێکی تر...گوێ بگرە! جماعەتەکەت لە مووبەقن، بچۆ بۆ لای ئەوان...

یەکێکی دی گوتی:

– بۆ خۆیان لەوێ دانیشتوون و هیچ عەیبێکیان نییە!

لە پەنجەرەکەوە روانیمە ناو مووبەقەکە، سەیرم کرد پۆلاندییەکان هەموویان لەوێندەرن، لەوە دەچوو زۆر کەسی تریش لەوێ بن. لە کاتێکا بەوپەڕی شپرزەیی و پەشۆکاوی بەرەو مووبەقەکە دەچووم، خەڵکەکە لە دواوە پێم پێدەکەنین و جنێویان دەدامێ و هۆی هایان لێدەکردم.

– بە ئێمە رازی نەبوو! هۆی هۆی! بیگرن، نەڕۆی!...

لەوەتای رێم کەوتبووە ئەم زیندانە، تانەو شەری وام بە خۆوە نەدیبتوو. بەڕاستی ساتێکی بە ژان بوو، بەلام شتێکی چاوەڕوان کراوبوو، چونکە خەڵکەکە لە ڕادەبەدەر هاڕوژا بوون، لە ڕاڕەوی مووبەقەکەدا تووشی "ت... سکی" بووم، ئەمە گەنجێکی سەر بە چینی نەجیمزادان بوو، خوێنەوارییەکی زۆری نەبوو، بەلام کوڕێکی بە ورەو جوامێرو نەفس بەرز ودلاوا بوو، زیندانییەکان ئەویان لە ئێمە جیاکردبووەوە، وەکو زیندانییە نەجیمزادەکانی دی نەیان دەبوغزاندو بگرە لە هەندێ رووەوە خۆشیشیان دەویست. بە هەڵسوکەوت و رەفتاریا مرۆڤێکی مەردانەو ئازاو بوێر بوو.

هاواری کردمێ و گوتی:

– گوریانچیکوف ئەوە چ دەکەی ؟ وەرە ژووریێ !....

لێم پرسی:

– باشە ئەم قەرەباڵغییە چییە ؟

– جماعەت دەیانەوێ سکالا پێشکەش بکەن، چما نازانی ؟ بەلام خەیاڵیان خاوە، هیچ بە هیچ ناکەن، کێ گوێ لە سکالای زیندانییان دەگرێت، کێ باوەڕیان پێدەکات ؟ هەڵبەتە ئیدارەی زیندان بە دوای هاندەرەکاندا دەگەڕێ، ئەگەر ئێمەیان لەگەڵ بین، تاوانەکە دەخەنە ملی ئێمەو ئێمە بە بەرپرسیاری رووداوەکە دەزانن. دەزانی ئێمەیان بۆچی بۆ ئەم شوێنە ناردووە! ئیدارە ئەگەر بیەوێ ئەوان سزابدات، ئەوپەڕەکەی چەند جەڵدەیەکیان بۆ دەبڕێتەوەو تەواو، بەلام سەبارەت بە ئێمە بێگومان دەمان داتە دادگا. چونکە مێجەر زۆری ڕق لێمانە، تەنیا بە دادگایی کردنمان دڵی فێنك دەبێتەوە. ئیدی ئێمە دەکات بە بیانوو،و پاساوی کردەوەکانی خۆی!

کە چووینە مووبەقەکەوە، "م... کی" گوتی:

– زیندانییەکانیش بە دەست و پێ بەستراوی دەمانفرۆشن!....

"ت... سکی*(٣)" گوتی:

– هەڵبەتە بەزەییانیش پێماندا نایەتەوە.

جگە لە زیندانییە نەجیمزادەکان، نزیکەی سی زیندانی دیکەش لە مووبەقەکەدا بوون، هەر یەکەیان بە هەنجەتێك نەیدەویست بەشداری لەو گەلە سکالایەدا بکات، هەندێ لە ترسنۆکیداو هەندێکی دی بەو هەنجەتەی سکالا سوودی نییەو کەس گوێی لێناگرێت. یەکێك لەوانە ئاکیم ئاکیمیچ بوو – کە دژی هەموو جۆرە سکالاو کارو کردەوەیەکی نا ئاسایی و نا یاسایی بوو– ئاکیم بەوپەڕی هێمنی و خوێنساردی، بێ هیچ دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەك چاوەڕوانی کۆتایی ئەو مەسەلەیە بوو، کە دڵنیا بوو، سەرکەوتن بۆ ئیدارەو مامورانی ئیدارەی زیندانە (ئەشعیا

فومیچ)ش لە مووبەقەکە بوو. زۆر ناڕەحەتو خەمبار بوو، شپرزەو نیگەران لووتی داژەندبوو،و بە نیگەرانییەوە گوێی لە قسەکانی ئێمە دەگرت. یەجگار ناڕەحەتو نیگەران بوو. جگە لە پۆلاندییە نەجیمزادەکان، کۆمەڵێك زیندانی دیکەی پۆلاندی سەر بە چینی عەوامی خەڵکیو، ژمارەیەك زیندانی ترسنۆکی رووسی لە مووبەقەکەدا بوون، ئەمانە کۆمەڵێك خەڵکی ماتو بێدەنگ بوون، نەیان وێرا بوو لەگەڵ زیندانییەکانی تردا مان بگرن، بە خەمینیو نا ئومێدییەوە چاوەڕوانی کۆتایی مەسەلەکە بوون. هەروەها ژمارەیەکی دیکە لە زیندانییانی پەستو بێزار لە مووبەقەکە مابوونەوە، نەك لەبەر ترسنۆکی، بەڵکو لەبەر ئەوەی دڵنیا بوون کە ئەم یاخی بوونە بێ مانایەو نە هیچی لێ شین دەبێتو نە سەردەگریو نە سەردەکەوێ. بەڵام هەستم دەکرد زۆریش باوەڕیان بە خۆ نەبوو،و پەریشانو پەشێو دەیان نواند. هەرچەندە دڵنیا بوون کە ئەوان لەسەر هەقن، کە ئەنجامی سکاڵاکە هەمان ئەنجام دەبێت کە ئەوان پێشبینیان کردووە، بەڵام هەستیان بە جۆرە تەریقییەك دەکرد، هەستیان بەوە دەکرد پشتیان لە هاوڕێکانی خۆیان کردووە، هاوڕێکانیان بە مێجەر فرۆشتووەو خیانەتیان لێکردووون.

"یولکین"ش لە مووبەقەکەدا مابووەوە، یولکین ئەو جووتیارە سیبیریاییە رێوی سیفەتە بوو، کە لەسەر پارە تەزویر کردن گیرابوو ودە بێگارە زیندان پەسترابوو، ئەوەی کە بۆڕی بە کولیکۆف-ی بەیتاڵ دابوو،و هەموو مشتەرییەکانی لێ کردبووەوەو نانی بڕی بوو. هەروەها کابرا پیرە ستارودوبییەکەش لە مووبەقەکەدا مابۆوە. هەموو ئاشپەزەکانیش لە جێی خۆ نەجولا بوون، رەنگە لەبەر ئەوەی خۆیان بەستاقی ئیدارەی زیندانەکە دەزانی، بۆیە پێیان جوان نەبوو خۆیان تێکەڵی ئەو مانگرتنو یاخی بوونە بکەن.

رووم کردە م...کی و بە دوو دڵی گوتم:

- جگە لە مانەی ئێرە هەموو زیندانییەکانی دی رۆییشتوون...

"ب" لە بن لێوانەوە گوتی:

- ئێمە هەقمان چیە ؟

- ئەگەر ئێمە بەشداریمان بکردایە، سەد هێندەی ئەوانە بەر تالوکە دەکەوتین. بەڕاستی من ڕقم لەو چەتەو دزانەیە. یانی تۆ بەڕاستی پێت وایە ئەم سکاڵایە سەر دەگرێ ؟ ئاخر بۆچی خۆمان بخەینە ئەم گێژاوەوە ؟ من تێناگەم ئەوانە چ لەزەتێك لەوە دەبینن کە بە دەستی خۆیان، خۆیان گیرۆدە دەکەن.

زیندانییەکی پیری منجڕی خوێنتاڵ گوتی:

- نەخێر، هیچ بە هیچ ناکەن.

(ئەلمازوف)ش کە لەگەڵماندا وەستا بوو، هەڵیدایەو گوتی:

- نەخێر هیچ بە هیچ ناکەن، تەنیا ئەوە نەبێ کە پەنجا نەفەرێك بە تێهەڵدان بدەن.

نەفەرێکی دی هاواری کرد:

- مێجەر هات.

هەموو بەلەز خۆمان گەیاندە بەر پەنجەرەکان. مێجەر عەینەکی لە چاوکردبوو، وەکو دڕندە توڕەو تڕۆ لە ژوورەوە دەرپەڕی، دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو، بە بێدەنگیو مەنگی بەرەو ریزی زیندانییەکان چوو. مێجەر لەم جۆرە هەڵوێستانەدا، سەرباری ئەوەی زۆر گۆساخو بیٚ چاوو روو دەبوو، بە هیچ جۆرێکیش خۆی شێلو نەدەکرد، دەبیٚ ئەوەش بڵێین کە مێجەر زۆربەی کات مەستو سەرخۆش بوو. لەو کاتانەدا قەیتانە پرتەقاڵییەکەی کڵاوە چڵکنەکەیو ئەستێرە زیوە لە ڕەونەق کەوتووەکانی سەر شانی، شێوەیەکی شوومو ترسناکیان پیٚ دەبەخشی. لە دوای مێجەرەوە (دیاتلوف)ش هات، دیاتلوف فەرمانبەری زیندان بوو، کەسایەتیەکی زۆر گرینگی زیندانەکە بوو، لە ڕاستیدا ئەو حوکمی زیندانەکەی دەکردو بەڕێوەی دەبرد. گەنجێکی زۆر بە تواناو زیرەكو ڕێوی سیفەت بوو،ودەسەلاتێکی زۆری بەسەر مێجەرەوە هەبوو. کابرایەکی ناڕەسەنو بەدخوا نەبوو، زیندانییەکان بە شێوەیەکی گشتی لێی رازی بوون. سەرگروبانەکەو سیٚ چوار سەربازی بە دواوە بوون. دیار بوو کە سەر گروبانەکە سەرکۆنەو سەرزەنشتێکی باش کرا بوو و چاوەڕوانی ئەوە بوو زۆر لەوەش خراتری پیٚ بکرێت. زیندانییەکان کە لەو ساوەی سەر گروبانەکە چوو بوو بۆ لای مێجەر، بەسەری کۆتەوە وەستا بوون، کە چاویان بە مێجەر کەوت هەموو ڕێك تەکیان دا بە یەکەوەو بە ڕێزەوە وەستانو چاوەڕوانی یەکەم قسەی ،تۆ بڵیٚ یەکەم نەڕەو هاواری سەرۆکەکەیان بوون.

زۆری نەبرد کە مێجەر یەکەم قسەی لە زار دەرهات، دووەم قسەی بوو بە هاوار، تۆ بڵیٚ بە نەڕە. بەتەواوەتی دەهری بوو بوو. لە پەنجەرەکانەوە دەمان بینی، بەلەز لەم سەری ریزەکەوە بۆ ئەو سەری ریزەکە دەهاتو دەچوو، هێرشی دەکردە سەر زیندانییەکانو بەر دەمرێژی پرسیارانی دەدان. ئێمە چونکە لێیانەوە دوور بووین، نە گوێمان لە پرسیارەکانو نە لە بەرسڤەکان دەبوو، تەنیا گوێمان لە هاتو هاواری بوو و هیچی تر.

– ڕێگران، چەتە، یاخیان!... کوتەك دەزانیٚ قۆناغ لە کوێیە! هەڵبەتە خەڵکانێك هەن هانتان دەدەن.

ئەوسا پەلاماری زیندانییەك دەداتو هاوار دەکات:

– تۆ یەکێکی لە هاندەران! تۆ هاندەریت !

گوێمان لە بەرسڤی زیندانییەکە نەبوو، بەڵام دیتمان کە دوای تۆزێك لە ریزەکە دەرچوو بەرەو بارەگای پاسەوانان(قەرەوڵخانە) وەڕێکەوت... پاشان زیندانی دووەمو ئەوجا زیندانی سێیەمیش لە ریز دەرهێنرانو رەوانەی بارەگای پاسەوانان کران!

– هەمووتان دادگایی دەکرێن! کە لە پەنجەرە وازەکەوە چاوی بە ئێمە کەوت، قسەکەی بڕیو گوتی:

– کیٚ لە مووبەقەکەیە ؟ خێرا لەویٚ دەریان کەنو هەموویانم بۆ بێنن!

دیالتوف، بەرەو مووبەقەکە هات، کە پێمان گوت: ئێمە سکاڵامان نییەو هیچ گلەییەکمان نییە، یەکسەر بۆ لای مێجەر گەڕایەوەو پەیامەکەی ئێمەی گەیاندیٚ. مێجەر بە تۆنێکی ئارامترو بە شادمانییەوە گوتی:

– ئاوا، یانی ئەوانە هیچ سکالاّو گلەییەکیان نییە. قەیدی نییە، هەموویانم بۆ بێنن!

لە مووبەقەکە وەدەرکەوتین. هەستم بە جۆرە تەریقی و شەرمەزارییەك دەکرد، هەر هەموومان بە دەم ڕێوە سەرمان شۆرکردبووەوە.

مێجەر نیگایەکی میهرەبانی کردین، بەلەزو پەلە پەل گوتی:

– ئەها... پرۆکوفیف! یولکین تۆش! ئەدی تۆ ئەلمازوف! ئەمە ئێوە لێرەن! وەرن وەرن ریز بن!

ئەوجا مێجەر لەسەری ڕۆیی و گوتی:

– تۆش لەگەڵ ئەماندای م.... کی.... ناویان بنووسن!دیالتوف ناوی هەموویان بنووسە، ناوی رازییەکان بە جیا لە ناوی ناڕازییەکان بنووسە... هەر هەموو ناوەکان بنووسە، ناوی کەس مەپەڕێنە. هەموو ناوەکان بنووسەو بۆمی بێنە... هەر هەمووتان دادگایی دەکەم خوێڕینە! پێتانی نیشاندەدەم کە من کێم!

ئەو هەڕەشەیە کاری خۆی کرد. یەکێك لە نێو ناڕازییەکانەوە، بە دەنگێکی گڕو بە نە بەدڵی گوتی:

– ئێمە رازین.

– ئاوها... رازین... کێ رازییە ؟ ئەوانەی رازین با لە ریزەکە بێنە دەرێ!

چەند دەنگێکی دی بەرز بووەوە:

– ئێمە! ئێمە !

– ئێوە لە خواردنەکە رازین ؟ کەواتە هاندراون ؟ بێگومان ئاژاوەگێڕانێك هانیان داون ؟ وا وەیلا بە حاڵی ئەو هاندەرانە!

دەنگێك لە نێو حەشاماتەکەوە بەرز بووەوە:

– خودایا بە خێری بگێڕی !

مێجەر بە توندی بەرەو لای دەنگەکە هێرشی بردو نەڕاندی:

– کێ ئەو قسەیەی کرد ؟ تۆ بوویت راستوگویف؟ دەی خێرا بۆ بارەگای پاسەوانان !

راستوگویف، لە ریزەکە دەرچوو، بە خاوەخاو بەرەو بارەگای پاسەوانی وەڕێکەوت. راستوگویف گەنجێکی دەموچاو پڕی بالاّ بەرز بوو. ئەو، ئەم قسەیەی نەکردبوو. بەلاّم کە مێجەر داوای لێکردبوو بڕوات بۆ بارەگای پاسەوانی، بێ چەندوچوون ملی دا بوو.

مێجەر دیسان نەڕاندی:

– لە تێریدا چاوتان سوور بووە! ڕاوەستە بۆم قەپۆز زل! دوای سێ ڕۆژ خۆت دەبینییەوە کە ناتوانی... ڕاوەستن بۆم، بزانە چۆن یەك یەك دەتان دۆزمەوەو هەمووتان دەستگیردەکەم. دەی ئەوانەی رازین و گلەییان نییە لە ریز بێنە دەرێ!

ژمارەیەك لە زیندانیانی پەست و خەمین گوتیان:

– ئێمە هیچ گلەییەکمان نییە پایە بەرز!

بەڵام ئەوانی دی بێدەنگ بوونو هیچیان نەگوت. مێجەریش ئەمەی دەویست. قازانجی لەوەدابوو کە بە زووترین کات کۆتایی بەم مەسەلەیە بێنێ، ئیدی کۆتایی بە گلەییو هەڕەشەکانی هێناو بەلەز گوتی:

– ئا.... یانی ئێستا کەس سکاڵاو گلەیی نیە. هەموو رازین. بەخۆم دەمزانی، ئەمە ئۆینی هاندەرانە! بەڵێ بێگومان ئەمە دەستی ئاژاوەچیانە!

ئەوسا ڕوو لە دیالتوف گوتی:

– دەبێ هەموو ئاژاوەچیو هاندەرەان بدۆزرێنەوە. دەیان دۆزینەوە، دەی ئێستا وەختی چوونە سەر کارە. دەهۆڵەکە لێدەن!.

مێجەر بە خۆی لەسەرژمێری تیمی کاردا ئامادە بوو.

زیندانییەکان هەموو کڕوکپ، ماتو خەمین بەرەو کار وەڕێکەوتن، لە دڵی خۆیاندا خۆشحاڵ بوون کە هەرنەبێ چاویان لە چارەی شوومی مێجەر دەبڕا. مێجەر هەرکە لە دابەشکردنی تیمەکانی کار بووەوە، ڕۆیی بۆ بارەگای پاسەوانی،و هاندەرەکانی سزا دا، بەڵام زۆر سەختگیری نەکرد. دیاربوو دەیویست بە زووترین کات ئەم کێشەیە چارەسەربکات. یەکێك لەوانەی کە نێردرا بوو بۆ بارەگای پاسەوانی پاشان بۆی گێڕامەوە کە داوای بوردنی لە مێجەر کردووەو ئەویش یەکسەر بەخشیویەتی. دیاربوو کە مێجەر ئاسوودە نەبوو، لەوە دەچوو کەمێك ترسا بێت. یاخی بوون هەمیشە کارێکی ئاڵۆزە. هەرچەندە ناتوانرێ ئەو کارەی زیندانییەکان بە یاخی بوون دابنرێ ( چونکە تەنیا گەیی بووە مێجەر، لە سەرانی باڵاتر شاردرابووەوە ) بە هەرحاڵ هەر چۆنێ بوو، کێشەیەکی ناخۆشو نا ئاسایی بوو، زیاتر لەو ڕووەوە مایەی نیگەرانیو ناڕەحەتی بوو کە تێکڕای زیندانییەکان تیایدا بەشدار بوون. بۆیە دەبوا بە هەر نرخێ بووە ئەم ئاژاوەیە دابمرکێتەوە. مێجەر زوو بە زوو هاندەرەکانی مەرەخەس کردو بۆ سبەینێ خواردنەکە کەمێك باش بوو، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاندو وەکو جارانی لێهاتەوە. مێجەر لە ڕۆژانی دواتردا زوو زوو سەردانی زیندانەکەی دەکرد، سەرپێچیکارانی سزا دەدا. سەر گروبانیش، سەرسامو حەپەساو، پەشێوو پەریشان، نیگەرانوخەمبار دەهاتودەچوو. لەوە دەچوو وەخۆ نەهاتبێتەوە. زیندانییەکانیش تا ماوەیەکی زۆر نەیاندەتوانی ئارام بگرن، ئەگەرچی کەمێك هێور بوو بوونەوە، بەڵام تارادەیەك هەر نیگەران بوون. ئێستا کزوماتو حایرو پەشێو بوون. هەندێکیان سەری خۆیان کز دەکردو هیچیان نەدەگوت، هەندێکی تریان لە بن لێوانەوەو بەدەم پرتەو بۆڵەوە باسی ئەم ریسکەیان دەکرد، زۆریشیان، وەکو ئەوەی بیانەوێ خۆیان سەرکۆنە بکەن، بە داخو کەسەرەوە باسی ئەم مانگرتنە نابەجێیەیان دەکرد. مانگرتنێك کە لە جێی خۆیدا نەبوو.

یەکێکیان دەڵێت:

– وەرە هاوڕێ، بگرەو بخۆ!... قسە ئاسانە، بەڵام کردار گرانە.

– زەنگوڵە کردنە ملی پشیلە، کاری مشك نییە!

– ئێمە تا کوتەك نەخۆین قەدری عافێت نازانین... کوتەك دەزانێ قۆناغ لەکوێیە. با مەمنوونی بەختی خۆمان بین کە ئەمری نەکرد هەموومان دارکاری بکەن!

– باشترین شت ئەوەیە زۆر بیربکەیتەوەو کەم قسە بکەی!

– چیە دەرسم دادەدەی ؟ چما تۆ موعەلیمی ؟

– بەڵێ، دەرست دادەدەمو ئەولاتریش !

– تۆ کێی تا دەرسی من دابدەی ؟

– من پیاوم، ئەدی تۆ چیت ؟

– نەخێر تۆ گوی سەگی !

لە هەموو لایەکەوە هاوار بەرزبووەوە:

– بۆ خاتری خوا بیبڕنەوە، ئەم هاتو هاوارەتان لە چیە ؟

بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژی مانگرتنەکە، دوای ئەوەی لە کارو بێگار گەڕاینەوە، تووشی پترۆف بووم. پترۆف بە دوومدا دەگەڕا. بەدەم برێك ورتە ورتی نا مەفهوومەوە لێم نزیك بووەوە، کە گەییشتە لام بێدەنگ بوو، بەدەم پیاسەی دوو قۆڵییەوە لە فکران ڕاچوو. تا ئەو کاتەش هیچ شتێك لە مەسەلەی مانگرتنەکە حاڵی نەبوو بووم. بە هیوا بووم پترۆف شتێکم تێبگەیەنێو بۆ باس بکات. بۆیە لێم پرسی:

– ئەرێ پترۆف گیان، هاوڕێکانت لە ئێمە تووڕە نین ؟

لە پڕ وەخۆ هاتەوەو گوتی:

– تووڕە ؟ کێ ؟

– زیندانییەکان... ئایا لە نەجیمزادەکان تووڕەن ؟

– بۆچی تووڕە بن ؟

– لەبەر ئەوەی بەشداری مانگرتنەکەمان نەکردن !

پترۆف گوتی:

– باشە ئێوە بۆ مان بگرن، مان لە چی بگرن، ئەدی ئێوە لە کیسەی خۆتان نان ناخۆن !

– خۆ لە نێو ئێوەشدا خەڵکانێك هەن لە کیسەی خۆیان نان دەخۆنو لە مانگرتنەکەشدا بەشدارییان کرد.... دەبوایە ئێمەش پشتیوانیتان لێبکەین... ئەدی هاوڕێتان نین ؟

پترۆف بە سەرسامی لێی پرسیم:

– ئێوە هاوڕێی ئێمەن ؟

تەمەشایەکم کرد. نەیتوانی نیازو مەبەستەکەی من وەخوێنێ. بەڵام من بە تەواوەتی لەو حاڵی بووم. بۆ یەکەمجار ئەو مەسەلەیەم بۆ ڕوون بووەوە کە لە مێژبوو، لە مێشكو خەیاڵدانمدا گینگڵی دەداو پێوەی دەتلامەوە. مەسەلەیەك کە تا ئەو دەمە تەنیا مەزەندەو خەیاڵ بوو لەلام. ئیدی بۆم دەرکەوت هەرگیز ناتوانم ڕۆژێ لە ڕۆژان ببم بە هاوڕێی زیندانییەکان، تەنانەت ئەگەر مەحکومی ئەبەدیش بم، مەحکومی بەشی تایبەتیش بم. ئیدی لەوساتەوە هەیئەتو بیچمی پترۆف، بۆ هەتا هەتایە لە خەیاڵدانو یادگەمدا چەسپی. هێندە بە سادەییو ڕاشکاویو بێگەردیو حیرەتەوە گوتی: " ئێوە هاوڕێی ئێمەن ؟!" وای لێکردم لە دڵی خۆمدا بپرسم ئاخۆ جۆرە تەوسو توانجێك لە قسەکانیا نەبوو، چەشنە ڕابواردنێك لە پشت پەردەی قسەکانیەوە

نەبوو؟ نەخێر، شتی وام تیا بەدی نەکرد. تەنیا ئەوە بوو کە من هاوڕێی ئەوان نیم‌و تەواو.... تۆ بە ڕێی خۆت‌و ئێمە بە ڕێی خۆمان... تۆ بە خێرو ئێمە بە سەلامەت... تۆ ژیانی تایبەتی خۆت هەیەو ئێمە ژیانی خۆمان.

ئەلهەقی وام وێنا دەکرد، کە زیندانییەکان لە دوای ئەم مانگرتنە ناکامە، بە کەوڵکردن کەوڵمان دەکەن. ژیانمان لێ دەکەن بە دۆزەخ. بەڵام بە هیچ جۆرێ شتی وا ڕووی نەدا! تەنانەت کەمترین گلەییشیان لێنەکردین، کەس تاقە نیگایەکی خراپی نەکردین! تەنیا وەکو جاران ئەگەر ڕێکەوت‌و بۆنەیەك هەڵکەوتبا، تەشەرێکیان بە گوێدا دەداین... دەنا هیچ ڕقێکیان لێ هەڵنەگرتین. تەنانەت رقیان لەو هاوسنفانەی خۆشیان کە بەشداری مانگرتنەکەیان نەکردبوو و لە مووبەقەکە دەرنەچوو بوون، هەڵنەگرت، ڕقیان لەوانەش هەڵنەگرت کە زوو بە زوو بایان دابووەوەو لە ریزەکە هاتبوونە دەرێ‌و گوتبوویان رازین‌و گلەییان نییە! کەس هەر باسی ئەو مەسەلەیەشی نەکرد. ئەوەم زۆر پێ سەیر بوو! تا ئێستاش هەر پێم سەیرە!

***<u>پەراوێز:</u>***

***١- ئەو چیرۆکە دڵتەزێنەی کە بە ناهەق دراوەتە پاڵ ملازم ئیلنسکی کە گوایە بابی خۆی کوشتووە، دۆستویفسکی هەندێ بەشی لە ڕۆمانی برایانی کارمازوفدا بەکار هێناوە.***

***٢- تاگانروك کەوتووەتە سەر دەریای ئازوف، و پترۆباڤلوسك-ش کەوتووەتە کامتشاتکا، دوو هەزار فەرسەخێك لە یەکترەوە دوورن.***

***٣- "ت .... کی" سیمون توکارفسکی یە (١٨٢٣- ١٩٠٠) یەکێکە لە شۆڕشگێڕانی پۆڵاندی. خاوەنی کتێبێکە بە ناونیشانی " حەوت ساڵ لە زینداندا" .***

((١٩))

## هاوڕێکانم

لە سەرەتاوە زیاتر مەیلم بەلای ئەوانەدا هەبوو کە وەکو خۆم بوون، واتا نەجیمزادە بوون. بەڵام لە نێو ئەو سێ نەجیمزادە رووسەی کە ئێستا هاوزیندانی من بوون، یانی لە نێوان ئاکیم

ئاكميچو (ئا... ف)ی شۆڤارو ئەو کوڕەی بەوە تاوانبار بوو کە بابی خۆی کوشتبوو، تەنیا پەیوەندیم دەگەڵ ئاکیم ئاکمیچ دا هەبوو. تەنیا دڵی خۆم بۆ ئەو دەکردەوە. ئەویش تەنیا لەو کاتانەدا کە بێتاقەتیو نائومێدییەکی دژوار بەرۆکی دەگرتمو خەمێکی بێ ئەندازە دایدەگرتمو هەستم دەکرد بەرگە ناگرمو دەبێ بۆ کەسێکی هەڵڕێژمو جگە لەو کەسی ترم شك نەدەبرد. لە فەسڵی پێشوودا هەوڵم داوە زیندانییەکان پۆلێن بکەمو بەسەر دەستەی جیاوازدا دابەشیان بکەم. بەڵام کە ئێستا (ئاکیم ئاکمیچ)م وەبیر کەوتووەتەوە، هەستدەکەم دەبێ دەستەیەکی دیکەش بخەمە ریزی پۆلێنکارییەکەمەوە، دیارە ئەم دەستەیە جگە لە ئاکیم ئاکمیچ کەسی دی ناگرێتەوە. ئەم دەستەیە بریتی بوو لەو زیندانییانەی کە دنیایان دابووە بەر کلکان، خەم ساردو بێ مۆبالات گوێیان بە هیچ نەدەدا، بەلایانەوە گرینگ نەبوو لە بێگارە زیندان دا بژین، یان ئازادبنو لە دەرێی زیندانیدا بژین، بەڵام ئەو جۆرە کەسانە لەگێن بوو، بەشێوەی ریزپەڕ لەلای ئێمە هەبن. ئاکیم ئاکمیچ یەکێك بوو لەو ریزپەرانە. بە نەفەسێ لە زیندانو بێگارە زیندان دا گیرسابووەوە وەکو ئەوەی ئیدی بە یەکجارەکیو بۆ هەتا هەتایە هەر لە زینداندا بژی. هەموو شتەکانی، دۆشەكو بالیف، قاپو ئامانەکانی زۆر بە دیقەتو رێكو پێکی دانا بوو، بەجۆرێ رێکی خستبوون وەك ئەوەی زیندان واری یەکجارەکیو هەتا هەتایی ئەو بێت. ئاکیم ئاکمیچ هێشتا ساڵانێکی فرەی مابوو کە مەحکومیەتەکەی تەواو بکات، بەڵام باوەڕ ناکەم قەت بیری لەوە کردبێتەوە کە رۆژانێ لە رۆژان ئازاد ببێو خەو بەو رۆژەوە ببینێ. ئیدی بە تەواوەتی دەگەڵ واقیعدا سازابوو، بەو هەلومەرجە رازی بوو کەتێی کەوتبوو، ئەمەشی لە ملکەچیو گوێڕایەڵی نەبوو، بەڵکو تەبیعەتی وابوو. ئاکیم ئاکمیچ، مرۆڤێکی دڵسۆزو مەردو ڕەند بوو. لە هەوەڵی زیندانییەکەمدا، یارمەتییەکی زۆری دام، کۆمەڵێك ئامۆژگاری بەسوودی کردم، بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم کە هەندێجار، زۆری خەمبار دەکردم، من بۆ خۆم، کەسێکی نیگەرانو خەماوی بوومو ئەویش هێندەی دی قوڕەکەی خەست دەکردەوە. کە خەمو پەژارەو نائومێدی زۆری بۆ دەهێنام، دەچووم گرێی دڵم بۆ ئەو دەکردەوە بەو هیوایەی دڵخۆشیم بداتەوەو دوو قسەی ئومید بەخشم بە گوێدا بدات،و هیچ نەبێ بە نارەزاییەوە باسی چارەنووسی ڕەشی هاوبەشی خۆمان بکەینو داخی دڵی خۆمان هەڵڕێژینو دڵخۆشیەکی خۆمان بدەینەوە. بەڵام ئاکیم ئاکمیچ، هیچی نە دەگوت، بە کاوەخۆ خەریکی فانۆسەکانی خۆی دەبوو، یان زۆر بەوردی باسی ئەوەی بۆ دەکردم کە لە فلان ساڵدا نمایشێکی سوپاییان کردووەو فەرماندەی لەشکرەکە ناوی فلان بووە،و ئامارژەو هێمای نێوان سەبازانی تۆپخانە چی بووەو چۆن گۆڕدراوە... هتد. هەر هەموو ئەم تولو تەفسیلاتەی بە دەنگێکی یەك نەواو ئارام، وەك ئەوەی دڵۆپە بێو تك تك بێتە خوارێ، دەگێڕایەوە. تەنیا کاتێ کە باسی ئەوەی دەگێڕایەوە کە کاتی خۆی لە قەفقاز بووەو بەشداری کارێکی کردووە ( ئێستا بیرم نەماوە ئەو کارە چی بوو )و میداڵی (سانت ئان) یان داوەتێ نەواری میداڵەکەیان بەشمشێرەکەیەوە کردبوو، گەرم دەبوو،و تۆزێ جدی تر قسەی دەکردو کە ناوی "سانت ئان"ی دەبرد، وەکو ئەوەی نهێنییەك بدرکێنێ کەمێ دەنگی نزم دەکردو پاشان بۆ دوو سێ دەقیقەیەك بێدەنگ دەبوو... لە ساڵی یەکەمی حەپسییەکەمدا، هەندێجار لە خۆمەوەو

بێئەوەی هۆیەکەی بزانم، ڕقم لە ئاکیم ئاکمیچ هەڵدەستاو لە دڵی خۆمدا نەفرەتم لەو قەدەرو چارەنووسە دەکرد کەمنی کرد بوو بە هاوزیندانی ئەوو تەختە خەوەکانمان ئەوەندە لە یەکترەوە نزیك بوو کە لەزگ سەرمان لە سەری یەکتر بدات، بەڵام هەر دوای سەعاتێك ژێوان دەبوومەوەو دەکەوتمە سەرکۆنە کردنی خۆم. بەهەرحاڵ تەنیا لە ساڵی یەکەمدا تووشی ئەو حاڵەتە دەبووم. پاشان شارەزای تەبعو تەبیعەتی ئاکیم ئاکمیچ بوومو دەگەڵی ڕاهاتم،و کە ئەو حاڵەتانەی جارانی خۆم بیر دەکەوتەوە تەریق دەبوومەوە. هەڵبەتە بیرم نایەت ڕۆژێ لە ڕۆژان بەزەقیو ڕوو بەڕوو لەگەڵی بەشەڕ هاتبم.

جگە لەو سێ رووسە، هەشت*(١) هاوڕێی دیکەشم هەبوون، دۆستایەتیەکی زۆر خۆشو بتەوم دەگەڵ هەندێکیاندا پەیداکرد، دۆستایەتی هەندێکیانم، نەك هەموویان، پێ خۆش بوو. هەرە باشەکەیان لە توڕەییو چیکڵدانە تەنگیدا بێ وێنە بوو. تەنانەت دوای ماوەیەك ناچاربووم پەیوەندی خۆم دەگەڵ دوانیاندا ببڕمو قسەیان لێ دابڕم. تەنیا سیان لەوانە خوێنەوارو ڕۆشنبیر بوون کە بریتی بوون لە: ب... کی*(٢)، م...سکیو ز...سکی*(٣) کە پیاوێکی پیرو جاران مامۆستای بیرکاری بوو بوو. ئەمە پیرە مێردێکی باش بوو، بەڵام خووی تایبەتی خۆی هەبوو، سەرباری ئەوەی لە بواری خۆیدا زاناو زانیار بوو، بەڵام هزرو هزرینی تەسكو سنووردار بوو. م... کیو ب... کی زۆر لەو جیاواز بوون. لە هەوەڵەوە (م... کی)م چووە دڵەوە، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان قسەیەکی بەرزو نزممان لە هەنبەر یەکدا نەکرد. زۆر قەدرو حورمەتم دەگرت، بەڵام پەیوەندیو دۆستایەتیم دەگەڵیا تۆخ نەبوو، قەتیش ڕۆژێ لە ڕۆژان نەگییمە ئەو ئاستە. هەر چەندە پیاوێکی توڕەو تڕۆو رووگرژو بە گومان بوو. بەڵام زۆر بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. توانای خۆ کۆنترۆڵ کردنی هەبوو، من ئەم سیفەتەیم بە دڵ نەبوو، پیاو هەستی دەکرد کە هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان دڵی خۆی بۆ کەس نەکردووەتەوەو ناکاتەوە. لەوەشە من هەڵە بووبم. گرینگ ئەوەیە پیاوێکی زۆر بە تەبیعەتو نەفس بەرز بوو. زیرەکیە لەڕادە بەدەرەکەی، دوو ڕووییەکەی، دڕدۆنگیو دوورە پەرێزییەکەی، گومانێکی قووڵی لەلای دەورو بەرەکەی دروست دەکرد. پیاوێك بوو چەند بە گومان بوو ئەوەندەش لە هەندێ رووەوە بە باوەڕبوو. ئەم دووفاقیە سەرچاوەی عەزابی روحی ئەو بوو. سەرباری هەموو ئەمانە، بە ئاشکرا دژایەتی هەردوو هاوڕێ ب...سکیو ت... سکی دەکرد.

ب... سکی پیاوێکی نەخۆش بوو، خەریك بوو تووشی سیل دەبوو، زۆر توندە تەبیعەتو چیکڵدانە تەنگو دڕ بوو، بەڵام لە ناخا نیهاد پاكو پاقژ دڵ بوو. هەر ئەم بەد مجێزیو توڕەییە وای لێکردبوو هەندێجار وەکو منداڵی گرۆزو وڕکنو بیانووگر دەهاتە بەرچاو. من نەمدەتوانی دەگەڵ ئەم تەبیعەتو خووەدا هەڵکەم، بۆیە هاتوچۆو پەیوەندیم دەگەڵ (ب.. کی) دا بڕی، بێ ئەوەی تۆزقاڵێك خۆشەویستیم بەرانبەری کەم بێتەوە، ڕێك بە پێچەوانەی (م... کی)یەوە کە هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان لێی زیز نەبوو بووم، بەڵام خۆشیشم نەدەویست. کە هەموو پەیوەندییەکم لەگەڵ (ب... سکی)دا بڕی، ناچاربووم پەیوەندی دەگەڵ هاوڕێکەشیا، "ت... سکی"، کە لە فەسڵی پێشوودا باسم کردووە، ببڕم، هەڵبەتە ئەمەم زۆر لەبەرگران بوو، چونکە هەرچەندە

خوێنەوارییەکی کەمی هەبوو، بەڵام پیاوێکی جوامێرو بوێرو جوانخاس بوو. ئەم پیاوە (ب... کی) بەڕادەیەك خۆش دەویست، هەرکەسێ قسەی لێ دابڕایە، ئیدی بێ چەندوچوون، دەبوو بە دژمنی. ئەوەبوو لەسەر (ب... کی) بەینی دەگەڵ (م...کی)شدا تێکچوو. هەرچەندە بەزەحمەتێکی زۆر ئەو بڕیارەی دا. بە هەرحاڵ هەموو ئەو پیاوانە، توندە تەبیعەتو بەدمجێزو هەستیارو بێ حەوسەڵەو جێکڵدانە تەنگو خەمۆكو پڕگومان بوونو ئەمەش هۆی خۆی هەبوو. ئیدی ژیانی زیندان بۆ ئەوان زۆر دژوارترو زەحمەتتر بوو لە ژیانی ئێمە، چونکە لە وڵاتو زێدو زاگەی خۆ دوور خرابوونەوەو هەندێکیان حوکمی دوورو درێژی دەساڵو دوازدە ساڵ درا بوون. لە هەموو ئەمەش ناخۆشتر ئەوە بوو، کە بۆچوونو قەزاوەتێکی پێشوەختەو بێ بنجو بناوانیان دەرهەق بە هەموو زیندانییەکان لا دروست بوو بوو وهەموو زیندانییەکیان بە دڕندە دەزانیو نەدەیان توانیو نەدەیان ویست بچووکترین نیشانەی مرۆڤدۆستیان تیا ببینن یا کەشف بکەن. دیارە ئەم بۆچوونو قەزاوەتە بێ بنجو بناوانە زادەی ئەو ژینگە سەختو هەلومەرجە دژوارە بوو کە تێی کەوتبوون، ئیدی ژیانیان لە زیندانڎا زۆر ناڕەحەت بوو. بەینیان تەنیا دەگەڵ چەرکەسو تاتارەکانو ئەشعیا فومیچدا خۆش بوو... ڕقیان لە زیندانییەکانی دی بوو وخۆیان لێ دەپاراستن. تەنیا رێزی ئەو پیاوە پیرە موسوڵمانەیان دەگرت کە خەڵکی ستارودوب بوو. بەڵام بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە من لە زنداندا بووم، تاقە زندانییەکم نەبینی گاڵتە بە ڕەگ و ڕەچەڵەك و ئاینو باوەڕیان بکات، لە کاتێکا لە نێو خەڵکی عەوامی ئێمەدا واباوە کە بە تەوسو توانجەوە بڕواننە خەڵکی بیانی، بە تایبەتی ئەڵمانەکان، خەڵکی بۆیە گاڵتەیان بە ئەڵمانی دەکرد چونکە بە درۆزنو دوو ڕوویان دەزانین، کەچی زیندانییەکانی لەمەڕ ئێمە، هێندەی ڕێزو قەدری نەجیمزادە پوڵاندییەکانیان دەگرت، ئەوەندە ڕێزی ئێمەی نەجیمزادەی رووسیان نەدەگرت. قەت نە ئازاریان دەدانو نە تەشەریان لێ دەدان، کەچی پۆڵاندییەکان نە ئەمەیان دەبینیو نە لەبەر چاویان بوو. ناسی "ت.... کی"م کرد، جا با بێمەوە سەر باسی ئەو پیاوە. ئەم پیاوە کە دەگەڵ هاوڕێکەیدا بەرەو زیندانەکەی لەمەڕ ئێمە دێت، بە درێژایی ڕێگا "ب.... کی" هاوڕێی لەکۆڵ دەکات، چونکە "ب" کابرایەکی ریوەڵەی مردەڵەی لەش بەبار بوو، لە نیوەی قۆناغی یەکەمی ڕێگادا پەکی دەکەوێ. هەوەڵجار ڕەوانەی تاراوگەی ئو-گورسك*(٤) دەکرێن کە بە قسەی خۆیان وەزعیان لەوێ باش دەبێت، بە هەرحاڵ وەزعی ئەوێندەر زۆر لە وەزعی زیندانەکەی ئێمە باشتر دەبێت. بەڵام چونکە نامە – هەڵبەتە نامەی زۆر ئاسایی- بۆ زیندانییانی شارێکی دی دەنێرنو حکومەت بەمە دەزانێو بڕیاردەدات بۆ زیندانەکەی ئێمەیان بنێرێ، تا ڕاستەوخۆ لە ژێر چاودێری دەسەڵاتی باڵادابن. تا هاتنی ئەوان (م....کی) بە تەنیا بوو، جا تەسەور بکە لە ماوەی یەکەم ساڵی زیندانییەکەیدا چەند نیگەرانو تەنیا بووە!

هەموو زیندانییە سیاسیەکانی لای ئێمە گەنج بوون، تەنیا "ژ..کی" نەبێ کە وەکو پێشتریش باسم کرد، هەمیشە خەریکی نوێژو وێردو نزایان بوو، تەمەنی پەنجا ساڵێك دەبوو. ئەم پیاوە کە بێگومان مرۆڤێکی ئابڕومەند بوو، تەبیعەتێکی زۆر سەیروغەریبی هەبوو. تەنانەت هاوڕێکانیشی: "ت.... کی و ب.... سکی" خۆشیان نەدەویستو بەدەگمەن قسەیان دەگەڵ

دەکردو گلەییان لێدەکرد کە کەسێکی کەللە ڕەقو سەرسەختو بە بڕوبیانووە، من نازانم تا چ ئەندازەیەك هەق بەوان بوو. بەڵام ئەوەندە دەزانم ئەگەر خەڵکی لە زینداندا یان — لە هەر شوێنێکی تردا، بە زۆرو بێ خوایشتی خۆیان کۆ بکرێنەوە – شەڕو بشێوێنیو ناکۆکیو بوغزو کینەیان زیاتر دەکەوێتە نێوان وەك لەوەی بە ئازادیو بەخواستی خۆیان کۆ ببنەوەو یەك بگرن. دیارە ئەم ناکۆکیو بشێوێنییەش فاکتەرو هۆکاری زۆری هەیە. ئەمە جگە لەوەی "ژ....کی" بە خۆی مرۆڤێکی کورت بینو ناساز بوو. هیچ یەکێك لە هاوڕێکانی لەگەڵیا هەڵی نەدەکرد. هەر چەندە من قەت لەگەڵی تێك نەچوو بووم، بەڵام پەیوەندیشم لەگەڵیا قووڵو تۆخ نەبوو. ئەو پیاوە ماتماتیك زانێکی لەزەبر بوو، لە بیرمە ڕۆژێ، بە زمانێکی تێکشکاوی نیوە رووسیو نیوە پۆڵاندی باسی تیورییەکی ئەستێرەناسی بۆ کردم کە گوایە لە داهێنانو دۆزینەوەی خۆی بووەو بۆی باسکردم کە کاتی خۆی کتێبێکی زانستی دەربارەی ئەو بابەتە نووسیوە، بەڵام هەموو مەڵبەندو بنکە زانستییەکان گاڵتەیان پێکردووە. لەوە دەچوو مێشکی کەمێك تێك چووبێو پارسەنگی بوێ. جاری وابوو چەندین ڕۆژی یەك لە دوای یەك دەکەوتە سەر چۆکانو نوێژی دەکردو وێردی دەخوێندو نزای دەکرد، ئەمە وای کرد بوو گشت زیندانییەکان ڕێزی بگرنو تا مردیش هەر ڕێزیان دەگرت. دوای نەخۆشیەکی کوشندە، لە زینداناو، بە بەرچاوی منەوە کۆچی دوایی کرد. کە یەکەم ڕۆژ گەییە زیندانەکەی لەمەڕ ئێمە، بەهۆی بەدحاڵی بوونێکەوە دەگەڵ مێجەردا، گشت زیندانییەکان خۆشیان ویست. کە ئەو زیندانیانە بە قۆناغ لە (ئو-گورسك)ـەوە بۆ زیندانەکەی ئێمە هێنرابوون، لە ڕێگە قژو ڕدێنیان نەتاشی بوون. کە بە سەرو ریشی هاتووەوە برابوونە بەردەم مێجەر، هەرکە چاوی پێیان کەوتبوو، زۆر توڕە بوو بوو، ئەم سەرپێچییەی، هەرچەندە هیچ خەتاو تاوانێکی زیندانییەکانی تیا نەبوو بوو، پێ قووت نەچوو بوو. ئیدی مێجەر یەك بە خۆی نەڕاند بووی:

– ئەمانە چین! سەرسەرین، چەتەن، ڕێگرن چین!...

(ژ... سکی) لەو کاتانەدا بە ئاستەم لە رووسی دەگەیی، وای زانی بوو لەوان دەپرسن کە ئاخۆ چەتەن، یان ڕێگرن، ئەویش وەڵامی دابووەوە:.

– ئێمە سەرسەریو بەرەڵلا نین، زیندانی سیاسین.

مێجەر دەنەڕێنێ:

– چۆن ؟ چی ؟ قسە لە قسەی من دەکەی! یەکسەر بۆ پاسەوانخانەکەی بەرنو دەست بەجێ سەد دانە جەڵدەی لێبدەن....

ئەم پیرەمێرە، بێ هیچ چەندوچوونێك ڕێك بە دەما ڕادەکشێتو دەستی دەخاتە بەینی ددانەکانیەوەو بێ هیچ ئاخو ئۆفێك، بێ ئەوەی بەحاڵ ببزوێ، سزاکەی خۆی وەرگرتو مەردانە هەستایە سەرپێ. لەو کاتەدا "ت.... سکی"و "ب .... کی"یان هێنا بۆ زیندانەکە، "م....کی" لەبەر دەرگا چاوەڕوانیان بوو، هەرکە بینیانی هەرچەندە پێشتر نەی دیتبوون، یەکسەر باوەشی پێداکردنو دەستی لە مل وەرینان. ئەم دووە کە زۆر لە پێشوازییەکەی مێجەر پەستو توڕە بوون، ئەو ڕووداوە تاڵەیان بۆ گێڕایەوە کە بەسەر " ژ.... کی" هاتبوو. من ئێستاش ئەو ساتەم

له بیره كه "م... كی" ئەو رووداوەی بۆ گێڕامەوە. "م...كی" گوتی: "له قەپێلكی خۆم دەرچوو بووم، نەك هەر توڕە بووبووم، بەڵكو دەلەرزیم... چووم بۆ بەر دەروازەكەو له چاوەڕوانی "ژ...كی"دا وەستام. چونكه دەبوا دوای سزاكەی یەكسەر له بارەگای پاسەوانییەوە بێتە دەرێ. له پڕ دەرگا كرایەوە. "ژ... سكی"، رەنگی سپی هەڵگەڕابوو، لێوی دەلەرزی، بێئەوەی تەمەشای هیچ كەسێك بكات، به بەردەم ئەو زیندانییانەدا كه له حەوشەكەدا بوون، تێپەڕی – زیندانییەكان دەیانزانی نەجیمزادەیەك شەلاخكاری كراوە – خۆی به قاوشەكەدا كردو یەكسەر چوو بۆ سەر جێگاكەی خۆی‌و بێئەوەی تاقە قسەیەك لەگەڵ هیچكەسێكدا بكات، كەوتە سەر چۆكان‌و دەستی به نوێژو دوعاو نزایان كرد. زیندانییەكان نەك هەر سەرسام بوون بەڵكو زۆریش خەفەتیان بۆ خوارد. كه چاوم بەم پیرەمێردە سەر سپییە كەوت كه بەو تەمەنەوە ماڵ‌و ژن‌و منداڵەكانی له زاگەی خۆی به جێ هێشتبوو، كه دیتم چۆكی داداوەو پاش ئەو سزا ناهەقە نوێژ دەكات‌و وێردان دەخوێنێ، زۆر توڕە بووم، ئاگام له خۆ نەما، دەتگوت مەست‌و سەر خۆشم."

ئیدی لەو سەعاتە بەدواوە زیندانییەكان "ژ...سكی"یان خۆشویست، بەڕاستی زۆر دڵبەندی ئەو هەڵوێستەی بوون كه له ژێر لێدان‌و جەڵدەدا، هیچ ئاخ‌و ئۆفێكی نەكردبوو. هەڵبەتە پێویستە ئەوەش بڵێم كه هەرگیز ناكرێ ئەو نموونەیەی سەرەوە به نموونەی باوی مامەڵەی ئیدارەی زیندان دەگەڵ زاندانییانی نەجیمزادە بزانرێ ، ئیدی نەجیمزادەی رووسی بن یان پۆڵاندی. ئەمە شتێكه پەیوەندی به خودی بەرپرسی زیندانەكەوە هەیە، كه ئەگەر كەسێكی ناڕەسەن‌و ناجسن بێ،و بەخوت‌و خۆڕایی ڕق له زیندانییەكی بەدبەخت هەڵگرێت، دەتوانێ ژیانی لێ تاڵ بكات، ژیانی لێبكات به دۆزەخ. بەڵام پێویستە دان بەوەشدا بنەم كه سەركردایەتی باڵای تاراوگەو بێگارە زیندانەكانی سیبیریا، كه بەرپرسیاریەتی تێكڕای بەرپرسانی زیندان‌و تاراوگەكانی له ئەستۆ بوو، ئامۆژگاری‌و رێنمایی تایبەتی دەرهەق به زیندانییانی نەجیمزادە هەبوو، تەنانەت زۆرجار، چاوپۆشی زیاتریان لێدەكرا، یەكەم لەبەر ئەوەی ئەو فەرماندە گەورانە به خۆیان نەجیمزادە بوون، دووەم زۆرجار نەجیمزادەكان ملیان بۆ جەڵدە نەدابوو و بەگژ جەلادەكانی خۆیاندا چوو بوونەوەو ئاكامی خراپی لێ كەوتبووەوە، سێیەم، كه ئەمەیان بەڕای من هۆی بنەڕەتی بوو، ساڵانێك لەمەوبەر، پتر له سی‌و پێنج ساڵان، كۆمەڵێكی زۆر له نەجیمزادان به كەڕەتێ*(٥) دەزگیردەكرێن‌و هەواڵەی تاراوگەو گرتووخانەكانی سیبیریا دەكرێن، ئەو نەجیمزادە دوورخراوانە، ئەوەندە رێزی خۆیان دەگرن، ئەوەندە سەلارو سەنگین‌و خۆشرەفتار دەبن، كه سەرانی تاراوگەو گرتووخانەو بێگارە زیندانەكان، ناچاردەبن زۆر رێزیان بگرن‌و مامەڵەیەكی جیاوازتریان دەگەڵ بكەن وەكو دەگەڵ زیندانییانی ئاساییدا. ئیدی ئەمە بوو به داب‌و بەرپرسانی بچووكی زیندانەكانیش، پەیڕەوی سەرانی سەرووی خۆیان دەكردو به چاوێكی دی تەمەشای زیندانییانی نەجیمزادەیان دەكردو مامەڵەیان له تەكدا دەكردن. وێڕای ئەوەش گەلێك له بەرپرسە بچووكەكان گلەییان له ئامۆژگاری‌و رێنماییەكانی سەرانی خۆیان دەكردو داخی ئەوەیان دەخوارد كه رێ نادرێن به مەیل‌و ئارەزووی خۆیان رەفتار بكەن، چونكه رەفتاریان سنووردرابوو، ئەگەر ئازادی رەفتاریان بدرایە زۆریان غەدر له زیندانییەكان دەكردو

سەختگیرییان دەگەڵ دەکردن. دیارە من ئەم قسانە لە گیرفانی خۆمەوە دەرناهێنم، بەڵکو بەڵگەم هەیە، بۆ نموونە زیندانییان دابەش کرابوون بەسەر سێ دەستەوە، دەستەی دووەمیان کە من یەکێك بووم لەوان، بریتی بوون لەو زندانییانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی سوپاییدا بوون، ئەمانە ژیانیان زۆر سەخت تر بوو لە ژیانی زیندانییانی دەستەی یەکەمو(کە لە کانەکاندا کاریان پێدەکرا) دەستەی سێیەم ( کە لە کارخانەکاندا کاریان پێدەکرا ). جا ژیانی دەستەی دووەم هەر بۆ نەجیمزادەکان سەخت نەبوو، بەڵکو بۆ گشت زیندانییەکانی ئەو دەستەیە هەر سەختو دژوار بوو، چونکە سیستەمی بردنەکەیان، سیستەمێکی سوپایی تەواو بوو، رێك لە هەر بنکەیەکی سوپایی دیکەی رووسیا دەچوو. سیستەمی سوپایی هەمیشە جدیترو بەزەبتو رەبت ترە. بۆ نموونە زیندانییانی ئەم دەستەی دووەمە هەمیشە پێ بە کۆتو زنجیر بوون، پاسەوانیان بە دیارەوە بوو، بۆ کوێ چووبان پاسەوانیان دەگەڵ دەچوو، کە شتی وا لەگەڵ دوو دەستەکەی تردا نەدەکراو نەبوو، هەڵبەتە ئەمە قسەی سەر زاری زیندانییەکانی لای ئێمە بوو کە خەڵکانی شارەزاش هەمان قسەی ئەوانیان دەکرد. بۆیە زیندانییانی ئەم دەستەیە خۆزیان بە زیندانییانی دەستەی یەکەم دەبرد (کار لە کانان) کە گوایە بەگوێرەی یاسا قورسترین سزا بوو. بەڵێ ژیانیان لە دەستەی دووەمدا ئەوەندە ناخۆش بوو، خەویان بەوەوە دەبینی بۆ بێگار بچن بۆ کانەکان. هەموو ئەو زیندانییانەی کە لە گرتووخانەکانی دیکەی رووسیاوە هاتبوون بۆ سیبیریا، یەك دڵو یەك زمان باسی خراپی زیندانەکانی خۆیانیان دەکرد، ئەوەیان دووپات دەکردەوە کە زیندانو گرتووخانە نەبوون، بەڵکو دۆزەخ بوون، دڵنیایان دەکردین کە سیبیریا لە چاو زیندانو گرتووخانەکانی دیکەی رووسیادا، وەکو بەهەشتە. جا ئەگەر ئێمەی نەجیمزادە، لە زیندانی دەستەی دووەمدا، کە لەلایەن جەنەراڵێکی سوپاییەوە، سوپاییانە بەڕێوە دەبرا، لە چاو زیندانیانی دیدا، مدارایەکی زیاتر دەکراین، ئەوا بێگومان زیندانیانی دەستەی یەکەمو سێیەم بە گشتی لە دەستەکەی ئێمە پتر مدارا دەکران، پێموایە من بە باسکردنی ئەو شوێنانەی کە خۆم بە پراکتیکی تیایدا بووم، توانیومە نموونەیەکی زندوو دەربارەی رەوشی سەرانسەری گرتووخانەو تاراوگەکانی سیبیریا پێشکەش بکەم. ئەو واریقاتو بەسەرهاتانەی کە لەلایەن زیندانییانی هەردوو دەستەی یەکەمو سێیەمەوە بۆم گێڕدراونەتەوە، دروستیو راستی ئەنجامگیرییەکەی من دەسەلمێنن. ئێمە لێرە، لە ژێر چاودێرییەکی هێندە توندا بووین، کە چاودێری وا لە هیچ شوێنێکی تردا نەبوو: لە هیچ روویەکەوە خاتریان نەدەگرتین،و چاوپۆشیان لێنەدەکردین، هەمان کارو هەمان بێگار، هەمان کۆتو هەمان زنجیر، هەمان حەپسو هەمان قفڵ، خۆڵاسە هەمان مامەڵەی هەموو زیندانییەکانی ترمان دەگەڵ دەکرا. یانی مەحاڵ بوو پەنا بدرێین یان بپارێزرێین یان چاوپۆشیمان لێبکرێ، چونکە لە سەردەمێکی نزیکی سەردەمی ئێمەدا، خەڵکانی دوو زمانو بوختانچی و چاڵ هەڵکەنو شۆڤار لەو شارەی ئێمەی لێ بووین، ئەوەندە زۆر بوو بوون، کە ئیدارەی زیندانو فەرمانبەرەکانی لەوە دەترسان زمانیان لێبدرێو ببنە قوربانی بوختانی بوختانچییان... لەو سەردەمەدا چاوپۆشی لە هەندێ زیندانی بە تاوانی زۆر گەورە دادەنرا... بۆیە فەرمانبەرەکان، لە خۆیان دەترسان، لەوە دەترسان ناویان بە خراپە دەرچێ یان

وەزیفەکانیان لە دەست بدەن... بۆیە هەمان مامەڵەی زیندانیانی ئاساییان دەگەڵ ئێمەشدا دەکرد، بە حیساب تەنیا لە مەسەلەی ئەشکەنجەو سزای بەدەنیدا بەخشرا بووین... بەڵام لە راستیدا ئەگەر هەڵەو خەتاو سەر پێچییەکی چکۆلەشمان کردبا، رێك‌و بێ چەندوچوون دەخراینە ژێر جەڵدە... چونکە سیستەمی سوپایی وا دەخوازێ هەمووان لە بەردەم سزا یەکسان بن، بەڵام لە خۆڕاییی‌و بەبێ هۆ، وەکو هەر زیندانییەکی ئاسایی، نەدەخراینە ژێر جەڵدە. کە فەرمانداری زیندانەکە بە سزاکەی "ژ... سکی" زانی بوو، بەڕاستی لە مێجەر توڕە بوو بوو و ئاگاداری کردبووەوە کە ئاگای لە خۆی بێ‌و جارێکی دی کاری وا نەکات. هەموو زیندانییەکان بەمەیان زانی بوو، هەروەها ئەوەشیان زانی بوو کە فەرماندار، متمانەیەکی زۆری بە مێجەر هەبوو و چونکە زۆر پابەندی یاسا بوو و نموونەیەکی تەواو عەیاری فەرمانبەری گوێڕایەڵ بوو، خۆشی دەویست، کە ئەو هەواڵەی بیستبوو، "هەواڵی ئەشکەنجەدانی (ژ... سکی)، زۆر بە توندی سەر کۆنەی کردبوو. ئیدی مێجەر پەندو دەرسێکی لەمە وەرگرتبوو، بۆ نموونە بە ئاواتەوە بوو رۆژێ لە رۆژان (م...کی) لە قافا بگرێت‌و بیخاتە ژێر جەڵدەو پێی رابوێرێ. زۆری رق لە (م...کی) بوو، هەڵبەتە بەهۆی ئەوەوە کە (ئا....ف) بوختانی بۆ کردبوو و زمانی لێدا بوو. بەڵام وێڕای ئەوەی هەمیشە لە بیانوویەك دەگەڕاو، بۆی لە کەمیندا بوو،و شۆڤار و جاسووسی بە سەرەوە دانا بوو، هەر بەو ئاواتەی نەگەیی. ئیدی هەواڵی مەسەلەکەی (ژ... سکی) لە شارا بڵاوبووەوە، رای گشتی دژی مێجەر هاڕوژا، خەڵکێکی زۆر سەرزەنشتیان کردو تەنانەت هەندێ کەس سەر کۆنەشیان کرد.

ئێستاش یەکەم بەرخوردی خۆم دەگەڵ مێجەردا لە بیرە.وەختێ گەییشتینە توبولسك، زۆر چیرۆك‌و حیکایەتی ترسناکیان لەمەڕ بەدخوویی‌و بەدمجێزی مێجەر، بۆ من‌و زیندانییەکی نەجیمزادەی دی گێڕایەوە. هەندێ لەو کۆنە زیندانییانەی ( کە کاتی خۆی بیست‌و پێنج دانە ساڵ حوکم درا بوون‌و حوکمەکانیان تەواو کرد بوو،و لەم شارەدا ئاکنجی بوو بوون،و وەکو ئێمە نەجیمزادە بوون، تا ئێمە لە زیندانی توبولسك بووین، هەڵبەتە بە شێوەیەکی کاتی لەوێ بووین، چەند جارێك لە پیاوەتی‌و چاکەی خۆیان سەریان داین،و ئامۆژگارییان کردین کە ئاگامان لە خۆ بێ‌و خۆمان لە شەڕی ئەم پیاوە بپارێزین کە قەرار بوو ببێ بە بەرپرسی زیندانەکەمان، هەروەها بەڵێنیان داینێ، کە بچنە لای هەندێ کەسی ناسراوو دەستڕو تا شەفاعەتمان بۆ بکەن‌و لە شەڕی مێجەرمان، بپارێزن. ئەلهەقی نامەشیان بۆ هەرسێ کیژەکەی فەرماندار نووسی بوو، کە لە رووسیاوە بۆ دیدەنی بابیان هاتبوون، دیارە ئەوانیش بە قازانجی ئێمە قسەیان کردبوو. بەڵام جەنەراڵ فەرماندار، دەیتوانی چ بکات ؟ تەنیا ئەوەندەی لە دەست دەهات کە بە مێجەر بڵێ پێویستە بە یەك چاو سەیری هەمووان بکات‌و دادپەروەرانە یاسا جێبەجێ بکات. سەعات سێی پاش نیوەڕۆ بوو کە من‌و هاوڕێکەم گەیینە ئەم شارە، پاسەوانەکان، یەکسەر بۆ لای مێجەریان هێنایین. لە ڕاڕەوەکەدا وەستێنراین، ناردیان بە شوێن عەریف خەفەری زیندانەکەدا. هەرکە عەریف خەفەر گەییە جێ، یەسەر مێجەر خۆی بە ژوورا کرد. دەموچاوی سوور، یەکپارچە رق‌و

کینه بوو، ڕێك له جاڵجاڵۆکەیەکی دڕ دەچوو که خۆی بۆ پەلاماردانی مێشێکی داماو ئامادە بکات که کەوتبێتە داوییەوەو بێهودە پەلەقاژەی دەرباز بوونی بێت.

مێجەر ڕووی کردە هاوڕێکەم‌و پرسی:

– نێوت چییە ؟

دەنگی گڕو پچڕ پچڕ بوو، دەیویست بەو شێوەیە سامی خۆیمان بەسەردا بنوێنێ

ئەوجا ڕووی له من کرد، له ژێر چاویلکەکەیەوە نیگایەکی کردم‌و پرسی:

– ئەدی تۆ ؟

ناوی خۆم پێ گوت. ئەوجا ڕووی کردە عەریف خەفەرو گوتی:

عەریف... ئەمانە یەکسەر بۆ زیندان ببەن، با له قەرەوڵخانەکەش سەریان بتاشن، وەکو زیندانییانی مەدەنی سەریان بتاشن، یانی نیوەی سەریان.. سبەینێ کۆت‌و زنجیریان بکەن!

سەرو پاڵتۆی خاکیمان لەبەربوو که پەڵە پەڵەی زەردیان بە پشتەوە بوو، ئەم پاڵتۆیانەیان له توبولسك دابووینێ. که چاوی به پاڵتۆکانمان کەوت، له سەری ڕۆیی‌و گوتی:

– ئەم پاڵتۆیانە چیە ؟ ئەمانە له کوێوە دێن ؟ ئەمە ئونیفۆرمی تازەیە... بێگومان ئونیفۆرمی تازەیە... ئەمانە بەتەمان... ئەمە دەستوری پترسبورگە ؟..."

بە دەم ئەو قسانەوە، به دەورماندا دەسوڕایەوەو یەك یەك تەمەشای دەکردین. ئەوجا لەو پاسەوانەی پرسی که لە گەڵماندا هاتبوو:

– ئەمانە هیچیان پێ نیە ؟ هیچیان لەگەڵ خۆدا نەهێناوە ؟

یارۆی پاسەوان، خەبەردار وەستاو بەرێزەوە تفەنگەکەی خستە سەر شانی‌و بگرە کەمێکیش له ترسا دەلەرزی، هەموو خەڵکی مێجەریان دەناسی‌و لێی دەترسان، یارۆی پاسەوان بەرسڤی دایەوەو گوتی:

– پایە بەرز، جلی تایبەتی خۆیان پێیە !

– هەموو ئەم جلانەیان لەبەر داکەنن، تەنیا جلی ژێرەوەیان لەبەر بێڵنەوە، جلی سپی... ئەگەر جلەکانی ژێرەوەیان سپی نیە، ڕەنگاو ڕەنگە، ئەوانەشیان لەبەر داکەنن، بیخەنە هەڕاجەوەو پارەکەی بخەنە سەندوقی داهاتی زیندانەوە.

ئەوسا نیگایەکی توندی ئێمەی کردو لەسەری ڕۆیی:

– مەحکوم یان زیندانیی بێگارە زیندان نابێ هیچی هەبێت. ئاگادار بن! ئاگاتان له ڕەفتارو هەڵسوکەوتی خۆ بێ! نامەوێ بچووکترین شت ببیستمەوە! دەنا سزاو ئەشکەنجەی بەدەنی له خزمەتتاندایە! هەرکە پێ خوار دابنەن، شەلاغ ئامادەیە!

هەڵبەتە من فێری ئەو جۆرە پێشوازییە نەبووم، بۆیە بە درێژایی ئەو شەوە نیمچە نەخۆش بووم، که چوومە ئەو دۆزەخەوە بە جارێ خەم دایگرتم! بەهەرحاڵ من پێشتر باسی ئەو شتانەم کردووە، بۆیە پێویست ناکات، جارێکی دی دووبارەی بکەمەوە.

گوتم که ئێمە هیچ جۆرە حەسانەیەکمان نەبوو، وەکو هەموو زیندانییەکانی دی مامەڵەمان له تەکدا دەکرا. بەڵام جارێکیان ویستیان یارمەتیمان بدەن، (من‌و ب... سکی) هاوڕێمیان، بۆ

ماوەی سێ هەیڤ، لە نووسینگەی ئەندازیاریدا، وەکو نڤیسەڤان (ناسخ) دانا، هەڵبەتە ئەم کارە ژێراو ژێرو بەنهێنی کرا، بۆیە هەموو ئەوانەی کە پێیان دەزانی، وایان دەنواند ئاگایان لەشتی وانیە. چونکە باش ئەندازیاری نووسینگەی ئەندازیاری، بە نهێنی ئەم چاکەیەی دەگەڵ کرد بووین. ڕێك لەو سەردەمەدا بوو کە لیوتنان کولونیل "ژ... کوف" بۆ ماوەیەکی کەم فەرماندارمان بوو. ئەم پیاوە بۆ ئێمە زۆر باش بوو، دەتگوت لە ئاسمانەوە بە تایبەتی بۆ مدارا کردنی ئێمە نێردراوە ( بەڵام زۆر نەمایەوە. درۆم نە کردبێ تەنیا شەش مانگێك مایەوەو ئەوسا بۆ رووسیا گەڕایەوە) یادگارو بیرەوەرییەکی زۆر باشی لەلای گشت زیندانییەکان بەجێ هێشت. زیندانییەکان نەك هەر خۆشیان دەویست، بەڵکو دەیانپەرست. من نازانم چۆن بەو ڕادەیە خۆی خۆشەویست کرد بوو، بەڵام هەر لە سەرەتاوە، زیندانییەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە ئەو بەڕێوەبەری کاری ئەندازیاری بوو، زیندانییەکان زۆر لێی ڕازی بوون‌و بەردەوام بە ستایشەوە دەیانگوت: "باوکمانە، بە ڕاستی باوکە، باوکایەتی هەر لە خۆی دێ!" پیاوێك بوو ڕووخۆش، کراوە، ژیاندۆست، کورتە بالأیەکی چاو گەشی، نیگا نەترس، متمانە بەخۆ بوو، دەگەڵ هەموو زیندانییەکاندا خۆشڕەفتار بوو، وەکو بابی ڕاستەقینە زیندانییەکانی خۆش دەویست! من نازانم زیندانییەکان بۆچی بەو ڕادەیە ڕمووەدەی بوو بوون‌و خۆشیان دەویست. بەڵام ئەوە دەزانم، مەحاڵ بوو زیندانییەك بدینێ‌و قسەیەکی خۆشی دەگەڵ نەکات، بەروویا پێنەکەنێ‌و شۆخی‌و سوعبەتی دەگەڵ نەکات. هەڵبەتە لە قسەو سوعبەتەکانیا زۆر بێ فیزو خاکی بوو، قەت وەکو گەورەو بەرپرس خۆی نەدەنواند. بەڵکو وەکو هاوڕێ مامەڵەی دەگەڵ زیندانییەکاندا دەکرد. کەچی سەرباری ئەمەش، زیندانییەکان نەك هەر زۆریان ڕێز دەگرت، بگرە شەرمیانیش لێدەکرد. هەر زیندانییەك بەرێکەوت لە دوورەوە ئەم فەرماندەیەی دیبا، ڕووی دەگەشایەوە، بزەیەکی بۆ دەکردو کڵاوەکەی وەکو ڕێزێك بۆ دادەگرت. خۆ ئەگەر فەرماندەکە مەرحەبایەك‌و قسەیەکی دەگەڵ کردبا، ئەوەی بە خەڵاتێکی گەورەو پڕ شانازی بۆ خۆی دەزانی. ئەمەیە ئەنجامی خۆشەویستی! ج.. کوف، کابرایەکی بە هەیبەت بوو، هەنگاوی هەڕاوی دەنا، لە ڕێکردنا قوت‌و قیت بوو. زیندانییەکان پێیان دەگوت "هەڵۆ". هەڵبەتە ئەم پیاوە نەیدەتوانی هیچ یارمەتییەکی زیندانییەکان بدات، چونکە تەنیا بەڕێوەبردنی کاروبارە ئەندازیارییەکانی لە ئەستۆ بوو، کە ئەویش بە گوێرەی پرەنسیپی یاسایی ڕێکخرا بوو،و نەیدەتوانی بەموو لێی لابدات یان بیگۆڕێت. بەڵام ئەگەر بەرێکەوت دەستەیەکی لە زیندانییان دیتبا کە لە کار بوونەتەوە، لە جیاتی ئەوەی بە خێرایی رایان بگرێ‌و ماتەڵیان بکات، بەر لە لێدانی دەهۆڵی پایدۆس ئیزنی دەدان بۆ شوێنی خۆ بگەڕینەوە. زیندانییەکان بۆیە خۆشیان دەویست چونکە متمانەی پێیان هەبوو، ڕێزی دەگرتن‌و، نەی دەبوغزاندن، خۆی بەسەردا نەدەنواندن. دڵنیام ئەگەر هەزار رۆبڵی لێکەوتباو دەستی دزترین زیندانیی ئێمە کەوتبا، بە دەقی خۆیەوە بۆی دەگێڕایەوە. دوای هاتنی ئێمە بە مانگێك، دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە دەگەڵ مێجەردا، مێجەری بێزراودا بە شەڕ هاتووەو سەرکۆنەی کردووە، ئەمە هێندەی دی لە نێو زیندانییەکاندا خۆشەویستی کرد! زیندانییەکان لە خۆشیا لە پێستی خۆ نەدەهێورین! فەرماندار هاودەورەی مێجەر بوو، واتا

دۆستو هاوڕێی کۆن بوون، که پاش دابڕانێکی زۆر لێره یەکیان گرتبووەوه، دۆستایەتیەکەیان دەمە زەرد کردبووەوه، بەڵام زۆری پێ ناچێت، بەینیان تێك دەچێت، بەشەڕ دێنو لەوه بەدوا ج.... کوف دەبێ به دژمنی سەر سەختی مێجەر. تەنانەت باسی ئەوەش دەکرا، که له یەکیان داوه، هەڵبەته مێجەر ئەو جۆره هەرەزەکارییەی لێدەوەشایەوه. که زیندانییەکان بەمەیان زانی زۆریان پێ خۆش بوو، له بەینی خۆیاندا دەیانگوت:"چما ئەم هەشت چاوه دەگەڵ پیاوی پیاوانەدا هەڵدەکا؟ دەك دەستی قوماندان(فەرماندار) خۆش بێ. هەشت چاو هەر قوماندانی وای قابیله. قوماندان هەڵۆیه هەڵۆ، بەڵام مێجەر...." من پێم شەرمه ئەو وشه ناشیرینه بخەمه سەر کاغەز که زیندانییەکان به مێجەریان دەگوت. زیندانییەکان زۆریان حەزدەکرد بزانن کێ لەم شەڕەدا سەرکەوتووه، کێیان ئەویتریان پڕ شەق کردووه! خۆ ئەگەر ئەم دەنگۆیه درۆ دەرچووبا، زیندانییەکان زۆریان پێ ناخۆش دەبوو! بۆیه بەپێی حەزی خۆیان دەیانگوت: "بێگومان قوماندان داری داوه به روحیا، تەختی کردووه. راسته قوماندان پیاوێکی کورته باڵایه، بەڵام زۆر رەشیدو بەغیرەتو بوێره! بێگومان مێجەر له ترسا خۆی وەبن قەرەوێڵەکەی داوەو خۆی شاردووەتەوه!" بەڵام ج... کوف، هەر زوو داخو کەسەرێکی زۆری بۆ زیندانییەکان بەجێ هێشتو لەوێ نەما! هەڵبەته گشت ئەندازیارەکان خەڵکی باشو مەردو رەند بوون، لەو ماوەیەدا که من له زینداندا بووم، سێ چوار جاریان گۆڕین... زیندانییەکان له بەینی خۆیاندا دەیانگوت: "حەیفێ له ئێمه چوو، جارێکی دی پیاوی وا نابینینەوه. هەڵۆیەك بوو لەو گۆڕه. فریشتەی نیگابانی ئێمه بوو!".

بۆیه ج.... کوف، منو "ب .... سکی" نارد بۆ کارکردن له نووسینگەکەی خۆی، چونکه زیندانییانی نەجیمزادەی خۆشدەویست. پاش رۆییشتنی ئەویش، وەزعو حاڵمان تا ئەندازەیەك باش بوو. چونکه ئەندازیاره ئەفسەرەکان، به تایبەتی یەکێکیان، زۆریان خاتر دەویستین. ئێمه ئەوەندەمان راپۆران نووسی بووەوه. که خەتمان تەواو خۆش بوو بوو و لەسەر کارەکه راهاتبووین، رێك لەو کاتەدا، فەرمانێك له سەرێڕا هات که بمان گێڕنەوه سەر کارەکەی جارانمان. دیار بوو، یەکێك راپۆرتی لێدابووین! ئەلهەقی ئێمەش ئەوەمان زۆر پێناخۆش نەبوو، چونکه ئەوەندەمان نووسینان شەکڵ نووس کردبووەوه بێزار بوو بووین. ئیدی بۆ ماوەی دوو ساڵ، به دوو قۆڵی دەگەڵ (ب .... سکی)دا له کارگەو وەرشەکاندا کارمان کرد، ئیدی بەردەوام خەریکی گەنگەشەو گفتوگۆیان بووین. باسی هیواو ئاواتەکانی خۆمان دەکرد، بیروبۆچوونی خۆمان دەگۆڕییەوه. ئەم هاوڕێ هەره باشەم (ب ....سکی) هەندێجار راوبۆچوونی سەیرو توندی هەبوو. هەندێ کەس هەن زۆر زیرەکن، بیروباوەڕی سەیریان لەلا دروست دەبێ، ئەوەنده بیروباوەڕی خۆیان خۆش دەوێ، بچووکترین ئیرادی بەرانبەریان پێ قەبووڵ ناکرێ، له بچووکترین رەخنه زویر دەبن. کوڕم دەوێ بەرپەرچیان بداتەوه. جا (ب ... سکی) له هەموو ئیرادێکی من دەڕەنجا، زۆر به توندی بەرپەرچی دەدامەوه. خۆ رەنگه زۆرجاریش ئەو له من زیاتر لەسەر هەق بووبێ، ئەو له هەندێ بۆچووندا، له من واقیع بینتر بووبێ. بەڵام ئەنجام به ناچاری لێکدی جیابووینەوه،

هەڵبەتە من ئەمەم زۆر پێناخۆش بوو، چونکە خاڵی هاوبەشی زۆرمان لە نێواندا هەبوو، لە زۆر شتدا هاوڕەئی بووین.

ئیدی "م.... کی" ڕۆژ بە ڕۆژ خەمین تر دەبوو. نا ئومێدیو بیٚ هیوایی زۆری بۆ دەهێنا. لە سەرەتای زیندانییەکەی مندا زۆر کراوەتر بوو و زیاتر بیروبۆچوونەکانی خۆی دەردەبڕی. کە من گەییمە زیندان، ئەو ساڵی سێیەمی زیندانی دەگوزەراند. لە سەرەتاوە زۆر بە بایەخەوە دەیدواندمو گوێی لەو هەواڵانە دەگرت کە من پێم بوو، چونکە هیچ دەنگو باسێکی دەرێی زیندانی نەدەزانی. بە پەرۆشەوە پرسیاری لێدەکردم، بە وردی گوێی لە وەڵامەکانم دەگرت، ڕمووودەم بوو بوو. بەڵام وردە وردە سارد بووەوەو، ئەو جۆشو خرۆشەی نەماو، بەسەر خۆیدا کڕکەوتو ڕازی دڵی خۆی دەرنەدەبڕی. بە تەواوەتی دامرکایەوەو ڕۆژ بە ڕۆژ گۆشەگیرتر دەبوو. باسی ئەو زیندانییانەی دەکرد کە من تازە خەریك بوو دەمناسینو ئاشنایان دەبووم، بە زمانی فەرەنسی دەیگوت: "من ڕقم لەو چەتەو ڕێگرانەیە !" چەندم هەوڵدەدا کە بەرگرییان لێبەکەمو بەڵگەم بۆ دێنایەوەو موناقەشەم دەکرد فایدەی نەبوو و گوێی لێنەدەگرتم،و قسەکانی منی بە گوێدا نەدەچوو و نەدەچوو. خۆ ئەگەر بە ڕێکەوتو لە غەفڵەتێکدا، لە سەد ڕەئیدا، ڕەئێکی لیٚ وەرگرتبام، ئەوا بۆ سبەینیٚ بایەدایەوە سەر بای بەڕە بۆڕو دووبارە بە زمانی فەرەنسی دەیگوتەوە: " من ڕقم لەم چەتەو ڕێگرانەیە ". جا چونکە ئێمە بە زۆری بە زمانی فەرەنسی قسەمان دەگەڵ یەکدی دەکرد، یەکێك لە سەربازەکانی هێزی ئەندازە بە نێوی درانچنیکوف، ناوی نابووین "پەرستار"، مەگەر هەر خوا خۆی بزانیٚ بۆچی ئەو ناوەی لێنا بووین!. (م.... کی) تەنیا کە دەهاتە سەر باسی دایکی، توڕە نەدەبوو وهەڵنەدەچوو. بۆی دەگێڕامەوە کە: "پیرەژنێکی نەخۆشی زەمینگیرە، منی لە هەموو شتێکی ئەم دنیایە خۆشتر دەویٚ، نازانم ئاخۆ ئێستا مردووە یان ماوە! ئەگەر دەیزانی منیان خستووەتە ژێر جەڵدە!...".

"م.... کی" لە چینی نەجیمزادان نەبوو، بەر لەوەی زیندانی بکرێت، شەلاخو جەڵدەی خوارد بوو، هەرکە ئەوەی وەبیر دەکەوتەوە، لێوی خۆی دەگەستو ڕووی وەردەگێڕا. لە ئاخرو ئۆخری زیندانییەکەیدا، لە جاران زیاتر حەزی لە تەریکیو تەنیایی دەکرد، لەگەڵ کەسدا پیاسەی نەدەکرد. ڕۆژێك، نزیکی نیوەڕۆ، بانگ کرا بۆ لای قوماندان، قوماندان بە ڕوو خۆشیو بە دەم زەردەخەنەوە پێشوازی دەکاتو لێی دەپرسێت:

– "م... کی" بڵیٚ بزانم شەویٚ خەوت بە چیەوە دی !

(م... کی) کە لە دیدارەکەی فەرماندار (قوماندان) گەڕایەوە، بۆی گێڕامەوەو گوتی: " کە قوماندان ئەو پرسیارەی لێکردم، دڵم داخورپا، دەتگوت لە پڕ دڵیان شەق کردم."

م.... کی لە وەڵامی قوماندان دا دەڵێت:

– شەویٚ، لە خەوما، نامەیەکی دایکم بۆ هاتبوو

قوماندان پێی دەڵێت:

– لەوە خۆشترە! لەوە خۆشترت لە ڕێیە. تۆ لەمڕۆوە ئازادی... دایکت تکانامەیەکی بۆ تزار ناردووە...تزار تکاکەی قەبووڵ کردووە. فەرموو ئەم نامەیە بخوێنەوە... ئەمە فەرمانی ئازادیی تۆیە... لەم ساتەوە تۆ ئازادیت و زیندان جێی تۆ نییە.

کە بەو هەواڵەوە بۆ لای ئێمە گەڕایەوە، لە خۆشیدا ڕەنگی بوو بوو بە زەعفەرانی زەرد.

پیرۆزباییمان لێکرد. بە دەستە ساردو لەرزۆکەکانی تەوقەی دەگەڵ کردین. هەموو ئەو زیندانییانەی کە بە ئازادی ئەو خۆشحاڵ بوو بوون پیرۆزباییان لێکرد.

ئیدی لەوێندەر، هەر لەو شارەدا بوو بە موهاجیرنشین (مستوطن)و پاش ماوەیەکی کەم ئیشیان دایەو بوو بە فەرمانبەر. لە سەرەتاوە زۆرجار بە سەردانی دەهات بۆ زیندان بۆ لامان، هەواڵو دەنگوباسی هەمە جۆری بۆ دەهێناین، بە تایبەتی هەواڵو دەنگوباسی سیاسی کە خۆی حەزی لێدەکرد.

پۆڵاندییەکان، جگە لەو چوارەی کە باسم کردن‌و گوتم زیندانی سیاسی بوون، دوانی دیکەشیان هەبوو کە زۆر گەنج بوون‌و بۆ ماوەیەکی زۆر کەم دوورخرابوونەوە، ئەم دوانە هەر چەندە خوێنەوارییەکی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام خەڵکێکی ئابڕومەندو سادەو ساکارو ڕاشکاوو قسە لە روو بوون. سێیەمی ئەمانە نێوی ئا... کزوکوفسکی بوو، ئەمە گەنجێکی زۆر ساویلکەو بیٚ شەخسیەت بوو. بەڵام نەفەری چوارەمیان کە نێوی "ب .... م" بوو، هەندیٚ بە تەمەن بوو، ئەمە کاریگەرییەکی خراپی لەدڵو دەروونی هەمووماندا جێهێشت. نازانم ئەمە بۆچی بۆ سیبیریا نەفی کرا بوو، هەرچەند بەخۆیو لە خۆیەوە هۆی نەفی کردنەکەی گێڕایەوە. ئەمە پیاوێکی نەفس نزم، بورژوا تەبیعەت بوو، هەمان رەئیو تەبیعەتی بابایەکی دوکانداری هەبوو کە سەروەتو سامانەکەی عانە عانە کۆکردبێتەوە. هیچ رۆشنبیرییەکی نەبوو، جگە لە پیشەکەی خۆی وەکو بۆیەچیو نیگارکێشی، هیچ شتێکی دیکەی بەلاوە مەبەستو گرینگ نەبوو. ئەلهەقی بۆیەچیو نیگارکێشێکی زۆر چاکو کارامە بوو. سەران‌و بەرپرسانی زیندانەکەمان، بەمەیان زانی، ناوبانگی وەستاییو دەستڕەنگینی بڵاوبووەوە، هەموو خەڵکی شار. بۆ رازانەوەو بۆیەو جوانکاری دیوارو بن میچی ژوورەکانیان روویان لەو دەنا. لە زەرفی دووساڵێکدا زۆربەی ماڵەکانی فەرمانبەرو کارمەندەکانی بۆیەو تازە کردەوە، هەڵبەتە فەرمانبەرەکانیش کرێی باشیان دەدایە، بۆیە هەمیشە گیرفانی گەرم بوو. بەڵام باشترین کار ئەوە بوو کە هەمیشە سیٚ شاگردیان لە هاوڕێکانی خۆی دەگەڵدا بۆ کار دەنارد، دووان لەو شاگردانە، فێری پیشەکەی ئەو بوون، تەنانەت یەکێك لەو سیٚ شاگردە کە نێوی ( ت ... ریزیفشکی بوو) بوو بە نیگارکێش‌و بۆیەچییەکی هێندە لێهاتوو کە هیچی لە وەستاکەی کەمتر نەبوو. مێجەرەکەی لەمەڕ خۆمان کە لە خانوویەکی دەوڵەتیدا ئاکنجی بوو، " ب ....م"ی بانگ کردو ئەمری پێکرد دیوارو بن میچی خانووەکەی بۆ بۆیە بکات. (ب... م) بە جۆریٚ هونەرو دەست رەنگینی خۆی لەم کارەدا بەکار هێنابوو، کە خانووەکەی فەرماندار (قوماندان) لە چاو ئەوەی مێجەردا نەیدەکردە هیچ. خانووەکەی خانوویەکی کۆنی یەك نهۆمی بوو، لە دیوی دەرەوە زۆر پیس‌و داڕوخاو بوو، بەڵام لە ناوەوە هێندە پوختەو جوان کرابووەوە، کەم کۆشکی رازاوەی دەگەییشتیٚ. ئیدی مێجەر بۆ

خۆی لە خۆشیا خەنی بوو... و بگەییشتایەتە هەر کەسێك، دەستەکانی خۆی هەڵدەگلۆفت‌و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ تێی دەگەیاند کە گەرەکیەتی ژن بێنی‌و بە تۆنێکی سەنگین دەیگوت: "پیاو لە خانوویەکی وادا بژی، چۆن بیر لە ژن ناکاتەوە، ئەم خانووە تەنیا ژنی نوقستانە؟" ئیدی زۆر لە (ب ... م)و شاگردەکانی رازی بوو. کاری بۆیەکردنی ماڵەکەی مێجەر یەك هەیڤی خایاند، مێجەر لە ماوەی ئەو مانگەدا رەئی سەبارەت بە ئێمە تەواو گۆڕا، بگرە حیسابی تایبەتی بۆ ئێمەی زیندانییانی سیاسی دەکردو داکۆکی‌و بەرەڤانی لێدەکردین. کار گەیی بووە ئەوە کە رۆژێ "ژ... سکی" بانگ کردبوو ودوای عوزرخوایی پێی گوتبوو:

– گوێ بگرە "ژ... سکی"! من غەدرم لێکردیت، دەزانم بە خۆڕایی خستمیتە ژێر شەلاخ‌و جەڵدە، زۆر بە داخەوەم، من پەشیمانم. تێدەگەی ؟ من لەم کارە ژێوانم، بمبورە!

ژ... سکی بەرسڤی دابووەوە کە باش تێدەگات.

مێجەر لەسەری دەڕوات‌و دەڵێت:

– دەزانی کە من، من، منی سەرۆکی تۆ، بۆیەم بۆ ئێرە بانگ کردوویت، تا داوای بوردنت لێبکەم؟ حاڵی هەیت ؟ ئاخر تۆ لە ئاستی مندا چیت ؟ تۆ لە ئاستی مندا کرمێکی، بگرە لە کرمیش کەمتری! تۆ بابایەکی زیندانیت، بەڵام من سوپاس بۆ خوا کە مێجەرێکم*(٧)... مێجەر! تێ دەگەی ؟

ژ... سکی بەرسڤی دەداتەوە کە تێ گەییشتووە.

مێجەر لەسەری دەڕوات:

– زۆر باشە.... جا من گەرەکمە دەگەڵت ئاشت ببمەوە. بەڵام ئایا تۆ لە من دەگەی، لەم کارەی من دەگەی؟ بە تەواوەتی هەست دەکەیت کە ئەم کارەی من تا سەر مۆخ کارێکی ئینسانیە ؟ لەو ئاستەدایت کە بەتەواوەتی هەستی پێ بکەیت؟ تەسەور بکە... من، منی مێجەر، منی مێجەر، دەمەوێ ئاشتت بکەمەوە.... هتد.

ژ... سکی، بە خۆی ئەم دیمەنەی بۆ گێڕامەوە، کەواتە ئەم مرۆڤە دڕو دڕندەو هەمیشە مەست‌و مەردم ئازارە لە سۆزی مرۆڤانی‌و مرۆڤدۆستی بەدەر نەبووە. بەڵام ئەگەر سەیری کورت بینی‌و کەللە رەقی ئەو بکەین، ئەو قەناعەتەمان لا دروست دەبێت کە ئەم رەفتارو هەڵوێستەی لە پیاوەتی‌و بەخشندەیی نەبووە. بەڵکو گومان لەوەدا نییە کە مەستی و سەرخۆشی دەورێکی زۆری تیا دیتووە.

هەڵبەتە خەون‌و ئاواتەکەی مێجەر نەهاتەدی. هەرچەندە لێبڕابوو کە هەرکاتێ لە بۆیە کردن‌و جوانکاری خانووەکەی بووەوە ژن دێنێ. بەڵام فریا نەکەوت، ژنی نەهێنا. لە جیاتی زەماوەند، درایە دادگاو ناچار کرا دەست لە کار بکێشێتەوە. ئیدی پەتکی هەڵەو تاوانەکانی پێشوویشی کەوتە سەر ئاو. جاران لە شاردا بەڕێوەبەری پۆلیس بوو. ئەم جەزرەبە کوت‌و پڕە وڕو کاسی کرد. کە زیندانییەکان بەم هەواڵەیان زانی زۆر خۆشحاڵ بوون. ئەو رۆژە بۆ ئەوان جەژن بوو. دەیان گێڕایەوە دەیانگوت مێجەر وەکو پیرەژن دەگریاو دەی ناڵاند. بەڵام چاری چی بوو؟ دەبوایە مل بداتە خەت‌و دەست لە کار بکێشێتەوە. هەوەڵجار ئەسپە شێیە جوانەکانی فرۆشت.

هەرچییەکی تری هەبوو فرۆشتی، سەرەنجام کەوتە سەر ساجی عەلی. پاش ئەوە، جارجاریٚ دەمان بینی، چاکەتێکی شڕۆڵەی لەبەرو کاسکێتێکی پیسی لەسەر بوو، مۆڕەی لە زیندانییەکان دەکرد. بەڵام هەرکە جلی مێجەرییەکەیان پیٚ داکەند ئیدی هەیبەتو سامەکەی جارانی نەما. بە جلکی سوپاییەوە خوایەك بوو بۆ خۆی، بەڵام بە جلکی مەدەنییەوە زیاتر لە خزمەتکار دەچوو. تومەز قیمەتی ئەم پیاوە بە جلە سوپاییەکەیەوە بوو!....

<u>پەراوێز:</u>

*١- "هەشت هاوڕێی دی": ئەمانە پۆڵاندیو زیندانیی سیاسی بوون.*

*٢- "ب.... سکی": شۆڕشگێڕێکی پۆڵاندی بوو.*

*٣- "ژ.... سکی": جوزیف زوخوفسکی، شۆڕشگێڕێکی پۆڵاندی بوو، لە ساڵی ١٨٠٠ لە دایك بوو. لە ساڵی ١٩٤٨ دا حوکمی بیست ساڵ زیندان درا. لە ساڵی ١٨٥١دا لە زینداندا مرد.*

*٤- "ئو- گورسك": شارێکە کەوتووتە سیبیریای رۆژئاواوە لە دەڤەرو هەرێمی سیمیبا لاتنسك.*

*٥- "ئەمانە دیسامبەرییەکان بوون": لە ساڵی ١٨٢٦دا دەستگیرکران، ژمارەیان نزیکەی سەد کەسێك دەبوو.*

*٦- "بەڵام من سوپاس بۆ خوا مێجەرم": ئەم مێجەرە تاقە ئەفسەر نەبوو کە ئەو دەستەواژەیەی بەکار دەبرد، بەڵکو ئەفسەرانی دیکەش هەبوون لە سەردەمی مندا ئەو دەستەواژەیەیان بەکاردەبرد، بە تایبەتی ئەوانەی لە دەرەجەدارییی بچووکەوە، گەیی بوونە پلەی ئەفسەری ( ئەم پەراوێزە لە نووسینی دۆستۆیفسکییە ).*

دوای ڕۆیشتنی مێجەر بە ماوەیەکی کورت، سیستەمی زیندانەکەمان بە تەواوەتی دەسکاری کراو گۆڕدا. بێگارە زیندانو بەشی زیندانی مەدەنی لابراو، کرا بە زیندانێکی سوپاییو وەکو هەر گرتووخانەیەکی سوپایی دیکەی سەرانسەری رووسیا، بە سیستەمی سوپایی بەڕێوە دەبرا. لەوە بەدواوە مەحکومانی دەستەی دووەم بۆ ئەم زیندانە نەدەنێردران، وای لێهات جگە لە زیندانییانی سوپایی، واتا ئەو زیندانییانەی کە لە مافی مەدەنی خۆیان بێ بەش نەکرابوون، هیچ زیندانیەکی تریان بۆ ئێرە نەدەنارد، جا ئەو زیندانیە سوپاییانە، لەو سەربازانە بوون، کە حوکمێکی کەم دەدران ( درێژترین حوکمیان لە شەش ساڵ تێناپەڕی )، کە حوکمەکەیان تەواو دەکرد، وەکو جاری جاران بۆ پایەگا سوپاییەکانی خۆیان دەگەڕانەوەو سەربازی خۆیان دەکرد. هەڵبەتە زیندانیە مەدەنیە کۆنەکان، ئەوانەی حوکمی ئەبەدیو بیست ساڵ درابوون،و لە هەر مافێك بێ بەش کرابوون، داغمەیان پێوە نرابوو،و سەریان سفرکرابوو، دەبوایە لەبەر بێ جێگایی تا حوکمەکانیان تەواو دەکەن لێرە بمێننەوە. هەڵبەتە لە پێش ئەم گۆرانکاریەدا لە زیندانەکەی ئێمەدا (بەشی تایبەتی) هەبوو، ئەمە هیچ گۆڕانێکی بەسەر نەهات ،چونکە لە بنەڕەتدا بۆ تاوانبارانی سوپایی دامەزرابوو.. بە هەرحاڵ هیچ زیندانییەکی تازەی مەدەنی بۆ ئێرە نەدەنێردرا، کۆنەکانیش یەك یەك حوکمەکانیان تەواو دەکردو بەرە بەرە ئازاد دەبوونو وای لێدەهات لە زەرفی دەساڵێکدا تاقە زیندانییەك لەو جۆرە زیندانییانە لە زیندانەکەماندا نە دەما. بەشە تایبەتیەکەی زیندانەکەمان وەکو خۆی مایەوە، ناو بەناو هەندێ تاوانباری سوپایی خەتەر دەگەیشتنە لای ئێمەو، بەشێوەیەکی کاتی لەلای ئێمە زیندانی دەکران ، چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد لە سیبریای رۆژهەڵاتدا بێگارە زیندانی دیکە بێتە دامەزراندن. شێوەی ژیانمان نەگۆڕا، کارو سیستەمەکە وەکو جاران بوو. تەنیا سیستەمی بەرێوەبردنی زیندانەکە دەسکاریو تازە کرایەوە: ئەفسەرێکی گەورە بەپلەی قوماندان کرا بە فەرمانداری زیندانەکە، چوار ئەفسەریشی خرابووە ژێردەست کە بەنۆرە کاریان دەکرد . سەربازە نوقستانەکان، نوقستانانی جەنگ دەرکران، دوازدە سەربازی دەرجەدارو چاودێر لە جێی ئەوان دانران. زیندانییەکان دابەش کران بەسەر چەند دەستەیەکی دە کەسییەوە، بۆ هەر دەستەیەك، سەردەستەیەك لە خودی زیندانییەکان هەڵبژێردرا، دیارە ئەم سەردەستەیە هەر بەناو سەردەستە بوو دەنا هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر هاوڕێو هاوزیندانییەکانی خۆیدا نەبوو، بەو جۆرە (ئاکیم ئاکمیچ) بەسەر دەستە هەڵبژێردرا.جلەوی ئەم سیستەمە تازەیە ڕاستەوخۆ لە دەستی فەرمانداری زیندانەکەماندا بوو. ئیدی گۆڕانکارییەکە لەمە هێوەتر نەڕۆیی.

زیندانییەکان لە سەرەتاوە زۆر نیگەران بوون، زۆر بە جددی گەنگەشەو گفتوگۆیان دەربارەی ئەم سیستەمە تازەیە دەکرد، رەخنەو ئیرادیان لێدەگرت، بەڵام کە دیتیان شتەکان وەکو جاری جاران بەڕێوە دەچێت، ئیدی هێور بوونەوەو ژیانمان ئاوەڕۆی جارانی خۆی وەرگرتەوە. بەڵام ئەوەندە هەبوو کە بەلای کەمەوە لەشەڕی مێجەر ڕزگاربووینو ترسمان ڕەوییەوەو، هەناسەیەکمان وەبەرهاتەوە،و هەر زیندانییەك بۆی هەبوو، لە کاتی پێویستدا دادو سکاڵای خۆی بەرێتە لای سەرانی زیندانو ئەگەر لەسەر هەق بوایە، دادیان دەپرسی،و بێ گوناحان

تاوان‌و باجی گوناحی خه‌تاکاریان نه‌ده‌دا. هه‌رچه‌نده ده‌رجه‌داران له جێی سه‌ربازانی نوقستانی جه‌نگ، دانرابوون‌و سه‌رپه‌رشتی‌و چاودێری کاروباری زیندانه‌که‌یان ده‌کرد. مه‌یفرۆشی به هه‌مان ده‌قی جارانه‌وه به‌رده‌وام بوو. زۆربه‌ی ئه‌م ده‌ره‌جه‌دارانه خه‌ڵکی ئابڕووم‌ه‌ندو دووربین‌و ئاقڵ بوون‌و قه‌دری خۆیان ده‌زانی. یه‌ك دوانێك له‌مانه له سه‌ره‌تاوه ده‌یانویست خۆیانمان به‌سه‌را بسه‌پێنن‌و وه‌كو سه‌رباز مامه‌ڵه‌مان ده‌گه‌ڵ بكه‌ن، به‌ڵام زوو به زوو تێگه‌ییشتن كه سه‌روكاریان ده‌گه‌ڵ كێدایه، خێرا بایان دایه‌وه. ئه‌وانه‌ی كه به داب‌و نه‌ریتی زیندانه‌كه نامۆو بێگانه بوون، خودی زیندانییه‌كان، ڕامیان كردن‌و به‌داب‌و نه‌ریتی زیندانه‌كه‌یان ڕاهێنان. ته‌نانه‌ت ئه‌م كاره هه‌ندێ چیرۆك‌و ڕووداوی خۆشیشی لێكه‌وته‌وه. بۆ نموونه زیندانییه‌كان، یه‌كێك له ده‌رجه‌داره‌كانیان له خشته بردبووو عه‌ره‌قیان ده‌رخوارد دابوو، سه‌رخۆش بوو بوو، كه وه‌خۆ هاتبووه‌وه، زیندانییه‌كان قه‌ناعه‌تیان پێ هێنابوو، مادامێكی ئه‌ویش وه‌كو ئه‌وان خواردویه‌تیه‌وه، بۆی نییه ڕێگه‌ی ئاڵوویری عه‌ره‌قیان لێبگرێت. سه‌ره‌نجام كاتێ كه زیندانییه‌كان به قاچاغ‌و له ڕیخۆڵه‌دا عاره‌قیان ده‌هێنایه ناو زیندانه‌كه، ده‌ره‌جه‌داره‌كان خۆیان له گێلی ده‌داو چاوپۆشیان لێده‌كردن. ئیدی ده‌ره‌جه‌داره‌كانیش، وه‌كو سه‌ربازه نوقستانه‌كانی پێشوو، ده‌چوون بۆ بازاڕو نانی سپی‌و گۆشت‌و هه‌موو جۆره خۆراكێكی تریان، به‌مه‌رجێ قه‌ده‌غه نه‌بوایه، بۆ ده‌كڕین‌و بۆیان ده‌هێنانه‌وه بۆ زیندانه‌كه، ئیدی ئه‌مه بوو بوو به كارێكی ئاسایی. ئیدی من نه‌مزانی حیكمه‌تی ئه‌م گۆڕانكارییه چی بوو، بۆچی زیندانه‌كه‌مان بوو به زیندانێكی سوپایی. كه ئه‌م گۆڕانكارییه ڕووی دا من تازه دوو ساڵم ته‌واو كردبوو. یانی ده‌بوایه دوو دانه ساڵی دیكه له سایه‌ی ئه‌م سیستەمه تازه‌یه‌دا به‌سه‌ر به‌رم..

ئایا پێویسته له‌سه‌رم له‌م بیره‌وه‌رییانه‌دا سه‌راپای ئه‌و ژیانه بگێڕمه‌وه كه له زیندانیدا به‌سه‌رم برد ؟ نه‌خێر... من خۆم قه‌ناعه‌تم به‌وه نیه... خۆ ئه‌گه‌ر پێویست بوایه به‌ریز، هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی كه له‌م ماوه‌یه‌دا دیتبوومن‌و جه‌ربانده‌بوومن بگێڕمه‌وه‌و وه‌كو خۆی تۆماری بكه‌م، ئه‌وا قه‌باره‌ی ئه‌م كتێبه دوو چه‌نانه‌و سێ چه‌نانه‌ی ئێستا زیادی ده‌كرد، هه‌نگێ وه‌سفه‌كان زۆر دووباره ده‌بوونه‌وه‌و جوانی‌و له‌زه‌تی خۆیان له ده‌ست ده‌داو له زۆربه‌ی فه‌سڵه‌كاندا به شێوه‌یه‌كی ڕۆتینی‌و یه‌كهاوی دووباره ده‌بوونه‌وه، به تایبه‌تی ئه‌و خوێنه‌رانه‌ی كه له میانه‌ی فه‌سڵه‌كانی پێشوودا، وێنه‌یه‌كی ڕوونیان له‌مه‌ڕ ژیانی زیندانییانی ده‌سته‌ی دووه‌م له هزرو بیردا چه‌سپی بوو، بێزارو بێتاقه‌ت ده‌بوون. من ویستوومه له ڕێگه‌ی تابلۆیه‌كی زۆر وردو ڕوون‌و دروسته‌وه، زیندانه‌كه‌ی خۆمان‌و ئه‌وه‌ی به درێژایی ساڵانێكی زۆر له‌وێنده‌ر به‌سه‌رم هاتووه، به‌رجه‌سته بكه‌م. ئیدی نازانم ئاخۆ مه‌به‌ستم پێكاوه یان نا ؟ به‌هه‌رحاڵ من ناتوانم له مباره‌یه‌وه هیچ حوكمێك بده‌م به‌ڵام هه‌ستده‌كه‌م ده‌توانم لێره‌دا كۆتایی پێ بێنم. كه ئه‌م بیره‌وه‌ریانه هه‌ڵده‌ده‌مه‌وه، هه‌ست ده‌كه‌م هه‌رچی كۆنه عه‌زابی جارانه له ناخما بێدارده‌بێته‌وه‌و ده‌ست ده‌نێته بینم‌و هه‌ناسه‌م سوار ده‌بێت. هه‌ڵبه‌ته به‌شێك له‌و بیره‌وه‌ریانه، له زه‌ینمدا كاڵ بوونه‌ته‌وه‌و وه‌كو تاپۆو سێبه‌ران ده‌نوێنن. به‌ڵام دڵنیاشم زۆر شتم هه‌ر به یه‌كجاره‌كی له بیرچووه‌ته‌وه‌و به یه‌كجاره‌كی له مێشكمدا سڕاونه‌ته‌وه. ئه‌وه‌ی بیرم مابێ ئه‌وه‌یه كه ئه‌و ساڵانه زۆر به‌خاوی‌و

خەمناكی بورین، رۆژگار زۆر درێژ بوون، بە خاوی تێ دەپەڕین، دەتگوت دڵۆپەی پاش بارانەو تك تك لە بن میچان دەهاتە خوارێ. لە بیرمە كە ئارەزوویەكی زۆر بەهێز، ئارەزووی ڕابوون‌و ژیانەوە، ئارەزووو كەڵكەڵەی تازە بوونەوەو بەردەوام بوون لەسەر ژیان، تواناو بەهرەی خۆ راگری‌و چاوەڕوانی‌و سەبرو حەوسەڵەو هیواداربوونی پێ دەبەخشیم. سەرەنجام توانیم بەم ژیانە ڕابێم، هەموو رۆژێ چاوەڕوانی تەواوبوونی ئەم دەورانەم دەكرد، رۆژم دەژمارد، لەگەڵ تێپەڕبوونی هەر رۆژێكدا ئۆخژنێكی سەیرم بە دڵ‌و دەروونندا دەگەڕا. تەنانەت كاتێ كە هێشتا هەزار رۆژم لەبەردەما مابوو كە لەم زیندانەیدا بەسەر بەرم، دڵی خۆم بەوە خۆش دەكرد، دەمگوت گوێ مەدەیە، سبەینێ دەبێ بە نۆسەدو نەوەدو نۆ رۆژ، لە هەزار دێتە خوارێ..

هەروەها لە بیرمە لە كاتێكا، لە هەموو ئەم ماوەیەدا. لە نێو ئەو سەدان زیندانیەدا كە لە دەورم بوون، هەستم بە تەنیاییەكی بەسام دەكرد، ئیدی بەرە بەرە وام لێهات حەزم لەم تەنیایی‌و گۆشە گیرییە دەكرد. بەدەم ئەم تەنیایی‌و گۆشەگیرییەوە، ژیانی ڕابردووی خۆمم دەور دەكردەوە، وردو درشتی ژیانی خۆم شەن‌و كەو دەكرد. بە قووڵی بیرم لێدەكردەوە، زۆر بێڕەحمانە حوكمم لەسەر خۆم دەدا. زۆرجار سوپاسی قەدەرو چارەنووسم دەكرد كە بەهرەی ئەم تەنیایی‌و گۆشەگیرییەی پێ بەخشیوم كە ئەگەر ئەوە نەبوایە نەم دەتوانی بەو جۆرە دەربارەی خۆم قەزاوەت بكەم‌و بەو بێ منەتیە بە ناخی ژیانی ڕابردووی خۆمدا بچمەوەو ئەو دەمانە هەزارویەك هیواو ئاوات لە دڵم چەكەرەیان دەكرد! بیرم دەكردەوە، بڕیارم دەدا، سوێندم دەخوارد كە لە ئایندەمدا، هیچ یەكێك لە هەڵەو خەتاكانی رابردووم دووبارە نەكەمەوە. بەرنامەیەكی تەواوم بۆ ئایندەی خۆم دادەنا، بەڵێنم بە خۆ دەدا كە بەوپەڕی جددی ئەو بەرنامەیە جێبەجێ بكەم‌و بەموو لێی لانەدەم. باوەڕی تەواوم بەخۆم‌و بە توانای خۆم هەبوو كە ئەو بەرنامەیە ئەنجام دەدەم. ئیدی چاوەڕوانی ئازادی خۆمم دەكرد، زۆر بە تاسەی ئازادییەوە دەژیام. دەمویست هێزو توانای خۆم لە مەیدانی خەباتێكی تازەدا بجەڕبێنم. هەندێجار تاسەو كەڵكەڵەیەكی پڕ جۆش بەرۆكی دەگرتم‌و دەستی دەخستە بینم، هەناسەی سوار دەكردم. هەڵبەتە هەڵدانەوەو بێداركردنەوەی ئەم بیرەوەریانە كە جگە لە خۆم پەیوەندییان بە هیچ كەسێكی ترەوە نیە، بۆ من گەلێك پڕ سوێ‌و بە ئازارە... بۆیە تۆماریان دەكەم، چونكە پێموایە هەموو كەسێك دەتوانێ لێیان تێبگات،‌و هەر كەسێك لە تافی لاوی‌و هەڕەتی بەهێزیدا، ئەگەر نەگبەتی شانی بگرێت‌و دەستگیربكرێ‌و دە زیندان بخرێت، هەست بە هەمان ئەو شتانە دەكات كە من هەستم پێكردوون.

با لەوەی پتر بەتانی ئەم بابەتەدا نەچم‌و بۆ ئەوەی ئەم بیرەوەری‌و یاداشتانە بە شێوەیەكی كوت‌و پڕ كۆتاییان نەیەت، هەندێ شتی دیكەش دەگێڕمەوە.

پێموایە، رەنگە خەڵكانێك هەبن بپرسن ئایا هەڵاتن لە زیندان مەحاڵە، ئایا بە درێژایی ئەو ساڵانەی من لە زینداندابووم هیچ هەوڵێكی هەڵاتن رووی نەداوە ؟ وەكو پێشتریش گوتوومە، هەر زندانییەك كە دوو یان سێ ساڵی لە زینداندا گوزەراندو بەڕێ كرد، حیساب بۆ ئەو ماوەیە دەكات، حیساب بۆ زەرەرو قازانجی خۆی دەكات، وا بیردەكاتەوە مادامێكی دوو سێ ساڵێكی بەڕێ كردووە، قازانجی لەوەدایە پاشماوەی مەحكومیەتەكەی بەبێ هیچ ڕیسك‌و سەركێشییەك تەواو

بکاتو بە گوێرەی یاسا ببێ بە موهاجیرنشینێکی ئازاد. دیارە ئەوانەی کە وابیردەکەنەوە، زیاتر ئەو زیندانییانەن کە مودەتی مەحکومیەتەکەیان کەمە. بەڵام ئەوانە کە ماوەی حوکمەکەیان زۆرە، زۆرجار بیر لە هەڵاتن دەکەنەوەو ئامادەن هەر ڕیسکێك لەو پێناوەدا بکەن... بەڵام وێڕای ئەمەش هەوڵی هەڵاتن لە زیندانەکەی ئێمە زۆر کەم بوو. ئایا هۆی ترسنۆکی زیندانییەکان بوو، زەبتو ڕەبتی توندی سیستەمی سوپایی بوو، یان تۆبۆگرافیای شارەکە بوو کە کەوتبووە ناوەندی بیابانو دەشتێکی کاکی بە کاکیەوە، هەڵاتن هەروا ئاسان نەبوو ؟ نازانم... پێموایە هەموو ئەو فاکتەرانە دەوریان هەبوو... هەڵاتن لە زیندانەکەی ئێمە ئەستەم بوو. لە سەردەمی زیندانییەکەی مندا، تەنیا یەك جار دوو زیندانی کە هەردووکیان زیندانیی زۆر خەتەر بوون، هەوڵیاندا هەڵێن.

کە مێجەر دەستی لە کار کێشایەوەو ڕۆیی، ئا... ف ( شۆڤارو جاسوسی زیندانەکە ) بێ پشتو پشتیوان مایەوە. "ئا....ف" هێشتا گەنج بوو. بەڵام گەرمیو ساردی ڕۆژگاری چەشتبوو و قاڵ بوو بووەوە. کابرایەکی بێباك، بە وەرەو چاونەترسو، زۆر زیرەكو زیتەڵ بوو. ئەگەر ئازاد بکرایە، بێگومان دەستی بە کاری جاسوسیو شۆڤاریو دەستبڕیو پارە کێشانەوە لە خەڵکی دەکردەوەو بۆ ئەو مەبەستە هەر ڕێگەیەکی، چەند ناپیاوانەش بوایە، دەگرتە بەر، بەڵام ئەمجارە بە ئاسانی دەستگیر نەدەکرایەوە، چونکە لە زیندانا ئەزموونێکی زۆری پەیدا کردبوو. لە زیندانیشدا مومارەسەی تەزویر کردنی پاسپۆرتانی دەکرد. شارەزاییەکی باشی لەو بوارەدا پەیدا کردبوو. هەڵبەتە من زۆر لەمە دڵنیا نیم، چونکە بە چاوی خۆم شتی وام لێ نەدیتبوو، بەڵکو لە زیندانییەکانی دیکەم بیستبوو، بە قسەی زیندانییەکان، کە جارجار بۆ ماڵی مێجەر دەچوو، خۆی بە مووبەقەکەی ئەودا دەکردو لەوێندەر پاسپۆرتانی تەزویر دەکردو دەرامەتێکی باشیشی لەم کارە دەست دەکەوت. بە هەرحاڵ ئەم پیاوە ئامادەبوو لە پێناوی گۆڕینی چارەنووسی خۆیدا، هەر سەرکێشیو ریسکێك بکات. بە هەرحاڵ، من هەلی ئەوەم برەخسا کە لە نزیکەوە بیناسمو بچمە ناخی دڵو دەروونیەوە. بێ ئەدەبیو نامەردیو خوێڕیەتیو بێباکیو بێ ئامانی ئەم کابرایە لە ڕادەبەدەر بوو، پیاو قێزی لێی دەکردەوە.

سێ بەندییەکی وەها بوو، ئەگەر حەزی لە عەرەق بکردایەو هیچ ڕێگەیەك نەبوایە بۆ وەدەست هێنانی عەرەق، تەنیا پیاوکوژی نەبێ، ئامادە بوو بێ چەندوچوون لە پێناوی قاپێ عەرەقدا پیاوێك بکوژێت، بە مەرجێ کە کەس پێی نەزانیبا. لە زیندانەکەی ئێمەدا فێری ئەوەبوو کە حیساب بۆ هەموو شتێك بکات، هەر لەبەر ئەو وردیو وریاییەی بوو کە (کولیکوف)ی تاوانباری بەشی تایبەتی دۆستایەتی دەگەڵدا گرت.

پێشتر باسی ئەم (کولیکوف)ەم کردووە، هەرچەندە پیاوێکی میانە ساڵ بوو، بەڵام زۆر چالاكو چەلەنگو زیتو زیتەڵ بوو،و ژیانی لێدەچۆڕا. گەلێك بەهرەو توانای نائاسایی هەبوو. لەو پیاوانە بوو کە مل بۆ پیری نادەنو دەیانەوێ تا دوا هەناسە هەر بە گەنجی بژینو لە ژیان تێر نابن.

من پێم سەیربوو کە دەمبینی کولیکوف وەکو زیندانییەکانی دی ملی داوەتە خەتو هیچ هەوڵێکی هەڵاتن نادات، تومەز کولیکوف ژێراو ژێر بڕیاری هەڵاتنی دابوو. نازانم ئەم جووتە،

کامیان کاریگەریی بەسەر ئەویترەوە زیاتر بوو ؟ بەڵام پێدەچوو، لە هەموو شتێکدا هاوتای یەك بن، هیچیان لە هیچیان کەمتر نەبوو، کۆپی یەکتر بوون. بۆیە زۆر زوو بوون بە دۆستی یەکتر پێموایە کولیکوف چاوەڕوانی ئەوە بوو کە ئا....ف پاسپۆرتێکی قەڵبی بۆ دروست بکات. هەروەها (ئا...ف) کۆنە ئەسڵزادە بوو، سەر بە خانەدانانی کۆمەڵگە بوو، ئەمە خۆی لە خۆیدا دەرفەتێکی باشترو شانسێکی پتری بۆ ئەو جووتە پیاوە دەڕەخساند، ئەگەر بیان توانیبا خۆ بگەیەننەوە رووسیا. ئیدی هەر خوا دەیزانی ئەم جووتە لەسەرچی رێکەوتبوون‌و بە چ هیواو ئومێدێك بوون. بەهەرحاڵ ئەو هیواو ئومێدانە، گەورەتر بوون لە هیواو خەو خەیاڵی تەریدەو وێڵگەڕانی سیبیریایی، کولیکوف کە بە تەبیعەت ئەکتەرو لێبۆکێکی لێهاتوو بوو، دەیتوانی دەوری هەمە جۆر لە ژیاندا بدینیٚ‌و هەقی خۆی بوو بە بەهرەو تواناکانی خۆی پشت ئەستوور بێت. زیندان ئەو جۆرە خەڵکانە دەپوکێنێتەوە، خەفەیان دەکات. بۆیە ئەو جووتە لێبڕان کە لە زیندان هەڵێن.

بەڵام هەڵاتن بەبیٚ هاودەستی چاودێرو پاسەوان مەحاڵ بوو، بۆیە دەبوایە هاودەستی چاودێرێك مسۆگەر بکەن. لە یەکێك لە دەستە سوپاییەکانی نێو زیندانەکەدا پیاوێکی پۆڵاندی کەمێك پیر هەبوو، بەڵام بە گوڕو گورج‌و گۆڵ‌و چالاك‌و چەلەنگ‌و بیٚ پەرواو بێباك بوو، هەڵبەتە شایستەی چارەنووسێکی باشتر بوو. ئەمە بە گەنجی بۆ خزمەتی سەربازی، بۆ سیبیریا نێردرا بوو، دوای ماوەیەك، غەریبی نیشتمان دەکات‌و لە خزمەتی سوپایی هەڵدێت، دەگیرێت‌و پاش سزای جەڵدەو شەلاخان، حوکمی دوو ساڵ دەدریٚ‌و هەواڵەی سەربازگەی تەمێکاری دەکرێت. پاش ئەوەی حوکمەکەی تەواو دەکات دەی نێرنەوە بۆ فەوجەکەی خۆی، ئیدی ئاقڵ دەبێت‌و هێندە بە جدیی‌و دڵسۆزی مل بۆ خزمەتی سوپایی دەدات کە لە پاداشتی ئەو دڵسۆزییەدا دەیکەن بە سەر دەستەو عەریف. ئەم پیاوە زۆر بە خۆی دەنازی‌و متمانەو شانازی لە دەم‌و دووی دەخوێنرایەوە. من هەندێجار لە نێو ئەو سەربازانەدا دەم بینی کە چاودێریان دەکردین. پۆڵاندییەکانیش هەندیٚ شتیان لە بارەوە بۆ گێڕابوومەوە. لەوە دەچوو دەردی دوورە وڵاتی‌و غەمی غوربەت، کاریان تیٚ کردبیٚ‌و بوو بیٚ بە کەرب‌و کینەیەکی لە بن نەهاتوو. ئەم پیاوە لە هیچ شتێك نەدەپرینگایەوە، کۆڵدان‌و گەڕانەوەی لە مەزەبا نەبوو. ئامادەی هەموو کارێك بوو. کۆلیکوف، کە بە زیرەکی خۆی ئەو ریسککاری‌و سەرکێشییەی تیا بەدی کرد بوو، ئەوی بۆ ئەنجامدانی ئەم نەخشەو پلانە هەڵبژارد بوو. ئەم عەریفە نێوی کولیر بوو. ئیدی بە سیٚ قۆڵی تەگبیر دەکەن‌و رۆژی هەڵاتنەکەیان دیاری دەکەن. مانگی حوزەیران بوو، کەش‌و هەوای شار لەم مانگەداو بە تایبەتی لە وەرزی هاویندا یەك هەواو نەگۆڕە، ئەمە وەرزی باران بڕانە ، بۆ تەریدەو وێڵگەڕان‌و ئاواران یەکاو یەك بوو. هەڵبەتە زیندانییەکان نەیاندەتوانی یەکڕاست لە زیندانەکە وەدەربکەون‌و هەڵێن، چونکە شار لە زیندانەکەمانەوە دوور بوو، کەوتبووە بەرزی‌و چوار دەوری دەشتێکی راست‌و تەختانی بوو، هیچ بێشەو دارستانێکی لە نزیك نەبوو کە پیاو خۆی تیا پەنا بدات. بۆیە دەبوایە پێش هەموو شتێك جلەکانیان بگۆڕن. بۆ ئەم کارەش دەبوایە خۆیان بگەیەننە پەناگایەکی نزیکی شار کە کولیکۆف لە مێژ بوو ئەو پەناگایەی دابین کردبوو. ئیدی

نازانم ئاخۆ هاوڕێ دڵسۆزەکانی، لە دەوروبەری شاردا، ئاگایان لەم رازە هەبوو یان نا، هەر چەندە من لەمە دڵنیانیم، بەلاّم پێدەچوو ئاگاداربووبن. لە ماوەی ئەو ساڵەدا، کیژێکی گومان لێکراوی گەنج و جوان، بە نێوی فانیکا مانیکا، لە گۆشەیەکی ئەو دەڤەرەدا گیرسا بووەوەو دەست بە کار بوو بوو، ئەو کیژە وەعدو بەڵێنی زۆری دابوونێ کە لە دوای هەلاّتنی ئەوان، هەندێ لە بەڵێنەکانی خۆی بردبووە سەر. خەڵك و خوا " ئاگرو گڕ "شیان بەم کیژە دەگوت. بێگومان ئەو کیژە هاودەستی هەلاّتووەکان بوو، چونکە کولیکۆف ئامادە بوو لە پێناوی ئەودا خۆی بە کوشت بدات.

کە بەیانی، زیندانییەکان کۆکرانەوە تا دەستە دەستە جیا بکرێنەوەو بۆ سەر کار بنێردرێن، ئەو سێ برادەرە، بە جۆرێ ریزبوون کە دەگەڵ شیلکین دا بۆ سەر ئیش بنێردرێن. شیلکین زیندانی بوو، وەستای سپیکاری و گەچکاری بوو، ئیشی ئەوە بوو کە ئەو پایەگاو قاوشە سوپاییانە نۆژەن و گەچکاری بکاتەوە کە زیندانییە سەربازەکان دەمێ بوو چۆڵیان کردبوو. (کولیر)ش توانی کارێکی وەها بکات کە بە چاودێری ئەوانی دابنەن. چونکە بە پێی رێنمایی و دەستوور دەبوایە دوو سەرباز بۆ چاودێری سێ زیندانی دابنرێت، تازە سەربازێکی گەنجیان بەگەڵ عەریف کولیر خست، تا هەم فێری کاروبارە سوپاییەکان ببێ و هەم یارمەتی عەریف کولیر بدات. دیارە دەبێ ئەم دوو زیندانییەی کە لێڕابوون هەڵێن و برەڤن، کاریگەرییەکی زۆریان بەسەر (کولێری) دنیادیدەو زیرەکەوە هەبووبێ، دەنا چۆن دەیانتوانی بەو ئاسانییە پیاوێکی دنیا دیدەو پوختەو زیرەك، دەرجەدارێکی جددی و هێمن کە هەمووی چەند ساڵێکی کەمی مابوو خزمەتی سوپایی تەواو بکات و مەرەخەس ببێ، بێننە رەداو ڕیشی خۆی بداتە دەست ئەوان.

ئەمانە، واتە هەر سێ زیندانییەکەو هەردوو چاودێرەکە سەعات شەشی بەیانی دەگەنە پایەگاکە. چۆڵ و هۆڵ، جگە لەوان کەسی تری لێنابێت. دەست بەکار دەکەن، پاش سەعاتێك کولیکۆف و ئا...ف بە (شیلکین)ی هاوڕێیان دەڵێن کە ئامێرێکی کارکردنیان لە بیرچووەو دەچن لە کارگەکە (وەرشە) دەیهێنن. دەبوایە زۆر وریایانەو بە شێوەیەکی ئاسایی مامەڵە دەگەڵ شیلکین دا بکەن تا گومانیان لێنەکات. شیلکین، وەستاو بەنایەکی لێهاتوو، مۆسکۆیی بوو، زیرەك و وریایەکی کەمدوو بوو، زۆر لاوازو باریك و بنێس بوو. بۆ ئەوە دروست بوو بوو بە چاکەت و پانتۆڵەوە، لە دوکانێکی شاری مۆسکۆدا دابنیشێت و دوکانداری بکات، بەلاّم دەگەڵ قەدەرو چارەنووسدا چ دەکرێ، ئەوەتا ئێستا دوای گەڕانێکی زۆر سەرەنجام، بۆ هەمیشە لە بەشی تایبەتی زینداندا، یانی لە نێو خەتەرناکترین مەحکوومانی دەزگای دادڤانی سوپایی دا گیرساوەتەوە. من هۆو سەرچاوەی ئەم چارەنووسە خەمناکەی ئەو نازانم، لێ شیلکین هیچ جۆرە بەدخوایی و شەڕەنگێزییەکی نەدەنواند، زۆر بە هێمنی و سەلامەتی و بێوەیی لە زیندانەکەماندا دەژیا. ناوبەناو هەندێك ناشیانە دەیخواردەوەو مەست دەبوو، لەوە بترازێ هیچ عەیبێکی تری نەبوو. هەڵبەتە کولیکۆف و جماعەتەکەی نەخشەکەی خۆیان پێ نەگوتبوو، دەبوایە چەواشەی بکەن. کولیکۆف، چاوێکی لێ داگرتبوو و وای تێگەیاند بوو کە دوێ شەو قاپێ ئارەقیان لە کارگەکە شاردووەتەوەو بۆیە بۆ ئەوێندەر دەچن تا ئەو ئارەقە بێنن. بەو جۆرە (شیلکین)ی

فریودا، کەمترین گومانی لێنەکرد. وەستا شیلکین و گەنجە تازە سەربازەکە بە دوو قۆڵی مانەوە، (کولیکۆف و ئا....ف)ش بە چاودێری کولیر بەرەو ئاوەدانییەکەی قەراخ شار وەڕێکەوتن و دوور کەوتنەوە.

نیو سەعاتێك بوری و جماعەت نەگەڕانەوە. شیلکین کە زۆری لەم جۆرە واریقات و رووداوانە دیتبوو، کەوتە بیرکردنەوە، زۆری بیرکردەوە، لە پڕ ئەوەی بیرکەوتەوە کە باری دەروونی کولیکۆف ئاسایی نەبوو، دوو جاران چاوی لە (ئا....ف) داگرتبوو و بە چپە دواندبووی. شیلکین تازە هەموو شتەکانی بیردەکەوتەوە. "کولیر"یش سەرنجی راکێشا بوو. پێش ئەوەی دەگەڵ جووتە زیندانییەکەدا بکەوێتە ڕێ، گەنجە تازە سەربازەکەی بانگ و ئامۆژگاری کردبوو کە دوای ئەو چی بکات و چی نەکات، دیارە ئەم کارەی ئەو شتێکی نا ئاسایی بوو. ئیدی شیلکین تاپتر بیری دەکردەوەو چینەی لە یادگەی خۆی دەکرد، گومانی زیاتر دەبوو. کە کات درەنگ بووو کەس نەگەڕایەوە، ئیدی گومان بەجارێ زۆری بۆ هێنا، دەیزانی بە هۆی ئەم کارەو چ مەترسییەکی دێتە ڕێ، لەگێن بوو ئیدارەی زیندان گومان لەو بکەن، بەوە تاوانباری بکەن کە هاودەستی هەڵاتووەکان بووەو ڕێگەی داون هەڵێن، ئەگەر فریا نەکەوێ و زوو بە زوو ئیدارە ئاگادار نەکاتەوە، ئەوا شتەکە لە گومان دەردەچێت و بەسەر ئەودا ساغ دەبێتەوە. کەواتە پێویستە تا زووە فریا بکەوێ و ماتەڵ نەبێ. هەنگێ بیری کەوتەوە کە لەو دواییانەدا کولیکۆف و ئا...ف زۆر رمووەدەی یەکتر بوو بوون و زۆرجار پێکەوە دەکەوتنە فسکە فسك و دەچوونە پشت قاوش و پایەگاکان و دوور لە چاوی خەڵکی خەریکی پیلان و تەگبیران دەبوون. تەنانەت ئەوەشی بیر کەوتەوە کە پێشتریش ئەو گومان و مەزەندەیەی لەلا هەبووە کە لەگینە شتێکیان لە ژێر سەردا بێ... شیلکین تەمەشایەکی سەربازە چاودێرەکەی کرد. خۆی دابوو بەسەر تفەنگەکەیداو بەدەم باوێشکەوە سەری قامکی لە کەپوویدا دەگێڕا. ئیدی شیلکین بۆ ئەوەی لە خەیاڵی نەدات، دڵی نایەت گومانەکەی خۆی بۆ ئاشکرا بکات، تەنیا داوای لێکرد کە لەگەڵیا تا کارگەکە بڕوات. دەیویست بزانێت کە ئاخۆ هاوڕێکانی چوون بۆ ئەوێندەر یان نا، ئاخۆ کەس دیتوونی یان نا. کە بۆی دەرکەوت کەس نەیدیتوون، ئیدی گومانەکانی بوون بەڕاست. شیلکین لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەگەر تەنیا بۆ مەی نووشی و رابواردن بۆ ئەوێندەر چووبان، وەکو هەندێجار کولیکوف ئەو کارەی دەکرد، هەڵبەتە بە منیان دەگوت. چونکە ئەمە شاردنەوەی بۆچییە ؟" کە شیلکین گەییە ئەم قەناعەتە، یەکسەر لەوێندەرەوە، بێئەوەی بگەڕێتەوە بۆ سەر کارەکەی، بەرەو زیندان دایکێشا. دەوروبەری سەعات نۆی بەیانی بوو کە شیلکین گەییشتەوە زیندان، یەکسەر خۆی بەلای عەریف خەفەردا کرد، حاڵ و حیکایەتەکەی لە سیری تا پیازی بۆ گێڕایەوە. یارۆ زۆر ترسا، لە هەوەڵەوە باوەڕی نەدەکرد. شیلکین رووداوەکەی وەکو گومانێك بۆ باس کرد بوو، ئەویش بەلەز رۆیی بۆ لای مێجەر، مێجەریش بەلەز خۆی دەگەیەنێتە فەرماندارو هەواڵەکەی پێ دەگەیەنێت. دوای چارەکە سەعاتێك بڕیاری پێویست درا. راپۆرتێك لەمبارەیەوە بۆ فەرمانداری گشتی بەرزکرایەوە. چونکە ئەم جووتە زیندانییە لە زیندانییە خەتەرەکان بوون، ئەگەری ئەوە هەبوو لە پترسبۆرگەوە فەرمانی سزایەکی قورس بۆ ئیدارەو کارگێڕانی زیندانەکە دەربچێت و

زۆر بەتوندی سەرکۆنە بکرێن. ئا.. ف، ئەگەر راست بێ یان درۆ، یەکێك بوو لە زیندانییە سیاسییەکان. (کولیکوف)ش زیندانی (بەشی تایبەتی) بوو، واتا لە تاوانبارە گەورەکان بوو، ئەمە جگە لەوەی کۆنە سوپایی بوو. تا ئەو کاتە هیچ کەسێك نەیتوانی بوو لە زیندانی (بەشی تایبەتی) هەڵێت. هەنگێ سەرپەرشتیارەکان بیریان کەوتەوە کە بەپێی دەستورو رێنماییان دەبێ هەر زیندانییەکی بەشی تایبەتی کە بۆ بێگار دەردەکرێ، دوو پاسەوانی بەگەڵ بخرێت. جا ئەم یاساو رێسایە رەچاو نەکرابوو، بۆیە لەگێن بوو ئەم سەر پێچی و خەمساردیە زۆر خراپ بەسەر گشت فەرمانبەران و کارگێرانی زیندانەکەدا بشکێتەوەو قورەکە خەست تر بکاتەوە. ئیدی بەلەز قاسیدو تاقیبکاران بۆ هەموو گوندو شارەدێو باژێرۆکانی دەوروبەری شار بەرێ کران. هەواڵی هەلاتنی زیندانییەکان بە هەموو شوێنەکان ڕاگەیەنرا. ناوو نیشانیان بە هەموو کەسێك دراو ژمارەیەك سەربازی قۆزاقیان بۆ تاقیبودۆزینەوەیان نارد. خێرا خەبەر بە گشت بەڕێوەبەرایەتی و هەرێمەکانی دەوروبەر درا. بە کورتیەکەی ترس و پەریشانیەکی زۆر هەموو لایەکی گرتەوە.

مقۆ مقۆو هەراو هەنگامەی ناو زیندانەکەش، لە هی دەرێ کەمتر نەبوو. هەواڵەکە دەماودەم دەگەڕا، کە زیندانییەکان دەستە دەستە لە کار دەگەڕانەوەو بە هەواڵەکەیان دەزانی. لە دڵی خۆیانداو ژێراو ژێر کۆلێك خۆشحاڵ دەبوون... ئەم هەواڵە جگە لەوەی رۆتینیەتی ژیانی زیندانی دەرەواندەوە، جۆرە دڵخۆشییەکیش بوو بۆ زیندانییەکان، هەواڵ، هەواڵی هەلاتنە، گاڵتە نیە، بۆیە ئاساییە لە سەرانسەری زیندانەکەدا ڕەنگ بداتەوە، دڵی خەڵکی خۆش بکات و دەماری زیندانییەکان بجولێنێ. هیواو ئاوات و متمانەیان لە دڵو دەروونیدا ببوژێنێتەوەو هەست بکەن "گۆڕینی چارەنووسی" مەحاڵ نیە. لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت: "بۆچی ئەوان بتوانن هەڵێن، ئێمە نەتوانین... بۆچی چمان لەوان کەمترە ؟.." هەرکەسەو لە ژێر کاریگەریی ئەم بیرۆکەیەدا راست دەبووەوەو نیگایەکی پڕ هاندانی هاوڕێکەی خۆی دەکرد. هەموو زیندانییەکان هەستیان بە جۆرە غروور شانازییەك دەکردو، بە چاوی سووك دەیانڕوانییە دەرەجەدارەکان، ئیدی زوو بەزوو هەموو بەرپرسەکان، بە خودی فەرمانداریشەوە رژانە ناو زیندانەکە. زیندانییەکان هەموو سینگیان دەرپەڕاند بوو، کرۆکپ و، چاو نەترس و، ورە بەرز تەمەشای بەرپرسەکانیان دەکرد، زمانحاڵی نیگایان دەیگوت: "ئێمەش دەتوانین هەمان کاربکەین، ها؟". زیندانییەکان پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە بەرپرسەکان بە تەمای پشکنینی گشتین.و لەم حاڵەتانەدا خوا خوای بیانوویەکیانە، بۆیە خێرا هەموو شتێکیان دەشاردەوە. پێشبینی زیندانییەکان دروست دەرچوو. پشکنین و تەحەری دەستی پێکرد، زیندانەکە ژێرو ژوور کرا، هیچ شوێنێ نەما زۆر بە وردی نەپشکنرێت، بەڵام هیچ شتێك نەدۆزرایەوە.

دوای نیوەڕۆ، زیندانییەکان بۆ بێگار نێردرانەوە، ژمارەی پاسەوان و چاودێرەکانیان کرد بە دوو هێندەی جاران. شەوێش ئەفسەران و دەرەجەدارانی خەفەرو پاسەوان، هەر سا نا ساتێ خۆیان بە ژوورو قاوشەکاندا دەکردو یەك یەك دەیان پشکنین. بە پێچەوانەی رەوشی باوەوە، دوو جارانیان بۆ سەر ژمێری ریزکردین، دوو جار لەسەر ژمێریەکەدا هەڵەیان کرد، ئەمە هێندەی

دی ڕەوشەکەی شڵەقاند، بۆیە هەموویان بردینە نێو حەوشەکە تا سەر لە نوێ سەر ژمێرمان بکەنەوە. دوای ئەوەو جارێکی دی لە نێو قاوشەکەشدا سەرژمێریان کردینەوە.

بەڵام ئەم پەشێویە زیندانییەکانی نیگەران نەکرد. وا خۆیان دەنواند کە نە خەمی ئەوانەو نە گوێیان لێیەتی. شەوەکەیان زۆر بە ئارامی بەسەر بردو هیچ سەریەشەیەکیان بۆ خۆ دروست نەکرد. لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت: "لە شەڕ دەگەڕێن، بەڵام نابێ هیچ بیانوویەکیان بدەینە دەست !" بەرپرسەکانیش لە دڵی خۆیاندا دەیانپرسی: "ئایا لە نێو ئەمانەدا هاودەستیان نییە؟ پاشدزەکانیان لێرەنین ؟!" بۆیە بە دزییەوە خەفۆ چاودێریان بە سەرەوە دانایین تا بزانن چی دەکەین و چی دەڵێین، بەڵام ئەم کارە دادی نەدان. زیندانییەکان بەخۆشحاڵیەوە، لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت: "ئەوانە هێندە کەر نین خەڵکی لە دوای خۆیان بەجێ بێڵن !" "پیاو کاری وا گەورەی بەدەستەوە بێ، رازی خۆی بە کەس ناڵێ !" "خەڵکی وەکو کولیکۆف،و ئا... ف، هیچ شوێنەوارێك لە دووی خۆ جێ ناهێڵن، ئەوانە لە شوێنێ ناخەون ئاو بێتە ژێریان، رێوین خۆ لە جێی خوڕان نادەن! ئەوانە خەڵکانێکن ئەگەر بیانەوێ بە کونی دەرزییەوە دەچن! گرەویان لە شەیتان بردووەتەوە !". قەدرو قیمەتی کولیکۆف و ئا....ف لە لای زیندانییەکان سەد قات بەرز بووەوە، شانازیان پێوە دەکردن. هەستیان دەکرد کە هەواڵی ئەم سەرکێشی و ریسکە دەبێ بە داستان و دەکەوێتە سەر زاری گەورەو بچووکی مەردم و نەوە بۆ نەوەی دەگێڕێتەوەو هەتا هەتایە دەمێنێ.

یەکێك دەیگوت:

– ئەوەیە ئەقڵ، قوربانی ئەو ئاوەزەتان بم!

یەکێکی دی:

– ها! خۆ دەیانگوت مەحاڵە کەس بتوانێ لێرە بڕەڤێ... ئەدی ئەوانە چۆن هەڵاتن !

زیندانییەکی دی بە تەوسەوە هەڵدەداتێ:

– راستە، بەڵام دەزانی ئەوانەی هەڵاتوون کێن ؟ دایك دانیشێ و رۆڵەی وا بێنێ! تۆ دەتەوێ خۆ بێنیتە ریزی ئەوان ؟ بە تۆزی پێیانیشدا ناگەی!

ئەگەر کاتەکەی کاتێکی دیکە بوایە، ئەو زیندانییەی کە بەو جۆرە وەڵام درایەوە، هەرگیز بێدەنگ نەدەبوو،و بەرگری لە خۆی دەکردو بەگژ بەرانبەرەکەیدا دەچووەوە. بەڵام ئەمجارە بێدەنگ بوو و بە شەرمێکەوە گوتی: "راستە! هەموو کەسێك کولیکۆف نییە، پیاو دەبێ بە کردەوە، پیاوەتی خۆی بسەلمێنێ !...."

زیندانییەکی دیکە کە تا ئەو دەمە کڕوکپ گوێی لە قسەکان دەگرت و بە هێمنی لەبەر پەنجەرەی مووبەقەکە دانیشتبوو، بەسەری قامکان گۆنای خۆی خوراندو بە دەنگێکی نەرمی سازگاری ئاوێتە بە شادمانیەکی پەنهان گوتی:

– ئەرێ بە راست کوڕینە، ئێمە بۆچی لێرە بمێنین ؟ ئاخر چی بکەین لێرە ؟ ئێمە زندووی مردووین، مردووی بێ کفن و گۆڕین، وا نییە ؟!

یەکێك لە زیندانییەکان بەرسڤی دایەوەو گوتی:

– گلەیی چی دەکەی ؟ خۆ زیندان پێڵاو نییە خێرا لە پێتی دابکەنیو توڕی بدەیتو تەواو. ئێمە لێرە بەستراوینەتەوە....

زیندانییەکی گەنجی بێ ئەزموونی خوێنگەرم هەڵیدایە:

– چما کولیکۆف زیندانیی نەبوو! ئەدی هەڵنەهات ؟

زیندانییەکەی پێشوو، مۆڕەیەکی لە زیندانییە گەنجەکە کردو گوتی:

– کولیکۆف! کولیکۆف! خەڵکی وەکو کولیکۆف زۆر کە من گیانی من...

– ئەدی ئا...ف؟ بەڕاستی ئازایە!

– ئۆ! ئەوە هەر باسی مەکە، ئەگەر خۆی بیویستایە دەی وەکو کولیکۆڤ دەخستە گیرفانییەوە!

– خۆزگە دەمزانی، ئاخۆ دوور کەوتوونەتەوە ؟ زۆر مەراقمە ئەمە بزانم!....

ئیدی سەری قسە کرایەوە. "ئاخۆ ئێستا لە شارەوە دوورن؟ لە کوێندەرەوە هەڵاتوون؟ چ ڕێییەکیان گرتووەتە بەر؟ کام ڕێگە بۆ ئەوان باشترە ؟ کام بازێڕۆك نزیکە ؟". ئیدی ئەو زیندانییانەی کە شارەزای ئاوەدانییەکانی دەوروبەری شار بوون کەوتنە قسەو ئەوانی دی بە تاسەوە کەوتنە گوێ گرتن. کە باس هاتە سەر خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری شار، هەموو گوتیان کە خەڵکی باش نین،و هەموو ئاکنجیانی نزیکی شار، ئیشی خۆیان دەزانن،و ئامادەنین داڵدەی زیندانییانی هەڵاتوو بدەنو کۆمەکیان بکەن، بگرە ئەگەر بۆیان بکرێ، دەستگیریان دەکەنو ڕادەستی حکومەتیان دەکەن.

– خۆزگە دەتان زانی ئەو جووتیارانە چەند گڵاون! چەند ناڕەسەنو بەدکارن! هەر حەیوانێکن لەو گۆڕە!

– جووتیاری هیچو پووچو نامەردن!

– خەڵکی سیبیریا، شیرحەرامێکی وەهان، لە هیچ شتێك ناپرینگێنەوە، پیاو کوشتنو ئاو خواردنەوەیان لە لا یەکە، غەریبەیەکیان بەردەست بکەوێ، بە کەوڵ کردن کەوڵی دەکەن!..

– بەڵام برادەرانی ئێمە...

– ئیدی... با بزانین کێ سەر دەکەوێ... برادەرانی ئێمە لە هیچ ناترسن، باکیان بە هیچ نییە.

– بە هەرحاڵ، کەسێ نەمرێ، هەواڵیان دەبیستینەوە!

یەکێك لە زیندانییەکان گوتی:

– تۆ پێت وایە، بتوانن بیان گرن ؟

یەکێك لە زیندانییەکان، کە تەواو جۆشی سەند بوو، مشتێکی بەسەر مێزەکەدا کێشاو گوتی:

– من دڵنیام، تازە هەرگیز ناگیرێن!

یەکێکی دی گوتی:

– ئەمە پەیوەندی بەو ڕەوشەوە هەیە کە دێتە پێشێ...

سکوراتۆف هەڵیدایە:

– برادەرینە، پێموایە ئەگەر من لە زیندان هەڵێمو بڕەڤم، بە عەمرانتم دەستگیر ناکرێمەوە!

یەکێك لە زیندانییەکان پرسی:

– تۆ ؟

زیندانییەکانی دی لە قاقای پێکەنینیان دا، هەندێکی تریان خۆیان لە گێلی داو وایان نواند کە نایانەوێ گوێیان لە قسەکانی ببێ، بەڵام سکوراتوف دەست بەردار نەبوو، لەسەری رۆیی و گوتی:

– زۆر جار لە دڵی خۆمدا دەڵێم ئەگەر هەڵێم هەرگیز نایەڵم دەستگیر بکرێم. ئەگەر لە کونی مشکیشدا خۆم شاردووەتەوە، نایەڵم دەستی دژمنم بگاتێ !

– ئەوەندەت زەحمەتە تا برسێتی زۆرت بۆ دێنێ، هەنگێ بەپێی خۆت دەچی بۆ لای جووتیارێك‌و سواڵی نانی لێدەکەی !

دیسان لە قاقای پێکەنینیان دایەوە.

سکوراتۆف گوتی:

– سواڵی نان ؟ درۆزن!

– خۆت درۆزنی، ئەم فشە فشە چیە ؟ ئەدی هەر تۆ نەبوویت دەگەڵ هاپۆ (ڤاسیا)تدا جووتیارێکتان کوشتبوو لەسەر ئەوەی گوایە دوعای مەرگی لە مانگایەك کردبوو و مانگاکە مردبوو، ئەگەر ئەوە نەبوایە ئێوە ئیشتان چی بوو لێرە ؟ بۆ ئێستا لە زینداندا دەبوون ؟

زیندانییەکان لە قاقای پێکەنینیان دایەوە. سکوراتۆف هاواری کرد:

– درۆ دەکەی! میکیتکای دوو زمان ئەم درۆیەی بۆ گێڕاونەتەوە. من لەو مەسەلەیەدا نەبووم هاپۆ ڤاسیا، جووتیارەکەی کوشتبوو نەك من، ئێوە بە ناهەق منتان تێوە گلاندووە! من بابایەکی مۆسکۆییم‌و لە منداڵیمەوە تەریدەو چەتە بووم. با شتێکتان بۆ بگێڕمەوە کاتێ کە منداڵ بووم‌و ڕەبەنی کڵێسا دەیویست فێری نوێژو دوعا خوێندنم بکات، گوێی ڕادەکێشام‌و دەیگوت: "بڵێ خودایا،لە رەحمی خۆت بێ بەشم مەکە، خودایا بە کەرەمی خۆت رەحمم پێ بکە!" منیش لە دوایەوە دەمگوتەوە: "خودایا، بە کەرەمی خۆت بۆ زیندانم بنێرە!"، هەرکە سەرم لە هێلکە جووقاوە وا بووم.

هەموو زیندانییەکان لە قاقای پێکەنینیان دا. ئەمە رێك ئەو شتە بوو کە سکوراتوف بۆی دەگەڕا. هەموو حەزو هیوایەتێکی پێکەنین‌و حەنەکبازی بوو! لیبۆکێك بوو لەو گۆڕە! بەڵام زیندانییەکان هەر زوو گەڕانەوە سەر باسە جددیەکەی خۆیان، بە تایبەتی ئەوانەی کە تەمەنێکیان هەبوو و شارەزاییان لە مەسەلەی هەڵاتن‌و ڕەڤیندا هەبوو، زیندانییە گەنجەکان بە هێمن‌و کونجکاوی، ملیان قوت دەکردەوەو بە خۆشحاڵییەوە چاویان دەبڕییە دەم‌و زاریان‌و گوێیان لە قسەکانیان دەگرت. خەڵکێکی زۆر لە ئاشخانەکەدا کۆبووبوونەوە. تاقە یەك کەس لە چاودێرو دەرەجەدارەکان لەوێ نەبوو، دەنا زیندانییەکان نەدەوێران بەو ڕاشکاوییە کۆڕی قسەو باسان گەرم بکەن. لە نێو ئەو کەسانەدا کە خۆشحاڵیان دەردەبڕی، چاوم بە تاتارییەك کەوت بە نێوی مامتیکا، ئەم پیاوە، کورتە باڵایەکی گۆنا زەق‌و ڕەقی گوپ قوپاوی ڕواڵەت کۆمیدی بوو، بە حاڵ رووسی دەزانی،و بە ئاستەم لە قسەی رووسی زمانان دەگەیی، کەچی لە هەموو ئەوانی

دیکە زیاتر گوێی هەڵدەخستو کەیفی بە قسەکان دەهات. سکوراتۆف کە لە سوچێکەوە کزکۆڵەی کردبوو، ئاوڕی لێی دایەوەو گوتی:

– ها مامیتکا یاکشی (باشە) ؟

مامیتکا کەللە ئەستوورەکەی لەقاندو بە گەرمی گوتی:

– یاکشی! ئا... یاکشی!...

– نایان گرن ؟ یۆك ؟

مامیتکا، بەدەم سەر لەقاندنو دەست جوڵاندنەوە گوتی:

– یۆك! یۆك !....

– ئەگەر درۆ بکەی دوایی خۆم دەزانم چیت پێدەکەم ها ؟

مامیتکا بەد ەم سەر لەقاندنەوە گوتی:

– یاکشی، یاکشی !

سکوراتۆف، چەپۆکێکی ئەوتۆی بەسەریا کێشا کە کڵاوەکەی هێنایە سەرچاوی و گوتی:

– دەیسا.... هانێ ئەم (یاکشی)یە بگرە!...

ئەوجا، بەوپەڕی شادمانی لە ئاشخانەکە وەدەرکەوت،وکابرای تاتاری بەسەرسامیو هەپەساوی لەوێندەر بەجێهێشت!....

بۆ یەك هەفتەی تەواو ئەوپەڕی زەبتو رەبت لە زیندانەکەدا بەکاربرا. گەڕان بە دوای هەڵاتووەکاندا، لە گوندو باژێرۆکەکانی ئەو دەوروبەرە بەردەوام بوو. زیندانییەکان ئاگایان لە هەر نەخشەو بڕیارێکی حکومەت بوو دەرهەق بە هەڵاتووەکان، نازانم ئەمەیان چۆن دەزانی!... لە رۆژانی سەرەتادا، هەواڵەکان دڵخۆشکەرە بوون، بە قازانجی هەڵاتووەکان بوو: لە هیچ شوێنێکەوە سەرو سۆراخیان نەبوو، کەس نەیدەزانی ئەرز قووتی داون، ئاسمان هەڵی کێشاون! زیندانییەکان لە دڵی خۆداو لە بەینی خۆیاندا گاڵتەیان بە بەرپرسەکان دەکرد، ئیدی لە چارەنوسوی هاوڕێکانیان دڵنیا بوونو هیچ نیگەرانییەکیان لەو بارەیەوە نەبوو. هەر زیندانییەك قسەیەکی دەکرد:

"نا، نایان دۆزنەوە! تازە تەواو، هێز نییە دەسگیریان بکات !".

"تازە وەکو گوللە بۆی دەرچوون !"

"خوا حافیزیان بێ، وانییە ؟".

ئێمە دەمانزانی کە حکومەت خەبەری بە هەموو جووتیارانی دەوروبەر داوەو جووتیاران کون بە کون بە دوایانەوەنو هەرچی دارستانو پەناو پاسارو شیوو دۆڵی دەڤەرەکە هەیە بە دوایاندا دەگەڕێن. زیندانییەکان بەدەم ژارخەنەوە دەیانگوت:

– بێ فایدەیە ! بێگومان پێشتر پەناگەیەکیان بۆ خۆ پەیدا کردووە! خوا دەزانێ هەنووکە لای کێ خۆیان پەنا داوە؟

– بێگومان! ئەوانە خەڵکی ئاقڵن، پێشوەختە هەموو تەگبیرێکیان کردووە!

ئیدی پەت بۆ هەموو جۆرە گریمانەو خەیاڵێك شلكرا، هەندێك وایان وێنا دەكرد كە: هەڵاتووەكان لەگینە هێشتا لە دەوروبەری شاردا بنو خۆیان لە ئەشكەوتێكدا شاردبێتەوەو چاوەڕوانی ئەوەبن، ئەم هەراو زەنایە بنیشێتەوەو تۆزێ سەرو ریشیان بێتو نەناسرێنەوەو ئەوسا لە پەناگەكەیان بێنە دەرێو درێژە بە رێڕەوی خۆیان بدەن... لەوەیە ئەم كارە شەش هەیڤان بخایەنێ..

بەمجۆرە هەركەسەو بەدەم خەیاڵەوە چیرۆكو حیكایەتێكی بۆ خۆی دروست دەكرد. لە پڕو دوای هەشت ڕۆژان، دەنگویەك داكەوت كە شوێن پێی هەڵاتووەكانیان هەڵگرتووەو بە دوایانەوەن. هەر زوو ئەم هەواڵە بە درۆ خرایەوە، بەڵام بۆ شەوێ هەمان دەنگۆ سەری هەڵدایەوە. زیندانییەكان زۆریان لەبەر گرانو ناخۆش بوو. بۆ سبەی بەیانی خەبەر لە شارەوە هات كە هەڵاتووەكان دەستگیركراونو بەڕێوەن كە بۆ زیندانیان بێننەوە. دوای نیوەڕۆ هەواڵی تازەتر گەییە زیندان: گوایە لە گوندێكی چكۆڵەی هەفتا فەرسەخی شاردا دەسگیركراون. ئەنجام هەواڵی ڕاستو دروست گەیی. سەرگروبانی زیندانەكە كە تازە لەلای مێجەر هاتبووە، ڕای گەیاند كە ئەمشەو هەڵاتووەكان، دەگەیەننە قەرەوڵخانەكەی زیندان. كەواتە هیچ گومانێك دەربارەی دەسگیركردنەوەیان نەما. مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێ ئەم هەواڵە چ كارێكی ناخۆشی لە زیندانییەكان كرد، بەڕاستی لەوەسف كردن نایەت. لە سەرەتادا زۆر نیگەرانو توڕە بوون، جمو جۆڵێكی زۆریان تێكەوت، بەڵام زۆری نەبرد كە دامركانەوەو بێدەنگ بوون. ئەوجا بەرە بەرە كەوتنە ریشخەنو تانەو تەشەر. ئەمجارە تانەو تەشەریان لە حكومەت نەدەدا، بەڵكو لە هەڵاتووەكانیان دەدا .لە سەرەتاوە چەند كەسێكی كەم دەستیان بە تانەو تەشەران كرد، پاشان هەموو ئەوانی دیكەش بە گەڵیان كەوتن، تەنیا یەك دوو زیندانی سەلارو سەنگین نەبێ، كە ئەقڵیان هیچ هەراو هەنگامەو تەوسو توانجێكی نەدەبڕیو خۆیان تێكەڵی ئەو شتانە نەدەكرد. زیندانییەكان، لە سەرەتاوە بە چ جۆشو خرۆشو گەرمو گوڕییەكەوە كەوتبوونە ستایشو پیاهەڵدانی كولیكوفو ئا... ف ،بە هەمان نەفەسەوە بایان دایەوەو كەوتنە زەمو سەرزەنشتو پێ ڕابواردنیان. وەكو ئەوەی نامەردییەكی گەورەیان دەرهەق بەوان كردبێت. تەنانەت زیندانییەكان بە تەشەرەوە ئەوەیان دەگێڕایەوە كە ئەو جووتە بەرگەی برسێتیان نەگرتووەو بۆ سواڵی نان خۆیان بە گوندێكدا كردووە، كە ئەمە بۆ كەسی تەریدەو یاخی ئەو پەڕی شەرمەزاریو بچووكییە. بەڵام ئەم چیرۆكو حیكایەتانە، فریان بە ڕاستیەوە نەبوو. هەڵاتووەكان كە هەستیان كردبوو، شوێن پێیان هەڵگیراوەو بە دوایانەوەن، بۆ ڕێ گومكێ خۆیان بەبێشەیەكی چڕوچوغووردا كردبوو، بەڵام تاقیبكارەكان زوو فریا كەوتبوون ئابلۆقەیان دا بوون، هەڵاتووەكان كە دیتبوویان هیچ مەفەڕێكیان نیە، ناچار خۆیان ڕادەستی تاقیبكاران كرد بوو. وەختێ شەوێ جەندرمە كولیكوفو ئا..ف) یان بە دەست و پێ بەستراوی گەیاندە قەرەوڵخانەی زیندانەكە، هەموو زیندانییەكان رژانە نێو حەوشەكە تا ببینن چ لە هاوڕێكانیان دەكەن. سەیریان كرد گالیسكەكانی فەرماندارو مێجەر لەبەر بارەگای پاسەوانەكان (قەرەوڵخانە) وەستاون. هەڵاتووەكانیان داگرت، زنجیرو پێوەندیان لە دەستو لاق كردن، ئامادەیان كردن كە سبەینێ بۆ

دادگایان بنێرن. کە زیندانییەکان بە حەقیقەتی بویەرو رووداوەکەیان زانی خۆبەخۆ دەستیان لە تانەو تەشەران هەڵگرت، کە زانیان کولیکوفو ئا.. ف، لە هەر چوارنکالەوە گەمارۆدراونو هیچ مەفەڕێکیان نەبووەو ناچاربوون خۆ بە دەستەوەبدەن، هەنگێ کەوتنە هاو خەمیو هاو سۆزی دەگەڵیانداو ئیدی باسیان هاتە سەر باسی دادگاو دادگایی کردن. هەرکەسەو لە ئاوازێکی دەخوێند، یەکێك دەیگوت:

– بەلای کەمەوە یەکی هەزار جەڵدەیان بۆ دەبڕنەوە.

یەکێکی دی بۆی دەسەندەوە:

– هەزار! هیچت نەوتووە! تا لە ژێر جەڵدەدا نەیان کوژن دەستیان لێ هەڵناگرن. رەنگە بە هەزار جەڵدە لە ئا.. ف رازی بن، بەڵام ئەویتر مەحاڵە، بە کوشتن دەیکوژن، چونکە ئەو زیندانی (بەشی تایبەتیە).

هەڵبەتە مەزەندەی زیندانییەکان ڕاست دەرنەچوو. ئا.. ف پێنج سەد جەڵدەی بۆ بڕدرایەوە، ئیدی چونکە ئەمە یەکەمین سەرپێچی بوو بوو،و هەڵسوکەوتو رەفتاری پێشووشی لە زینداندا باش بوو بوو، خاتریان گرتبووو مدارایان کردبوو. بەڵام سەبارەت بە کولیکوف پێموایە هەزارو پێنج سەد جەڵدەیان بۆ بڕی بووەوە. وەکو دەبینن سزاکەیان لە چاو خۆیدا سووك بوو. جا ئەم جووتە پیاوە، چونکە خەڵکی ئاقڵ بوون، لە دادگاییەکەیاندا ناوی کەسی تریان نەبرد بوو و کەسیان تێوە نەگلاند بووو گوتبوویان خۆیان، بێ کۆمەکی هیچ کەسێك، بێئەوەی چووبنە هیچ شوێنێك، یەك ڕاستو یەکسەری لە زیندانەکەوە هەڵاتوون.

بە ڕاستی من لە هەموویان زیاتر بەزەییم بە کولیردا دەهاتەوە، جگە لەوەی کە گشت هیواو ئومێدێکی بە با ڕۆیی، سزاکەشی لە سزای هاو دەستەکانی زۆر قورستر بوو. دوو هەزار جەڵدەی خواردو وەکو زندانییەکی بێگارە زیندان، هەواڵەی زیندانێکی دیکەی دوور کرا.

ئیدی، لەسەر ئامۆژگاریو داوای پزیشکان، ئا.. ف لە سزاکەی بەخشرا. بەڵام هەرکە گەییە نەخۆشخانەکە کەوتە لاف لێدانو خۆ هەڵکێشان، دەیگوت لە مڕۆ بە دواوە لە هیچ کۆسپو تەگەرەیەك ناپرینگێتەوە. بزانە چۆن کارێکی وەها دەکات کە خەڵکی بە داستان بیگێڕنەوە! بەڵام کولیکوف، هیچ نەگۆڕا، هەر پیاوە سەلارو سەنگینو شایستەکەی جاران بوو. پاش ئەوەی سزاکەی خۆی وەرگرتو بۆ زیندان گەڕایەوە، وەکو ئەوە بوو بۆ ساتێکیش زیندانەکەی جێ نەهێشتبێ. بەڵام زیندانییەکان بە هەمان چاوی جارانەوە سەیریان نەدەکرد. هەرچەندە ئەو نەگۆڕا بوو،و دەیزانی چۆن قەدری خۆی بگرێت، بەڵام زیندانییەکان لە دڵی خۆیاندا ئەو رێزو حورمەتەی جارانیان نەدەگرت. وەکو هەر یەکێك لە زیندانییەکانی دی مامەڵەیان لە تەکدا دەکردو قارەمانەکەی جاران نەبوو. ئیدی لە دوای هەڵاتنەکەوە ئەستێرەی کولیکوف کەوتە لێژی. تومەز لەم دنیایەدا تەنیا سەرکەوتن ئیحتوباری هەیەو سەرکەوتن هەموو شتێکە!...

***پەراوێز:***

***١- ياكشی: وشەيەكی تاتاريە بە مانای (باش، باشە) دێت.***
***٢- يوك: وشەيەكی تاتاريە بە مانای: (نەء ، نا، نەخێر) دێت.***



## دەرچوون لە زيندان

ئەم هەوڵی هەڵاتنە لە دوا ساڵی حەپسييەكەی مندا روويدا. ئەم دوا ساڵەم، بەتايبەتی دوا رۆژەكانيم، وەكو سەرەتاكانی ساڵی زيندانييەكەم، بە جوانیو بە روونی لەبیر ماوە. پێموایە هەر چەندە پێويست ناكات زۆر بە تانيا بڕۆم،و وردو درشتی بگێڕمەوە، بەڵام دەبیٚ ئەوە بڵێم ئەگەرچی زۆر بەتاسەوە بووم تا زووترە ساڵەكە بڕێتەوەو رزگاربم، بەڵام لە چاو ساڵەكانی پێشووترا ناخۆشيەكی ئەوتۆی تيا نەبوو. يەكەم لەبەر ئەوەی لە نێو زيندانييەكاندا دۆستانی

زۆرو هاوڕێی باشم گرتبوون كە هەموویان بە پیاوی جوامێرو بە هەڵوێستو باشیان دەزانیم. ژمارەیەكی زۆریان دڵسۆزانەو بیٚ ڕیا خۆشیان دەویستم.تەنانەت ئەو سەربازەی كە منو هاوڕێكەمی تا دەرێی دەروازەی بێگارەزیندانەكە بەرێ كرد، خەریك بوو بۆمان دەگریا، هەر چەندە بە فەرمی ئازاد بوو بووین، بەڵام دەبوایە تا مانگێك لە یەكێك لە دەزگاكانی دەوڵەتداو لە شارا بمێنینەوە ئەوجا بە تەواوەتی مەرەخەس دەكراین، ئەم سەربازە لە ماوەی ئەو مانگەدا، زۆرجار دەهاتە دیدەنیمانو سەری دەداین. بەڵام هەندێكی دیكەش هەبوون، كە ئێستاو ئەوسا نەبوون بە دۆستمو تاقە قسەیەكیان دەگەڵ نەكردم، دەتگوت دیوارێكی بەرز لە نێوان منو ئەواندا دروستكراوەو نایەڵێ دەنگمان بگاتە یەك!.

لەم دوا ساڵەمدا، لە چاو ساڵەكانی پێشوودا زۆر ئاسوودە بووم. لە نێو ئەو ئەفسەرانەدا كە لەم شارەدا سەرقاڵی خزمەت بوون، هەندێكم لە كۆنە هاوڕێیانی سەردەمی قوتابیاتی خۆم ناسییەوەو دۆستایەتیو پەیوەندی خۆمم دەگەڵیاندا تازە كردەوە. ئیدی لە ڕێگەی ئەوانەوە دەمتوانی نامە بۆ ماڵباتو كەسوكارەكەم بنووسم،و داوای پارە بكەمو هەندێ كتێبم بۆ بنێرن. ساڵانێك بوو كە تاقە كتێبێكیشم نەخوێندبووەوە، كە یەكەم كتێبم پێ گەیی – كە گۆڤارێك بوو– مەگەر خوا بە خۆی بزانیٚ چ هەستو سۆزو گودازێكی سەیرو غەریب بەرۆكی گرتم، ئێستاش لە بیرمە كە هەر ئەو شەوە، كاتیٚ كە دەرگای قاوشەكەیان لەسەرداخستین، یەكسەر دەستم بە خوێندەوەی كرد، تاكو بەرەبەیان سەرم لەسەری هەڵنەبڕی، وام هەست دەكرد ئەم كتێبە پەیامێكەو لە دنیایەكی ترەوە بۆم هاتووە. ژیانی ڕابردووم بە ڕوونی هاتەوە بەرچاوم،و بە دەم خوێندنەوەی گۆڤارەكەوە لە خۆم دەپرسی ئایا من هەمان كەسەكەی جارانم ؟ ئایا زۆر دواكەوتووم، ئایا ئەوان زۆر لە خەمی مندا بوون! ئایا ئەم دابڕانەیان زۆر لەبەر گران بووە ؟ ئایا دوای من دنیا زۆر گۆڕاوە ؟ پەیوەندیو كێشەكان گۆڕاون ؟. هەوڵم دەدا نەك هەر وشەكان، بەڵكو ئەو دیوی وشەكانیش بخوێنمەوەو ئەو هێمایانە ببینم كە ئاماژە بوون بۆ ئەو رابردووەی من تیایدا ژیا بووم، ئاشنای بووم، عەوداڵی ئەو رەمزو نیشانانە بووم كە لە رابردوودا، لە سەردەمی ئازادی مندا، دڵو دەروونانی دەهەژاند، بەڵام هەوڵەكانم بیٚ سوود بوو... هەڵبەتە پێویستە دان بەوەدا بنەم كە زانیم بە دنیاو ژیانی تازە نامۆو بێگانەم، زۆر لە ژیانی تازە دواكەوتووم، زۆرم خەفەت خوارد، ئیدی ئەندامێكی دابڕاوو پاشكەوتووی كۆمەڵگە بووم. چار نییە دەبیٚ دەگەڵ ئەم شتە تازانەدا بسازێمو نەوەی نویٚ بناسم! بەدەم ئەو خەیاڵانەوە كەوتم بەسەر وتارێكدا كە ناوو ئیمزای ناسیاوێكی هەرە ئازیزی منی پێوە بوو، ئیدی زۆر بە تامەزرۆیی كەوتمە خوێندنەوەی... بەڵام زۆربەی نووسەرانی گوتارەكانی دیكەم نەدەناسی، ناویانم بەلاوە ئاشنا نەبوو. نووسەرانی تازە هاتبوونە مەیدان. زۆرم حەزدەكرد ئەو نووسەرە تازانە بناسم. بەڵام بەداخەوە ژمارەی ئەو گۆڤارو كتێبانەی دەگەییشتە دەستم، لەوە كەمتر بوو كە بەو ئاواتەم بگەم. ئەمە جگە لەوەی بە دەست هێنانی كتێب زۆر زەحمەت بوو... خۆ لە سەردەمی مێجەری پێشوودا نەك هەر زەحمەت بوو، بەڵكو قەدەغەش بوو، وای بە حاڵو رۆژگاری ئەو كەسەی كتێبێكی پیٚ بگیرایە!... سزای قورسی لەسەر بوو. ئەگەر ئیدارەی زیندان، لە هەڵمەتێكی

پشکنیندا کتێبێکی دۆزیبایەوە، ئیدی قیامەت ڕادەبوو، پرسیاربارانیان دەکردیت: ئەم کتێبەت لە کوێ هێناوە؟ کێ بۆی هێناویت ؟ کێ شەریك‌و هاودەستتە ؟ جا وەرە بەرسڤی ئەو جۆرە پرسیارانە بدەوە! چ جوابێك دەدەیتەوە ؟ لەبەر ئەوە بەبێ کتێب لە زینداندا ژیام، سەرم کز دەکردو دەچوومە قەپێلکی خۆمەوە، زۆرجار پرسیارم لەخۆ دەکرد، وەرە بە دوای وەڵامی پرسیاری بێ وەڵامدا بگەڕێ! ئیدی نیگەران‌و ناڕەحەت خەوم دەزڕا.... بە هەرحاڵ با لەوەی پتر بە تانانی قساندا نەچم، چونکە ئەو بەسەرهات‌و سەربورانە نە لە وەسفکردن دێن‌و نە تەواو دەبن!

من لە زستانا خرابوومە زیندانەوەو دەبوایە لە هەمان وەرزو مانگ‌و ڕۆژیشدا لە زیندان دەرچم‌و ئازاد ببم. بە دەم چاوەڕوانی هاتنی زستانەوە، وەك ئەوەی غەرقی ئاگربم، ڕۆژانم دەژمارد! مەگەر هەر خوا بزانێ کە دەمبینی هاوین خەریکە بنەوبارگەی خۆی دەپێچێتەوەو گەڵای درەختان زەرد هەڵدەگەڕێن‌و گیای دەشت‌و مێرگان وشك دەبن، چ شادمانی‌و ئۆخژنێك لە دڵ‌و دەروونم دەگەڕا! ئەنجام وەرزی هاوین ماڵاوایی کرد.... گەردەلوول‌و بای پایزە بە گڤ‌و هۆڕ هەڵیکرد، یەکەم بەفر کەوت.... ئیدی ئەو زستانەی کە ساڵەهای ساڵ چاوەڕوانی بووم هات... چەند زیاتر لە ڕۆژی ئازاد بوون نزیك دەبوومەوە دڵم زیاتر لێیدەدا. کەچی تا لە ئازادی نزیکتر دەبوومەوە، هێمن ترو بە سەبرتر دەبووم. زۆرم پێ سەیر بوو، زۆرجار گلەییم لە خۆ دەکرد کە کابرایەکی خەم ساردو بێ موبالاتم، ئەم ساردو سڕییە چییە، لە بەفر دروست بووم !

گەلێك لە زیندانییەکان، کە لە کاتی ئیسراحەت‌و پشوودا لە حەوشەی زیندانەکەدا پیاسەم دەکرد، دەهاتن بۆ لام‌و پیرۆزباییان لێدەکردم. یەکێکیان گوتی:

– ئەلکساندەر پترۆفیچ! پیرۆزە! بەو زووانە ئازاد دەبیت، تۆ دەڕۆیت‌و ئێمەی نەگبەت‌و کڵۆڵ لێرە دەمێنینەوە، باوەڕ بکە غەریبیت دەکەین!....

منیش :

– نوخشە بێ لە ئێوەش، ئەدی تۆ مارتینوف کەی ماوەی زیندانییەکەت تەواو دەبێ ؟

– من ؟ هێشتا زۆرم ماوە گیانە... دەبێ حەوت دانە ساڵی دی حەپسی بکێشم....

بەدەم ئەو قسەیەوە، حایرو حەپەساو دەیڕوانییە دووری دوور وەك ئەوەی بڕوانێتە ئایندەی خۆی.....

بەڵێ... گەلێك لە هاوزیندانییەکانم، ڕاستگۆیانەو لە ناخی دڵەوە پیرۆزباییان لێدەکردم، هەستم دەکرد لە جاران میهرەبانترو دۆستانەتر رەفتارم دەگەڵ دەکەن. هەستیان دەکرد کە من ئیدی یەکێك نیم لەوان، لەوان ناچم، بابایەکم ئازاد، بەڕێم دەکەن. ك.... زنسکی کە گەنجێکی نەجیمزادەی پۆڵاندی هێدی‌و هێمن‌و خۆش مەشرەب بوو، حەزی دەکرد وەکو من لە کاتی بێ ئیشیدا لە حەوشی زیندانەکەدا پیاسە بکات. هەستی دەکرد کە هەوای ئازادو جوڵان تەندروستی دەپارێزن‌و قەەبووی هەوای پەنگاوەی شەوانی ناو ژوورو قاوشەکانی بۆ دەکاتەوە. ڕۆژێك لە کاتی پیاسە کردندا، بە دەم زەردەخەنەوە رووی تێکردم و گوتی:

– دەزانی زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەوەم تۆ لە زیندان ڕەها بیت. چونکە کە تۆ لە زیندان دەرچوویت، ئیدی من تەنیا یەك ساڵم لە زینداندا دەمێنێ.

جا پێویستە لێرەداو، بە شێوەیەکی ڕەوتەنی ئەوەش بڵێم کە ڕەنگە تەسەوری ئازادی، بە حوکمی مەحروومیەت لە ئازادی، لە هزرو خەیاڵی زیندانییاندا، زۆر گەورەترو جوانتر لە ئازادی واقیعی و راستەقینە، بنوێنێ. هەر زیندانییەك ماناو چەمکی ئازادی لە قەوارەی ڕاستەقینەی ئازادی گەورەتر دەبینێو ئەمە خاڵی هاوبەشی هەموو زیندانییەکە. یانی خوڵامێکی شەپڕێوی شڕۆڵەی خزمەتکاری ئەفسەرێك وەکو پاشایەك دێتە بەرچاوی بابایەکی زیندانی، بە نموونەی مرۆڤی ئازادی دەزانێ، ئەمە چیە، کۆتو زنجیری لە دەستو لاقاندا نییە،سەری بە گوێزان سفر نەکراوە، بۆ هەر شوێنێ بڕوات چاودێرو پاسەوانی بە دواوە نییە.

ئێوارەی دوا شەوی زیندانم، دەگەڵ خۆراوادا، دوا پیاسەم بە دەوری دیواری حەوشەی زیندانەکەدا کرد!.... لە ماوەی ئەم دە ساڵەدا هەزاران جار بە بن ئەم دیوارەدا پیاسەم کردبوو! بەتایبەتی لە ساڵی یەکەمدا، لەوێ، لە بن دیواری زیندانەکەدا، پەستو غەمگین، نا ئومێدو بێ هیوا بە تاقی تەنیا پیاسەم دەکرد!!! ئێستاش لە بیرمە کە هەزاران جار، ئەو ڕۆژانەم دەژماردو دەژماردەوە کە دەبوایە لە زینداندا بە سەریان بەرم. ژمارەی ڕۆژەکان یەكو دوان نەبوو، بە هەزاران ڕۆژ بوو، خودایا چ ڕۆژگارێکی تاڵ بوو، هەر نەدەبڕایەوە! خودایا لەو ساوە بۆ ئێستا عومرێکە! ئا ئێرە، ئەم گۆشەیە شوێنی پیرە هەڵۆکەمان بوو... ئا لێرەدا زۆرجار (پترۆف)م دەبینی، کە لە دوورەوە دەی بینیم یەکسەر بۆ لام دەهات... پترۆف ئێستاش لێم نەدەبووەوە، کە لە دوورەوە دەی بینیم بەلەز بۆ لام دەهات، کرۆکپ شان بەشانم دەکەوتە پیاسە وەکو ئەوە بوو بیەوێ بزانێ چ خەیاڵێکم لە مێشکدایە، لە دڵی خۆمدا خوا حافیزیم لە یەك بە یەکی کۆڵەکە دارە چوار گۆشەو ناڕێکەکانی دیواری حەوشە کرد... مەگەر هەر خودا بزانێ لە ڕۆژانی هەوەڵی حەپسییەکەمدا ئەم کۆڵەکانەم چەند ناشیرینو ترسناك دەهاتە بەرچاو، هەڵبەتە ئەوانیش لە جاران پیرتر بوو بوونو سوا بوون... بەڵام تەمەنیانم بۆ دیاری نەدەکرا... مەگەر هەر خوا بزانێ چ گەنجانێك، چ بەهرەو توانایەك لە نێو چوار دیواری ئەم زیندانەدا، بە خوتو خۆڕایی، بە ناهەق، بێ ئەوەی کەسێك قازانجی لێبکات، زندە بە چاڵ کرابوو، بە فیڕۆ درا بوو! هەڵبەتە دەبێ دان بەوەشدا بنەینو بڵێین: کە هەموو ئەو پیاوانە، خەڵکی بلیمەتو بەهرەدار بوون.... لەوەیە بەهرەدارترینو بەتواناترین ڕۆڵەی میللەتەکەمان بووبن... کەچی هەر هەموو ئەو بەهرەو توانایانە، بۆ هەتا هەتایە بەبادا دران! ئەم تاوانە لە ئەستۆی کێیە ؟ کێ تاوانبارە ؟ بەڵێ کێ تاوانبارە ؟.

سارە زی لە خەو ڕابووم، بەر لەوەی زیندانییەکان بۆ سەر کار بڕۆن، بە گشت ژوورو قاوشەکاندا گەڕام تا خوا حافیزی لە زیندانییەکان بکەم. زۆر دەستی زبرو غاراوی کار، تەوقەیان دەگەڵ کردم، بەڵام ژمارەی ئەوانەی دۆستانە تەوقەیان دەگەڵ کردم کەم بوو. بەڵام ئەوانی دی هەستیان دەکرد کە بووم بە کەسێکی تر،و ئیدی یەکێك نیم لەوان. دەیان زانی من لە شاردا کەسوکارو ئاشناو ڕۆشنای ئەرستۆکراتو نەجیمزادەم هەنو هەرکە لە زیندان وەدەرکەوتم، سەر لە نوێ

دەبمەوە بەیەکێك لەو نەجیمزادانە،و سەروساخت دەگەڵ ئەواندا پەیدا دەکەمەوەو دەبمە هاومەجلیسی ئەوان، بۆیە خودا حافیزیو تەوقە کردنەکەیان هەرچەندە، گەرمو گوڕو لە دڵەوە بوو، بەڵام خۆمانە نەبوو، یانی وەکو ئەوە نەبوو خواحافیزی لە یەکێك لەخۆیان بکەن، خۆ هەندێکی دیکەیان، ڕوویان لێوەرگێڕامو وەڵامی دوعاخوازییەکەیان هەر نەدامەوە. هەندێکیان تەنانەت بە بوغزو کینەوە نیگایان کردم.

دەهۆڵی چوونە سەر کار لێی دا، هەموو زیندانییەکان بۆ سەر کار ڕۆییشتنو من بە تاقی تەنیا مامەوە. سوشیلوف لە پێش هەموو خەڵکەکەی ترەوە هەستا بوو، و دەرفەتی هێنا بوو کە دوا چایم بۆ ئامادە بکات. ژارۆ سوشیلوف! کاتێ کە جلو بەرگو قایشو قروشو هەندێ وردە شتو کەمێ پارەم دایە، گریان ئەوکی گرت. لێوە لەرزانەکانی گەستو بە دەم ڕوندك ڕشتنەوە گوتی: " نا... ئەمە نا... لەمەم کەم نییە.... تۆ لە من دەچییت ئەلکساندەر پترۆفیچ، تۆم لە دەست دەچییت... ئاخر چۆن بەبێ تۆ هەڵبکەم ؟....

دوا خوا حافیزم لە (ئاکیم ئاکیمیچ)ش کردو پێمگوت:

– نوخشە بێت لە تۆش، تۆش بەم زووانە ئازاد دەبیت.

توند دەستی گوشیمو لە بن لێوانەوە گوتی:

– من هێشتا ماوەیەکی زۆرم ماوە لێرە، زۆر زۆر!

دەستم لە ملی وەریناو تێر یەکترمان ڕامووسی.

دوای ڕۆییشتنی زیندانییەکان بە دە دەقیقەیەك، منو هاوڕێکەم، کە کاتی خۆی پێکەوە هاتبووینە ئەم زیندانە، بە یەکجارەکی زیندانەکەمان بەجێهێشت. ئیدی لەوێندەرەوە یەکڕاست چووین بۆ کارگە (وەرشە)ی ئاسنگەرییەکە تا پێوەندەکانی لاقمان بکەنەوە. ئەمجارەیان هیچ چاودێرێکی چەکدارمان لەگەڵدا نەبوو، تەنیا یەکێك لە عەریفەکانمان لەگەڵدا بوو. چەند زیندانییەکی مەحکوم بە بێگارە زیندان لە کارگەی ناڤبری کاریان دەکردو پێوەندەکانیان لە لاقمان دەرهێنا. من چاوەڕوانم کرد تا کۆتو زنجیرەکانی هاوڕێکەمیان شکاند، پاشان لە سندانەکە نزیك کەوتمەوە. ئاسنگەرەکان بە پشتا وەریان چەرخاندم، ئەوجا لاقیان هەڵبڕیمو خستیانە سەر سندانەکە، دەیانویست زۆر وەستایانەو لێهاتووانە کارەکەیان ئەنجام بدەن.

وەستاکە بە شاگردەکەی گوت:

– پەرچەکە، یەکەمجار پەرچەکە ڕاست بکەوە.... بزماری پەرچەکە بسوڕێنە، ئاوها دای بنە، زۆر باشە! دەی ئێستا بە چەکوشەکە لێی بدە.

کۆتو زنجیرەکانم کەوتن. هەڵم گرتنەوە. دەمویست جارێکی دی بە دەستەوەیان بگرمو بۆ دواجار تەمەشایان بکەم.... باوەڕم نەدەکرد کە ئەم کۆتو زنجیرە تۆزێ لەمە پێش لە لاقی مندا بووە.

زیندانییە ئاسنگەرەکان، بە دەنگی گڕو پچڕ پچڕ، کە شادمانی پێوە دیار بوو، گوتیان:

– پیرۆزە، بە دوعا، بڕۆن لە پەنای خوادا بن !

**بەڵێ ... بە دوعا!... بەرەو ئازادی، بەرەو ژیانێکی تازە!.... من لە نێو مردواندا ڕابووبوومەوە!....**

**چ ساتێك بوو! ئەو ساتە، مەحاڵە، لە وەسف کردن نایەت !**

***<u>تێبینی:</u>***

***ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٢٤ لە سلێمانی، گەڕەکی ڕزگاری لە پاچڤەی ئەم شاکارەی دۆستۆیفسکی بوومەوە کە لەم سەرچاوانەوە کراوە بە کوردی:***

- ***الاعمال الادبیة الکاملة (٥) دوستویفسکي/ ذکریات من منزل الاموات/ ترجمة: الدکتور سامي الدروبي.***
- ***خاطرات خانه اموات/ اثر فیودور داستایوسکی / ترجمه مهرداد مهرین/ چاپ دوم/١٣٨٩/ مؤسسه انتشارات نگاه***

# فەرهەنگۆك

## ئا

**ئەداو ئەتوار: ڕەوشت و ئاکار**

**ئارایشتکار : ئارایشتگەر ، مکیاجکار**

**ئەوك : قوڕگ، ەروو، بەرمل**

**ئاسیو : ئازار، بەڵا ، زیان، زەرەر**

**ئاشخانە : مووبەق، چێشتخانە**

ئەنگۆ: ئێوە، هەە، هون

ئەگەرنا: دەنا، ئەگینا، ئەگین، گەرنا

ئێژی : دەڵێی

ئەفسووناوی : سیحراوی، جادوویی

ئیکلام : کڕنۆش، سەرچەماندن بۆ ڕێزگرتن

ئامێز : باوەش، هەمێز

ئەزبەنی : گەورەم، قوبان

ئاران: گەرمەسێر، گەرمیان، زستانەوار

ئۆین: پیلان، دەسیسە، فێڵ و مەکر

ئۆینباز : بەمەکرو فێڵباز، پیلانگێڕ

ئێشك: پاس، کێشك

ئاکنجی: نیشتەجیٚ

ئالوودە:گیرۆدە، خووپێگرتوو

ئاوەز: هۆش، فام، ئەقڵ

ئاشپەز: شیوکەر، چێشت لێنەر، چێشت چی

ئەنگێزە: هۆ، هاندەر، سۆنگە

ئەستەم: زەحمەت، ئاسیٚ ، دژوار

ئیرەیی: حەسوودی

ئەستێڵ: حەوز

ئیستەرەم: دەمەویٚ

ئەستڕ: بەر، بەری کەواو...

ئاپۆڕا: حەشامات، قەرەباڵغی

ئەوقات : پارێزەر

ئامال کەسك : مەیلەو سەوز

ئەزبەرمە : لەبەرمە

ئیراد : رەخنە ، گلەیی

ئۆنیفۆرم : جلی چوون یەك

## ب:

باوەژن: زڕدایك، هوٚی دایك، باجی

باب: باوك

باڵانما: باڵانوێن، ئاوێنەی باڵاڕوان

بەلەز: خێرا، بەپەلە، گورج

بلوور: شووشه

بێنەوا: هەژار، بێچارە، داماو

بە تۆبزی: بە زۆر، بە خورتی

بە روحم : بە بەزەیی ، دلۆڤان

برنجه: جۆرە کانزایەکە، زەردی سەماوەر(قصدير)

بەلەنگاز: بێچارە،نەدار، بەسەزمان

بەرۆك: یاخە، یەخە

بەکاوەخۆ: بە هێواشی

بەرسڤ: وەڵام

بەڕك: گیرفان، باخەڵ

بالیفۆکە: سەرینی بچووك، گۆشە

بوری: تێپەڕی

بیلبتون: بە تەواوەتی

بەو ئاوایە: بەو جۆرە، بەو شێوەیە

باریە: لۆسە

بەستێن: رۆخ، کەنار، گویٚ چەم، دەم چەم

بێشە: دارستان، لێر

بەرکۆشە: بەرهەڵبێنە

بن پیاڵە: ژێر پیاڵە

بۆرەقنە: ئامال بۆر، مەیلەو بۆر، بۆرباو

بوێر : ئازا، دلێر

بێوەی: بیٚ زیان، سەلامەت

باڕ : بێچووە مەلی بەهارە

بێزوو: بێزگ، مەگیرانی

بێزگەوان: بێزووکەر

بەلاٚنس: هاوسەنگی

بارتەقا: باتەقا، هەنبەر، بەرانبەر

باجەوان: باجگر

بەسویٚ: بە ژان، بە ئازار

بەردەبار: پیاوی زاناو بە تەگبیر

بێدادی: نەهەقی

بەیتاڵ: پزیشکی ئاژەلاٚن

بویەر: رووداو

**باژێرۆك: شارۆچکە**

**باشار: دەربڕدن، خۆراگرتن**

**بەرایی: پێشایی، بەراهی**

**بەڵەد: شارەزا، ڕێزان، ڕێنوێن**

**بەفرە ژیلکە: بەفری زۆر دەنك ورد**

**بەلەك: پووز**

## پ:

**پێشخزمەت: نۆکەری بەردەستان**

**پارك: باخ**

**پواز: سنگێکە لە درزی داری قەڵشاوی دەنێن تا نەیەتەوە یەك**

**پۆڕ: باڵندەیەکی خۆش گۆشتە، لە مریشك گەورەترە**

**پێشکار: خزمەتکار**

**پەیڤ : وشە، وتە ، قسە**

**پەز: مەڕ، مێگەلە مەڕ و بزن**

**پەری : فریشتە**

**پاژ: بەش**

**پرتەو: تیشك ، روناکی**

**پێکڤە: پێکەوە، بە هەڤڕا**

**پڕ: زۆر، تەژی**

**پۆستین: فەروە، کەوڵی تیسکن**

**پەژمردە: چەرمسی، ژاکاو**

**پایدۆس: دەست لە کار هەڵگرتن**

**پۆڵکە: گاگۆز**

**پەسیو: پەسیڤ، هەلأمەت**

**پیتاك: باربوو، کۆکردنەوەی دارایی**

**پێشکە : مێشوولە**

**پۆڕ سپی : قژ سپی، سەر سپی**

## ت:

**تەمەشاڤان: بینەر، سەیرکەر**

**تەژی: پڕ، لیپاو لیپ، سەر ڕێژ**

**تێشت: نانی بەیانی، قاوەڵتی، بەرقلیان، تاشتی**

تالووکە: مەترسی، خەتەر

تەبارە: دەغڵی گەیشتووی نەدوراو، قایمە دەغڵ

تەژەو ناقۆڵاٚ: گەورەو ناشیرین

تاین: یارۆ، فلأن، ناڤبری

تاژی: سەگی ڕاو، تانجی

تەشقەڵە: گەڕ، بیانووپێگرتن

تەیرو تو: باڵندەو مەلان

تەوازۆ: تەوازی، عوزرخوایی، داوای بوردن

تخوب: سنوور، کەوشەن، تخووم

تەوێڵ: ناوچەوان، هەنیە، ئەنی، توێڵ،جەمین

تۆرینۆک:تووڕەو دڵناسک

تەختەبەن: تەختە خەو

تەقوو: بەڵکوو ،هاتوو

تاقەتکردن: شاردنەوە، داکردن

تۆلاز: مێباز، چاو لەوەڕێن

تیلمە: تیلماسک

تیلاگ: لاسەر

تاوەگاز: تاوانگاز، بە هەتاو سووتاو

تەڵفیزی: تەڵفیسی، تەوس، گاڵتەو گەپ

تەریدە : ڕێگر ، چەتە

## ج:

جەگەن: گیایەکە لاسکی سێ سووچە لە زەڵکاودا دەڕوێ

جنگن: شەڕانی، دڕ، نەگونجاو

جەلۆ: هەرزە پیاو، سەرسەری

جندەخانە: سۆزانی خانە، قەحپەخانە

جەڕباندن:تاقی کردنەوە، تەجرەبە کردن

جوڕنە: حەوزۆکەی گەرماو

جما: جولاٚ، بزوا

## چ:

چەلەنگ: چوست و چالاك، گورج و گۆڵ، شۆخ و شەنگ

چینی: جۆرێ سواڵەتی هەرەباشە، وەکو کاشی

چتۆ: چۆن، چلۆن، کوو

چڕین: وتن ( بۆ گۆرانی و قام)

چێڵ: مانگا

چەنگ: ئامێرێکی موسیقایە، هارپ

چەکمە: جەزمە، پووت

چەمەنزار: مێرگ، مێرغوزار، سەوزەزار

چما: بۆچی، ئەڕا، لەبەرچی

چەرموو : سپی

چقڵ: دڕك، دڕو، دڕی

چەرچی: فرۆشیاری گەڕیدە، دەستفرۆش

چوغورد: چوغور، چغر، چڕ

چمك: سووچ، گۆشە

چوارنکال: هەرچوارلا

چێبوو: دروست بوو

چەمووش: سڵ، رەوەك، لەقەهاوێژو گازگر

## ح:

حایرمان: سەرسام بوون

حەسار: حەوش

حەنەك: جەفەنگ،قسەی گاڵتەو گەپ

حەشەری: بەر بەتاو، ژنی بە ئاڵۆش

حەژمەت: مەینەت، خەفەت، کەسەر، داخ، خەم

حەجامات: خوێن بەردان

## خ:

خەنی لە خۆتان: خۆشی لە خۆتان

خشکۆك: دەلال، جوانکیلە، جوان، قەشەنگ

خورجین: هەگبەی لە بەن، جانتای لە بەن، خورج

خا: خات، خاتوون، خانم ، یا

خاپاندن: فریودان، تەفرەدان، خەڵەتاندن

خاپینۆك: فریبۆك، فێڵباز

خانەدان: نەجیمزادە، ئەسڵزادە

خودان: خێو، خاوەن، ساحێب

خوڵك: خوڵق

خۆرتی: بە تۆبزی، بە زۆری

خشت: ڕێك، بیٚ کەم و زیاد

خوبزە: نۆکەر، خزمەتچی، خوڵاّم

خاکی: بیٚ هەوا، بیٚ فیز

خەرگە: پەڕۆی کۆن و پیس

خوابەختەکی: خۆو بەخت، بە هەڵکەوت

خوارنگە : چێشتخانە

## د :

داماو: بێنەوا، بەلەنگاز، بێچارە

دەڤەر: ناوچە، ئاقار، شوێن، جیٚ

دێرکەوتن: دواکەوتن

دلپاقژ: دڵپاك، بیٚ فڕو فێڵ، بیٚ گزی

دەربار: دیوەخان و بارەگای پاشا

ژنەوتن: بیستن

داگەڕان: هاتنە خوارەوە

دڵنەواز : دڵگیر، مایەی دڵخۆشی

دلۆڤان: بە بەزەیی، دڵنەرم، میرەبان

هاژۆتن: لێخوڕین

دیدەوانی: ئێشکگرتن ( بە تایبەتی ئێشکی سەر قەلاّت و بورجان)

داپیرە: دایە گەورە، نەنك

دەلیڤە: دەرفەت ، هەل

درەخت: دار

دەربارییان: دەست وپێوەندانی دیوەخان و بارەگای پاشایەتی

دڕوو: دڕك، چقڵ، دڕی

دڵڕەش: بیٚ ەزەیی، ستەمکار، دڵرەق، ڕکوونی

دامە: مۆر

دنگ: دینگ، ئامرازی چەڵتووك کوتان

دەڵەکدان: پاڵنان

دڕدۆنگ: دوودڵ، بە گومان

دوونیەتی: خوێڕیەتی، بچووکی

دەڵەچە: مەرایی کەر، ماستاوچی

دۆنکی: داردەستی حەسحەسی ناو بازاڕ

دەماوەر: وتە پاراو، قسە زان، بەدەم

## ڕ:

ڕەقسین: سەما، هەڵپەڕین

ڕنەك: قەشەو

ڕدێن: ریش

روندك: فرمێسك، رونتك، ئەسر، ئەسرین

رۆحانی: پیاوی ئاینی

راز: نهێنی

رابوون: هەستان

رۆخانە: روبار، چۆم، چێم، ڕوو

ڕند: جوان، خوشیك، خوشكۆك

ڕمووده: ئالووده، هۆگر

رادەست: خۆ بە دەستەوەدان

رەند: مێرخاس، مەرد، پیاوانە

رەقیب: نەیار، خەنیم

ریسك: مغامەرە

ریوەڵە: بچکۆلەی لاواز، بێ نموود

رۆنیشت: دانیشت

رووپامایی: مەرایی، دەڵەچەیی، بن ریشەیی

راموسان: ماچ

رەهەنە: رەهەندە، عەودالّ ئاوارە، چۆڵگەڕ

## ز:

زڕکیژ: کچی مێرد بۆ باوەژن، یان کچی ژن بۆ باوەپیاڕە

زێدە: زیادە

زەلام: گەورە، ناقۆلاّو تەژە

زار: دەم، دەو

زوڕییەت: وەچەو نەوەو نەتیرە

زێد: زاگە

زاگە: زێد، شوێنی لە دایکبوون، مەفتەن

زوخاڵ: ڕەژوو، خەڵووز

زگڕەش: ڕکوونی، بوغزن، کینە لە دڵ

زوقوم: سیخوار

زرانی: ئەژنۆ، چۆک

## ژ:

ژێوان: پەشیمان

ژارخەن: پێکەنینی ژەهراوی

## س:

سەرزەنشت: سەرکۆنە، لۆمە

سەندەڵ: قاپقاپ، تەقتەقیلە

سپڵە: پێنەزان، بێ ئەمەك، بێ وەفا، نمەك حەرام

سۆز: پەیمان، بەڵێن

ستران: گۆرانی، قام، لاوك

سپێدە: بەرەبەیان

سەوزەزار: مێرگ، مێرگوزار، چەمەنزار

سەمت: لا، ئالی، ڕەخ

سەربوردە: بەسەرهات، سەرگوزەشتە، سەربهورد

سەرگوروشتە: سەربوردە،

سخێف: جنێو

سەختگیر:توند و بەزەبت و ڕەبت

سیوات: خوێنەواری

سائەقڵ: شێتۆکە

سەربۆز: سەر ماش و برنج

ساناو: قوڕاو

سێوی: هەتیوو، منداڵی بێ داك و باب

سیکتر: دەرکردن، تڕۆکردن

سونگی: قەمە

سەهەندە: بزۆز، نەسرەوت، زرینگ، ئاژاوەچی

سێبەندی: بێ شەرم و حەیا،

ستێران: ئەستێران

سابرێن: نێری، تەگە

**سەرۆ: ئیلهام، سرووش**

**سارە زی : سبەی زوو، سۆزی**

**سۆل: پێلاو، کەوش**

## ش:

**شڕندە: ژنی دەمدرێژی شەڕانی بێحەیا**

**شڕپۆش: شڕۆڵە، بیٚ بەرگ و بار**

**شەیپور: بۆقی، کەڕەنا**

**شام: شیو، شیڤ، خواردنی ئێواران**

**شکەفت: ئەشکەوت**

**شکەستەنی: ناسک، شتیٚ زوو بشکیٚ**

**شتاقیان، هیچیان، کەسیان**

**شنگ: هێز، تاقەت، توانا**

**شەقاو: هەنگاو**

**شلینگ: پارەیەکە**

**شاپ: شەق**

**شەکەت: ماندوو، هیلاك**

**شوورە: دیوار**

**شەڕبار: پڕشەڕ، شەڕانی**

**شەنگولٚ: بە دەماخ، کەیف خۆش**

**شەبەیخوون: پەلامارو هێرشی شەوانە**

**شەلاق: شەلاخ، قامچی**

**شەم: مۆم، شەمالك**

**شەمدان: مۆمدان، شەمان، جێگەی مۆم**

**شۆڤار:زمان شڕ، نێوان تێکدەر، جاسووس**

**شەکەت: ماندوو. هیلاك**

**شاشك: مێزەر، پێچی مێزەر**

**شیرەت: راوێژ، ئامۆژگاری**

**شوڤار: زمان شڕ، جاسووس**

## ع:

**عاسا: دار عاسا، داردەست**

**عەیار: زیتەلٚ، زۆرزان**

عەبەنووس: دارێکی ڕەش و ڕەق و بەنرخە

عەیان: دیار، ئاشکرا، لەبەرچاو

## غ:

غاڕ: ئەشکەوت

غوڕابی خەو: شیرنە خەو، خەوی قورس

غەوارە: غەریبە، بێگانە

## ف:

فەرمایشت: فەرموودە، قسە

فەرخە: بێچوە مەل و جانەوەران

فشقیات: حەنەك، گاڵتەوگەپ، ئاخافتنی بێ تام

فراڤین: نیوەرۆژە، خواردنی نێوەرۆ

فەرسەخ: فەرسەق

فڕناخ: لووت بەرز، بە دەعیە، روحزل

فاما: فامیدە، تێگەییشتوو، زیرەك

ڤالا: بەتاڵ، خاڵی، پووك، ئاواڵە، کراوە

## ق:

قالیچە: مافووری بچووك

قرمز: سوور

قەڕاڵ: پاشا

قەڕاڵنشین: پاشانشین، ئیمپراتۆریەت

قورباقە: بۆق

قاوەڵتی: تاشتی، بەرقلیان، نانی بەیانی، تێشت، قاوەتوون

قووچانی: هەڵهات

قشتیلە: بچووکی جوانکیلە

قالۆر: قاوغ

قاپ: قاچ

قاوغ: قەپێلك، قاپۆرە

قوشقی: تووڕە، وەڕەز، سڵ ، ڕەوەك

قەرقەشە: تەشقەڵە، شەرو ناخۆشی

قۆپی: زەڵکاوی قامیشەڵان

قەڵەمرەو: سنوور و کەوشەنی ژێر دەسەڵاتی کەسێك یان دەوڵەتێك

قوو: باڵندەیەکە لە قاز سپی ترو زلترە
قەلآیی:کانزایەکی سپی نەرمە مسی پیٚ سپی دەکەنەوە
قژاوڵە: تاق تاقکەرە
قاوش: هۆڵ، شوێنی نووستنی بە کۆمەڵ
قەساس: سزا، تۆڵە
قەرەبەخت: بەخت رەش، بەدبەخت، نەگبەت
قامك: پەنجە، ئەنگوست، پل، کلك
قامبێژ: گۆرانی بێژ
قەساو: قەساب
قەلەزراو: ترسنۆك
قاژو: پەڕندەی قاژ

## ك:

کوت ومت: ەقاودەق
کوانگە: کوانوو، ئاگردان
کارمامز: بەچکە ئاسك
کودەڵە: بێچووە بەراز
کوختە: کۆخ، خانووی چکۆلەو خراپ
کوڵکە: موو، توك
کولۆ: کوللە
کەوەیی: شینکی، شینباو، خۆڵەمێشی
کێوە: بۆ کویٚ
کەپەك: سۆس
کۆمەك: یارمەتی، هاریکاری
کلۆر: ناوبەتاڵ
کوریژگە: کوڕی بچووك
کەپوو: لووت، دفن
کەونارا: زۆرکۆن، شوێنەوار
کەسك: سەوز
کۆمیدی: پێکەنیناوی
کامکردن: نەوس تکان
کەزی: پرچ، زڵف
کلآوخود: کلآوی ئاسنینی شەڕڤان

کەرب: رق و کینە

کان: مەعدەن

کێوستان، کۆسار، کۆجاڕ

کۆلۆنی: موهاجیرنشین، نشیمەن، موستەعمەرە

کەمدوو: کەم قسە

کۆسار: کۆجاڕ، کێوستان

کەوی: ماڵی، دەستەمۆ

کەڤر: بەرد

کەندەکار: کەسێك کە لە دار نەخش دەکەنێ

کێشکچی: پاسەوان، نیگابان

کۆ : سڵ، سڵکردنەوە

کەپوو : لووت، دفن

کارگە : وەرشە

کەرپووچ : خشتی سوورەوەکراو

کەوە ڕۆژ : سپیە ڕۆژ ، ڕۆژی بێ هەتاو

کلاّونە : جۆرە پۆپنەکی

## گ:

گۆساخ: چاوقایم، رووقایم

گەدا: پارسەك، سواڵکەر، دەرۆزەکەر

گورزە: باقەی گەورە

گەرەکمە: دەمەوێ ، دەخوازم

گەمە: یاری، وازی، کایە

گەنج: زێرو زیو، ماڵی دنیا

گەردنبەند: ملوانکە

گازکردن: بانگکردن

گۆرین: یارۆ، ناڤبری

گوند: دێ، ئاوایی

گومناو: ناوبزر، نەناسراو

گۆزینگ : قولەپێ

گەلۆز: ناولینگ

گول: گەڕ و گول

گاگۆز: پۆڵکە

گارد: پاسەوانی تایبەت

گۆنگ : ئاڵۆز

گەنگەشە: موناقەشە

گووراو : موخلووق

گەدگین : چێشتی پارچە عور

گەلە سکاڵا : سکاڵای بە کۆمەڵ ،سکاڵای دەسەجەمی

## ل:

لە کەیفان: لە خۆشیان

لە بیلادەوە: لە ئیجادەوە، لە بنەرەتەوە

لیرەوار: دارستان، جەنگەڵ، بێشەڵان

لاپرەسەن: فزوڵ، فزوڵی

لەزگ بوو: خەریك بوو، وەخت بوو

لێ: بەڵام

لێبڕا: بڕیاری دا

لۆسە: باریە

لاق: قاچ، لنگ

لەزکرن: خێراکردن، پەلەکردن

لایدە: بێگانە

لەهەنبەر: بەرانبەر

لێ : بەڵام

لەیستۆك : بووکەشووشە، بووکەڵە

لەگەز : مەتەڵ

لەش بەبار: نەخۆش

لەگین:رەنگە، لەوەیە

لوتاوە : پیس بووە

لەز : خێرا ،پەلە

لەبڕ : یەکسەری، بەقۆنتەرات

لاشەڕ : بێوەی، سەلامەت ، دوورە شەڕ

لاکەوە : لاچۆ ، برۆ کەنار

## م:

موغازە: فرۆشگە، دوکان

**مێریڤان: دلۆڤان، میهرەبان**

**مشوور: تەگبیر، بەخەم کردن**

**مژوول: سەرقاڵ، سەرگەرم**

**ملۆ وموش: ملۆمۆ، گەران و بۆنکردنی زەمین بۆ پەیداکردنی خواردن**

**مۆڵ: زۆر، فرە، زەحف**

**مژمژە: مەساسە**

**میرغەزەب: جەلاد**

**مەزرا: کێڵگە**

**مقاش: ماشە**

**مەگیرانی: بێزوو**

**مەرزو بۆ: ولآت، نیشتمان**

**مقەوا: کارتۆن**

**مەنهۆڵ: زێراب**

**مەزڵ: قۆناغ، جێی مەبەست**

**میرەبان : دلۆڤان ، میهرەبان**

**ماڵبات: خانەوادە ، بنەماڵە**

**مدارا :سەبرو حەوسەڵە ، دڵڕاگرتنی دۆست و ئەحباب**

**مووبەق : ئاشخانە**

**منجڕ :نەژنەو ،سوور لەسەر شتێك**

**مسکێن : رەعییەت، بەرحوکمی ئاغا**

**مەعلان : پسپۆڕ ، لێزان**

**مراك : کەوچك ، کەچك**

**ماشقە : گراوی ،دۆستی مێوینە**

## ن:

**هێورین: حەوانەوە**

**نەزاکەت: ئەدەب، سەلاری**

**نیگابان: پاسەوان**

**نەیجەزار: قامیشەلآن**

**نسیبەت: بەلآ**

**نەترە: وورە**

**ناچیز: هیچ، زۆر کەم**

**نەژاد: رەگەز، رەچەڵەك، ئەسڵ**

ناحەز: ناشیرین

نێچیرڤان : ڕاوچی

نشیمەن: بارەگا ، شوێنی دانیشتن

نەزاکەت : لوتف و ئەدەب

نك : كن ،لا، جەم ، دەف

ناڤبری : ناوبراو

نەژنەو :نەبیست، منجڕ

نمەد : لباد نیوداشت: نە کۆن و نەتازە

نها : ئێستا، هەنووکە، نهوو

نەخاسمە : بەتایبەتی

## و:

وەمێنیٚ:بمێنێتەوە

وەکرد: کردەوە

وەشێرت: شاردەوە

وێنا: تەسەور

وار: هەوار، شوێن، مەڵبەن

وێدەدەم: دەدەمیٚ

وەقف کردن : تەرخان کردن

وەردەوەدان : لە جاریٚ پتر کێڵاٚن

وەردیان : زیندانەوان

واز : کراوە

## هـ:

هانکە هانك: هەناسە برکیٚ

هەژگ: لکەداری وشکەوە بوو، چڕوچیلکەی ئاوردوو

هەڕوگیڤ: هەرەشەو گورەشە

هەڵدێر: جێگەی زۆر بەرزو قیت لە شاخ و کێودا

هەزاربەهەزار: شاخی زۆر بەرزو عاسی

هەڵزنان: هەڵگەڕان بۆ سەرەوە

هایم: سەرگەردان، وێڵ

هەنبەر: بەرانبەر

هەترەش: زەندەق، زراو

هەنووکە: ئیستا، نها، نهوو

هۆشن: بەهۆش

هەتەر: مەودای حوکمی چاو

هۆڤی: کێوی، وەحشی

هزرو هزرین : بیرو بیرکردنەوە

هەیڤ : مانگ

هەدا : سەبر ، حەوسەڵە

هەراوزەنا : هەراو هەنگامە

هەڕەمە : تێکەڵ و پێکەڵ، گەنم ودانەوێڵەی تێکەڵکراو

هاپۆ : مام

هەڵەشە :لەسەر، بێ ئەقڵ

هەرەت : تاف

هەتوان : مەرهەم ، مەڵحەم

هەڤڕك : ملەکەر، ململانێ، ڕکبەڕکێ

هەڕوو : هەڕە ، بڕۆ

هەنگێ : هەینێ ، ئەوسا

هەشتاو : پەلە ، لەز، خێرا

هەڕە : مشار

هەوسار : هەفسار، ئەوسار، رەشمە

## ی:

یاڵ: تووکی سەر ملی شێرو یەکسم

یەکهاوی: یەکجۆر، یەکدەست، بێگۆڕان

یارۆ : فلاَن

یاتاخ : پێخەف ، نوێن

حەمە کەریم عارف

* کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.

- لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.

• یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) رۆژنامەی هاوکاری لە ١٩٧٣/٦/٨ بڵاوبووەتەوە.

- لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.

- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢، گۆڤاری نەوشەفەق.

* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك،نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.

*له ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستان بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزلوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.

- لە هەشتاکانەوە تا ٢٠١٠/٨/٢٠راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩
٢- کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم،١٩٨٨،چاپی سێیەم ٢٠٠٧
٣- بەیداخ، چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٨٨
٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم ٢٠٠٥
٥- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك،چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان
٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێڕان چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ
٧- نینا، رۆمان، سابت رەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،١٩٨٥ چاپی سێیەم ٢٠٠٥
٨- نامۆ، رۆمان، ئەلبیر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ١٩٨٧چاپی چوارەم ٢٠٠٩ وەشانخانەی سایە،سلێمانی
٩- رێبەر، رۆمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) ١٩٨٣، چاپی دووەم، ٢٠٠٧
١٠-شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راه کارگر)، چاپی دووەم، ٢٠٠٩ خانەی وەرگێڕان.
١١- هاوماڵەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم ٢٠٠٠ دەزگای گوڵان
١٢ – بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦
١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق
١٤- دوورە وڵات، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گوڵان
١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨
١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر
١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥
١٨- ئەو رۆژەی کە ونبووم (کۆمەڵە چیرۆکی بیانی) چاپی یەکەم،٢٠٠٦
١٩- جێ پێ (کۆمەڵە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم ٢٠٠٦،نووسەرانی کەرکوك
٢٠- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆك، چیخۆف،چ١،دەزگای موکریانی

٢١- چیرۆکستان ،کۆمەڵێك دەق‌ورەخنەی جیهانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسەرانی کەرکوك
٢٢-دیدارو دەق‌و رەخنە،چ٢٠٠٥،١
٢٣-دیداری چیرۆکڤانی، چ٢٠٠٥،١
٢٤-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ٢٠٠٨،١نووسەرانی کەرکوك
٢٥- میوان، چیرۆك،ئەلبێر کامۆ

---

٢٦- مەسەلەی کورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥
٢٧- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١٩٩٨١،١
٢٨- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤
٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦
٣٠- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا،کریس کۆچرا،چاپی شەشەم ٢٠١١
٣١ -کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨
٣٢- چینی کۆن، چ١(        )دەزگای موکریانی

---

٣٣- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی
٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

---

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر
٣٦- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٣٧- جولەکەکەی ماڵتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.
٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ
٣٩- بەد حاڵی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولام حسەینی ساعیدی)
٤١- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بڵاوەخانەی سایە، سلێمانی
٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵلائەلبوسێری..

---

٤٣- منداڵە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.
٤٤- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان، یەلماز گونای
٤٥- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان
٤٦- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ مناڵان)
٤٧- چەند چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (٢٣ئەفسانە)

---

٤٨- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەکەم٢٠٠٨
٤٩- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر

٥٠- ئيلياده، هۆميرۆس، چ١،دەزگای سەردەم ٢٠٠٩

٥١- گۆڤەنـد و زنـار (فەرهـەنگی فارسـی - کـوردی) حەمـە کـەریم عـارف، چ١(٢٠٠٦-٢٠٠٨)دەزگای موکریانی

٥٢-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چ١، ٢٠٠١

٥٣- چرنیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس

٥٤- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.

٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.

٥٦- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی

٥٧- گوگول، نووسەری ریالیست

٥٨- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی

٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی

٦٠- خافروغ لە شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی

٦١- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان

٦٢-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

٦٣- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٤- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٥- مێـژووی ئـەدەبیاتی جیهـان (ئـەدەبیاتی ئینگلیـزی زمـان- ئـەمریکاو ئینگلیسـتان لـە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٦- ریالیزمودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام،چ٢٠٠٤،١،دەزگای سپیرێز

٦٧- قوتابخانە ئەدەبییەکان،رەزا سەید حسەینی، چ٢٠٠٦،١دەزگای موکریانی

٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی

٦٩- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ٢، ٢٠٠٦

٧٠- هونەروژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی

٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ١،یانەی قەڵەم ٢٠٠٦

٧٢- رێبازە هونەرییەکانی جیهان

٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦

٧٤- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ٢٠٠٧،١

٧٥- دەربارەی رۆمان و چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨

٧٦- مـەرگی نووسـەرو چـەند باسـێکی دیکـەی ئـەدبی-رۆشـنبیری،حەمەکەریم عـارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك

٧٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی،٢٠٠٩
٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()
٧٩- پەڵکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤
٨٠- خیانەتی حەڵاڵ، حەمە کەریم عارف
٨١-بووکی هەزار زاوا، کۆچیرۆك، بزورگی عەلەوی
٨٢-ئەبوزەر، د.عەلی شەریعەتی
٨٣-ریوایەت، ڕۆمان، بزورگی عەلەوی
٨٤-وقفات في رحاب الپقافە الکوردیە، حەمە کەریم عارف
٨٥-هەژاران، ڕۆمان، دوستوفسکی
٨٦-دەیڤد کۆپەرفیلد، (رۆمانی کورتکراوە بۆ نەوجەوانان) چارلس دیکنز
٨٧-ئۆدیسە، داستان، هۆمیرۆس
٨٨-ڤل الصوت و قصص اخری، تقدیم و ترجمە جلال زنگابادی
٨٩-شازادە و گەدا، رۆمان، مارك توین
٩٠-توحفەنمای ئەدەبیاتی جیهانی
٩١-سفرەی فەقیران   حەمە کەریم عارف
٩٢-باڵندەکەی من    رۆمان، فریبا وفی
٩٣- نامەکانی تولستۆی
٩٤- جەمیلە، رۆمان    جەنگیز ئایتماتۆڤ
٩٥- حەفتا چیرۆکی چینی بۆ منالانی کورد
٩٦- الرحیل الدامی....تقدیم وترجمە: جلال زنگابادی
٩٧- کڵوانە سوور... کۆچیرۆك بۆ مندالان
٩٨- ئەو پیاوەی کە سێبەری خۆی فرۆشت ..رۆمان..شامیسۆ
٩٩- دکتۆر...شانۆنامە...برانسیلاڤ
١٠٠- با خەییام باش بناسین /جەلال زەنگابادی
١٠١- دۆزەخی پیرۆز، رۆمان ،برهان شاوی
١٠٢- من و نەنکم و ئیلاریون و ئیلیکۆ / رۆمان / نودار دومبادزە
١٠٣- یادگارییەکانی خانەی مردووان/ دۆستویفسکی

* لە راپەرینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات وبەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاودەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بکات...